بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر


**<u>پێناسی کتێب</u>**

ناوی کتێب : مێژووی تەبەری

بابەت :مێژوویی

بەرگی: چوارەم

**نوسینی: محمد بن حریر طبری**

**وەرگێرانی: زانەر محمد**

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠١٠

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

تیراژ :١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن (٢٤٥٨) ساڵی (٢٠٠٩) پێدراوە

# پێڕست

## ساڵی نۆیەمی کۆچی دەستی پێکرد

لەم ساڵەدا نێردراوانی مناڵەکانی ئەسەد هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، پێش ئەوەی کەس بۆ لای ئێمە بنێرێت، خۆمان هاتین. خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((یمنون علیك أن اسلمواقل لا تمنوا علی اسلامکم.

واتاکەی: منەت دەکەنە سەر تۆ کەباوەڕیان هێناوە، بڵێ: منەتی ئیسلامی خۆتان مەخەنە سەر من.)).

لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە نێردراوانی هۆزی بەلی هاتن و لای رەوەیفع کوڕی سابتی بەلەوی دابەزین.

هەروەها لەم ساڵەدا نێردراوانی داریانی لەخم هاتن. ژمارەیان دەکەس بوو.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا عوروە کوڕی مەسعودی سەقەفی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەگەمارۆی سەر تاییف گەڕایەوە، عوروە کوڕی مەسعود بەدوای ئەو هات و پێش ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) بگاتە مەدینە، خۆی پێگەیاند و باوەڕی هێنا، وتی: وەك موسوڵمانێك دەگەڕێتەوە لای خەڵکەکەی خۆی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەتکوژن. چوونکە زانیبووی خەڵکەکەی لەخۆڕاگری کردنیان لەتاییف لەخۆبایی بوون.

عوروە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منیان لەچاویان زیاتر خۆش دەوێت. ئەویان خۆش دەویست. خۆشەویستی و گەورەی خەڵکەکەی بوو. بەرێکەوت تا پێشنیاری ئیسلامیان پێبکات. هیوادار بوو بەهۆی ئەو ڕێزەی لەناو ئەواندا هەیەتی، دژایەتی نەکەن. کاتێك لەسەر بانی ماڵەکەی خۆیەوە پێشنیاری ئیسلامی بەخەڵکان و دینەکەی خۆی ئاشکرا کرد، تیربارانیان کرد. تیرێکی بەرکەوت و کوژرا.

بەگومانی مناڵەکانی مالك بکوژی عوروە یەکێك لەوان بەناوی ئەوس کوڕی عەوفە. هۆزەکانی هاوپەیمان گومانیان کردووە یەکێك لەوان لەتایەفەی مناڵەکانی عەتال بەناوی وەهب کوڕی جابر ئەوی کوشت.

بەعوروەیان وت: سەبارەت بەخوێنبایی خۆت چی دەڵێت؟

وتی: ئەمە رێز و شەهید بوونە و خواوەند بەمنی بەخشیوە، منیش وەك ئەو شەهیدانەی هاورێی پێغەمبەرم کەلێرە کوژران. لەگەڵ ئەوان بەخاکم بسپێرن.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەو هاوشێوەی ڕەسووڵێکی (نێردراوێکی) شەهیدە کە لەسووری (یس) ئاماژەی پێدراوە.

لەم ساڵەدا نێردراوانی تاییف هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). دەڵێن: لەمانگی ڕەمەزاندا بوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: چەند مانگ دوای کوژرانی عوروە کوڕی مەسعود، خەڵکانی تاییف لەناوخۆدا گفتوگۆیان کرد و وتیان توانای بەرگری کردن لەبەرابەر عەرەبەکانیان نییە. بەیعەتیان کرد و باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

یەعقوب کوڕی عوتبە کوڕی موغەیرە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی ئومەییەی عیلاجی لەعەبد یالەیل کوڕی عەمرۆ، دابڕابوو. ئاژاوە لەناو ئەوان سەریهەڵدا. عەمرۆ یەکێك بوو لەزیرەکترین پیاوانی عەرەب. ڕۆژێك ڕۆشتە ماڵی عەبدیالەیل و پەیامی دا کەعەمرۆ کوڕی ئومەییە دەڵێت: وەرە بۆ لای من.

عەبدیالەیل بەنێردراوی وت: بەراست عەمرۆ تۆی ڕەوانە کردووە؟

وتی: بەڵێ و هەمێستا لەماڵەکەی تۆدا وەستاوە.

عەبدیالەیل وتی: هەرگیز چاوەڕوانی ئەمەم نەدەکرد. عەمرۆ پیاوێکی سوودخواز بوو. کاتێك ئەوی بینی، بەخێرهاتنی کرد. عەمرۆ وتی: بەناچاری دەبێت ئاشت ببینەوە. ئەم پیاوە دەسەڵاتی فراوان و عەرەبەکان هەموویان موسوڵمان بوون. ئێوە توانای خۆڕاگری لەبەرابەر ئەوتان نییە، بەکارەکانی خۆتاندا بچنەوە.

سەقیفییەکان لەناوخۆدا گفتوگۆ و راوێژیان کرد. بەیەکیان وت: مەگەر نابینین کەس لەئێوە لەئەماندا نییە، هەرکەس بڕواتەدەر دەیکوژن. بڕیاریاندا کەسێك بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) بنێرن، بەهەمان شێوە کەپێشتر عوروەیان ناردبوو. لەگەڵ عەبدیالەیل کەوتەکانی هاوشێوەی عوروە بوو، گفتوگۆیان کرد تا بڕواتە لای پێغەمبەر(د.خ). بەڵام رازی نەبوو چونکە دەترسا لەکاتی گەڕانەوە ئەو بەڵای بەسەر عوروەدا هێنایان، بەسەر ئەویشدا بیهێنن. وتی: ئەو کارە ناکەم مەگەر چەند کەسێك لەگەڵ من بنێرن. بڕیاریاندا لەهۆزەکانی هاوپەیمان حەکەم کوڕی عەمرۆ و نەمەیر کوڕی خەرەشەی لەگەڵدا بنێرن.

وەفدی نوێنەران شەش کەس بوون. عەبدیالەیل لەگەڵیان بەرێکەوت. سەرکردەی وەفدەکە بوو. ئەوانی لەگەڵ خۆی برد چوونکە لەچارەنووسی عوروە ترسا بوو. دەیویست کاتێك بۆ تاییف گەڕانەوە، هەرکام لەنوێنەرانی خەڵك، ڕێگە لەتوند و تیژی ئەوان بگرن.

کاتێك نێردراوانی سەقیف لەمەدینە نزیك کەوتنەوە، لەسەر چاڵاوێك دابەزین و موغەیرە کوڕی شوعەبەیان لەوێ بینی کە لەسەرەی خۆیدا چوارپێکانی پێغەمبەری دەلەوەڕاند چوونکە کاری لەوەڕاندی چاروێکانی پێغەمبەر(د.خ)، هەر ڕۆژە و لەئەستۆی کەسێکدا بوو. کاتێك موغەیرە ئەوانی بینی، بەخێرایی بەرێکەوت بۆ ئەوەی مژدەی هاتنی ئەوان بە پێغەمبەر(د.خ) بدات. ئەبوبەکر ئەوی بینی و موغەیرە پێی وت کەنێردراوانی سەقیف هاتوون تا بەیعەت ببەستن و باوەڕ بێنن. دەیانەوێت مەرجەکانیان بۆ دابنرێت و سەبارەت بەخەڵك و سامانەکەی خۆیام پەیمانێك لە پێغەمبەر(د.خ) وەربگرن.

ئەبوبەکر وتی: سوێندت دەدەم پێش من مەڕۆ لای پێغەمبەر(د.خ) تا خۆم ئەم هەواڵەی پێبدەم.

موغەیرە رازی بوو. ئەو، ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەهاتنی نێردراوانی سەقیف ئاگاداری کردەوە. موغەیرە گەڕایەوە بۆ لای کەسەکان و فێری کردن چۆن سلاو بۆ پێغەمبەر(د.خ) بنێرن، بەڵام ئەوان وەك ڕۆژگاری جاهلییەت سلاویان کرد.

کاتێك ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، لەسووچێکی مزگەوتەکەدا خێوەتێکیان بۆ هەڵدرا. خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس لەنێوان ئەوان و پێغەمبەر(د.خ) هاتوچۆی دەکرد تا ئەو پەیمانەی مەبەستییان بوو، نوسرا. خالید پەیمان نامەکەی نووسی. دەستیان بۆ خواردنەکەی پێغەمبەر(د.خ) نەدەبرد، خالید لێی خوارد و باوەڕیان هێنا و پەیمانەکە نووسرا.

یەکێك لەو شتانەی داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد کەلات، بتەکەی سەقیف بۆ ماوەی سێ ساڵ بهێڵێتەوە و وێرانی نەکات بەڵام پێغەمبەر(د.خ) رازی نەبوو. ساڵێکیان لێ کەم کردەوە و رازی نەبوو. سەرئەنجام بەیەك مانگ رازی بوون بەڵام پێغەمبەر(د.خ) رازی نەبوو. وەك دەڵێن: مەبەستیان ئەوە بوو بەهێشتنەوەی لات لەدەستدرێژی نەزان و ژنەکانی خۆیان پارێزراو بن و خەڵکان لەوێران بوونی بتەکە نەشلەژێن و پەرێشان نەبن تا ئەو کاتەی دڵیان بەنووری ئیسلام ڕووناك دەبێتەوە. بەڵام پێغەمبەر(د.خ) رازی

نەبوو و پێداگرانە دەیفەرموو: ئەبوسوفیان کوڕی حەرب و موغەیرە کوڕی شوعبە بۆ وێرانی کردنی بتەکە دەنێرێت.

هەروەها داوایان کرد نوێژیان لەسەر نەبێت و بتەکانیان بەدەستی خۆیان بشکێنن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: رازیم بەوەی بتەکانتان بەدەستی خۆتان بشکێنن بەلآم سەبارەت بەنوێژ، ئەو دینەی نوێژی نەبێت، پەسەند نییە.

وتیان: ئەی محەممەد، نوێژ دەخوێنین هەرچەندە هۆکاری ریسواییە.

کاتێك باوەڕیان هێنا و پەیمان نامەکە نووسرا، پێغەمبەر(د.خ) عوسمان کوڕی ئەبی عاسی وەك سەرکردەی ئەوان دیاری کرد کەلەهەموویان گەنجتر بوو. ئەو زیاتر لەهەمووان خوازیاری فێربوونی فێرکارییە دینییەکان بوو. ئەبوبەکر ئەم بابەتەی لای پێغەمبەر(د.خ) باس کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتن و مەبەستی گەڕانەوە بۆ سەرزەمینی خۆیان کرد، پێغەمبەر(د.خ) ئەبوسوفیان و موغەیرە کوڕی شوعبەی بۆ وێران کردنی لات نارد. لەگەڵ ئەوان بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتنە تاییف، موغەیرە دەیویست ئەبوسوفیان پێش بخات، بەلآم رازی نەبوو، وتی: تۆ بڕۆ ناو خەڵکەکەی خۆت. ئەبوسوفیان لەزی ئەلهێرەم مایەوە. کاتێك موغەیرە ڕۆشتە ناو شارەکە، بەپاچ دەستی بەشکاندنی لات کرد. منداڵەکانی موعتیب لەتایەفەکەی خۆی، دەوریان گرتبوو لەترسی ئەوەی نەکا تیر بهاوێژن و خوێنی بڕێژن بەهەمان شێوەی عوروەیان کوشت. ژنانی سەقیف بەسەری رووت هاتنەدەر و بۆ بتەکەی خۆیان دەگریان. کاتێك موغەیرە لەبتەکەی دەدا، ئەبوسوفیان دەیوت: ئافەرین، دەسخۆش. و کاتێك لەشکاندنی تەواو بوو، هەموو سامانی بتەکەی هەڵگرت و ناردی بۆ لای ئەبوسوفیان. پێغەمبەر(د.خ) فەرموویبووی: قەرزەکانی عوروە و ئەسوەد کوڕی مەسعود لەسامانی لات بداتەوە. ئەو کارەی کرد.

لەم ساڵە پێغەمبەر(د.خ) بۆ غەزای تەبوك مەدینەی بەجێهێشت.

## گێڕانەوەی غەزای تەبوك

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەتاییف گەڕایەوە، زەیحەججە و رەجەبی لەمەدینە بەسەر برد. دواتر فەرمانیدا خەڵکان بۆ غەزای رۆمەکان ئامادە بن.

کوڕی حەمید دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدا بۆ غەزای رۆمییەکان خۆیان ئامادە

بکەن. لەبەر ئەوەی وەرزی گەرما و وشکەساڵی و میوەکان گەییوو و سێبەر خۆشەویست بوو، خەڵکان مانەوە لەسێبەر و باخیان پەسەند کرد و لەجووڵە بێزار بوون.

پێغەمبەر(د.خ) کاتێك مەبەستی شەڕی دەکرد، بەئاشکرا نەیدەهێنایە سەرزمان، ئاماژەی بەشوێنی مەبەست دەدا جگە لەغەزوەی تەبوك لەبەر ئەوەی ڕێگەکەی دوور بوو و بەشێوەیەکی ئاشکرا لای خەڵکان باسی کرد و فەرمووی کەرەستەکانی سەفەر ئامادە بکەن. خەڵکان خۆیان ئامادە دەکرد بەڵام لەڕۆشتن بێزار بوون چوونکە شەڕ کردن لەگەڵ ڕۆمییەکانیان بەدژوار دەزانی.

ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) خۆی بۆ غەزا ئامادە کرد و بەجەد کوڕی قەیسی سولەمی فەرموو: ئەمسالْ بۆ شەڕی مناڵەکانی ئەسفەر دێیت؟

جەد وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، مۆڵەتی مانەوەم پێبدە و شەیدام مەکە. خەڵکان دەزانن کەس لەمن زیاتر شەیدای ژنان نییە، دەترسم ئەگەر ژنانی مناڵەکانی ئەسفەر ببینم، نەتوانم خۆڕاگری بکەن.

پێغەمبەر(د.خ) پشتی تێکرد و فەرمووی: مۆڵەتم پێدایت. ئەم ئایە سەبارەت بەو هاتەخوار:

((ومنهم من يقول ائذن لي و لا تفتني، الا في الفتنة سقطوا و ان جهنم لمحيطة بالكافرين.

واتاکەی: یەکێك لەوان کەسێك داوای مۆڵەت دەکات و دەڵێت گیرۆدەی گوناحم مەکە بزانن گرفتاری گوناح بوون و جەهەننەم کۆکەرەوەی کافرەکانە.))

دەستەیەك لەدووڕووان بەخەڵکانیان وت: لەم گەرمایەدا بەرێمەکەون. چوونکە تامەزرۆی جیهاد نەبوون و گومانیان لەراستییەکان دەکرد. دژی پێغەمبەر(د.خ) قسەیان دەهێنایە سەرزمان. ئەم ئایە سەبارەت بەوان هاتەخوار:

(( و قالوا لا تنفروافي الحر قل نار جهنم اشد حرا لو كانوا يفقهون. فليضحكوا قليلا و ليبكوا كثيرا جزاء بما كانوا يكسبون.

واتاکەی: وتیان: لەگەرمایە بەرێمەکەون، بڵێ گەرمای جەهەننەم زۆر سەختترە ئەگەر تێدەگەیشتن. لەسزای ئەو کردەوانەی ئەنجامیاندا دەبێت کەم پێبکەنن و زۆر بگرین.))

پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەم سەفەرە زۆری هەوڵدەدا. فەرمانیدا خەڵکان خۆیان ئامادە بکەن و هانی بەتواناکانیدا چوارپێ بەکەسانی هەژار ببەخشن. دەستەیەك لە

سامانداران بەمەبەستی وەرگرتنی پاداشتی خوایی ئەو کارەیان کرد. عوسمان کوڕی عەفان لەم ڕێگەدا سامانێکی زۆری خەرج کرد. کەس وەك ئەو نەبوو.

حەوت کەس لەئەنسار کەنازناوی گرینۆکەکانیان پێبڕا، ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و داوای چوارپێیان کرد: پێغەمبەر(د.خ) ئەم ئایەی خوێندەوە:

((لاأجدما احملكم عليه) و ئەوان ((تولوا و اعينهم تفيض من الدمع حزنا ان لا يجدوا ما ينفقون.))

واتاکەی: هیچم نییە ئێوەی سوار بکەم. ئەوان ڕۆشتن و چاویان پڕ فرمێسك بوو لەبەر ئەوەی هیچیان بۆ خەرج کردن نەبوو.))

دەڵێت: یامین کوڕی عومەیری نەزری، باوکی لەیلی عەبدولرەحمان کوڕی کەعب و عەبدوللە کوڕی موغەفەلی بینی دەگریان، وتی: بۆ دەگرین؟

وتیان: ڕۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ) تا چوارپێمان پێبدات بەلام نەیبوو، چوارپێمان نییە سوار بین و بەرێکەوین.

یامین وشترێك و بڕێك خورمای پێدان و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوتن.

دەڵێت: بیانووهێنەرەوانی عەرەب هاتن، بەلام خواوەند بەبیانووەکانی ئەوان ڕازی نەبوو. وەك بۆمنیان باس کردووە ئەوان لەمناڵەکانی غەفار بوون. یەکیان خەفاف کوڕی ئەیمە بوو.

کارەکەی پێغەمبەر(د.خ) سەری گرت و بۆ ڕۆشتن ئامادە بوو. چەند کەسێك لەموسوڵمانان و لەناویان کەعب کوڕی مالکی سولەمی و موراره کوڕی رەبیع لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف و هیلال کوڕی ئومەییە کوڕی واقیفی و باوکی خەیسەمە لەمناڵەکانی سالم کوڕی عەوف، لەڕۆشتن بەجێمان. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەسەنییەت ئەلوەداع ئوردوی لێدا، عەبدوللە کوڕی ئەبی لەخوار ئەو ئوردودی لێدا. وەك دەڵێن: ئوردوەکەی ئەو بچوکتر لەئوردوی پێغەمبەر(د.خ) نەبوو.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت عەبدوللە کوڕی ئەبی لەگەڵ دەستەی ڕیاکاران و دوودڵان و لەناویان عەبدوللە کوڕی نەبتەل و ڕوفاعە کوڕی زەید کوڕی تابووت مانەوە. ئەوان لەدوژمنە گەورە نێوخۆییەکانی ئیسلام بوون و دژی موسوڵمانان فرت و فێڵیان بەکار دەبرد.

حەسەنی بەسری دەڵێت: خواوەند سەبارەت بەو دەستەیە ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((لقدا ابتغوا الفتنة من قبل و قلبو الك الامور حتى جاءالحق و ظهر امر الله وهم كارهون.

واتاكەی: پێشتریش فیتنەگێڕ بوون و كارەكانیان لەتۆ خراپ دەكرد و دەشێواند تا ڕاستی هات و فەرمانی خواوەند هەرچەند لێی بێزار بوون، ئاشكرا بوو.))

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عەلی كوڕی ئەبی تالیبی وەك سەرپەرەستی ماڵ و خێزانەكەی خۆی لەمەدینە بەجێهێشت و فەرمووی لەگەڵ ئەوان بمێنێتەوە و سەباع كوڕی عەرەفەتەی غەفاری وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا. دووڕووەكان ئەم هەواڵەیان بڵاو كردەوە بۆیە عەلی كوڕی ئەبی تالیبی بەجێهێشت چوونكە حەز بەهاوڕێیەتی ئەو ناكات.

كاتێك دووڕووەكان ئەم قسەیان هێنایە سەرزمان، عەلی سیلاحی شەڕی هەڵگرت و بەڕێكەوت و لەجورف بەپێغەمبەر گەیشتەوە، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، خراپەكاران گومان دەكەن بۆیە منت لەمەدینە بەجێهێشت چوونكە هاوڕێیەتی منت پێخۆش نییە.

فەرمووی: درۆیان كرد، تۆم بۆ پاراستنی ماڵ و خێزانەكەم بەجێهێشت، بگەڕێرەوە و ئاگات لەماڵەكانی من بێت، مەگەر حەز ناكەیت بۆ من هاوشێوەی هارون بۆ موسا بیت، بەم جیاوازییە دوای من پێغەمبەرایەتی نامێنێت.

عەلی گەڕایەوە بۆ مەدینە و پێغەمبەر(د.خ) درێژەی بەڕێگەكەی دا.

باوكی خەیسەمی سالی لەڕۆژێك زۆر گەرم گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی خۆی. بینی هەر دوو ژنەكەی لەناو باخەكەی، هەركامیان سایەوانێكیان تەڕ كردووە و ئاوی فێنك و خواردنیان داناوە. كاتێك لای سایەوانەكان وەستا و ژنەكان و ئاوی فێنك و خواردنی بینی، بەخۆی وت: پێغەمبەر(د.خ) لەبەردەم هەتاو و بادایە و ئەمە دادپەروەری نییە باوكی خەیسەمە لەسێبەری فێنك و ئاوی فێنك و خواردنی ئامادە لەگەڵ ژنە جوانەكانی لەناو باخەكەی ژیان بەسەر ببات. بەژنەكانی وت: نایێمە ناو سایەوانەكەی ئێوە و بەدوای پێغەمبەر(د.خ) دەڕۆم. توێشووی ڕێگەم بۆ ئامادە بكەن. ژنان ئەو كارەیان كرد. سوار وشترەكەی بۆ پەیوەست بوون بە پێغەمبەر(د.خ) ملی ڕێگەی گرتەبەر. كاتێك پێیان گەیشت كە لەتەبوك دابەزیبوون.

باوكی خەیسەمە لەڕێگا چاوی بەعومەیر كوڕی وەهب كەوت. ئەویش بۆ پەیوەست بوون بە پێغەمبەر(د.خ) ملی ڕێگەی گرتبووە بەر. بوونە هاوڕێ و كاتێك لەتەبوك نزیك كەوتنەوە، باوكی خەیسەمە بەعومەیری وت: من گوناحێكم هەیە باشترە تۆ لەدواوەی من بێیت. عومەیر ئەو كارەی كرد و باوكی خەیسەمە ڕۆشت تا لە پێغەمبەر(د.خ) نزیك

کەوتەوە. خەڵکان وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) سوارەیەك لەرێگەوە دێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: زۆر باش دەبێت ئەگەر باوکی خەیسەمە بێت.

وتیان: سوێند بەخوا خۆیەتی.

کاتێك وشترەکەی خەواند، هات و سڵاوی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: باوکی خەیسەمە مەترسی لەتۆوە نزیك بوو.

باوکی خەیسەمە بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) گێڕایەوە و داوای کرد دۆعای بۆ بکات.

پێغەمبەر(د.خ) کاتێك گەیشتە حوجر دابەزی و خەڵکەکەی لەچاڵاوەکەی ئاویان هەڵگرت. کاتێك شەو داهات، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەم ئاوە مەخۆنە ودەستنوێژ مەگرن. ئەگەر هەویرتان کردووە، بیدەن بەوشترەکان و خۆتان لێی مەخۆن. کەس لەئێوە ئەمشەو بەتەنیا لەئوردووگا نەڕواتەدەر.

خەڵکان فەرمانەکانی پێغەمبەریان ئەنجامدا جگە دووان لەمناڵەکانی ساعیدە کەیەکیان بۆ دەست بەئاو گەیاندن ڕۆشت و ئەوی دیکەیان بەدوای وشترە ونبووەکەی خۆی دەگەڕا. ئەوەی بۆ دەست بەئاو گەیاندن ڕۆشت، نەیتوانی گمیز بکات و ئەوی بەدوای وشترەکەی دەگەڕا، با ئەوی بۆ کوێستانی تەی برد. کاتێك پێغەمبەریان لەبەسەرهاتی ئەوان ئاگادار کردەوە، فەرمووی: مەگەر نەموت بەتەنیا ئوردوگا بەجێمەهێڵن. ئەوەی نەیدەتوانی گمیز بکات، دۆعای بۆ کرد و چاك بوویەوە و ئەوەی بۆ کوێستانی تەی دوورخرابوویەوە، لەلایەن ئەو نێردراوانەی لەخەڵکانی تەی هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، گەڕایەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەسەرهاتی ئەم دوو پیاوە لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدراوە.

بۆبەیانی خەڵکان لەبێ ئاوی سکالایان بەرز کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) پاڕایەوە و خواوەند هەورێکی نارد و بارانی باراند. خەڵکان تێراوبوون و بەئەندازەی پێویستی خۆیان ئاویان هەڵگرت.

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە دەڵێت: لەمەحمود کوڕی لوبەیدم پرسی: ئایا خەڵکان دووروو و ریاکارەکانیان دەناسی؟

وتی: بەڵێ، کەس بوو دەیزانی براکەی یا باوکی یا مامی ریاکارە و لەیەکیان

دەشاردەوە. کەسانێك لەخەڵکەکەی من باسی ریاکارێکیان کرد کە ناوبانگی دەرکردبوو. لەهەموو شوێنێك بەدوای پێغەمبەرەوە بوو. کاتێك داستانی بێ ئاوی حوجر و پاڕانەوەی پێغەمبەر(د.خ) وباران بارین روویدا، پێمان وت: ئێستا چی دەڵێیت؟

وتی: هەورێك بوو بەرێکەوت لێرەوە تێپەڕی.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەوێ بەرێکەوت و لەرێگەدا وشترەکەی ونبوو، دەستەیەك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بۆ دوای وشترەکەدا گەڕان. یەکێك لەیاران بەناوی عومارە کوڕی حەزم کە بەشداری عوقفەبە و بەدری کرد، لای پێغەمبەر(د.خ) بوو. زەید کوڕی نەسیبی قینقاعی ریاکار، لەئوردوو لەگەڵیدا بوو، وتی: محەممەد دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) و هەواڵەکانی لەئاسمانەوە بۆ دێت، بەڵاَن نازانێت وشترەکەی لەکوێیە؟

پێغەمبەر(د.خ) بەعومارەی فەرمووی: کەسێك وتوویەتی، دەڵێت پێغەمبەرە و هەواڵەکانی لەئاسمانەوە بۆ دێت بەڵاّم نازانێت وشترەکەی لەکوێیە. سوێند بەخوا تەنیا شتێك دەزانم کەخواوەند پێم دەڵێت. ئێستا وشترەکەی نیشاندام و لەفلاَن دۆڵدایە و جڵەوەکەی لەدارێك گیری کردووە، بڕۆن و بیهێنن. ڕۆشتن و وشترەکەیان هێنا.

کاتێك عومارە بۆ لای هاورێکەی گەڕایەوە، وتی: سەیرە، پێغەمبەر(د.خ) باسی کەسێك کرد و کەبەو شێوەیە قسەی کردبوو، - ئاماژەی بەوتەکانی زەیددا- خواوەند ئاگاداری کردبوویەوە. یەکێك لەوان کەلای هاورێکەی عومارە بوو، وتی: سوێند بەخوا پێش ئەوەی بێیت، زەید ئەم وتانەی هێنایە سەرزمان. عومارە قوڕگی زەیدی گرت و گووشی، هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا، ئەم شەڕە هاورێیەتی منی دەکردو ئاگادار نەبووم، ئەی دوژمنی خوا بڕۆ و هاورێیەتی من مەکە.

دەڵێن: زەید دوای ئەم رووداوە تۆبەی کرد. بەوتەیەك بەهەمان شێوە دڵی خراپ بوو تا مردن.

پێغەمبەر(د.خ) بەرێگەدا دەڕۆشت و کاتێك کەسێك بەجێدەما، دەیانوت: پێغەمبەر(د.خ) فلاَن کەس نەهات.

دەیوت: کارتان پێی نەبێت، ئەگەر خێری هەبێت، پەیوەستی ئێوە دەبێت وئەگەر جیاواز لەوە بێت، خواوەند ئێوەی لەو ئاسوودە کردووە.

ئەبوزەر بەجێما چوونکە وشترەکەی نەیدەتوانی بڕوات. پێغەمبەر(د.خ) وتەکانی دووبارە کردەوە. کاتێك ئەبوزەر خاوی و لاوازی وشترەکەی خۆی بینی، کەلوپەلەکانی

خستە سەر پشت و پیادە شوێن پێغەمبەر(د.خ) کەوت. لەیەکێك لەمەنزڵەکان پێی گەیشتەوە. یەکێك لەموسوڵمانان ئەوی لەدوورەوە بینی و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، یەکێك لەرێگەوە دێت.

فەرمووی: چەند باش دەبوو ئەگەر ئەبوزەر بێت.

کاتێك سەیریان کرد، وتیان: سوێند بەخوا ئەبوزەرە.

فەرمووی: خواوەند ئەبوزەر ببەخشێت، بەتەنیای رێگەدەبرێت، بەتەنیا دەمرێت و بەتەنیا حەشر دەکرێت.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزەی دەڵێت: کاتێك عوسمان ئەبوزەری بۆ مانەوە لەرەبزە ناچار کرد، لەوێ مرد. کەس جگە لەکۆیلە و ژنەکەی ئامادە نەبوون. بەوانی وت: بمشۆن و کفنم بکەن. لەقەراغ رێگە دامنێن و یەکەم کاروان کەدێت، بڵێن: ئەمە ئەبوزەری هاوەڵی پێغەمبەرە لەدفن کردنی ئەو هاوکاریمان بکەن.

کاتێك ئەبوزەر مرد، کۆیلەکەی ئەو کارەی کرد. جەستەی کفن کراوی ئەویان لەقەراغ رێگە دانا. عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود و دەستەیەك لەخەڵکانی عێراق بۆ عەمرە دەرۆشتن و لەناکاو لەقەراغ رێگە جەستەیەکیان بینی. زۆری نەمابوو وشترەکان پێشێلی بکەن. کۆیلە لەقەراغ رێگەکە هەستا و وتی: ئەمە ئەبوزەر هاوەڵی پێغەمبەرە، هاوکاریمان بکەن تا بەخاکی بسپێرین.

دەڵێت: عەبدوڵڵە کوڕی مەسعود لەبینینی جەستەکە دەستی بەگریان کرد و وتی: بەراستی پێغەمبەر(د.خ)،راستی فەرموو: بەتەنیا رێگە دەبڕیت و لەتەنیاییدا دەمریت و بەتەنیا حەشر دەکرێیت.

داستانی بەجێمانی ئەبوزەری لەرێگەی تەبوك و فەرموودەکانی پێغەمبەری(د.خ) بۆ هاورێکانی باس کرد.

دەڵێت: چەند کەسێك لەریاکاران و لەناو ئەوان وەدیعە کوڕی سابت و مەخشی کوڕی حەمیر لەرێگەی تەبوك هاورێیەتی پێغەمبەریان دەکرد. یەکیان بەوەی دیکەی وت: گومان دەکەن شەڕ لەگەڵ مناڵەکانی ئەسفەر هاوشێوەی شەڕەکانی دیکەیە، سوێند بەخوا دەبینم بەیانی بەتەنافەکانەوە بەستراون. ئەم وتانەی بۆ ترساندنی موسوڵمانەکان هێنایە سەرزمان.

مەخشی کوڕی حەمیر وتی: سوێند بەخوا حەز دەکەم یەکی سەد قامچیمان لێبدەن

بەلام بۆ ئەو وتانەی تۆ ئایەی قورئان ڕەوانە نەکرێت.

پێغەمبەر(د.خ) بەعەمار کوڕی یاسری وت: بڕۆ لای ئەو خەڵکانەی قسەی ناڕەوایان هێناوەتە سەرزمان، بپرسە بزانە چییان وتووە، ئەگەر حاشایان کرد، بڵێ ئەمەو ئەوەتان باس کردووە. قسەکانی ئەوانی بۆ باس کرد.

عەمار ڕۆشت و قسەی لەگەڵ کردن. بۆ داوای لێبووردن هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). وەدیعە کوڕی سابت لەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) لای وشترەکەی خۆی وەستابوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) قسەمان کرد بۆ ئەوەی کات بەسەر ببەین. خواوەند ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((ولئن سألتهم ليقولن انما كنا نخوض و نلعب، قل ابا الله و آياته و رسوله كنتم تستهزئون.

واتاکەی: ئەگەر لەوان بپرسیت، دەڵێن: گفتوگۆمان کرد بۆ ئەوەی کات بەسەر ببەین، بڵێ: چۆن گاڵتەتان بەخوا و ئایەکانی ئەو و پێغەمبەرەکەی دەکرد؟))

مەخشی کوڕی حەمیر وتی: ناوی من و ناوی باوکم منی لەراستییەکان دوور خستەوە.

ئەم وتەی وەك سەرکۆنە کردنی خۆی هێنایە سەرزمان چوونکە مەخشی بەمانای ترسان و حەمیر بەمانای کەرەکانە. ئەوەی لەئایەکەدا باسی بەخشینی کراوە مەخشی بوو و ناوەکەی گۆڕا بۆ عەبدولرەحمان. داوای لەخواوەند کرد شەهید بوونی پێببەخشێت و کەس شوێنەکەی نەزانێت. لەسەردەمی ئەبوبەکر لەشەڕی یەمامە کوژرا و هیچ شوێنەوارێکیان لێ نەدۆزییەوە.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە تەبوك، یەحنا کوڕی روبە وەك فەرمانڕەوای ئیلە هات و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی ئاشتی بەست و باجیدا. خەڵکانی جەرباء و ئەزرەحیش بەهەمان شێوە باجیاندا و پێغەمبەر(د.خ) بۆ هەرکامیان پەیمانێکی نووسی و ئێستا لای ئەوان پارێزراوە.

پێغەمبەر(د.خ)، خالید کوڕی وەلیدی ببۆ لای ئەکیدەر کوڕی عەبدولمەلیك پاشای دومە نارد. ئەو لەخەڵکانی کێندە و مەسیحی بوو. پێغەمبەر(د.خ) بەخالیدی فەرموو: کاتێك سەرقاڵی ڕاوی گایە، دەیبینیت.

خالید کوڕی وەلید بەرێکەوت و لەمانگەشەوێکی ڕووناکدا گەیشتە نزیك قەڵاکەی ئەو. ئەکیدەر لەگەڵ ژنەکەی لەسەرەوە و گا شاخدارەکانی خۆی بەرەو دەرگای کۆشکەکەی دەبرد، ژنەکەی وتی: تا ئێستا گای لەمشێوەت بینیوە؟

وتی: نا سوێند بەخوا.

ژن وتی: کێ ئەم گایانە بەرەلاّ دەکات؟

ئەکیدەر دابەزی و فەرمانیدا ئەسپەکەی زین بکەن. چەند کەسێك لەئەندامانی بنەماڵەکەی و لەناویان حسانی برای لەگەڵی سەرکەوتن و شوێن گاکان کەوتن. لەوکاتەدا رووبەرووی سوارەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون. ئەکیدەر ئەسیر کرا و براکەی کوژرا. عابایەکی لەدیبای رازاوە بەزێر لەبەر ئەکیدەردا بوو. خالید هەڵیگرت و پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ مەدینە، بۆ پێغەمبەری نارد.

ئەنس کوڕی مالك وتی: سەرتان لەمە سوور دەمێنێت، سوێند بەو خوایەی گیانی محەممەد لەدەستی ئەودایە، جامانەی سەعد کوڕی مەعاز لەبەهەشت لەمە باشترە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دوای ئەوەی خالید ئەکیدەری هێنایە لای پێغەمبەر(د.خ)، لەخوێنەکەی خۆش و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست بەو مەرجەی باج بدات. دواتر ئازادی کرد و بۆ سەرزەمینی خۆی گەڕایەوە.

یەزید کوڕی رومان دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دە و چەند رۆژێك لەتەبوك مایەوە و زیاتر پێشڕەوی نەکرد و بۆ مەدینە گەڕایەوە. لەیەکێك لەدۆڵەکانی رێگە بەناوی موشەقەق ئاوێك لەتاشەبەردێکەوە دەهاتەدەر کە بۆ یەك یا دوو یا سێ کەس بەس بوو.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرکەس لەئێمە زووتر بگاتە ئاوەکە، لێی نەخواتەوە تا ئێمە بگەین.

دەڵێت: چەند کەسێك لەریاکاران پێش پێغەمبەر(د.خ) گەیشتنە ئاوەکە و هەموو ئاوەکەیان خواردەوە و کاتێك* پێغەمبەر(د.خ) گەیشت، ئاوی نەبینی، فەرمووی: کێ پێش ئێمە گەیشتۆتە ئێرە؟

وتیان: فلاّن و فلاّن.

فەرمووی: مەگەر نەموت لێی نەخۆنەوە تا ئێمە بگەین. پێغەمبەر(د.خ) نفرینی کردن. دواتر دابەزی و دەستی خۆی خستە ژێر بەردەکە و کەمێك ئاو کۆبوویەوە و لەبەردەکەی دا و دۆعایەکی خوێند و ئاوێکی فراوان لەبەردەکە هاتەدەر. کەسێك کەبیستبووی دەیوت: دەنگەکە وەك هەورە تریشقە بوو. خەڵکان ئاویان خواردەوە و بەئەندازەی پێویستیان هەڵگرت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرکەس لەئێوە تەمەنی درێژی هەبێت، دەبیستێت ئەمە دۆڵە لەهەموو دۆڵەکانی دەوروبەر سەرسەوزترە.

پێغەمبەر(د.خ) بەرێکەوت تا گەیشتە زی ئەوان کە یەك كاژێر لەمەدینەوە دوورە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) خۆی بۆ سەفەری تەبوك ئامادە دەکرد، بناغەدارێژەرانی مزگەوتی زەرار ڕۆشتنە لای و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە بۆ پەككەوتەکان و نەداران و شەوی بارانی مزگەوتێکمان دروست کردووە و حەز دەکەین بێیت و نوێژی تیا بخوێنیت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێستا لەسەفەردام و کاتم نییە، بەخواستی خوا ئەگەر گەڕامەوە، دێم و نوێژی تیا دەخوێنم.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەزی ئەوان دابەزی و لەتەواو بوونی مزگەوتەکە ئاگادار بوویەوە، مالیك کوڕی دەخشم لەمناڵەکانی سالمی و مەعن کوڕی عودی عێجلی بانگ کرد و وتی: بڕۆن ئەو مزگەوتە وێران و بسووتێنن چوونکە بناغەدارێژەرەکانی ستەمگەر و ستەمکاران.

ئەو دوانە بەخێرای ڕۆشتن تا گەیشتنە شوێنی مناڵەکانی سالیم، هۆزی مالیك کوڕی دەخشەم. ئەو بەمەعنی وت: لێرە بە تا ئاگرێك لەماڵەوە بێنم. ڕۆشتە ماڵەکەی خۆی و چەند لقێکی خورمای پێکەوە بەست و ئاگریدا. بەخێرایی بەرەو مزگەوتەکە بەرێکەوتن. خەڵکانێك لەناو مزگەوتەکەدا بوون. مزگەوتەکەیان ئاگر تێبەردا و خەڵکان بڵاوەیان لێکرد. ئەم ئایانەی قورئان سەبارەت بەوان هاتەخوار:

((والذین اتخذوا مسجد ضرارا و کفرا و تفریقا بین المؤمنین و ارصاد المن حارب الله و رسوله من قبل و لیحفلن ان اردنا الاالحسنی و الله یشهدانهم لکاذبون. لا تقم فیه ابد، المسجد اسس علی التقوی من اول یوم الحق ان تقوم فیه، فیه رجال یحبون ان یتطهروا و الله یحب المطهرین. افمن اسس بنیانه علی تفوی من الله و رضوان خیر ام من اسس بنیانه علی شفا جرف هار فانهار به فی نار جهنم؟ و الله لا یهدی القوم الضالمین.

واتاکەی: کەسانێك کەمزگەوتیان بۆ زیاندان و بەهێز کردنی کوفر و دووبەرەکی موسوڵمانان لەچاوەڕوانی کەسێك کەپێشتر شەڕ و دوژمنایەتی خوا وپێغەمبەری کردووە، دورست کردووە و سوێند دەخۆن تەنیا مەبەستمان چاکە بووە، خواوەند شایەتی دەدات کە ئەوان درۆزنەکان. هیچ کات لەویَ مەوەستە. مزگەوتێك کە لەیەکەم ڕۆژەوە، بناغەکەی لەسەر خۆپارێزی دارێژرابێت، شیاوترە لەویَ نوێژ بخوێنیت. پیاوانێکی لێیە ئارەزوو دەکەن پاکیزەیی بکەنە پیشە و خواوەند پاکەکانی خۆش

دەوێت. ئەو کەسەی بنەمای خۆی لەسەر خواپەرەستی و بەدەستی هێنانی ڕەزامەندی خواوەند بنیات ناوە، باشترە یا ئەو کەسەی بنەمای خۆی لەسەر لێواری لافاوێك داناوە دادەڕمێت و لەگەڵ ئەو دەکەوێتە ئاگری جەهەننەم؟ خواوەند ستەمکاران ڕێنوێنی ناکات.))

دروستکەرانی مزگەوت دوانزە کەس بوون:

خەدام کوڕی خالید، لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف.

سەعلەبە کوڕی حاتب لەمناڵەکانی عوبەید و باوکی حەبیبە هەردووکیان لەمناڵەکانی زەبیعە.

عوباد کوڕی حەنیف، برای سەهل کوڕی حەنیف لەمناڵەکانی عەمرۆ کوڕی عەوف.

جاریە کوڕی عامر لەگەڵ دوو کوڕەکەی موجەمەع کوڕی جاریە و زەید کوڕی جاریە.

نەبتەل کوڕی حارس و بەحزەج موالی مناڵەکانی زەبیعە.

بوجاد کوڕی عوسمانی زەبیعی و وەدیعە کوڕی سابت موالی مناڵەکانی ئومەییە تایەفەی باوکی لوبابە.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە مەدینە، دەستەیەك لەریاکاران لەوێ مابوونەوە، کەعب کوڕی مالك و موراره کوڕی ڕەبیع و هیلال کوڕی ئومەییە ، مابوونەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کەس لەگەڵ ئەو سیانە قسە نەکات.

دووڕووە بەجێماوەکان، ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و سوێندیان خوارد و بیانوویان هێنایەوە. پێغەمبەر(د.خ) چاوپۆشی لێکردن بەڵام خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) بەبیانووەکەیان ڕازی نەبوون.

موسوڵمانان سەرەتا قسەیان لەگەڵ ئەو سێ کەسە نەدەکرد تا خواوەند ئەم ئایەی سەبارەت بەوان ڕەوانە فەرموو:

((لقد تاب الله على النبى و المهاجرين و الانصار الذين اتبعوه فى ساعة العسرة من بعد ما كاد يزيغ قلوب فريق منهم ثم تاب عليهم انه بهم رؤف رحيم. و على الثلاثة الذين خلفوا حتى اذا ضاقت عليهم الارض بما رحبت و ضاقت عليهم انفسهم و ظنوا ان لاملجاء من الله الا اليه ثم تاب عليهم ليتوبوا ان الله هو التواب الرحيم.

واتاکەی: خواوەند پێغەمبەر(د.خ) و موهاجیر و ئەنسارەکانی بەخشی. ئەو کەسانەی لەکاتی تەنگانە دوای ئەوەی زۆری نەمابوو دڵی دەستەیەك بگۆڕێت، شوێنی کەوتن،

دووباره ئەوانی بەخشی و خواوەند لەگەڵ ئەوان بەخشەر و رەحیمە. هەروەها ئەو سێ کەسەی بەجێمابوون تا ئەو کاتەی زەوی بەو هەموو فراوانییە بۆ ئەوان تەسك و تەنگ بوو و لەخۆیان بێزار بوون و زانیان لەخوا تەنیا دەبێت پەنا بۆ خوا ببەن، ئەوانی بەخشی تا تۆبە بکەن چوونکە خواوەند بەخشەر ورەحیمە.)) تۆبەکەی ئەوان وەرگیرا.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی رەمەزان لەتەبووکەوە گەڕایەوە مەدینە.

لەم ساڵەدا نێردراوانی سەقیف هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێشتر باسمان کرد.

دەڵێت: لەرەبیع الاولی ئەم ساڵە، یانی ساڵی نۆی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ)، عەلی کوڕی ئەبی تالیبی لەگەڵ دەستەیەك بۆ سەرزەمینی تەی ڕەوانە فەرموو. عەلی هێرشی کردە سەریان و ژمارەیەکی لێ ئەسیر کردن. دوو شمشێر لەبتخانەکەی ئەواندا بوو بەناوەکانی رەسوب و موخەدیم. دەیانوت حارس کوڕی ئەبی شیمر نەزری کردووە شمشێرەکان بباتە ئەو بتخانەیە. یەکێك لەئەسیرەکان خوشکەکەی عودەی کوڕی حاتەم بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەو هەواڵانەی لەعودەی کوڕی حاتەم بەئێمە گەیشتووە کاتێکی دیاریکراوی نییە و جیاوازە لەوەی واقدی سەبارەت بەخوشکەکەی ئەو باسی دەکات.

عوباد کوڕی حەبیش دەڵێت: بیستم عودەی کوڕی حاتەم دەیوت: سوارەکانی پێغەمبەر(د.خ) هاتن. یا وتی: نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) هاتن و پووری من و کەسانی دیکەیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و لای ئەو ریزیان بەست.

پوورم دەڵێت: بەپێغەمبەرم وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کەسم دوورە و منداڵم نییە، من پیرێکی پەککەوتەم، تۆ چاکەم لەگەڵ بکە خوا چاکەت لەگەڵ بکات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کەسی تۆ کێیە؟

وتم: عودەی کوڕی حاتەم.

فەرمووی: ئەو کەسەی لەخوا و پێغەمبەرەکەی هەڵدێت؟

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چاکەی لەگەڵ کردم و کەسێك کە لەتەنیشتییەوە دانیشتبوو، (لەوانەیە عەلی بووبێت) وتی: داوای چوارپێیەك بکە.

عودەی دەڵێت: داوای چوارپێی کرد. پێغەمبەر(د.خ) پێیدا، هاتە لای من و وتی: کارێکت کرد باوکت نەیدەکرد، برۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، فلانی ڕۆشت و خێری دەستکەوت و فلانی ڕۆشت و خێری دەستکەوت.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ)، ژنێك و چەند منداڵێك لای دانیشتبوون، زانیم

نەپاشایە نەقەیسەر.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ لەوتنی لا اله الا الله هەڵدێیت، مەگەر خوایەك جگە لەخوای تاقانە هەیە؟. بۆ لەوتنی الله اكبر رادەكەیت، مەگەر كەس گەورەتر لەخوا هەیە؟ باوەڕم هێنا و نیشانەكانی ڕەزامەندیم لەروخساری ئەودا بینی.

شەیبان كوڕی سەعدی تایی لەعودەی كوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە: كەس لەپیاوانی عەرەب بەئەندازەی من ڕقیان لە پێغەمبەر(د.خ) نەبوو، سەركردەی خەڵكان و دینەكەم مەسیحی بوو. لەخەڵكەكەی خۆم یەك لەسەر چوارم وەردەگرت و كاتێك لەدەركەوتنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوومەوە، بەناخۆشم زانی، بەشوانەكەی خۆم كەكۆیلەیەكی عەرەب بوو، وت: چەند وشترێكی دەستەمۆ و قەڵەو لای من بەجێبێڵە و هەركاتێك بیستت سوپاكەی محەممەد روو لەسەرزەمینەكەی من دەكات، ئاگادارم بكەرەوە. ئەو كارەی كرد و وشترەكانی دانا.

بەرەبەیانێك كۆیلەكە هاتە لام و وتی: هەركارێك دەكەیت ئەنجامی بدە چوونكە ئالآكانم بینی و سەبارەت بەوان پرسیارم كرد، وتیان: سوپاكەی محەممەدە.

بەكۆیلەم وت: وشترەكانی من بێنە. كاتێك وشترەكانی هێنا، ژن و منداڵەكانم هەڵگرت و وتم: لەشام پەیوەستی یەكێك لەهاودینەكانی خۆم دەبم. ڕێگەی حەوشیەم گرتەبەر و كچەكەی حاتەمم بەجێهێشت. كاتێك گەیشتینە شام و نیشتەجێ بووین، سوپاكەی پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە دیاری تەی و كچەكەی حاتەم و كەسانی دیكەیان ئەسیر كرد. بردیانە لای پێغەمبەر(د.خ) و لەهەلآتنی من بۆ شام ئاگادار ببوویەوە.

دەڵێت: كچەكەی حاتەم لەچواردیوارییەك لەنزیك مزگەوتەكەدا بوو. ئەسیرەكانیان لەوێ ڕادەگرت. پێغەمبەر(د.خ) لای ئەو گوزەری كرد و ئەو ژنێكی زمان پاراو بوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) باوكم مردووە و كەسەكەی من دوورە، چاكەم لەگەڵ بكە تا خوا چاكەت لەگەڵ بكات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: كەسی تۆ كێیە؟

وتی: عودەی كوڕی حاتەم.

فەرمووی: ئەوەی لەخوا و پێغەمبەر(د.خ) هەڵدێت.

كچی حاتەم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشت و منی بەجێهێشت. ڕۆژێكی دیكە گەڕایەوە بۆ لای من. بێ هیوا ببووم. پیاوێك كەلەدوای پێغەمبەر(د.خ) ڕێگەی دەبڕی،

ئیشارەی بۆ کردم تا قسە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بکەم.

دەڵێت: هەستام و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) باوکم مردووە و کەسی من دوورە، چاکەم لەگەڵ بکە تا خوا چاکەت لەگەڵ بکات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: رازیم، لەرۆشتن پەلە مەکە تا کەسێکی بڕواپێکراو لەخەڵکەکەت بێت و بۆ بۆ سەرزەمینی خۆت بگەڕێنێتەوە، من ئاگادار بکەرەوە.

دەڵێت: پرسیم ئەو پیاوەی ئیشارەی لەمن کرد تا قسە بکەم، کێیە؟

وتیان: عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

دەڵێت: مامەوە تا کاروانێك لەتایەفەی بەلی یا قوزاعە هات. دەمویست بەرەو شام بڕۆم و پەیوەستی براکەم ببم. ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دەستەیەك لەخەڵکانی من هاتوون، بڕواپێکراون و من دەبەنە شوێنی مەبەست.

دەڵێت: جل و بەرگی بەمن بەخشی لەگەڵ چوارپێ و خەرجی. لەگەڵ کاروان بەرێکەوت تا گەیشتمە شام.

عودەی دەڵێت: لەگەڵ کەسانی خۆم دانیشتبووم و بینیم ژنێك بۆ لای ئێمە دێت، وتم: کچی حاتەمە. خۆی بوو.

کاتێك خوشکەکەم لەنزیکم وەستا، وتی: ئەی ستەمکار بۆ خزمەکان، ژن و منداڵەکانی خۆت هێنا و کچەکانی باوکت پشتگوێ خست.

وتم: خوشکم سەرکۆنەم مەکە، هیچ پاساوێکم نییە و تۆ راست دەکەیت.

دەڵێت: خوشکەکەم دابەزی و لای من نیشتەجێ بوو. ژنێکی دوورئەندێش بوو، پێم وت: سەبارەت بەم پیاوە بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بۆچوونم ئەوەیە لەزووترین کات پەیوەستی بیت، ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بێت هەرکەس زووتر پەیوەستی بێت، باشترە و ئەگەر پاشا بێت، بەگەورەیی ئەو ریسوا نابیت.

وتم: سوێند بەخوا بۆچوونی راست ئەمەیە.

دەڵێت: بەرێکەوتم تا گەیشتمە مەدینە، ڕۆشتمە لای پێغەمبەر(د.خ) لەمزگەوت، سڵاوم کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێیت؟

وتم: عودەی کوڕی حاتەم.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) هەستا و منی بردە ماڵەکەی خۆی. لەکاتی ڕۆشتن ژنێکی

پیری پەککەوتە ڕێگەی لێگرت. وەستا تا ژنەکە پێویستییەکانی خۆی باس کرد. بەخۆم وت: سوێند بەخوا ئەم پاشا نییە، بەرێکەوتین تا گەیشتینە ماڵەکەی. ڕاخەرێکی چەرمین لەگەڵای خورمای بۆ فرێدام و فەرمووی: لەسەر ئەوە دانیشە.،

وتم: نا تۆ دانیشە.

فەرمووی: تۆ دانیشە.

دەڵێت: دانیشتم و پێغەمبەر(د.خ) لەسەر زەوی دانیشت، بەخۆم وت: سوێند بەخوا ئەمە کردەوەی پاشاکان نییە.

فەرمووی: ئەی عودەی مەگەر تۆ لەدەستەی ڕەکوسی نیت؟

وتم: بۆ نا.

فەرمووی: مەگەر یەك لەسەر چوار لەخەڵکەکەی خۆت وەرناگریت؟

وتم: بۆ نا.

فەرمووی: بەپێی دینەکەت ئەمە بۆ تۆ حەڵاڵ نییە.

وتم: سوێند بەخوا بەو شێوەیە. زانیم ئەو پێغەمبەری نێردراوە و لەنەزانراوەکان ئاگادارە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عودەی ئەگەری لەمپەری بەردەم موسوڵمان بوونی تۆ ئەمە بێت کەدەبینی موسوڵمانان هەژارن، سوێند بەخوا بەڕادەیەك سامان لەناو خەڵکان فراوان دەبێت کەس ناخوازێت کۆی بکاتەوە. یا ئەگەری هەیە ئەوە بێت کەدەبینی دوژمنانی موسوڵمانان فراوانن و ژمارەیان کەمە. سوێند بەخوا ڕۆژێك لەڕۆژەکان ژنێك سوار لەسەر وشتر لەقادسییەوە بەرێدەکەوێت و زیارەتی کەعبە دەکات و جگە لەخوا لەکەس ناترسێت. ئەگەری هەیە ئەمە بێت کەدەبینی، دەسەڵات و مڵك لەدەستی کەسانی دیکەدایە، سوێند بەخوا دەبیستی موسوڵمانان دەستیان بەسەر کۆشکە سپییەکانی بابلدا گرتووە.

دەڵێت: باوەڕم هێنا، ئێستا دووان لەوانەی پێغەمبەر(د.خ) باسی کردن، هاتنەدی و یەکیان ماوەتەوە:

سوێند بەخوا کۆشکە سپییەکانی بابلم بینی دەستیان بەسەردا گیرا و بینیم ژنێك سوار لەسەر وشترەکەی خۆی لەقادسییەوە بەرێدەکەوێت و لەهیچ ناترسێت و زیارەتی کەعبە دەکات. سوێند بەخوا سێیەمیش دێتەدی و سامان بەرادەیەك فراوان دەبێت

کەس ناخوازێت کۆی بکاتەوە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی هۆزی تەمیم ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

عاسم کوڕی عەمرۆ کوڕی قتادە دەڵێت: عەتارد کوڕی حاجب کوڕی زەرارەی تەمیمی لەگەڵ دەستەیەك لەسەرانی هۆزی تەمیم وەك ئەقرەع کوڕی حابس و زەبەرقان کوڕی بەدری تەمیمی سەعدی و عەمرۆ کوڕی ئەهتەم و حەتات کوڕی فلاّن و نەعیم کوڕی زەید و قەیس کوڕی عاسمی سەعدی و دەستەیەکی فراوان لەتەمیمیەکان ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) . عوێەیینە کوڕی حوسن لەگەڵیاندا بوو.

ئەقرەع کوڕی حابس و عوێەیینە کوڕی حوسن لەگرتنی مەککە و گەمارۆی سەر تاییف هاوڕێی پێغەمبەر(د.خ) بوون و کاتێك نێردراوانی تەمیم هاتن لەگەڵ ئەوان هاتن. کاتێك تەمیمییەکان ڕۆشتنە ناو مزگەوت لەپشت ژوورەکانەوە بەناوی پێغەمبەری خوا دەنگیان بەرز کردەوە: ئەی محەممەد وەرەدەر.

دەنگی ئەوان بووە هۆی ڕەنجانی پێغەمبەر(د.خ) . هاتە لای ئەوان و وتیان: ئەی محەممەد هاتووین شانازی بەخۆمانەوە بکەین. مۆڵەت بەشاعیر و وتاربێژەکەی ئێمە بدە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مۆڵەتی هەیە.

عەتارد کوڕی حاجب هەستا و وتی:سپاس بۆ خوا منەتی سەرخستین و ئێمەی کردە پاشاکان و سامانی فراوانی پێبەخشین کەبەهۆیەوە چاکەکاری دەکەین و ئێمە لەهەموو خەڵکانی ڕۆژهەڵات ئازیزتر و ڕێزدارتر و ئامادەتر بۆ جەنگین، کەس هاوشێوەی ئێمە نییە، ئێمە سەرکردە و گەورەکانین و هەرکەس دەیەوێت شانازی بەخۆیەوە بکات، دەبێت تایبەتمەندی هاوشێوەی تایبەتمەندی ئێمەی هەبێت. ئەگەر بمانەوێت زیاتر لەمە باس بکەین، دەتوانین بەلاّم شەرم دەکەین زیاتر باسی بەخشـشە خواییەکان بکەین. لای خەڵکان ناسراویین. ئەمە باس دەکەم تا هاوشێوەی ئێمە ئاماژە بەتایبەتمەندییەکانی خۆتان بدەن.

ئەم قسانەی کرد و دانیشت.

پێغەمبەر(د.خ) بەسابت کوڕی قەیس کوڕی شەماسی خەزرەجی فەرموو: هەستە وەلاّمی ئەم پیاوە بدەرەوە.

سابت هەستا و وتی: سپاس بۆ خوای ئافرێنەری ئاسمانەکان و زەوی کەفەرمانەکانی خۆی سەبارەت بەوان ئەنجامداوە و زانستەکەی بەهەموو جێگەیەك

دەکات و هەرچی هەیە لەبەخششەکانی ئەوە و نیشانەی دەسەلاتی ئەوەیە ئێمەی کردە شاکان و لەباشترینی خەڵکانی خۆی پێغەمبەرێکی هەڵبژارد کە بەرەچەڵەک لەهەمووان بڕواپێکراوتر و لەوتەدا لەهەمووان راستگۆترە وبۆ چاکەکاری سەروەری هەمووانە. کتێبەکەی خۆی بۆ ئەو نارد و ئەوی کردە ئەمینی ئافرێنراوەکانی خۆی چوونکە ئەوی لەناو هەموو ئافرێنراوەکانی خۆی هەڵبژارد و پێغەمبەر(د.خ)، پێشنیاری خواپەرەستی بەخەڵکان دەکرد و موهاجیرانی خەڵکەکەی خۆی و سەرکردەکان کە لە هەمووان لەپێشتر و چاکەکارتر بوون، باوەڕیان پێ هێنا. دوای ئەوە یەکەم کەسان کەوەڵامی بانگەوازی پێغەمبەریان دایەوە، ئێمە بووین کەئەنساری خوا و هاوەڵانی پێغەمبەرین. لەگەڵ خەڵکان دەجەنگین تا باوەڕ بەخواوەند بێنن وهەرکەس باوەڕ بێنێت ماڵ و سامانی پارێزراوە و هەرکەس رێگەی کوفر بگرێتەبەر و حاشا لەراستییەکان بکات، لەرێگەی خوادا شەڕی لەگەڵ دەکەین و کوشتنی ئەو بۆ ئێمە ئاسانە، ئەم قسە دەکەم و بۆ ژنان و پیاوە باوەڕدارەکان داوای بەخشین دەکەم. سڵاو لەئێوە بێت.

تەمیمییەکان وتیان: ئەی محەممەد مۆڵەت بەشاعیرەکەی ئێمە بدە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: مۆڵەتی هەیە.

زەبەرقان کوڕی بەدر هەستا و هۆنراوەیەکی خوێندەوە کەناوەرۆکەکەی شانازی کردن بەتەمیمییەکان بوو.

حسان کوڕی سابت ئامادە نەبوو. پێغەمبەر(د.خ) کەسی بەدوای ئەودا نارد و کاتێک زەبەرقان کۆتایی بەهۆنراوکەی خۆی هێنا، پێغەمبەر(د.خ) بەحسانی فەرموو: هەستە و وەڵامی ئەم پیاوە بدەرەوە.

حسان هەستاو هۆنراوەیەکی بۆ وەسف پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان خوێندەوە. کاتێک تەواو بوو، ئەقرەع کوڕی حابس وتی: سوێند بەخوا ئەم پیاوە گەورەیی پێبڕاوە چوونکە وتاربێژەکەی لەوتار بێژەکەی ئێمە زمان پاراوتر و شاعیرەکەی لەوەی ئێمە شاعیرتر و دەنگیان لەئێمە زوڵاڵترە.

هەموو نێردراوانی تەمیم باوەڕیان هێنا و پێغەمبەر(د.خ) دیاری تایبەتی پێبەخشین.

ئەوان عەمرۆ کوڕی ئەهتەمیان لای بارەکانی خۆیان دانابوو، قەیس کوڕی عاسم کەلەگەڵ عەمرۆ دژومنایەتی هەبوو، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کەسێک لەئێمە لای

بارەکانمانە و گەنجێکی کەم تەمەنە. ئەوی ریسوا کرد بەلآم پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەویش هاوشێوەی کەسانی دیکە دیاری دانا.

کاتێك وتەکانی قەیس بەعەمرۆ کوڕی ئەهتەم گەیشت، هۆنراوەیەکی بۆ ئیهانە کردنی ئەو هۆنییەوە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ئەم ئایە سەبارەت بەنێردراوانی تەمیم هاتەخوار:

((ان الذین ینادونك من وراء الحجرات اکثرهم لا یعقلون.

واتاکەی: ئەو کەسانەی لەپشت ژوورەکانەوە تۆ بانگ دەکەن، زۆربەیان تێناگەن.))

واقدی دەڵێت: لەم ساڵدا عەبدوللە کوڕی ئەبی کوڕی سەلول سەرکردەی ریاکاران مرد. چەند رۆژی کۆتایی شەوال نەخۆش بوو. نەخۆشی ئەو بیست رۆژی خایاند و لەمانگی زیقەعدە کۆچی دوایی کرد.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان نێردراوانی پاشاکانی حەمیر، حارس کوڕی عەبدکەلال و نەعیم کوڕی عەبدکەلال و نەعمان، ئەمیر زیرەعین هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و نامەی ئەوانیان پێبوو کەباوەڕیان بەئیسلام هێنابوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نێردراوانی پاشاکانی حەمیر دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر(د.خ) لەتەبوك هاتنە لای و نامەی حارس کوڕی عەبدکەلال و نەعیم کوڕی عەبدکەلاب و نەعمان شای زی رەعین و هەمەدان و مەغافریان پێبوو. ئەوان موسوڵمانان ببوون و زەرعەی زویزەن، مالیك کوڕی موڕەی رەهاوی نارد بوو. پێغەمبەر(د.خ) لەوەلآمی ئەواندا نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا بۆ حارس، کوڕی عەبدکەلال و نەعیم کوڕی عەبدکەلال و نەعمان ئەمیری زی رەعین و هەمەدان و مەغافر!

بەلآم دواتر، لەکاتی گەڕانەوە لەسەرزەمینی رۆم نێردراوەکەی ئێوە لەمەدینە چاوی بەئێمە کەوت و نامەکەی ئێوەی گەیاند و ئاگاداری کردینەوە کەباوەڕتان هێناوە و ناباوەڕانتان کوشتووە. خواوەند رێگەی نیشانداون بەو مەرجەی خۆپارێزی بکەنە پیشە و شوێنکەوتەی خواوەند و پێغەمبەرەکەی بن، نوێژ بخوێنن و زەکات بدەن و یەك لەسەر پێنجی خوا و بەشی پێغەمبەر(د.خ) لەتالآنییەکان رەوانە بکەن. زەکاتی پێویست لەسەر موسوڵمانان بدەن. لەو داهاتەی بەکانی یا ئاوی باران ئاو دەدرێت و لەوەی بەئاوی چاڵ ئاو دەدرێت، نیوەی دەیەك، لەچل وشتر یەك بەچکە وشتری شیردەری مێ و لەسی وشتر یەك بەچکە وشتری نێر و لەهەر پێنج وشتر یەك بزن و لەهەر دە وشتر

دوو بزن و لەچل مانگا یەك مانگا و لەسی گا گوێرەکەیەکی نێر یا مێ و لە چل مەڕ بزنێك.

ئەمە زەکاتێکە خواوەند لەسەر موسوڵمانان فەرزی کردووە.

هەرکەس زیاتر بدات، بۆ خۆی باشترە وهەرکەس بەم ئەندازەیە بدات و ئیسلامی خۆی ئاشکرا و هاوکاری موسوڵمانان بکات، لەباوەڕدارانە و لەمافەکانی ئەوان کەڵك وەردەگرێت و پشتیوانی خوا و پێغەمبەری لەگەڵدایە و هەرکەس لەجوولەکە و مەسیحی باوەڕ بێنێت، لەماڧ موسوڵمانان کەڵك وەردەگرێت و ئەرکەکانی ئەوانی لەسەر شانە و هەرکەس لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوە((جوولەکە و مەسیحی) بۆ باوەڕهێنان بەئیسلام ناچاری نەکەن و دەبێت باج و سەرانە بدات کەبۆ ژن و پیاوی باڵغ یەك دینار یا هەر شتێك بەرابەر بەیەك دینارە و هەرکەس بیدات پشتیوانی خوا و پێغەمبەری لەگەڵدایە و هەرکەس نەیدات، دوژمنی خوا و پێغەمبەرە.

بەڵام دواتر: پێغەمبەری خوا، محەممەد، پەیام بۆ زەرعە و زویەزن دەنێرێت کاتێك نێردراوانی من، مەعاز کوڕی جەبەل و عەبدوللە کوڕی زەید و مالك کوڕی عوبادە و عوقبە کوڕی نەمر و مالك کوڕی موڕە و هاوەڵنیان هاتنە لای ئێوە، چاکەیان لەگەڵ بکەن و خێر و باجی وەڵاتەکەی خۆتان کۆبکەنەوە و تەسلیمی نێردراوانی منی بکەن. سەرکردەی نێردراوان مەعاز کوڕی جەبەلە و دەبێت رازی بگەڕێنەوە.

بەڵام دواتر، محەممەد شایەتی دەدات جگە لەخوای تاقانە خوایەك بوونی نییە و ئەو بەندە و نێردراوی خوایە، مالك کوڕی موڕەی رەهاوی پێی وتم تۆ پێش هەموو حەمیرییەکان باوەڕت هێناوە و ناباوەڕانت کوشتووە، مژدەی چاکەت لێ بێت. چاکە لەگەڵ حەمیرییەکان بکە و خیانەت مەکەن چوونکە ریسوا دەبن. پێغەمبەر(د.خ) هاورێ و پشتیوانی هەژار و دەوڵەمەندی ئێوەیە. زەکات بۆ محەممەد و بنەماڵی ئەو حەڵاڵ نییە، ئەم زەکاتە بۆ باوەڕداران و هەژارەکانە. مالك هەواڵ دێنێت، چاکەی لەگەڵ بکەن. من لەچاکەکاران و زاناکان و بیرمەندانی دینەکەم بۆ لای ئێوە رەوانە کرد. چاکەیان لەگەڵ بکەن چوونکە لای ئێمە گرنگن. والسلام علیکم رحمه الله و برکاته.))

واقدی دەڵێت:لەم ساڵەدا نێردراوانی تایەفەی بەهرا کەژمارەیان سیانزەکەس بوو هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و لای میقداد کوڕی عەمرۆ دابەزین.

دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی مناڵەکانی بوکا هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێت: لەم ساڵەدا پێغەمبەر(د.خ) موسوڵمانانی لەمردنی نەجاشی ئاگادار کردەوە. ئەو لەرەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچ مرد.

دەڵێت: لەم ساڵەدا ئەبوبەکر لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد و لەگەڵ سێسەد کەس لەمەدینەوە بەرێکەوت. پێغەمبەر(د.خ) بیست قوربانی بەودا نارد. ئەبوبەکر خۆی پێنج قوربانی پێبوو. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەم ساڵەدا حەج و قوربانی کرد.

پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بەدوای ئەبوبەکر نارد و لەعەرج پێیگەیشتەوە. لەرۆژی جەژنی قوربان ئایەکانی سورەی (برائت)ی بۆخەڵکان خوێندەوە.

سەدی دەڵێت: کاتێك ئایەکانی سورەی برائت هاتەخوار، پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەبوبەکری نارد و ئەوی کردە سەرەپەرەستی حەج کردن و کاتێك گەیشتە داری زی ئەلحەلیفە، بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) عەلی لەدواوە هات و ئایەکانی لەئەبوبەکر وەرگرت و ئەبوبەکر بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆ بن، ئایا هیچ شتێك سەبارەت بەمن هاتۆتەخوار؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نا، بەڵام کەس جگە لەمن یا لەمن نابێتە لێپرسراوی ئەم کارە مەگەر رازی نیت، تۆ لەئەشکەوتا هاوڕێی من بوویت و لەلێواری حەوزی بەهەشت، هاودەمی من دەبیت.

ئەبوبەکر وتی: بۆ نا ئەی پێغەمبەر(د.خ). ڕۆشت و سەرپەرەستی کردنی حەج لەئەستۆی ئەودابوو بەڵام عەلی ئایەکانی قورئانی بۆخەڵکان دەخوێندەوە. لەرۆژی قوربان هەستا و رایگەیاند دوای ئەم ساڵە چیتر هیچ ناباوەڕێك لەمسجد الحرام نزیك نابێتەوە و هیچ رووتێك بەدەوری ماڵی خوادا ناسوڕێتەوە و هەرکەس لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) پەیمانی هەیە، پەیمانەکەی تا کۆتایی ئەم ماوە کاری پێدەکرێت. ئێستا رۆژەکانی خواردن و خواردنەوەیە و خواوەند تەنیا موسوڵمانان دەخاتە بەهەشت.

ناباوەڕان وتیان: ئێمە لەپەیمانی تۆ وکوڕە مامەکەت بێزارین و تەنیا سەرکۆنە کردن لەئارادایە. کاتێك ڕۆشتن سەرکۆنەی یەکیان کرد و وتیان: ئێستا کەقورەیشییەکان باوەڕیان هێناوە، چی دەکەن؟ هەموویان موسوڵمان بوون.

محەممەد کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی نۆی کۆچ ئەبوبەکری کردە سەرپەرەستی حاجییەکان و سی یا چل ئایەی سورەی برائتی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبدا نارد و بۆ خەڵکانی خوێندەوە. بۆ ماوەی چوار مانگ دەرفەتی بەناباوەڕاندا

لەزەویدا بسووڕێنەوە، دوای ئەوەی هیچ ناباوەڕێك ڕوونەکاتە کەعبە و هیچ ڕووتێك بەدەوری ماڵی خوادا نەسوڕێتەوە. ئایەکانی لەرۆژی عەرەفە خوێندەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا زەکات فەرز کرا و پێغەمبەر(د.خ) لێپرسراوانی خۆی بۆ وەرگرتنی زەکات ڕەوانە فەرموو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا ئەم ئایە هاتەخوار:

((خذمن اموالهم صدقة تطهرهم.

واتاکەی: لەسامانی ئەوان زەکات وەربگرە تا پاکیان بکەیتەوە.))

هۆکارەکەی وەك باوکی ئیمامەی باهلی دەڵێت: داستانی سەعلەبە کوڕی حاتب بوو.

واقدی دەڵێت: لە مانگی شەعبانی ئەم ساڵە، دایکی کولسوم کچی پێغەمبەر(د.خ) مرد و ئەسما کچی عەمیس و سەفییە کچی عەبدولموتەلیب ئەویان کفن کرد و بەوتەیەك چەند ژنێکی ئەنسار کچی پێغەمبەریان شۆرد و کفنیان کرد. ژنێك بەناوی دایکی عەتییە یەکێك بوو لەوان و باوکی تەڵحە ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی.

دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی تایەفەی سەعد هوزەیم ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

عەبدوللە کوڕی عەباس دەڵێت: منداڵەکانی سەعد کوڕی بەکر، زەمام کوڕی سەعلەبەیان بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و ئەو وشترەکەی خۆی لەبەردەم دەرگای مزگەوتا خەواند. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هاوەڵانی خۆی لەوێ دانیشتبوو. زەمام پیاوێکی چالاك و تووکن بوو، دوو پرچی درێژ لەملاولای سەری شۆڕ ببوویەوە، هات و لەبەردەم پێغەمبەر(د.خ) وەستا و وتی: کامتان کوڕی عەبدولموتەلیبە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من کوڕی عەبدولموتەلیبم؟

زەمام وتی: محەممەد؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، پرسیارم هەیە و توندوتیژی دەکەم، لێم مەڕەنجێ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ناڕەنجێم، چیت پێخۆشە بپرسە.

وتی: سوێندت دەدەم بەخواکەت و خوای رابردووان و داهاتووان، خواوەند تۆی بۆ پێغەمبەری ناردووە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

وتی: سوێندت دەدەم بەخواکەت و خوای رابردووان و داهاتووان، خواوەند فەرمانی

پێداویت ئێمە بۆ پەرەستینی هانبدەیت کەتەنیا ئەو بپەرەستین وکەس نەکەینە شەریکی و حاشا لەو بتانە بکەین کەباوکان و باوەگەورێکانی ئێمە دەیانپەرەستی؟

فەرمووی: بەڵێ.

وتی: سوێندت دەدەم بەخوا، ئایا خواوەند فەرمانی پێداویت پێمان بڵێیت پێنج جارنوێژ بخوێنین؟

فەرمووی: بەڵێ.

دەڵێت: ئامارژەی بەهەموو روکنەکانی موسوڵمانی و ئیسلامدا و بۆ هەموویان پێغەمبەری سوێنددا. کاتێك کۆتایی بەوتەکانی هێنا، وتی: شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای محەممەد نییە و محەممەد نێردراو و بەندەی ئەوە. پێویستی و فەرزەکانی ئیسلام دەزانم و لەوەی یاساغت کردووە، خۆم بەدوور دەگرم و هیچی لێ کەم و زیاد ناکەم.

کاتێك ئەم قسانەی هێنایە سەرزمان، سوار وشترەکەی بوو، ڕۆشت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر راست بکاتە دەڕواتە بەهەشت.

دەڵێت: ئەژنۆی وشترەکەی کردەوە و ڕۆشت تا گەیشتە لای کەسەکانی خۆی. لەدەروی کۆبوونەوە و یەکەم وتە کەهێنایە سەرزمانی ئەوە بوو: لات و عوزا خراپە.

خەڵك وتیان: ئەی زەمام بێدەنگ بە، لەگوولی بترسە، لەشێتی بترسە.

وتی: سوێند بەخوا لات و عوزا نەسوودیان هەیە نەزیان، خواوەند پێغەمبەر و کتێبی ڕەوانە فەرمووە و بەهۆیەوە ئێوە لەبتپەرەستی رزگار دەکات. شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە. ئێستا لای ئەو دەگەڕێمەوە.

دەڵێت: هەمان ڕۆژ هەموو ژن و پیاوەکانی ئەو خەڵکە باوەڕیان هێنا. هیچ نێردراوێك بۆ خەڵکەکەی لەزەمام کوڕی سەعلەبە باشتر نەبوو.

## ساڵی دەی کۆچی دەستی پێکرد

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەمانگی رەبیع الاخرو بەوتەیەك مانگی رەبیع الاول و بەوتەیەك لەجومادی الاولی ئەم ساڵە پێغەمبەر(د.خ)، خالید کوڕی وەلیدی لەگەڵ چوارسەد کەس بۆ لای تایەفەی منداڵەکانی حارس کوڕی کەعب ڕەوانە فەرموو.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەمانگی رەبیع الاخر یا جومادی الاولی ساڵی دەیەم کۆچ، خالید کوڕی وەلیدی بۆ لای تایەفەی منداڵەکانی حارس کوڕی کەعب نارد. ئەوان لەنەجران ژیانیان بەسەر دەبرد. فەرمووی: پێش ئەوەی شەڕ دەستپێبکەن، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێشنیاری ئیسلامیان پێبکەن، ئەگەر رازی بوون، رازی بن و لای ئەوان بمێننەوە تا فێرکارییە دینییەکانیان فێر بکەن وئەگەر رازی نەبوون، بجەنگن.

خالید ڕۆشت و لەسەرزەمینی ئەوان دابەزی. کەسانی بۆ ئەم لاولا ڕەوانە دەکرد و پێشنیاری ئیسلامی بەخەڵکان دەکرد و دەیوت: ئەی خەڵکینە باوەڕ بێنن بۆ ئەوەی تەندروست بمێننەوە. خەڵکان باوەڕیان هێنا و موسوڵمان بوون. خالید لەوێ مایەوە و فێرکارییە دینییەکانی فێر کردن.

دواتر خالید نامەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحیم. بۆ محەممەد پێغەمبەر(د.خ) و نێردراوی خوا لەخالید کوڕی وەلید.

ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سڵاو و بەخششەکانی خواوەند بۆ تۆ بێت و من سپاسی دەکەم.

بەڵام دواتر، ئەی پێغەمبەر(د.خ)، منت بۆ لای منداڵەکانی حارس کوڕی کەعب نارد و فەرمانت پێدام کاتێك گەیشتم شەڕ دەستپێنەکەم و پێشنیاری باوەڕ هێنانیان پێبکەم کەئەگەر رازی بوون، رازی ببم و فێرکارییە دینییەکانیان فێر بکەم، ئەگەر باوەڕیان نەهێنا، بجەنگم. بەرێکەوتم و وەك پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێدابووم، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێشنیاری خواپەرەستیم پێکردن و سوارەکانم بۆ هەمو سووچ و کەنارەکان نارد ووتم: ئەی منداڵەکانی حارس باوەڕ بێنن تا تەندروست بمێننەوە،ئەوان، باوەڕیان هێنا و نەجەنگان. ئێستا لەناو ئەواندام و شەریعەتەکانی دینیان فێر دەکەم تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) نامەی خۆی دەنووسێت.))

پێغەمبەر(د.خ) بەمشێوەیە وەڵامی دایەوە:

((بسم الله الرحمان الرحيم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا بۆ خالید کوڕی وەلید. سڵاو لەتۆ.

بەڵام دواتر، نێردراو نامەی تۆی گەیاندە دەستم و بۆمان ئاشکرا بوو منداڵەکانی حارس بێ جەنگ باوەڕیان هێناوە و وەڵامی بانگەوازەکەی تۆیان داوەتەوە و خواپەرەستییان کردۆتە پیشە و شایەتی دەدەن محەممەد بەندە و نێردراوی خوایە. مژدەیان پێبدە و بیانترسێنە و بگەڕێرەوە. با نێردراوانی خەڵکەکە لەگەڵ تۆدا بێن. سڵاو و بەرەکاتی خوایی بۆ تۆ.))

خالید کوڕی وەلید گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و نێردراوانی منداڵەکانی حارس کوڕی کەعب و لەناویان قەیس کوڕی حوسین و یەزید کوڕی عەبدئەلمەدان و یەزید کوڕی موحەجەل و عەبدوللە کوڕی قورەیز زیادی و شەداد کوڕی عەبدوللە کوڕی قەنانی و عەمرۆ کوڕی عەبدوللە زەبابییان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، سڵاویان بۆ نارد و وتیان: شایەتی دەدەن تۆ نێردراوی خوایەت وخوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: منیش شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و من نێردراوی خوام.

فەرمووی: ئێوەن گرنگی بەلەمپەرەکان نادەن؟ کەس وەڵامی نەدایەوە. پێغەمبەر(د.خ) وتەکانی دووبارە کردەوە، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. کاتێك بۆ چوارەم جار وتەکەی هێنایە سەرزمان، یەزید کوڕی عەبدولمەدان وتی: بەڵێ، ئێمەین گرنگی بەلەمپەرەکان نادەین و چوار جار وتەکەی دووبارە کردەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر خالید نەینووسیبوو کەباوەڕتان هێناوە و بۆ شەڕی ئێمە نەهاتوون، سەری ئێوەم دەخستە بەرپێتان.

یەزید کوڕی عەبدولمەدان وتی: سوێند بەخوا نەوەسفی تۆ دەکەین نە وەسفی خالید.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کەواتە وەسفی کێ دەکەن؟

وتی: وەسفی خوادەکەین کەبەهۆی تۆوە ڕێگەی نیشانی ئێمەدا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قسەکانت ڕاستە.

پێغەمبەر(د.خ) پرسی: لەرۆژگاری جاهلی بەچ هۆکارێك بەسەر دوژمنانی خۆتان زاڵ

دەبوون؟

وتیان: ئێمە بەسەر کەسدا زاڵ نەدەبووین.

فەرمووی: با، بەسەر ئەو کەسانەدا زاڵ دەبوون کەشەڕی ئێوەیان دەکرد.

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، هۆکاری سەرکەوتنمان ئەوە بوو هاودەنگ بووین و دووبەرەکی لەناو ئێمەدا بوونی نەبوو و هیچ کات ستەم کردنمان دەستپێنەدەکرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: راستە.

پێغەمبەر(د.خ) قەیس کوڕی حوسینی کردە سەرکردەی نێردراوانی مناڵەکانی حارس کوڕی کەعب و لەکۆتاییەکانی شەوال یا سەرەتاکانی زیحەججە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە. چوار مانگ زیاتری نەخایاند پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: کاتێك نێردراوانی مناڵەکانی حارس کوڕی کەعب ڕۆشتن، پێغەمبەر(د.خ) عەمرۆ کوڕی حەزمی ئەنساری بۆ لای ئەوان نارد تا فیقە و سونەتەکانی پێغەمبەر(د.خ) و داب نەریتەکانی موسوڵمانییان فێر بکات و زەکات کۆبکاتەوە. نامەی فەرمان و کارەکانی ئەوی بەمشێوەیە نووسی:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەم وتاری خوا و پێغەمبەرە، ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، وەفادای پەیمانەکانتان بن، لە محەممەد بۆ عەمرۆ کوڕی حەزم، کاتێك ئەو بۆ یەمەن ڕەوانە دەکات، فەرمان دەدات لەهەر کارێك لەخوا بترسێت چوونکە پشتیوانی خواپەرەست و چاکەکارانە و فەرمان دەدات حەق بەپێی فەرمانی خواوەند وەربگرێت و مژدە بەخوا ببەخشێت و بۆ چاکە ناچاریان بکات. خەڵکان فێری قورئان و زانستەکانی دین بکات و لەخراپە دووریان بخاتەوە. هیچ کەسێکی ناپاك دەست لەقورئان نەدات. ئەرکەکانیان پێبڵێت و بەشێوەیەکی نەرم و نیان مامڵەیان لەگەڵ بکات. لەستەمکاریدا توند و تیژ بێت چوونکە خواوەند لەستەم بێزارە و ڕێگەی ستەمی لێ گرتوون و فەرموویەتی نەحلەتی خوا لەستەمکاران بێت.

دبێت مژدەی بەهەشت بەخەڵکان بدات تا کردەوەی بەهەشتییەکان ئەنجام بدەن و لەجەهەننەم بیانترسێنێت تا کردەوەی جەهەننەمییەکان ئەنجام نەدەن. بەدەم خەڵکانەوە بێت تا شارەزای کاروباری دین بن و نەریت و سونەتەکان و شێوازەکانی حەج کردنیان فێر بکات و لەفەرمانەکانی خوا سەبارەت بەحەجی اکبر و حەجی ئەصغر

(عەمرە) ئاگاداریان بکاتەوە و ڕێگە نەدا کەس لەجل و بەرگی تەسکدا نوێژ بکات، دەبێت جلەکان گەورە و فش، دەبێت لەجل و بەرگێك نوێژ بکات شەرمی بەدەرەوە نەبێت و ڕێگە نەدات کەس پرچی درێژی خۆی بهۆنێتەوە و لەپشتەوە بیبەستێت. کاتێك خەڵکان لەحاڵەتێکی گرژیدان ڕێگە نەدات باسی هۆز و عەشیرە بکەن و پێشنیاری ئەو کارە بەخەڵکان بکەن، دەبێت تەنیا پێشنیاری خواپەرەستی لەناو خەڵکان لەئارادا بێت و هەرکەس پێشنیاری خواپەرەستی نەکات و پێشنیاری گەڕانەوە بۆ هۆز و عەشیرە بکات، بەشمشێر بیکوژن تا هەموو گەڕانەوەکان تەنیا بۆ لای خواوەند بێت. دەبێت بڵێت خەڵکان دەستنوێژ بگرن و ڕوخسار و دەستیان تا ئەنیشك و قاچیان تا پاژنە بشۆن و دەستی تەڕ بەسەریاندا بێنن بەهەمان شێوە کەخواوەند فەرمانی پێداوە.

دەبێت لەکاتی خۆیدا نوێژ بخوێنن، ڕکوع و سجود تەواو و بێ کەم و کوڕی بێت، بەیانی و نیمەڕۆ و لەکاتی ئاوا بوونی خۆر و دەمەو عەسر ئەو کاتەی خۆر بەرەو ئاوابوون دەڕوات و ئێواریَ کەشەو دادێت پێش ئەوەی ئەستێرەکان لەئاسمان دەرکەون و خەوتنان، لەسەرەتای شەو، نوێژ بخوێنن و کاتێك بانگی نوێژی هەینی بفەرموون، بۆ نوێژی هەینی بڕۆن و خەڵکان دەبێت غوسڵ بکەن.

و دەبێت یەك لەسەر پێنجی خوا لەتالآنییەکان وەربگرێت و زەکاتی دیاریکراوی باوەڕداران کۆبکاتەوە لەداهاتی ئاوی دە یەك و لەداهاتی دێم و ئاودراو بەچاڵ نیوەی دەیەك و لەهەر دەوشتر دوو بزن و لەهەر بیست وشتر چوار بزن و لەهەر چل گا یەك گا و لەهەر سی مانگا، گوێرەکەیەکی نێر یا مێ و لەهەر چل سەڕ مەر، یەك بزن.

خواوەند بەمشێوەیە زەکاتی لەسەر موسوڵمانان داناوە. هەرکەس زیاتر ببەخشێت بۆ خۆی باشە. هەرجوولەکە و مەسیحییەك کەباوەڕ بەئیسلام بێنێت لەریزی موسوڵمانان هەژمار دەکرێت ماف و ئەرکەکانی ئەوانی لەسەر شانە و هەرکەس لەوان لەسەر دینەکەی خۆی بمێنێتەوە، بەزۆر بۆ ئەو کارە ناچاری نەکەن و بۆ هەر باڵغێك لەژن و پیاو یا هەر بەندەیەك یەك دینار یا بەرابەرەکەی وەربگرن. هەرکەس بیدات لەپەنای خوا و پێغەمبەردایە و هەرکەس نەیدات، دوژمنی خوا و پێغەمبەرە.

واقدی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، عەمرۆ کوڕی حەزم لێپرسراوی ئەو لەنەجران بوو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی شەوال نێردراوانی خەڵکی سەلامان کەحەوت کەس

بوون، بەسەرکردایەتی حەبیبی سەلامانی، گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان، نێردراوانی هۆزی غەسان هاتن.

لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان، نێردراوانی تایەفەی غامد گەیشتنە مەدینە.

هەروەها لەم ساڵەدا نێردراوانی هۆزی ئەزد کە دە و چەند کەس بوون بەسەرکردایەتی سەرد کوڕی عەبدوللە ئەزدی لەگەڵ دەستەیەک لەخەڵکانی ئەزد گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) سەرکردایەتی خەڵکانی ئەزدی بەوسپارد و فەرمووی: بەهاوکاری موسوڵمانان لەگەڵ ناباوەڕانی هۆزەکانی یەمەن بجەنگێت. سەد کوڕی عەبدوللە بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ سوپایەک بەرێکەوت و لەنزیک جەرش دابەزی کەشارێکی گەمارۆدراو بوو. هۆزەکانی یەمەن لەوێ دەژیان و هۆزەکانی خەسعەمیش لەکاتی ئاگادار بوونەوە لەهێرشی موسوڵمانان پەیوەستیان بوون.

بۆ ماوەی یەک مانگ گەمارۆی خستە سەر جەرش و دوژمن لەناو چوار دیواریدا بوو. نەیتوانی دەستی بەدوژمن بگات و بەناچار گەڕایەوە و کاتێک لەکێوی کوشر نزیک بوونەوە، جەرەشییەکان گومانیان کرد پاشەکشێیان کردووە و شوێنیان کەوتن. کاتێک لێی نزیک کەوتنەوە، گەڕایەوە و ژمارەیەکی زۆری لەوان کوشت.

خەڵکانی جەرش دوو کەسیان نارده مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) تا چاودێری بکەن. سەرەتای شەو کەلای پێغەمبەر(د.خ) بوون، فەرمووی: شکور لەکام دیارەدایە.

دووان لەخەڵکانی جەرش هەستان و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) لەدیاری ئێمە کێوێکی لێیە بەناوی کوشر و خەڵکانی جەرش بەمشێوەیە ناوی دەبەن.

فەرمووی: کوشر نییە، شوکرە.

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) چی روویداوە؟

فەرمووی: ئێستا قوربانییەکانی خواوەند لەوێ کوشتار دەکەن.

دەڵێت: ئەو دوو کەسە ڕۆشتنە لای ئەبوبەکر یا عوسمان، پێی وتن: پێغەمبەر(د.خ) باسی زیانی خەڵکەکەی ئێوەی کرد، هەستن و بپاڕێنەوە تا دوّعا بکات و خواوەند زیان لەسەر خەڵکەکەی ئێوە هەڵگرێت. ئەوان هەستان و داوایان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد. فەرمووی: خواوەندا زیان لەسەر خەڵکەکەیان هەڵبگرە.

ئەو دووپیاوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە و زانیان ئەو ڕۆژەی سەد کوڕی

عەبدوللە، خەڵکەکەی ئەوانی کوشتار دەکرد، هەمان ڕۆژ و کاژێر بوو کە پێغەمبەر(د.خ) فەرموودەکەی خۆی سەبارەت بەوان هێنایە سەر زمان.

کاتێك نێردراوانی جەرش هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕیان بەئیسلام هێنا، پێغەمبەر(د.خ) بۆ گوندەکەیان سنووری دیاری کرد و بۆ لەوەڕینی ئەسپ و چوارپێ و کشتوکاڵی ئەوان نیشانەی دانا و بەزاندنی ئەو سنوورە یاساغ کرا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا، لەمانگی ڕەمەزان، پێغەمبەر(د.خ)، عەلی کوڕی ئەبی تالبی لەگەڵ سوپایەك بۆ غەزای یەمەن ڕەوانە فەرموو.

بەرا کوڕی عازەب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خەڵکانی یەمەن ڕەوانە کرد تا پێشنیاری ئیسلامیان پێبکات. من یەکێك بووم لەهاوڕێکانی ئەو. شەش مانگ لەوێ ماینەوە وکەس بەپێشنیارەکانی ئێمە ڕازی نەبوو. پێغەمبەر(د.خ) عەلی ڕەوانە کرد و فەرمووی: خالید کوڕی وەلید و هاوڕێکانی بگەڕێنەرەوە و ئەگەر یەکێك لەهاوەڵانی خالید ویستی بمێنێتەوە، ڕێگەی پێبدات.

بەرا دەڵێت: یەکێك بووم لەو کەسانەی لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب مامەوە. کاتێك گەیشتینە سەرەتاکانی یەمەن، خەڵکەکەی ئاگادار بوونەوە و خۆیان ئامادە کرد. عەلی نوێژی بەیانی لەگەڵ خوێندین و دوای نوێژ ڕیزەکانی ئێمەی ڕێکخست. لەبەردەممان وەستا، سپاسی خوای کرد دواتر نامەی پێغەمبەری بۆ خەڵکان خوێندەوە. هەموو خەڵکانی هۆزی هەمەدان لەیەك ڕۆژ باوەڕیان بەئیسلام هێنا و عەلی ڕووداوەکەی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی. پێغەمبەر(د.خ) کاتێك نامەکەی عەلی خوێندەوە، سوجدەی برد. دواتر فەرمووی: سڵاو لەهۆزی هەمەدان، سڵاو لەهۆزی هەمەدان.

دوای ئەوان خەڵکانی یەمەن باوەڕ بەئیسلام دێنن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی تایەفەی زوبەید هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی زوبەید، ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا.

کاتێك خەڵکانی زوبەید لەکارەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوونەوە، عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب بەقەیس کوڕی مەکشوحی مورادی وت: ئەی قەیس، تۆ سەروەری خەڵکەکەتی، دەڵێن یەکێك لەقوڕەیش بەناوی محەممەد لەحیجاز دەرکەوتووە و دەڵێت پێغەمبەری خوایە، با بڕۆین و لەکارەکانی ئاگادار ببینەوە، ئەگەر بەهەمان شێوە

کەدەڵێت، پێغەمبەری خوا بێت، کاتێك دەیبینین، لێمان شاراوە نابێت و باوەڕی پێ دێنین و ئەگەر جیاواز لەمە بێت، لەکار و مەبەستەکەی ئەو بێ ئاگا نین. قەیس کوڕی مەکشوح بەوتەکانی رازی نەبوو.

عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب سوار بوو و گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ)و وتەکانی پشتڕاست و باوەڕی هێنا. کاتێك قەیس ئاگادار بوویەوە، هەڕەشەی لەعەمرۆ کرد و ڕقی ئەوی خستە دڵەوە، وتی: دژایەتی منی کرد و گرنگی بەبۆچوونەکەی من نەدا.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەناو منداڵەکانی زوبەید و سەرکردەی خەڵکان فەروە کوڕی مەسیکی مورادی بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، هەڵگەڕایەوە.

لەم ساڵەدا، پێش ئەوەی عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەگەڵ خەڵکانی زوبەید بڕواتە لای پێغەمبەر(د.خ)، فەروە کوڕی مەسیك لەپاشاکانی کێندە دابڕا و گەیشتە مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ).

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: فەروە کوڕی مەسیکی مورادی لەپاشاکانی کێندە دابڕا و دژایەتی ئەوانی کرد. هاتە لای پێغەمبەر(د.خ). پێش ئیسلام لەنێوان هۆزی موراد و هەمەدان شەڕێك ڕوویدا. لەشەڕێك کەبە ڕەزم ناوی دەرکرد، هەمەدانییەکان بەسەر هۆزی مورادد‌ا سەرکەوتن و ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت. ئەو کەسەی هەمەدانییەکانی بۆ شەڕی مورادییەکان برد، ئەجدەع کوڕی مالك بوو کەبووە هۆکاری ریسوایی خەڵکەکەی. فەروە کوڕی مەسیك لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و تیایدا باسی پاساوەکانی شکستەکەی خۆیان دەکات و دەڵێت:

((ئەگەر پاشاکان هەمیشەیی دەبوون، ئێمەیش هەمیشەیی دەبووین.
ئەگەر گەورەکان دەمانەوە، ئێمەیش دەماینەوە.))

کاتێك فەروە باوەڕی بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((کاتێك پاشاکانی کێندە
وەك قاچێکی نەخۆش لەکار بکەون
چوارپێی بۆ لای محەممەد غار پێدەدەم
چوونکە زۆر پێی هیوادارم))

کاتێك گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، پێی وت: ئەی فەروە، لەڕووداوەکەی ڕۆژی ڕەزم

کەزیان بەرخەڵکەکەت کەوت، خەمباریت؟

وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، هەرکەس خەڵکەکەی گرفتاری بەلاّ بێت، بەهەمان شێوە کەخەڵکەکەی من گرفتار بوو، خەمبار دەبێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەلاّم ئەم ڕووداوە لەئیسلامدا دەبێتە هۆی خێر و خۆشی بۆ خەڵکەکەت.

پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە لێپرسراوی هۆزەکانی موراد و زوبەید و مەزجەح و خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسی لەگەڵ ئەو نارد و پێکەوە زەکاتیان کۆدەکردەوە. خالید مایەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) مرد.

لەساڵی دەی کۆچ، جارود کوڕی عەمرۆ لەگەڵ نێردراوانی تایەفەی عەبدقەیس گەیشتنە مەدینە. جارود، مەسیحی بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك جارڕود گەیشتە خزمەت پێغەمبەر(د.خ)، گفتوگۆ و پێشنیاری ئیسلامی پێکرد و بۆ باوەڕهێنان، هانیدا.

جارود وتی: ئەی محەممەد، تا ئێستا لەسەر دینەکەی خۆم ماومەتەوە، دینەکەی خۆم پشتگوێ دەخەم و باوەڕ بەدینەکەی تۆ دێنم، بەلاّم ئایا دینەکەی من پشتڕاست دەکەیتەوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ و دڵنیام خواوەند تۆی بۆ دینێکی باشتر ڕێنوێنی کردووە.

دەڵێت: جارود باوەڕی هێنا و هاورێکانیشی موسوڵمان بوون. داوای چارویێیان لە پێغەمبەر(د.خ) کرد، فەرمووی: نیمە تا پێتانی بدەم.

وتیان: چارویێ وێڵ لەرێگادا هەیە، دەتوانین سواریان بین وبۆ وڵاتی خۆمان بگەڕێینەوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دەستیان لێ مەدەن چوونکە ئاگرە.

دەڵێت: جارود بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە و موسوڵمانێکی بڕوادار بوو تا مرد.لەسەردەمی هەڵگەڕانەوە زیندوو بوو. کاتێك خەڵکەکەی لەئسلام هەڵگەڕانەوە و باوەشیان بۆ دینی پێشوو کردەوە، مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزەر ناسراو بەغرور، هەڵگەڕایەوە. جارود هەستا و شایەتوومانی هێنایە سەرزمان و پێشنیاری ئیسلامی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە. سەرکۆنەی هەڵگەڕاوەکانی کرد.

پێغەمبەر(د.خ) پێش گرتنی مەککە عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ گەیاندی بانگەوازی ئیسلام بۆ لای مونزەر کوڕی ساوی عەبدی ڕەوانە کرد. مونزەر باوەڕی هێنا و دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) و پێش ئەوەی خەڵکانی بەحرەین لەدین هەڵبگەڕێنەوە، کۆچی دوایی کرد. عەلا لای ئەو بەنوێنەرایەتی پێغەمبەر(د.خ)، فەرمانڕەوایی بەحرەینی دەکرد.

هەروەها لەساڵی دەیەم، نێردراوانی تایەفەی منداڵەکانی حەنیفە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نێردراوانی تایەفەی حەنیفە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، موسەیلەمەی کەزاب (درۆزن) کوڕی حەبیب لەناویاندا دەبینرا و لەماڵی کچی حارس، ژنی یەکێك لەئەنسار دابەزین. موسەیلەمەیان بردە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەویان بەجل و بەرگ داپۆشیبوو. پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی لەمزگەوتا دانیشتبوو. لقێکی تازە پێگەییوی خورمای لەبەردەمدا بوو. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر(د.خ)، گفتوگۆی دەستپێکرد. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر داوای ئەم لقە خورمایە بکەیت، پێتی نادەم.

یەکێك لەپیرەکانی منداڵەکانی حەنیفە لەخەڵکانی یەمامە، دەڵێت: داستانی موسەیلەمە جیاواز لەمە بوو، کاتێك نێردراوانی منداڵەکانی حەنیفە ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، موسەیلەمەیان لای بارەکانیان دانا و کاتێك باوەڕیان هێنا، باسی ئەویان کرد و وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، یەکێك لەهاوەڵانی خۆمان لای بارەکان داناوە تا چاودێریان بکات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چیان بەوان بەخشییوە بەموسەیلەمەی ببەخشن و فەرمووی: ئەو خراپتر لەئێوە نییە. مەبەستی ئەوە بوو چاودێری کەل و پەلی هاورێکانی دەکات.

دەڵێن: ئەوان ڕۆشتن و بەخششەکانی پێغەمبەریان بەموسەیلەمەدا، دوژمنی خوا کاتێك گەیشتە یەمامە، لەموسوڵمانی پەشیمان بوویەوە و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و لەگەڵ خەڵکەکەی درۆی کرد. دەیوت: من لەپێغەمبەرایەتیدا شەریکی محەممەدم. بەنێردراوانی وت: مەگەر کاتێك ناوی منتان لای محەممەد باس کرد، نەیوت ئەو لەئێوە خراپتر نییە، بۆیە ئەم قسەی کرد چوونکە دەیزانی من شەریکی پێغەمبەرایەتیم.

موسەیلەمە وتەی کێشداری دەهێنایە سەرزمان، بۆ نموونە بۆ لاسایی کردنەوەی قورئان دەیوت:

لقد انعم الله على الحبلى، اخرج منها نسمه تسعى، من بين صفاق وحشي.

واتاکەی: خواوەند بەژنی دووگیان نیعمەتی بەخشی و بوونەوەرێکی زیندووی لێهێنایەدەر، لەنێوان کۆیلە و ئاژەڵەکان.

هەروەها نوێژی لەسەر شوێنکەوتەکانی خۆی هەڵگرت و شەراب و زینای بۆ حەڵاڵ کردن. شایەتی بۆ پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا و بەمشێوەیە منداڵەکانی حەنیفە شوێنی کەوتن و لەدەوری کۆبوونەوە.

خوا دەزانێت راستییەکان چۆن بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی هۆزی کێندە گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). سەرکردەکەیان ئەشعەس کوڕی قەیس کێندی بوو.

لەکوڕی شیهابی زوهری دەگێڕنەوە: ئەشعەس کوڕی قەیس لەگەڵ شەست سوار لەخەڵکانی کێندە هات و ڕۆشتنە ناو مزگەوت، قژی پرچ کردبوو، جل و بەرگی ڕەش و سپییان پۆشیبوو و کەنارەکانیان بەحەریر رازاندبوویەوە. کاتێک گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، فەرمووی: مەگەر هێشتا باوەڕتان نەهێناوە؟

وتیان: بەڵێ باوەڕمان هێناوە.

فەرمووی: کەواتە ئەم حەریرە چییە بەگەردنتانەوە. ئەوان حەریرەکەیان لەجلەکانی خۆیان کردەوە و فڕیاندا.

ئەشعەس وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە منداڵەکانی ئاکل ئەلموراڕین و تۆیش بەهەمان شێوە منداڵی ئاکل ئەلموراریت.

پێغەمبەر(د.خ) پێکەنی و فەرمووی: عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و رەبیعە کوڕی حارس بۆ ئەوان دەگێڕنەوە.

دەڵێت: رەبیعە و عەباس بازرگان بوون و کاتێک لەسەرزەمینی عەرەب سەفەریان دەکرد، لەوەڵامی خەڵکان دەیانوت ئێمە منداڵەکانی ئاکل ئەلمورارین و بەمشێوەیە شانازییان بەخۆیانەوە دەکرد کە(ئەمە نازناوی یەکێک لەپاشاکانی کێندە بوو کەپێیان دەوت ئاکل ئەلمورار (ئاڵفخۆڕ) وەك بڵێی نیشانەیەك بوو بۆ دەسەڵات و هێز.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئێمە منداڵەکانی عەزریم، ناوی دایکی خۆمان بەخراپە نابەین و حاشا لەباوکی خۆمان ناکەین.

ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: ئەی خەڵکانی کیندە، گوێتان لەم وتەیە بوو، سوێند بەخوا هەرکەس لەمەدوا بڵێت منالی ئاکل ئەلمورارین، هەشتا قامچی لێدەدەم.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی هۆزی موحاریب هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

هەروەها لەم ساڵەدا نێردراوانی رەهاوییەکان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

لەم ساڵەدا عاقیب و سەیید لەنەجرانەوە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و پێغەمبەر(د.خ) پەیمان نامەی ئاشتی بۆ نووسین.

لەم ساڵەدا نێرداوانی خەڵکانی عەبەس هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی رەمەزان، عودەی کوڕی حاتەم گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ).

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی عامری راهیب لەدەرباری هێرقل مرد وکەنانە کوڕی عەبدیالەیل و عەلقەمە کوڕی عەلاسە سەبارەت بەمیراتی ئەو شەڕ و کێشەیان نایەوە و پێغەمبەر(د.خ) لەبەرژەوەندی کەنانە داوەری کرد و فەرمووی ئەوان شارنشینن و تۆ بیابان نشین.

دەڵێت: لەم ساڵەدا نێردراوانی تایەفەی خەوەلان هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ژمارەیان دە کەس بوو.

یەزید کوڕی ئەبی حەبیب دەڵێت: دوای ئاشتی حۆدەیبییە و پێش شەڕی خەیبەر، ریفاعە کوڕی زەیدی جوزامی زەبیبی هات و کۆیلەیەکی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی و باوەڕی بەئیسلام هێنا. پێغەمبەر(د.خ) نامەیەکی بۆ خەڵکەکەی نووسی کەناوەرۆکەکەی ئەمەیە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە نامەی پێغەمبەرە بۆ ریفاعە کوڕی زەید کەمن ئەوم بۆ لای خەڵکەکەی و خزمەکانی ڕەوانە کرد تاپێشنیاری ئیسلام و باوەڕ هێنان بەخوا و پێغەمبەریان پێبکات و هەرکەس رازی بێت یەکێکە لەموسوڵمانان و هەرکەس رازی نەبێت، دوو مانگ دەرفەتی هەیە.))

کاتێك ریفاعە بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە، بەپێشنیارەکانی رازی و باوەڕیان هێنا و ڕێگەی حورەی رەجلایان گرتەبەر و لەوێ نیشتەجێ بوون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ریفاعە کوڕی زەید لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و نامەکەی پێغەمبەری هەڵگرتبوو، بەپێشنیارەکانی رازی و زۆری نەخایاند دەحیە کوڕی

خەلیفەی کەلبی لای قەیسەری فەرمانڕەوای ڕۆم گەڕایەوە. پێغەمبەر(د.خ) دەحیەی ڕەوانە کردبوو. ئەو کالأی بازرگانی لەگەڵ خۆیدا برد و کاتێك گەیشتە دۆڵی شنار، هونەید کوڕی عەوەز و کوڕەکەی کەهەردووکیان لەتیرەی زەلیعی جوزام بوون، هێرشیان کردەسەر و سامانەکەیان گرت. کاتێك منالەکانی زەبیب، کەسەکانی ریفاعە، ئاگادار بوونەوە، هێرشیان کردە سەر هونەید. نەعمان کوڕی ئەبی جەعال یەکێك بوو لەوان. کاتێك ڕووبەڕوو بوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد، سامانەکەی دەحیەیان وەرگرتەوە. دەحیە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و ڕووداوەکەی بۆ باس کرد و وتی: دەبێت تۆڵە لەهونەید وەربگرین. پێغەمبەر(د.خ) زەید کوڕی حارسەی ڕەوانە فەرموو. سوپایەکی کردە هاوڕێی. زەید بەرەو غەتەفان و وائل و سەلامان و سەعد کوڕی هوزەیم ڕۆشت کەدوای باوەڕهێنان لەحورە رەجلا نیشتەجێ ببوون.

لەو کاتەدا ریفاعە کوڕی زەید لەکەراعی رەبە بوو. بێ ئاگا و دەستەیەك لەمنالەکانی زەبیبی لەگەڵدا بوو. منالەکانی دیکەی زەبیب لەحورە لەمەسیلی ڕۆژهەلأت بوون.

سوپاکەی زەید کوڕی حارسە لەلای ئەولاجەوە هات و لەلای حورەوە هێرشی برد و هەرچی ماڵ و سامانیان بەدەست هێنا، هەڵیانگرت و هونەید ودوو کوڕەکەی لەمنالەکانی ئەحنەف و کەسێك لەمنالەکانی زەبیبیان کوشت.

کاتێك منالەکانی زەبیب ئاگادار بوونەوە و سوپاکە لەساراى مەدان بوو، حسان کوڕی مڵە سوار ئەسپەکەی زەید بەناوی عەجاجە بوو. ئەنیق کوڕی مڵە سوار ئەسپەکەی باوکی بوو بەناوی رەغال و باوکی زەید کوڕی عەمرۆ سوار ئەسپێك بەناوی شیمر. بەرێکەوتن تا لەسوپاکەی زەید نزیك کەوتنەوە. باوکی زەید بەئەنیف کوڕی مڵەی وت: تەواوی کە وبڕۆ چوونکە ئێمە لەزمانی تۆ دەترسین. ئەنیف مایەوە. کەمێکی دیکە بۆ پێشەوە ڕۆشتن و ئەسپەکەی دەستی لەزەوی دەدا، ئەنیف وتی: تۆ دەتەوێت بەو دوو ئەسپە بگەیت و من دەخوازم بەو دووپیاوە. جڵەوی ئەسپەکەی بەرەلأ کرد و پێیان گەیشتەوە، وتیان: ئێستا کەهاتوویت رێگە لەزمانی خۆت بگرە و پەلە مەکە. بڕیاردرا جگە لەحسان کوڕی مڵە کەس قسە نەکات. لەرۆژگاری جاهلییەت وشەیەك لەنێوان ئەواندا بوو و کاتێك یەکیان دەیویست شمشێر بوەشێنێت، دەیوت: (سووری)

کاتێك لەسوپاکە نزیك کەوتنەوە، سوارێکی ڕم بەدەست هاتەپێی، ئەوانی بۆ پێشەوە برد و ئەنیف وتی: سووری، بەلأم حسان وتی: ئارام بە. کاتێك گەیشتنە لای زەید کوڕی حارسە، حسان وتی: ئێمە خەڵکانێکی موسوڵمانین.

زەید وتی: سورەی حەمد بخوێنە. حسان سووری حەمدی خوێند کەپێشتر لەدەحیەی کەلبی فێر ببوو.

زەید کوڕی حارسە وتی: لەناو سوپادا جاڕ بدەن ناوچەکەی ئەوان بۆ ئێمە حەرامە مەگەر ئەوەی کەسێك خیانەت بکات. حسان کوڕی ملە خوشکەکەی خۆی کەژنی ئەی وەبر کوڕی عودەی زەبیبی بوو، لەناو ئەسیرەکاندا بینی و زەید کوڕی حارسە وتی: لەگەڵ خۆت ببە. ئەو بەندی خوشکەکەی خۆی گرت و دایکی فرزی زەلیعی وتی: کچەکانتان دەبەن و دایکەکانتان پشتگوێ دەخەن. یەکێك لەمناڵەکانی زەبیب وتی: ئەمە جادووی ژنەکانی زەبیبە. یەکێك لەسوپاییەکان ئەم قسەی بیست و زەیدی لێ ئاگادار کردەوە. فەرمانیدا بەندی دوو دەستی خوشکەکەی حسانیان کردەوە و وتی: لەگەڵ پورزاکانی خۆت دانیشە تا خواوەند فەرمانی خۆی سەبارەت بەئێوە دەربکات. فەرمانی بەسوپاکەیدا روونەکەنە ئەو دۆڵەی ئەم سێ کەسە لێوەی هاتوون. ئەوان شەوانە گەڕانەوە لای کەسەکانی خۆیان و شیریان خوارد و لەگەڵ چەند کەسێك بۆ لای ریفاعە کوڕی زەید بەرێکەوتن. لەناو ئەو کەسانەی ئەو شەوە بۆ لای ریفاعە کوڕی زەید ڕۆشتن، باوکی زەید کوڕی عەمرۆ و باوکی شەماس کوڕی عەمرۆ و سوەید کوڕی زەید و بەعجەت کوڕی زەید و بەرزەع کوڕی زەید و سەعلەبە کوڕی عەمرۆ و موخەریبە کوڕی عودەی و ئەنیف کوڕی ملە و حسان کوڕی ملە، دەبینران.

بەرەبەیان گەیشتنە لای ریفاعە، حسان پێی وت: تۆ دانیشتوویت و بزن دەدۆشیت و ژنانی جوزامیان ئەسیر کردووە چوونکە بەهۆی نامەکەی تۆوە فریودرا بوون.

ریفاعە کوڕی زەید داوای وشترەکەی کرد و بۆ ڕۆشتن ئامادە بوو، بەخۆی دەوت: تۆ زیندوویت، یا ناوی زیندووت هەڵگرتووە. چاویان بەئومەییە کوڕی زەفارە برای زەبینی کوژراو کەوت و بەرەو مەدینە بەرێکەوتن. سێ ڕۆژ لەرێگەدا بوون و کاتێك گەیشتنە مەدینە، روویان لەمزگەوت کرد، یەکێك ئەوانی بینی و وتی: وشترەکان لێرە مەخوێنن چوونکە دەستیان دەقرتێت. وشترەکانیان نەخەواند و دابەزین. کاتێك ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەوانی بینی، بەدەست ئیشارەی کرد تا بێنە پێش. کاتێك ریفاعە قسەی کردنی دەسپێکرد، یەکێك لەناو خەڵکان هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئەوان جادووگەرن. دوو جار قسەکەی دووبارە کردەوە.

ریفاعە وتی: خوا لەو کەسە خۆش بێت کەئەمڕۆ چاکەمان لەگەڵ دەکات. ئەمەی وت

و نامەکەی پێغەمبەری گەڕاندەوە و وتی: بیگرە ئەی پێغەمبەر(د.خ) چوونکە نامەکەی کۆنە و خیانەتەکەی تازەیە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی کورە بیخوێنە و بڵێ چییە؟

کاتێك نامەکە خوێندرایەوە، پرسیاری لێکردن و ڕووداوەکەیان بۆ باس کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: چی لەکوژراوەکان بکەم؟ سێ جار وتەکەی دووبارە کردەوە.

ریفاعە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) تۆ باشتر دەزانی ئێمە حەلاڵی تۆ حەرام ناکەین.

باوکی زەید کوڕی عەمرۆ وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، زیندووەکان ئازاد بکە و ئێمە خوێنی کوژراوان لەبەر چاو ناگرین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: باوکی زەید بۆچوونەکەی پەسەندە، عەلی لەگەڵ ئەوان برۆ.

عەلی وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، زەید گوێرایەڵی فەرمانەکانی من نابێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: شمشێرەکەی من لەگەڵ خۆت ببە. شمشێرەکەی بەعەلیدا.

عەلی وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چوارپێم نییە سواری بم.

پێغەمبەر(د.خ) وشتری سەعلەبە کوڕی عەمرۆ بەناوی مەکحال پێدا. کاتێك خەڵکان بەرێکەوتن، نێردراوی زەید کوڕی حارسە کەسوار لەسەر یەکێك لەوشترەکانی ئەبی وەبر بوو، دەرکەوت و ئەویان دابەزاند.

نێردراو وتی: ئەی عەلی من چکارەم؟

عەلی وتی: ماڵیان ناسییەوە و وەریانگرتەوە.

بەرێکەوتن تا گەیشتنە سوپاکە و هەموو سامانی خۆیان لەسوپاکە وەرگرتەوە بەشێوەیەك نەمەدیان لەژێر بارەکان دەردەهێنا.

## نێردراوانی مناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: نێردراوانی عامر لەگەڵ عامر کوڕی توفەیل و ئەربود کوڕی قەیس کوڕی مالك و جەبارەی سولەمی کەسەرکردە و بیرمەندەکانی خەڵکان بوون، هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). عامور کوڕی توفەیل مەبەستی خیانەتی لەسەردابوو.

خەڵکەکەی پێیان وتبوو: ئەی عامر خەڵکان موسوڵمان بوون. تۆیش باوەڕ بێنە.

عامر وتی: سوێند بەخوا سوێندم خواردووە دانەنیشم تا عەرەبەکان ببنە شوێنکەوتەی من.

کاتێك ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، بەئەربەدی وت: کاتێك گەیشتینە لای ئەو پیاوە، من سەرقاڵی دەکەم و تۆ بەشمشێر بیکوژە.

کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، عامر کوڕی توفەیل وتی: ئەی محەممەد، شتێکمان پێ ببەخشە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نا، مەگەر کاتێك باوەڕ بەخوای تاقانە بێنیت.

دووبارە وتی: ئەی محەممەد شتێکمان پێ ببەخشە. پێغەمبەر(د.خ) وتەکەی خۆی دووبارە کردەوە. عامر چاوەڕوان بوو ئەربود کارەکەی تەواو بکات، بەڵام ئەربود لەشوێنی خۆی نەدەجوولا، کاتێك کرداری ئەربودی بینی، وتی: ئەی محەممەد، شتێکمان پێببەخشە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: نا، مەگەر کاتێك باوەڕ بەخواوەند بێنیت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) ڕازی نەبوو هیچی پێببەخشێت، وتی: سوێند بەخوا مەدینە پڕدەکەم لەسوارە سوورەکان و پیادەکان. کاتێك ڕۆشت، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا، شەڕی عامر کوڕی توفەیل لەمن دوور بخەرەوە.

کاتێك نێردراوانی مناڵەکانی عامر لای پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتن، عامر بەئەربودی وت: دوای ئەوەی پێشنیاری کوشتنی ئەوم پێکردی، چیت بەسەر هات، سوێند بەخوا لەتۆ زیاتر لەهەموو خەڵکانی زەوی دەترسام، بەڵام چیتر نا.

ئەربود وتی: بێ باوك، پەلە مەکە، هەرکاتێك ویستم بیکوژم، دەبوویتە دیوارێك لەنێوان من و ئەو، جگە لەتۆ کەسم نەدەبینی، دەتویست بەشمشێر تۆ بکوژم؟

مناڵەکانی عامر بەرەو دیاری خۆیان بەرێکەوتن و لەرێگا، خواوەند، عامر کوڕی توفەیلی گرفتاری تاعون کرد و ئەوی کوشت. ئەم ڕووداوە لەماڵی ژنێکی سەلولی ڕوویدا. لەکاتی مەرگ وتی: ئەی مناڵەکانی عامر، غودەیەك هاوشێوەی غودەی وشترمر لەماڵی ژنێکی سەلولی.

هاوەڵانی عامر دوای بەخاك سپاردنی ئەو ڕۆشتن و کاتێك گەیشتنە سەرزەمینی مناڵەکانی عامر، خەڵك دەوریان گرتن و لەئەربودیان پرسی: چ هەواڵێکت پێیە؟

ئەربود وتی: هیچ، پێشنیاری پەرەستینی شتێکی بەئێمە دەکرد، حەزم دەکرد

لێرەدەبوو بۆ ئەوەی بیکوژم. یەك دوو ڕۆژ دوای ئەم وتەیە بەمەبەستی فرۆشتنی وشترەکەی لەماڵ ڕۆشتەدەر، خواوەند هەورەتریشقەیەکی نارد و خۆی و وشترەکەی سووتان.

ئەربود، لەدایکەوە برای لوبەید کوڕی ڕەبیعە بوو.

نێردراوانی هۆزی تەی هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) کەزەید ئەلخەیل سەرکردەیان بوو. کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(د.خ)، گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و پێشنیاری ئیسلامی پێکردن. باوەڕیان هێنا و لەسەر باوەڕەکەیان بەردەوام بوون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەزەید ئەلخەیل وتی: هەرکام لەخەڵکانیان بۆ تایبەتمەندییەك وەسف کردووە، و کاتێك هاتنە لای من، شیاوی ئەو وەسفە نەبوون جگە لەزەید ئەلخەیل کەبۆ وەسفی زیاتر شیاو بوو. ئەوی بەزەید ئەلخەیر ناو برد. فید و زەوییەکانی دیکەی بەو سپارد و لەمبارەوە نامەیەکی نووسی. زەید ڕێگەی سەرزەمینی خۆی گرتەبەر و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خۆزگە زەید لەگەرمای مەدینە گیان دەرباز بکات.

کاتێ زەید گەیشتە دیاری نەجد و لەسەر ئاوێك بەناوی قردە دابەزی، تا، ئەوی داگرت و گیانی سپارد. دوای مەرگی، ژنەکەی نامەکانی پێغەمبەری سووتاند.

لەساڵی دەی کۆچ، موسەیلەمەی درۆزن نامەیەکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی و ڕایگەیاند لەپێغەمبەریدا شەریکە.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: موسەیلەمە نامەیەکی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((لەموسەیلەمە پێغەمبەری خوا بۆ محەممەد پێغەمبەری خوا، سلاّو لەتۆ چوونکە لەپێغەمبەرایەتی ئێمەیان کردە شەریکی تۆ، نیوەی سەرزەمین بۆ ئێمە دەبێت و نیوەی بۆ قورەیش بەلاّم قورەیشییەکان خەڵکانێکی داگیرکەرن.))

دوو نێردراو ئەم نامەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) هێنا.

نەعیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعی دەڵێت: بیستم کاتێك پێغەمبەر(د.خ) نامەی موسەیلەمەی خوێندەوە، بەنێردراوەکانی وت: ئێوە چی دەڵێن؟

نێردراوەکان وتیان: شوێنکەوتەی قسەکانی ئەوین.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر کوشتنی نێردراوەکان ناڕەوا نەدەبوو، دەمکوشتن. دواتر نامەیەکی بۆ موسەیلەمە نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بسم الله الرحمان الرحيم. لە محەممەد پێغەمبەری خوا، بۆ موسەیلەمەی درۆزن، سڵاو لەو کەسەی شوێنکەوتەی ڕێگەی رزگارییە، بەڵام دواتر، سەرزەمین تایبەتە بەخوا و بەهەرکام لەبەندەکانی بخوازێت، دەیبەخشێت، ئەنجامی کارەکان بۆ خۆپارێزانە.))

ئەم نامەیە لەکۆتایی ساڵی دەیەمی کۆچ نووسرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەیەك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی موسەیلەمەی درۆزن و کەسانیتر لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ)، دوای ئەوە روویدا کە لەحەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە و بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە، گیانی سپارد.

باوکی موویهەبەی موالی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەحەجی ماڵئاوایی هێنا و بۆ مەدینە گەڕایەوە، بەدژواری ڕێگەی دەبڕی. ئەم هەواڵە لەهەموو ناوچەکان بڵاو بوویەوە و ئەسوەد لەیەمەن و موسەیلەمە لەیەمامە سەریان بەرز کردەوە. پێغەمبەر(د.خ) لەکارەکانی ئەوان ئاگادار بوویەوە. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) تەندروستی بەدەست هێنایەوە، تولەیحە لەسەرزەمینی مناڵەکانی ئەسەد شۆڕشی کرد. دواتر لەمانگی موحەرم نەخۆشییەکەی دەستی پێکرد و بەهۆیەوە گیانی ئەسپەردە کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ هەمو ئەو ناوچانەی باوەڕیان بەئیسلام هێنابوو، لێپرسراوانی خۆی نارد تا زەکات کۆبکەنەوە.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بۆ وەرگرتنی زەکات لێپرسراوانی خۆی بۆ هەموو ناوچە ئیسلامییەکان ڕەوانە فەرموو. موهاجیر کوڕی ئومەییەی بۆ سەنعا نارد و لەوێ بوو کەئەسوەد عەنسی بانگەشەی پێغەبمەری بەرز کردەوە، زیاد کوڕی لوبەیدی ئەنساری بۆ حەزەرمەوت نارد، عودەی کوڕی حاتەمی کردە کردە لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکاتی خەڵکانی تەی، مالك کوڕی نەویرەی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی تایەفەی مناڵەکانی حەنزەلە راسپارد. لێپرسراوی کۆکردنەوەی تایەفەی مناڵەکانی سەعد دوو کەس لەخۆیان بوون. عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ بەحرەین ناردو عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆنەجران.

لەمانگی زیقەعدەی ساڵی دەیەمی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) خۆی بۆ حەج ئامادە کرد و فەرمانیدا خەڵکانیش خۆیان ئامادە بکەن.

عایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: پێنج ڕۆژ بۆ کۆتایی زیقەعدە

پێغەمبەر(د.خ) بەمەبەستی حەج مەدینەی بەجێهێشت. تەنیا باسی حەج دەکرا تا گەیشتنە سەرف. پێغەمبەر(د.خ) قوربانی لەگەڵ خۆی برد و دستەیەك لەسەرکردەکان هاورێیەتیان دەکرد. فەرموو بووی نییەتی عەمرە بکەن مەگەر ئەو کەسەی قوربانی هێنابێت. ئەو ڕۆژە گرفتاری نەخۆشی مانگانە بووم، پێغەمبەر(د.خ) هات و بینی دەگریم و فەرمووی: عایشە ئەگەری هەیە گرفتاری نەخۆشی مانگانە بووبێتیت؟

وتم: بەڵێ، خۆزگە ئەم ساڵە بۆ ئەم سەفەرە نەدەهاتم.

فەرمووی: ئەو قسە مەکە، تۆ هەموو ڕێ ورەسمەکانی حەج ئەنجام دەدەیت تەنیا بەدەوری ماڵی خوادا ناسوڕێیتەوە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ناو مەککە و هەرکەس قوربانی نەهێنابوو و ژنەکانیان، نییەتی عەمرەیان کرد، لەڕۆژی قوربان بڕێك گۆشتی گایان هێنا بۆ ماڵەکەی من.

وتم: ئەمە چییە؟

وتیان: پێغەمبەر(د.خ) بەنوێنەرایەتی ژنەکانی خۆیان گای کردۆتە قوربانی و بۆ ڕۆژی بەرد هاویشتن، پێغەمبەر(د.خ) منی لەگەڵ عەبدولرەحمانی برام نارد.

کوڕی ئەبی نەجیح دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی بۆ نەجران ناردبوو. عەلی ئەحرامی بەست و لەمەککە خۆی بە پێغەمبەر گەیاند. کاتێك ڕۆشتە لای فاتیمەی کچی پێغەمبەر(د.خ)، ئەوی بینی ئیحرامی نەبەستبوو، وتی: ئەی کچی پێغەمبەر(د.خ)، حاڵت چۆنە؟

فاتیمە وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی نییەتی عەمرە بکەن و ئەحرامەمان نەبەست.

عەلی ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و کاتێك لەهەواڵەکانی سەفەرەکەی خۆی ئاگاداری کردەوە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ بەدەوری ماڵی خوادا بسوڕێرەوە.

عەلی وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، هاوشێوەی تۆ نییەتم کردووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڕۆ هاوشێوەی هاورێکانت ئیحرام دابنێ.

دەڵێت: وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) کاتێك ئیحرامم دەبەست وتم ئەی خوایە نییەتی من، نییەتی بەندە و پێغەمبەری تۆیە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قوربانیت پێیە؟

وتم: نا.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەقوربانی خۆی کردە شەریك. عەلی ئیحرامی بەست تا

ئەو کاتەی کۆتایی بەرێ ورەسمەکانی حەج هێنا. پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەویش قوربانی کرد.

یەزید کوڕی تەڵحە دەڵێت: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەیەمەنەوە هات تا پێغەمبەر(د.خ) لەمەککە ببینێت، بەخێرایی هات و کەسێك لەهاوەڵانی خۆی وەك سەرکردەی سوپاکەی دەستینشان کرد. ئەو کەسە، فەرمانیدا خەڵکان ئەو حیلانە بپۆشن کە لەیەمەنەوە هێنابووی. کاتێك سوپاکە لەمەککە نزیك کەوتەوە، عەلی بۆ بینینی ئەوان لەمەککە ڕۆشتەدەر و کاتێ بینی جلەکانیان پۆشیوە، وتی: بۆ ئەو کارەتان کرد؟

وتی: فەرمانمدا بیپۆشن تا کاتێك هاتن رازاوە بن.

عەلی وتی: پێش ئەوەی بگەنە لای پێغەمبەر(د.خ)، حیلەکان داکەنن.

دەڵێت: حیلەکانی وەرگرتەوە و سوپاکە، لەم کارە ڕەنجان.

باوکی سەعیدی خدری دەڵێت: کەسانێك سکاڵایان لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد. پێغەمبەر(د.خ) بۆ خەڵکان قسەی کرد و بیستم دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە، سکاڵا لەعەلی مەکەن، چوونکە ئەو لەکاری خوا یا لەرێگەی خوا، توندوتیژی دەکات.

عەبدوللە کوڕی ئەبی نەجیح دەڵێت: دوای ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەرێ ورەسمەکانی حەج هێنا و خەڵکانی فێر کرد، وتاری بەناوانگی خۆی بۆخەڵکان خوێندەوە. سەرەتا سپاسی خوای کرد و دواتر فەرمووی:

((ئەی خەڵکینە، وتەکانم ببیستن ئەگەری هەیە دوای ئەم ساڵە هیچ کات ئێوە لێرە نەبینم.

ئەی خەڵکینە، خوێن و ماڵەکانتان، وەك ئەم ڕۆژە و ئەم مانگە بۆ یەکتر حەرامە. دەڕۆنە بەردەم خواوەند و لەکردەوەکانی ئێوە دەپرسن. من ئاگادارم کردنەوە، هەرکەس ئەمانەتێکی لایە، بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە، سوو لەناوچوو، تەنیا مافتان بەسەرمایەی خۆتانەوە هەیە. نەستەم بکەن و نەبە ستەم رازی ببن. خواوەند فەرمانی داوە سوو نەمێنێت، سووی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیبیش لەناوچوو. یەکەم خوێن بەفیڕۆ دەڕوات، خوێنی ڕەبیعە کوڕی حارس کوڕی عەبدولموتەلیبە (ڕەبیعە کوڕی حارسیان لەتەمەنی شیرخواردن بەتایەفەی منداڵەکانی لەیس سپارد و خەڵکانی هوزەیل ئەویان کوشت)

فەرمووی: ئەمە یەکەم خوێنی رۆژگاری جاهلییەتە بەفیڕۆ دەروات.

ئەی خەڵکینە، چیتر شەیتان هیوادار نییە لەسەرزەمینەکانی ئێوە بیپەرەستن، بەلاّم ئارەزوو دەکات لەکردەوەکانی دیکە و لەشتە کەم بەهاکان، شوێنکەوتەی فەرمانەکانی ئەو بن. لەشەیتان بۆ دینەکەی خۆتان بترسن.

ئەی خەڵکینە، لەبیرکردنەوەی زیادەکان کوفرە تا مانگێك لەساڵێك حەلاڵ و لەساڵێکی دیکە حەرام بۆ ئەوەی ژمارەی موحەرەمەکانی خواوەند تەواو و حەرامی خواوەند حەلاڵ و حەلاڵەکەی حەرام بکەن. زەمان بەو شێوەی رۆژی ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی، دەسووڕێتەوە و ژمارەی مانگەکان لای خواوەند و لەکتێبی خواوەند دوانزە مانگە، چوار مانگی حەرامە، سێ مانگی لەدوای یەك و رەجەبی موزێر کە لەنێوان جومادی و شەعباندایە.

بەلاّم دواتر: ئەی خەڵکینە مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیە وئەوانیش بەهەمان شێوە، مافی ئێوە لەسەر ژنەکانتان ئەوەیە ئەو کەسەی بێزارن لێی، لەسەر فەرشی ئێوە دانەنیشێنن و کارە قێزەون و ناڕەواکان ئەنجام نەدەن و ئەگەر ئەو کارەیان ئەنجامدا، خواوەند رێگەی پێداون هاوجێگەیی ئەوان نەکەن و بەشێوەیەکی نەزۆر سەخت لێیان بدەن، ئەگەر دەستیان هەڵگرت، رۆژی و پۆششی ئەوان لەسەر ئێوە پێویستە. لەگەڵ ژنەکانتان بەشێوەیەکی نەرم ونیان هەڵسوکەوت بکەن چوونکە لەدەستی ئێوەدا ئەسیرن و دەسەلاّتییان نییە. ئەوان وەك ئەمانەتی خوا لەدەستی ئێوەدان و بەهۆی وشەکانی خواوەند حەلاّلن بۆتان.

ئەی خەڵکینە، گوێ لەوتەکانی من بگرن چوونکە ئاگادارم کردنەوە، شتێکم بۆ ئێوە بەجێهێشت ئەگەر پشتی پێببەستن، هیچ کات گومڕا نابن، کتێبی خوا و سوونەتی پێغەمبەری خوا.

ئەی خەڵکینە، ببیستن چوونکە ئاگادارم کردنەوە، تێبگەن، هەر موسوڵمانێك برای موسوڵمانێکی دیکەیە، موسوڵمانان بران و بۆ هیچ کەس ماڵی براکەی حەلاڵ نییە مەگەر ئەوەی بەرەزامەندی خۆی پێی ببەخشێت. ستەم لەیەك مەکەن، خواوەندا، ئایا ئاگادارم کردنەوە؟

دەڵێت: خەڵکان وتیان: بەڵێ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خوایە شایەت بە؟

عوباد کوڕی عەبدوڵلە کوڕی زوبەیر دەڵێت: ئەو کەسەی وتەکانی پێغەمبەری

بەدەنگی بەرز بەخەڵکان دەگەیاند، رەبیعە کوڕی ئومەییە کوڕی خەلەف بوو. دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت بڵێ: ئەی خەڵکینە دەزانن، ئەمە چ مانگێکە؟

وتیان: مانگی حەرامە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی، بڵێ: خوا خوێن و سامانی ئێوەی وەك ئەم مانگە بۆ یەك حەرام کردووە.

دوای ئەوە وتی: بڵێ پێغەمبەر(د.خ) دەفەرمێت: ئەی خەڵکینە دەزانن ئەم چ مانگێکە؟

رەبیعە بەدەنگی بەرز ئەمەی وت و خەڵکان وتیان: مانگی حەرامە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڵێ، خوێن و ماڵەکانتان وەك ئەم مانگە بۆ یەك حەرامە تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە لای پەروەردگار.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بڵێ: دەزانن ئەمڕۆ چ رۆژێکە؟

رەبیعە ئەمەی وت و خەڵکان وتیان: رۆژی حەجی ئەکبەرە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی:پێغەمبەر(د.خ) ماڵ و سامانی ئێوەی وەك ئەم رۆژە بۆیەك حەرام کردووە تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگار.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەعەرەفە وەستا، ئەو کێوەی لەوێ وەستابوو بەمەوقیف ناوی بردو هەمو عەرەفە مەوقیفە. بەرەبەیانی موزدەلیفە لەقەزەح وەستا و فەرمووی: ئێرە مەوقیفە. و هەموو موزدەلیفە مەوقیفە و کاتێك لەشوێنی قوربانی کردن قوربانی کرد، وتی: ئێرە قوربانگەیە و هەموو مەنی قوربانگەیە.

پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەرێ و رەسمەکانی حەج هێنا و خەڵکانی فێر کردو روونی کردەوە چ شتێك لەکاتی حەج کردن حەلاڵ و چ شتێك حەرامە. ئەمە حەجی ماڵئاوایی بوو چوونکە پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەوەی حەجی نەکرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ژمارەی ئەو غەزوانەی پێغەمبەر(د.خ) بەشداری تیا کرد بیست و شەش دانەیە و بەوتەیەك بیست و حەوت. ئەو کەسەی دەڵێت بیست و شەشە، غەزوەی خەیبەر و غەزوەی وادی ئەلقورا کە لەخەیبەرەوە بەرێکەوت، بەیەك غەزوە دەزانێت چوونکە دوای کۆتایی هاتن لەشەڕی خەیبەر نەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و لەوێوە بەرەو وادی ئەلقورا بەرێکەوت و ئەم دوو غەزوەیان بەیەك غەزا لەقەڵەمدا.

ئەوکەسەی دەڵێت بیست و حەوتە، خەیبەر بەغەزوەیەکی جیاواز لەوادی ئەلقورا

دەزانێت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هەموو ئەو غەزوانەی پێغەمبەر(د.خ) خۆی بەشداری تیا کرد، بیست و شەش دانەیە. یەکەم غەزای ئەو لەوەدان کەپێی دەڵێن غەزوەی ئەبوا.

دوای ئەو غەزوەی لەوات لەلای رەزەوی لەدۆڵی یەنبەع.

غەزوەی بەدری یەکەم کەشوێن کورز کوڕی جابری فیهری کەوت.

غەوزەی بەدری گەورە کەسەرکردەکانی قوڕیشی تیاکوژرا و ژمارەیەکی زۆریان ئەسیر کران.

غەزوەی مناڵەکانی سولەیم کەتا کدر پێشڕەوی کرد. کدر ناوی یەکێك لەچاڵاوەکانی مناڵەکانی سولەیمە.

غەزوەی سوەیق کە بەمەبەستی شوێن کەوتنی ئەبوسوفیان تا قرقرە ئەلکەدر پێشڕەوی کرد.

غەزوەی غەتەفان کەرووی کردە نەجد و بەغەزوەی زی ئەمر بەناوبانگە.

غەزوەی بوحران کە ناوی یەکێك لەکانەکانی حیجازە.

غەزوەی ئوحود.

غەزوەی حەمرا ئەلئەسەد.

غەزوەی مناڵەکانی نەزیر.

غەزوەی زات ئەلرقاع کەهێرشی کردە سەر نەخل.

غەزوەی بەدری کۆتایی.

غەزوەی دومەئەلجەندەل.

غەزوەی خەندەك.

غەزوەی مناڵەکانی قورەیزە.

غەزوەی مناڵەکانی لەحیانی هوزەیل.

غەزوەی زیقەرد.

غەزوەی مناڵەکانی موستەلیقی خوزاعی.

غەزوەی حوّدەیبییە. پێغەمبەر(د.خ) لەم سەفەرەدا مەبەستی جەنگی نەبوو بەڵام ناباوەڕان رێگەیان لیٚ بەست.

غەزوەی خەیبەر.

عەمرە ئەلقەزا.

غەزوەی گرتنی مەککە.

غەزوەی حەنین.

غەزوەی تاییف.

غەزوەی تەبوك.

پێغەمبەر(د.خ) لەنۆ غەزوەدا خۆی شەڕی کرد کەبەدر و ئوحود و خەندەك و قوڕەیزە و موستەلیق و خەیبەر و گرتنی مەککە و حەنین وتاییفە.

محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی سەهل دەڵێت: هەموو شەڕەکانی پێغەمبەر(د.خ) بیست و شەش دانەیە.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: شەڕەکانی پێغەمبەر(د.خ) ناسراوە و سەبارەت بەوان بۆچوونەکان وەك یەکە. کەس لەژمارەی ئەوان جیاوازی نییە و بیست و حەوت دانەیە. ئەگەر جیاوازی هەبێت سەبارەت بەپێش و پاشی ئەوانە.

لە عەبدوللە کوڕی عومەریان پرسی: پێغەمبەر(د.خ) لەچەند شەڕدا بەشداری کرد؟

وتی: بیست و حەوت.

وتیان: لەچەند دانەیان بەشدار بوویت.

وتی: بیست و یەك دانە. یەکەمیان خەندەك. بەشداری شەش غەزوەم نەکرد هەرچەند تامەزرۆی بەشداری کردن و هەموو جارەکان داوام لە پێغەمبەر(د.خ) دەکرد بەڵام رازی نەدەبوو تا ئەوەی لەشەڕی خەندەك مۆڵەتی پێدام.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەیانزە غەزوەدا خۆی شەڕی کرد. نۆ غەزوەیان ئەوانەن لەکوڕی ئیسحاق باسمان کرد و دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) لەغەزوەی وادی ئەلقوڕا شەڕی کرد و کۆیلەکەی بەتیر کوژرا.

دەڵێت: لەغەزای غابە شەڕی کرد و چەند کەسێکی کوشت و لەم رۆژەدا موحریز کوڕی نەزلە کوژرا.

سەبارەت بەژمارەی ئەو سوپایانەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ شەڕ ڕەوانەی کردن بۆچوونەکان جیاوازە.

عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەو کاتەی هاتە ناو مەدینە تا گرتنی مەککە، سی وپێنج سوپای بۆ شەڕ ڕەوانە کرد.

سوپای عوبەید کوڕی حارسی بۆ ئەحیا نارد کەچاڵێکە لەسەنییەت ئەلمورە.

سوپای حەمزە کوڕی عەبدولموتەلیب کە بۆعەیس لەکەناری دەریا ڕەوانەی کرد.

دەستەیەك شەڕی حەمزە پێشتر لەشەڕی عوبەیدە دەزانن.

شەڕی سەعد کوڕی وەقاس لەخەراری حیجاز.

شەڕی عەبدولله کوڕی جەحش لەلای نەخلە.

شەڕی زەید کوڕی حارسە لەقردە، یەکێك لەچاڵەکانی نەج.

شەڕی مورسەد کوڕی ئەبی مورسەدی غەنەوی لەرەجیع.

شەڕی مونزەر کوڕی عەمرۆ لەبئر مەعوونە.

شەڕی باوکی عوبەیدەی جەراح لەزوئەلقسە لەسەر ڕێگەی عێراق.

شەڕی عومەر کوڕی خەتاب لەتوربە لەسەرزەمینی مناڵەکانی عامر.

شەڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەیەمەن.

شەڕی غالیب کوڕی عەبدوللەی کەلبی لەیسی لەکەدید کە لەمەلوح کوژرا.

شەڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای مناڵەکانی عەبدولله کوڕی سەعد لەخەڵکانی فەدەك.

شەڕی باوکی عەوجای سولەمی لەسەرزەمینی مناڵەکانی سولەیم کەخۆی و هاوەڵانی هەموویان کوژران.

شەڕی عوکاشە کوڕی موحسن لەغومرە.

شەڕی باوکی سەلمە کوڕی عەبدئەسوەد لەقەتنی نەجد یەکێك لەچاڵاوەکانی مناڵەکانی ئەسەد و لەم شەڕەدا مەسعود کوڕی عوروە کوژرا.

شەڕی محەممەد کوڕی موسلیمەی حارسی لەقەرتای هەوازین.

شەڕی بەشیر کوڕی سەعد لەسەرزەمینی مناڵەکانی مورە لەفەدەك.

شەڕی بەشیر کوڕی سەعید لەیەمەن و جەناب، و بەوتەیەك جەبار لەسەرزەمینی خەیبەر.

شەڕی زەید کوڕی حارسە، لەجەموم، سەرزەمینی مناڵەکانی سولەیم.

شەڕی زەید کوڕی حارسە لەگەڵ هۆزی جوزام لەسەرزەمینی حەسمی.

شەڕی زەید کوڕی حارسە لەوادی ئەلقورا کەرووبەرووی مناڵەکانی فەزارە بوویەوە.

دوو شەڕی عەبدولله کوڕی رەواحە و هەردووکیان لەخەیبەر و لەیەکێك لەشەڕەکان یەسیر کوڕی رەزامی کوشت.

داستانی یەسیری کوڕی ڕەزامی جوولەکە بەمشێوەیە: ئەو نیشتەجێی خەیبەر و خەڵکانی غەتەفانی بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆدەکردەوە. پێغەمبەر(د.خ) عەبدوللە کوڕی ڕەواحە و دەستەیەك لەموسوڵمانانی ڕەوانە فەرموو. عەبدوللە کوڕی ئەنیس هاوپەیمانی مناڵەکانی سەلمە لەناویاندا دەبینرا.

کاتێك عەبدوللە و سوپاکەی ڕۆشتنە لای، گفتوگۆیان لەگەڵ کرد و بەڵێنیان پێدا و وتیان: ئەگەر بێیتە لای پێغەمبەر(د.خ)، کارێکت پێدەسپێرێت ورێزت دەگرێت. زۆریان قسە کرد تا ئەوەی لەگەڵ دەستەیەك لەجوولەکەکان لەگەڵیان بەرێکەوت. عەبدوللە کوڕی ئەنیس ئەوی لەریزی خۆی سواری وشتر کرد. کاتێك گەیشتنە شەش میلی خەیبەر و شوێنێك بەناوی قرقرە، یەسیر کوڕی ڕەزام لەڕۆشتن بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) پەشیمان بوویەوە. عەبدوللە هەستی پێکرد و دەستی بۆ شمشێر برد و قاچی قرتاند. یەسیر بەداردەستەکەی دەستی لەسەری عەبدوللەی دا و شکاندی. هەرکام لەموسوڵمانان هێرشیان کردە سەر جوولەکەی تەنیشتی و ئەوانیان کوشت جگە لەیەك کەس کە سوار لەسەر چوارپێکەی خۆی هەڵات.

کاتێك عەبدوللە کوڕی ئەنیس گەیشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، تفی کردە سەر برینەکەی. چڵکی نەکرد و چاك بوویەوە.

شەڕی عەبدوللە کوڕی عەتیك لەخەیبەر کەباوکی ڕافیعی کوشت. هەروەها پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان بەدر و نۆحۆد محەممەد کوڕی موسلیمەی لەگەڵ چەند کەسێك لەموسوڵمانان بۆ کوشتنی کەعب کوڕی ئەشرف ڕەوانە کردو ئەویان کوشت. هەروەها عەبدوللە ئەنیسی بۆ کوشتنی خالید کوڕی سوفیان کوڕی نەبیحی هوزەلی ڕەوانە کرد کە لەنەخلە یا عەرەفە خەڵکانی بۆ شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆدەکردەوە. عەبدوللە ئەوی کوشت.

عەبدوللە کوڕی ئەنیس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردم و فەرمووی: بیستوومە خالید کوڕی سوفیان خەڵك کۆدەکاتەوە تا شەڕ لەگەڵ ئێمە بکات. ئێستا لەنەخلە یا عەرەفەیە، بڕۆ و بیکوژە.

دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، تایبەتمەندییەکانی باس بکە تا بتوانم بیناسمەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتێك دەیبینیت، شەیتانت بیر دەخاتەوە. نیشانەکەی ئەوەیە کاتێك بیبینیت، لەرزینێك لەجەستەی خۆت هەست پێدەکەیت.

دەڵێت: شمشێرم هەڵگرت و بەرێکەوتم. خالیدم بینی چەندین ژنی لەگەڵدا بوو. بەدوای شوێنێك بۆ نیشتەجێ کردنی ئەوان دەگەڕا. دمەو ئێواریێ بوو. کاتێك ئەوم بینی، بەهەمان شێوە پێغەمبەر(د.خ) فەرموو بووی، لەرزینێکم لەجەستەی خۆمدا هەست پێکرد. بۆ لای ئەو بەرێکەوتم. دەترسام شەڕ لەگەڵ ئەو ببێتە هۆی ئەوەی نوێژەکەم بفەوتێت. لەکاتی ڕۆشتن بەسەر نوێژەکەم خوێند. کاتێك لێی نزیك بوومەوە، پرسی: کێیت؟

وتم: یەکێك لەعەرەبەکان، بیستوومە خەڵکان بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو پیاوە کۆدەکەیتەوە. منیش هاتووم.

وتی: بەڵێ، بەو کارەوە سەرقاڵم.

کەمێك پیاسەمان کرد و کاتێك دەرفەتم دەستکەوت، بەشمشێر کوشتم. گەڕامەوە. ژنەکانی گەیشتنە سەری. کاتێك گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، سڵاوم کرد، سەیری کردم و فەرمووی: سەرکەوتوو بوویت؟

وتم: بەڵێ. کوشتم.

فەرمووی: ڕاست دەکەیت.

پێغەمبەر(د.خ) هەستاو گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. کاتێك گەڕایەوە، داردەستێکی پێدام و فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵە، ئەم داردەستە بگرە و با هەمیشە پێت بێت.

دەڵێتك داردەستەکەم وەرگرت و گەڕامەوە بۆ لای کەسەکانی خۆم، وتیان: ئەم داردەستەت لەکوێوە هێناوە؟

وتم: پێغەمبەر(د.خ) پێی بەخشیم و فەرمووی هەمیشە پێم بێت.؟

وتیان: بڕۆ بپرسە بۆچی داردەستەکەی بەتۆدا؟

گەڕامەوە و وتم: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، بەچ مەبەستێك داردەستەکەت بەمندا؟

فەرمووی: بۆ ئەوەی لەرۆژی هەستانەوە لەنێوان من و تۆ نیشانە بێت چوونکە لەو رۆژەدا ئەوانی داردەستیان بەدەستەوەیە، ژمارەیان کەمە.

عەبدوڵڵە کوڕی ئەنیس داردەستەکەی پەیوەستی شمشێرەکەی خۆی کرد و تا کاتی مەرگ پێی بوو. وەسیەتی کرد داردەستەکە بخەنە ناو گۆڕەکەی.

شەڕی زەید کوڕی حارسە و جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب و عەبدوڵڵە کوڕی ڕەواحە لەمووتەی شام.

شەڕی کەعب کوڕی عومەیری فەغاری لەزات ئیتلاحی شام کە لەگەڵ هاورێکانی

خۆی لەوێ کوژران.

شەڕی عۆیەیینە کوڕی حوسن لەگەڵ منداڵەکانی ئەلعەنبەر و منداڵەکانی تەمیم. پێغەمبەر(د.خ) عۆیەیینەی بۆ لای ئەم تایەفە ڕەوانە فەرموو، کەسانێکی زۆری کوشت و چەندین کەسی لێ ئەسیر کردن.

عایشە دەڵێت: بەپێغەمبەرم وت: نەزرم کردووە یەکێك لەکۆیلەکانی منداڵەکانی ئیسماعیل ئازاد بکەم.

فەرمووی: ئەسیرەکانی منداڵەکانی عەنبەر دەگەن، یەکیان بەتۆ دەبەخشم تا ئازادی بکەیت.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەسیرەکان گەیشتنە مەدینە، نێردراوانی منداڵەکانی تەمیم و لەناویان ڕەبیعە کوڕی ڕەفیع و سەبرە کوڕی عەمرۆ وقەعقاع کوڕی مەعبەد و وەردان کوڕی موحریز و قەیس کوڕی عاسم و مالك کوڕی عەمرۆ و ئەقرەع کوڕی حابس و حەنزەلە کوڕی دارم و فەراس کوڕی حابس بۆ ئازاد کردنی ئەوان ڕۆشتنە لای پێغەمبەر(د.خ). لەناو ژنە ئەسیرەکان ئەسما کچی مالك و کاس کچی ئەری و نەجوە کچی نەهد و جومەیعە کچی قەیس و عەمرە کچی مەتەر دەبینران.

شەڕی غالیب کوڕی عەبدوڵلەی کەلبی لەیسی لەسەرزەمینی منداڵەکانی مورە و لەم شەڕەدا مێرداس کوڕی نەهیك بەدەستی زەید کوڕی حارسە و یەکێك لەئەنسارییەکان کوژرا. پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەو بەزەیدی وت: بۆ کەسێکت کووشت کەوتی لا اله الا الله؟

شەڕی عەمرۆ کوڕی عاس لەزات ئەلسلاسل.

شەڕی کوڕی ئەبی حەدرەد و هاوڕێکانی لەدۆڵی ئەزەم.

شەڕی عەبدوڵلە کوڕی ئەبی حەدرەد لەبیشە.

شەڕی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف.

شەڕی باوکی عوبەیدەی جەراح لەکەنار دەریا و بەشەڕی خەبت ناوی دەرکرد.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: هەموو غەزاکانی پێغەمبەر(د.خ) و ئەو دەستە شەڕکەرانەی ڕەوانەی فەرموو، چل و هەشت دەستەیە.

واقدی دەڵێت: لەساڵی دەیەم لەمانگی ڕەمەزان جەریر کوڕی عەبدوڵلەی بێجلی هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی هێنا. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ وێران کردنی بتی

زونەلخەسە ڕەوانە فەرموو.

دەڵێت: لەم ساڵەدا وەبر کوڕی یەحنس ڕۆشتە لای گەورەکانی یەمەن و پێشنیاری ئیسلامی پێکردن و لای کچەکانی نەعمان کوڕی بەرزج دابەزین. ئەوان موسوڵمان بوون و کەسیان بۆ لای فیروزی دەیلەمی نارد تا باوەڕ بەئیسلام بێنێت و باوەڕی هێنا هەروەها مەرکبود و عەتا کوڕی وەهب کوڕی مونەبە باوەڕیان بەئیسلام هێنا. یەکەم کەسان لەیەمەن قورئانیان کۆکردەوە، عەتا کوڕی مەرکبود و وەهب کوڕی مونەبە بوون.

لەم ساڵەدا لەیەمەن بازان لێپرسراوی فارسەکان لەو وڵاتە باوەڕی بەئیسلام هێنا و کەسی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و لەموسوڵمان بوونی خۆی ئاگاداری کردەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کەسانی دیکە لەگەڵ عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر و ئەوانەی غەزاکانی پێغەمبەر(د.خ) بەبیست و شەش دەزانن، بۆچوونیان یەك ناگرێتەوە.

باوکی ئیسحاق دەڵێت: لەزەید کوڕی ئەرقەمم بیست: پێغەمبەر(د.خ) لەنۆزدە غەزا بەشداری کرد و دوای کۆچ تەنیا حەجی ماڵئاوایی کرد.

دەڵێت: لەزەیدم پرسی: لەچەند غەزا لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بوویت؟

وتی: حەفدە.

وتم: یەکەم غەزا چی بوو؟

وتی: غەزای زات عەسیر یا زات عەشیر.

واقدی دەڵێت: ئەمە هەڵەیە. من ئەم حەدیسەم بۆ عەبدوللە کوڕی جەعفەر گێڕایەوە و وتی: گێڕانەوەی دانیشتووانی عێراق بەو شێوەیە بەڵام یەکەم غەزای زەید کوڕی ئەرقەم مەریسیعە. ئەو گەنجێکی تازەپێگەیشتوو و لەغەزای مووتە لەگەڵ من و عەبدوللە کوڕی ڕەواحەدا بوو. لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) زیاتر لەسێ یا چوار غەزوە بەشداری نەکرد.

مەکحول دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) هەژدە غەزاو لەهەشتیان خۆی شەڕی کرد. بەدر و ئوحود و ئەحزاب و قورەیزە لەوان بوون.

واقدی دەڵێت: حەدیسی زەید کوڕی ئەرقەم و حەدیسی مەکحول هەردووکیان هەڵەیە.

## حەجی ماڵئاوایی

جابر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سێ حەجی کرد، دووانیان پێش کۆچ و یەکیان دوای کۆچ، عەمرەیەکیشی لەگەڵ حەجەکانی ئەنجامدا.

عەبدوللە کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پێش ئەوەی حەج بکات، دوو عەمرەی ئەنجامدا.

کاتێك عایشە ئەمەی بیست، وتی: پێغەمبەر(د.خ) چوار عەمرەی کرد.

موجاهید دەڵێت: بیستم کوڕی عومەر دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) چوار جار عەمرەی کرد. کاتێك عایشە ئەمەی بیست، وتی: کوڕی عومەر دەزانێت پێغەمبەر(د.خ) چوار عەمرەی کرد و یەکیان لەگەڵ حەجدا بوو.

گێڕانەوەیەکی دیکە لەموجاهید دەگێڕنەوە: من و عوروە کوڕی زوبەیر ڕۆشتینە مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) و عەبدوللە کوڕی عومەر لای حوجرەکەی عایشە دانیشتبوو، پێمان وت: پێغەمبەر(د.خ) چەند عەمرەی کرد؟

وتی: چوار عەمرەی کرد و یەکیان لەمانگی رەجەبدا بوو. نەمویست وتەکانی ئەو بەدرۆ بخەمەوە. جووڵەی عایشەمان لەژوورەکەی خۆیەوە بیست، عوروە وتی: ئەی دایەگیان، ئەی دایکی باوەڕداران، وتەکانی باوکی عەبدولرەحمان دەبیستیت؟

عایشە وتی: چی دەڵێت؟

وتی: دەڵێت پێغەمبەر(د.خ) چوار عەمرەی کرد و یەکیان لەمانگی رەجەب بوو.

عایشە وتی: خواوەند باوکی عەبدولرەحمان ببەخشێت، لەهەموو عەمرەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە بوو، لەمانگی رەجەب عەمرەی نەکرد.

## هاوسەرەکانی پێغەمبەر(د.خ)

ئەوانەی دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) هاوسەری بوون و ئەوانەی لەدەورانی ژیان لێی جیابوونەوە و هۆکارەکانی جیابوونەوەیان و ئەوانەی پێش پێغەمبەر(د خ) مردن.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پانزە ژنی کردە هاوسەری خۆی. سیانزەیانی بردە ماڵەکەی خۆی و لەیەك کاتدا یانزە ژن هاوسەری بوو. لەکاتی مردن، نۆ ژنی بوو.

لەرۆژگاری جاهلییەت لەتەمەنی بیست و چەندساڵی، خەدیجە کچی خوەیلد کوڕی ئەسەد کوڕی عەبدولعوزای کردە هاوسەر، ئەو یەکەم ژنی پێغەمبەر(د.خ) بوو. پێشتر ژنی عەتیق کوڕی عابدی مەخزومی بوو. دایکی خەدیجە فاتیمە کچی زائیدە کوڕی ئەسەم بوو. کچێکی بۆ عەتیق هێنایە دنیا و عەتیق مرد.

دوای عەتیق، خەدیجە بوو بەهاوسەری باوکی هالە کوڕی زەرارە کوڕی نەباش. هیند کوڕی ئەبی هالەی هێنایە دنیا. دوای ئەو، باوکی هالە مرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) خەدیجەی کردە هاوسەری خۆی، منداڵەکانی باوکی هالە لای ئەو دەژیا.

خەدیجە هەشت منالی بۆ پێغەمبەر(د.خ) هێنایە دنیا: قاسم و تەییب و تاهیر و عەبدولله و زێنەب و روقییە و دایکی کولسوم و فاتیمە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: تا خەدیجە زیندوو بوو، پێغەمبەر(د.خ) کەسی دیکەی نەکردە هاوسەری خۆی. و کاتێك مرد، پێغەمبەر(د.خ) ژنی دیکەی هێنا. سەبارەت بەیەکەم ژن ودوای خەدیجە بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە عایشە کچی ئەبوبەکر، دەستەیەکی دیکە دەڵێن: سوودە کچی زەمعە کوڕی قەیس.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) عایشەی وەك هاوسەر هەڵبژارد، منالْ و شیاوی پەردە نەبوو. سودە بێوەژن و پێش پێغەمبەر(د.خ) شووی کردبوو. مێردەکەی سەکران کوڕی عەمرۆ کوڕی عەبد شەمس بوو. سەکران یەکێك بوو لەو موسوڵمانانەی بۆ حەبەشە کۆچیان کرد و لەوێ باوەڕی بەئاییني مەسیحی هێنا و مرد. پێغەمبەر(د.خ) لەمەککەی سوودی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەنێوان زاناکانی شارەزای ژیانی پێغەمبەر(د.خ) جیاوازی نییە لەوەی کە پێغەمبەر(د.خ) سوودەی پێش عایشە بردە ماڵی خۆی.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەهاوسەرگیری پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ عایشە و سوودە

عایشە دەڵێت: کاتێك خەدیجە مرد و پێغەمبەر(د.خ) هێشتا لەمەککە بوو، خەولە کچی حەکیم کوڕی ئومەییە کوڕی ئەوقس ژنی عوسمان کوڕی مەزعون پێی وت:ئەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ژن ناهێنیت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کێ بێنم؟

وتی: ئەگەردەخوازیت کچ و ئەگەر دەخوازیت ژن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کچ وەك کێ؟

وتی: کچی کەسێك کەزیاتر لەهەموو خەڵکانت خۆش دەوێت، عایشە کچی ئەبوبەکر.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی بێوەژن؟

وتی: سوودە کچی زەمعە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: برۆ و قسەیان لەگەڵ بکە.

دەڵێت: خەولە ڕۆشتە ماڵی ئەبوبەکر و دایکی رۆمان دایکی عایشەی بینی، وتی: خواوەند خێر و بەرەکەتی بۆ ئێوە ناردووە.

دایکی رۆمان وتی: مەبەستت چییە؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ) منی ناردووە تا خوازبێنی عایشە بکەم.

دایکی رۆمان وتی: من رازیم، چاوەڕێ بە تا ئەبوبەکر دەگەڕێتەوە.

کاتێك ئەبوبەکر گەڕایەوە، خەولە پێی وت: ئەی ئەبوبەکر، خواوەند خێر و بەرەکەتی پێبەخشیبوون. پێغەمبەر(د.خ) منی ناردووە تا خوازبێنی عایشەی بۆ بکەم.

وتی: مەگەر عایشە شیاوەبۆ ئەو، عایشە کچی برای ئەوە.

خەولە کاتێك ئەمەی بیست، بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە و لەوتەکانی ئەبوبەکر ئاگاداری کردەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: برۆ پێی بڵێ تۆ لەموسوڵمانیدا برای منیت و من برای تۆم و کچەکەی تۆ شیاوە بۆمن.

خەولە گەڕایەوە و ئەبوبەکری لەوتەکانەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار کردەوە.

ئەبوبەکر وتی: چاوەڕێ بە تا دەگەڕێمەوە.

دایکی رۆمان بەخەولەی وت: موتعیم کوڕی عودەی داوای عایشەی کردووە بۆ کوڕەکەی خۆی و ئەبوبەکر هیچ کات لەبەڵێنەکەی خۆی پەشیمان نابێتەوە.

ئەبوبەکر ڕۆشتە لای موتعیم کوڕی عودەی. ژنی موتعیم و دایکی ئەو کوڕەی عایشەی بۆ ئەو ناو بردبوو، لای ئەو دانیشتبوون. وتی: ئەی کوڕی ئەبوبەکر ئەگەر کچەکەی تۆ بکەینە ژنی کوڕەکەمان، دینەکەی دەگۆڕێت.

ئەبوبەکر رووی کردە موتعیم وتی: تۆ چی دەڵێیت؟

موتعیم وتی: ئەو وا دەڵێت.

ئەبوبەکر گەڕایەوە و پەیمانەکەی نێوانیان هەڵوەشایەوە. بەخەولەی وت:

پێغەمبەر(د.خ) بانگێشت بکە.

خەولە پێغەمبەری بانگێشت کرد. هات و عایشەی مارە کرد. لەو کاتەدا تەمنیا تەمەنی شەشساڵ بوو.

دەڵێت: دوای ئەو خەولە ڕۆشتە لای سوودە و وتی: سوودە، خواوەند خێر وبەرەکەتی بۆ تۆ دەوێت.

وتی: مەبەستت چییە؟

خەولە وتی: پێغەمبەر(د.خ) منی ناردووە تا خوازبێنی تۆ بکەم.

وتی: ڕازیم، لەگەڵ باوکم قسە بکە.

خەولە دەڵێت: باوکی سوودە، پیرێکی پەککەوتە بوو. ڕۆشتمە لای و هاوشێوەی ڕۆژگاری جاهلییەت سلاوم کرد، وتم: محەممەد کوڕی عەبدوللە کوڕی عەبدولموتەلیب منی ناردووە تا خوازبێنی سوودەی بۆ بکەم.

وتی: کەسێکی گەورەیە، کچەکەم دەڵێت چی؟

وتم: ڕازییە.

وتی: بانگی بکە.

دەڵێت: سوودەم بانگ کرد وپێی وت: سودە خەولە دەڵێت محەممەد کوڕی عەبدوللە ئەوی بۆ خوازبێنی کردنی تۆ ناردووە، کەسێکی ڕێزدارە و دەتەوێت ببیتە هاوسەری ئەو؟

وتی: بەڵێ.

وتی: محەممەد بێنە لای من.

دەڵێت: خەولە محەممەدی بردە لای و سوودەیان مارە کرد.

کاتێك عەبد کوڕی زەمعە مامی سوودە کە بۆحەج ڕۆشتبوو، گەڕایەوە، نارازی و خۆڵی دەکرد بەسەری خۆیدا و دواتر کاتێك باوەڕی هێنا، دەیوت: ئەو ڕۆژەی خۆڵەم دەکرد بەسەری خۆمدا لەبەر ئەوەی سوودە ببوو بەهاوسەری پێغەمبەر(د.خ)، نەزان بووم.

عایشە دەڵێت: کاتێك ڕۆشتینە مەدینە، ئەبوبەکر لەسەنح، گەڕەکی منداڵەکانی حارس کوڕی خەزرەج دابەزی. ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) هاتە ماڵی ئێمە. چەند کەسێك لەپیاوەکانی ئەنسار و چەند ژنێکی لەگەڵدا بوو. دایکم هات. دایکم منی هێنا، ڕوخساری شۆردم و سەرپۆشێکی دا بەسەرما. منی بەراکێشان برد و کاتێك گەشتینە

لای دەرگاکە، کەمێك وەستا تا ئارام بووینەوە. ڕۆشتمە ناو. پێغەمبەر(د.خ) لەژوورەکەی ئێمە لەسەر تەختێك دانیشتبوو.

دەڵێت: منی لای ئەو دانیشاند و وتی: ئەمە بنەماڵەی تۆیە، خواوەندا پیرۆزیان بێت و تۆیش بۆ ئەوان پیرۆز بکات. پیاو و ژنان ڕۆشتن و پێغەمبەر(د.خ) لەماڵی خۆمان لەگەڵ من خەوت. نەوشترێکی کوشت، نەبزنێکیان سەربڕی. تەمەنم حەوت ساڵ بوو. سەعد کوڕی عوبادە ئەوکاسەی ڕۆژانە دەینارد بۆ ماڵی پێغەمبەر(د.خ)، ناردی بۆ ماڵی ئێمە.

عوروە کوڕی زوبەیر بەمشێوەیە بۆ عەبدولمەلیك کوڕی مەروانی نووسی: سەبارەت بەخەدیجە کچی خوەیلد پرسیارت کرد تا کاتی مردنی بزانیت؟ مردنی ئەو سێ ساڵ یا نزیك لەسێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەر(د.خ) بوو و دوای مردنی خەدیجە عایشەی مارە کرد. پێغەمبەر(د.خ) دووجار عایشەی بینیبوو، پێیان دەوت، ئەوە هاوسەری تۆیە. عایشە تەمەنی شەش ساڵ بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) بۆ مەدینە کۆچی کرد، عایشەی بردە ماڵەکەی خۆی و لەو کاتەدا تەمەنی عایشە نۆ ساڵ بوو.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عایشە کچی ئەبوبەکری وەك هاوسەر هەڵبژارد. ناوی ئەبوبەکر عەتیق و ئەو کوڕی ئەبی قوحافە عوسمان بوو. پێغەمبەر(د.خ) سێ ساڵ پێش کۆچ عایشەی مارە کرد. لەو کاتەدا تەمەنی حەوت ساڵ بوو. دوای کۆچ بۆ مەدینە لەمانگی شەوال لەگەڵ ئەو ڕۆشتە پەردە. ئەو کاتە تەمەنی نۆساڵ بوو. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، تەمەنی هەژدە ساڵ بوو. تەنیا هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) کەکچ بوو، عایشەیە.

دوای ئەو پێغەمبەر(د.خ) حەفسە کچی عومەر کوڕی خەتابی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

پێشتر حەفسە کچی خونەیس کوڕی حوزافەی سەهمی بوو. خونەیس لەشەڕی بەدر بەشداری کرد و مناڵی نەبوو. لەمناڵەکانی سەهم جگە لەو کەس بەشداری شەڕی بەدری نەکرد.

دوای ئەو، پێغەمبەر(د.خ) دایکی سەلمەی وەك هاوسەری هەڵبژارد.

ناوی ئەو هیند و کچی ئەبوئومەییە کوڕی موغەیرەی مەخزومی بوو. پێش ئەو ژنی باوکی سەلمە کوڕی عەبدئەسوەدی مەخزومی بوو. ئەویش بەشداری بەدری کرد و سوارچاکی موسوڵمانان بوو. لەڕۆژی ئوحوّد تیری بەرکەوت و کوژرا.

باوکی سەلمە کوڕە پووری پێغەمبەر(د.خ) و لەگەڵ ئەو شیری خواردبوو. دایکی بەرە کچی عەبدولموتەلیب و لەدایکی سەلمە، عەمرۆ و سەلمە و زێنەب و دوڕەی هێنایە دنیا. کاتێك باوکی سەلمە مرد، پێغەمبەر(د.خ) حەوتجار تەکبیری وت. وتیان: ئەمە هەڵە بوو یا بەهۆی لەبیر کردنەوە؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هیچیان. ئەگەر هەزار تەکبیر بۆ باوکی سەلمە بوترێت، کەمە.

پێغەمبەر(د.خ) دایکی سەلمەی دوای شەڕی خەندەك و لەساڵی سێیەمی کۆچ وەك هاوسەر هەڵبژارد. کچی حەمزە کوڕی عەدبولموتەلیبی کردە هاوسەری کوڕەکەی ئەو یانی سەلمە.

دوای ئەوە لەغەزای مەریسیع لەساڵی پێنجەمی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) جەویریە کچی حارس کوڕی ئەبی زەراری وەك هاوسەر هەڵبژارد. پێشتر ئەو هاوسەری مالك کوڕی سەفەوان بوو. مناڵیان نەهێنایە دنیا و لەناو ئەسیرەکانی شەڕی مەریسیع، بەپێغەمبەر برا. ئەوی ئازاد و دواتر کردی بەهاوسەری خۆی. جویریە داوای لە پێغەمبەر(د.خ) کرد ئەسیرەکانی خەڵکەکەی ئازاد بکات. پێغەمبەر(د.خ) بەداواکەی رازی و ئەسیرەکانی ئازاد کرد.

دوای ئەو، پێغەمبەر(د.خ) دایکی حەبیبە کچی ئەبوسوفیانی کردە هاوسەر. پێشتر هاوسەری عوبەیدالله کوڕی جەحش و لەگەڵ مێردەکەی بۆ حەبەشە کۆچی کردبوو. عوبەیدالله لەحەبەشە باوەڕی بەمەسیحیەت هێنا و داوای لەدایکی حەبیبە کرد ئەویش باوەڕ بێنێت بەلاّم رازی نەبوو. مێردەکەی وەك مەسیحی مرد و پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەهاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسی بۆ لای نەجاشی نارد و نەجاشی بەهاوەڵانی پێغەمبەری وت: کێ لەهەمووان زیاتر لەو نزیکە؟

وتیان: خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس.

نەجاشی بەخالیدی وت: دایکی حەبیبە وەك هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەستنیشان بکە. خالید ئەو کارەی کرد مارەیی ئەویان بەچوارسەد دینار خەملاّند.

بەوتەیەك پێغەمبەر(د.خ) دایکی حەبیبەی لەعوسمان کوڕی عەفان خوازبێنی کرد و کاتێك ئەوی مارە کرد، کەسی بۆلای نەجاشی نارد. نەجاشی مارەیی ئەویدا و ڕەوانەی مەدینەی کرد.

دوای ئەو زێنەب کچی جەحشی وەك هاوسەر هەڵبژارد. پێشتر زێنەب کچی زەید

کوڕی حارسە موالی و زڕ کوڕی پێغەمبەر(د.خ) بوو. خواوەند منالّی پێنەبەخشی و ئەم ئایەی ڕەوانە فەرموو:

((واذتقول للذی انعم الله علیه و انعمت علیه امسك علیك زوجك و اتق الله و تخفی فی نفسك مالله مبدیه و تخشی الناس و الله احق ان تخشاه فلما قضی زید منها و طرا زوجنا کها لکی لا یکون علی المؤمنین حرج فی ازواج ادعیائهم اذا قضوا منهن و طراو کان امر الله مفعولا.

واتاکەی: کاتێك بەو کەسەی خواوەند نیعمەتی پێبەخشیبوو و تۆییش نیعمەتت پێبەخشیبوو، وت جووتەکەی خۆت بپارێزە و لەخوا بترسە و ئەو شتەی خواوەند ئاشکراکەری بوو لەناخی خۆتدا حەشارت دەدا چوونکە لەخەڵکان دەترسایت و شیاو بوو لەخواوەند بترسیت. کاتێك زەید پشتی تێکرد، ئەومان کردە هاوسەری تۆ تا باوەڕداران سەبارەت زڕکورەکانیان کاتێك زڕکورەکانیان پشتیان تێدەکەن، هیچ لێپرسراویەتییەکیان نەبێت و فەرمانی خواوەند دەبێت ئەنجام بدرێت.))

خواوەند زێنەبی کردە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) و جبرەئیلی بۆ ئەو کارە ڕەوانە فەرموو. زێنەب شانازی بەسەر ژنەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەکرد و دەیوت: سەرپەرەستی من لەسەرپەرەستی ئێوە گەورەتر و نێردراوی من (خوازبێنیکەر) لەنێردراوی ئێوە ڕێزدارترە.

پێغەمبەر(د.خ) سەفییە کچی حەیی کوڕی ئەختەبی ئەزیری کردە هاوسەری خۆی. پێشتر ژنی سەلام کوڕی موشکەم بوو. کاتێك سەلام مرد بوو بەهاوسەری کەنانە کوڕی ڕەبیع کوڕی ئەبی ئەلحەقیق کە محەممەد کوڕی موسلیمە بەفەرمانی پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەگەڵ ئەسیرەکانی دیکەی منالّەکانی ئەزیر کوشت.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی خەیبەر ئەسیرەکانی دەبینی و عاباکەی خۆی دا بەسەفییەدا، تایبەت بوو بەو. پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئیسلامی پێکرد و باوەڕی هێنا. دواتر ئازادی کرد و ئەمە لەسالّی نۆیەمی کۆچ روویدا.

پێغەمبەر(د.خ) مەیموونە کچی حارس کوڕی حوزنی کردە هاوسەر. ئەو، پێشتر ژنی عومەیر کوڕی عەمرۆ، لەخەڵکانی منالّەکانی عەقدەی سەقیف بوو. منالّی نەهێنابوویە دنیا. مەیموونە خوشکی دایکی فەزلْ ژنی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەسەفەری عەمرەی قەزا لەسەرف کردە هاوسەر. عەباس کوڕی

عەبدولموتەلیب کاروبارەکانی هاوسەرگیری ئەو دووانەی لەئەستۆ گرت.

هەموو ئەو ژنانەی باسمان کرد تا کاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) زیندوو بوون جگە لەخەدیجە کەپێشتر لەمەککە مرد.

پێغەمبەر(د.خ) نەشات کوڕی ریفاعە لەمناڵەکانی کەلاب کوڕی رەبیعەی وەك هاوسەر هەڵبژارد. ئەم تایەفەیە هاوپەیمانی مناڵەکانی روفاعەی قورەیزە بوون.

سەبارەت بەم ژنە گێڕانەوەکان جیاوازە: دەستەیەك بەسەنا ناوی دەبەن و دەڵێن ئەسما کوڕی سەڵەتی سولەمی و دەستەیەك دەڵێن: ناوی سەبا و باوکی سەڵت کوڕی حەبیبە.

پێغەمبەر(د.خ) شەنبە کچی عەمرۆ غەفاری کردە هاوسەری خۆی. ئەم تایەفەیش هاوپەیمانی مناڵەکانی قورەیزە بوون. دەستەیەك وتوویانە شەنبا لەمناڵەکانی قورەیزە بوو و بەهۆی لەناوچوونی تایەفەکەی، ڕەچەڵەکی دیار نییە. دەستەیەك ئەوبەیەکێك لەژنەکانی کەنانە دەزانن.

کاتێك شەنبا ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، گرفتاری نەخۆشی مانگانە بوو. پێش ئەوەی پاك ببێتەوە، ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر(د.خ) مرد و شەنبا وتی: ئەگەر محەممەد پێغەمبەر دەبوو، خۆشەویستترین کەسی نەدەمرد. پێغەمبەر(د.خ) تەلاقیدا.

پێغەمبەر(د.خ) غەزییە کچی جابر لەتایەفەی مناڵەکانی بەکر کوڕی کەلابی وەك هاوسەر هەڵبژارد. پێغەمبەر(د.خ) باسی جوانی و ئەندام رێکی ئەوی بیستبوو. باوکی ئەسیدی ئەنساری ساعدی بۆ خوازبێنی کردنی ئەو نارد. کاتێك هاتە لای پێغەمبەر(د.خ)، تازە باوەڕی هێنابوو، وتی: من بەم کارە رازی نەبووم، لەتۆ پەنا بۆ خوا دەبەم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوەی پەنا بۆ خوا ببات، پارێزراوە. ئەوی بۆ لای کەسەکانی گەڕاندەوە. دەڵێن: لەهۆزی کێندە بوو.

پێغەمبەر(د.خ) ئەسما کچی نەعمان کوڕی ئەسوەد کوڕی شەراحیبیلی کێندی کردە هاوسەری خۆی و کاتێك لەگەڵ ئەو ڕۆشتە پەردە، سپیەتی لەجەستەی ئەودا بینی، کەرەستەی پێویستی پێدا و ئەوی بۆ لای کەسەکانی گەڕاندەوە. بەوتەیەك نەعمان ئەوی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد و تەلاقیدا. هۆکارەکەی ئەوە بوو کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لێی نزیك کەوتەوە، پەنای بۆ خوا برد. پێغەمبەر(د.خ) کەسی بۆ لای نەعمان نارد و پرسی: مەگەر ئەمە کچی تۆ نییە؟

نەعمان وەڵامی دایەوە: بۆنا.

لەئەسمای پرسی: ئایا تۆ کچی نەعمان نیت؟

ئەسما وتی: بەڵێ.

نەعمان بە پێغەمبەری وت: تەلاقی مەدە چوونکە بەمشێوە و بەو شێوەیە. زۆری وەسف کرد و وتی: هیچ کات گرفتاری نەخۆشی مانگانە نەبووە. پێغەمبەر(د.خ) تەلاقیدا و دیار نییە لەبەر وتەی ژنەکە بوو یا بەهۆی وتەی باوکی کەوتی هیچ کات گرفتاری نەخۆشی مانگانە نەبووە.

دوای ئەوە، خواوەند، رێحانە کچی زەیدی قورزەی وەك تالانی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی.

مەقوقس فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە ماریەی قیبیتی پێبەخشی و ئیبراهیمی هێنایە دنیا

ئەمانە هاوسەرەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون و شەشیان قورەیشیین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی هوشام کوڕی محەممەد باسی هاوسەرگیری پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ زێنەب کچی خەزیمە نەکراوە کەئەویان بەدایکی هەژاران ناو دەبرد و لەتایەفەی مناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە بوو. پێش پێغەمبەر(د.خ) ژنی توفەیل کوڕی حارس کوڕی موتەلیب، برای عوبەیدە کوڕی حارس بوو. لەمەدینە و لەماڵی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی کرد.

دەڵێن: لەکاتی ژیانی پێغەمبەر(د.خ) هیچ کام لەهاوسەرەکانی جگە لەخەدیجە و شەراف کچی خەلیفە خوشکی دەحیەی کەلبی و عالیە کچی زەبیان نەمردن.

کوڕی شیهابی زوهری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) عالیەی کردە هاوسەری خۆی. ئەو لەتایەفەی مناڵەکانی ئەبی بەکر کوڕی کەلاب بوو. دواتر مارەیی پێدا و تەلاقی دا.

پێغەمبەر(د.خ) هەروەها قوتیلە کچی قەیس کوڕی مەعدیکەرب خوشکی ئەشعەس کوڕی قەیسی کردە هاوسەر و پێش ئەوەی لێی نزیك بکەوێتەوە، مرد و قوتیلە و براکەی لەئیسلام پەشیمان بوونەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فاتیمە کچی شورەیحی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

بەوتەی کوڕی کەلبی ئەو غەزییە کچی جابرە ونازناوەکەی دایکی شەریکە. پێغەمبەر(د.خ) دوای مردنی مێردەکەی وەك هاوسەر دەستنیشان کرد. لەمێردە

کۆنەکەی کوڕێکی بوو بەناوی شەریك و نازناوەکەی لەوەوە پێبڕا. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مەبەستی نزیك بوونەوەی لێ کرد بینی تەمەنی زۆرە و تەڵاقیدا. دایکی شەریك پێشتر موسوڵمان و دەڕۆشتە لای ژنەکانی قورەیش و پێشنیاری ئیسلامی پێدەکردن.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) خەولە کچی هوزەیل کوڕی هوبەیرەی کردە هاوسەر.

کوڕی عەباس دەڵێت: لەیلی کچی خەتیم کوڕی عودەی کاتێك پێغەمبەر(د.خ) پشت لەهەتاو دانیشتبوو هات و دەستی لەشانیدا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تۆ کێیت؟

وتی: کچی کەسێکم لەگەڵ با یەك جڵەویان هەبوو، من لەیلی کچی خەتیمم. هاتووم و خۆم پێشکەش بەتۆ دەکەم تا بمکەیتە هاوسەری خۆت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هاوسەری منیت.

لەیلی بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە و وتی: پێغەمبەر(د.خ) منی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

وتیان: کارێکی خراپت کرد، تۆ ژنێکی خوازیاری پیاوەکانیت و پێغەمبەر(د.خ)چەندین ژنی دیکەی هەیە، بڕۆ و خۆت رزگار بکە.

لەیلی گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر(د.خ)، وتی: تەڵاقم بدە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: تەڵاقمدایت.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) عەمرە کچی یەزیدی وەك هاوسەر هەڵبژارد کەیەکێك بوو لەمناڵەکانی رەواس کوڕی کەلاب.

## ئەو ژنانەی پێغەمبەر(د.خ) خوازبێنی کرد و نەیهێنان

یەکێك لەوان دایکی هانی کچی ئەبوتالیب بوو بەناوی هیند. پێغەمبەر(د.خ) خوزابێنی کرد بەڵام نەیبردەماڵەکەی خۆی چوونك دایکی هانی وتی مناڵی هەیە.

هەروەها زوباعە کچی عامر کوڕی قەرتی لەکوڕەکەی سەلمە کوڕی شهوام خوازبێنی کرد و وتی: دەبێت بۆچوونی خۆی بپرسم. ڕۆشتە لای دایکی و وتی: پێغەمبەر(د.خ) خوازبێنی تۆی کردووە.

وتی: چیت وەڵام دایەوە؟

وتی: وتم چاوەڕێ بێت تا وەڵامی تۆ دەپرسم.

وتی: مەگەر سەبارەت بە پێغەمبەر(د.خ) دەبێت بۆچوونی کەسێك بپرسیت، برۆ و ڕازی ببە.

سەلمە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، بەڵام پێغەمبەر(د.خ) بێدەنگ بوو لەبەر ئەوەی بیستبووی زوباعە تەمەنی زۆرە.

دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) لەسەفییە کچی بەشامە، خوشکی ئەعوەری عەنبەری خوازبێنی کرد. ئەو ئەسیر و پێغەمبەر(د.خ) ئەوی سەرپشك کرد و فەرمووی: ئەگەر دەخوازیت من هەڵبژێرە و ئەگەر دەخوازیت هاوسەرەکەت.

وتی: هاوسەرەکەم. پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد.

پێغەمبەر(د.خ) لەدایکی حەبیب کچی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب خوازبێنی کرد بەڵام بۆیان دەرکەوت کەعەباس لەشیرەوە برایەتی چوونکە سەوبیە شیری بەهەردووکیان دابوو.

لەجومرە کچی حارس کوڕی ئەبی حارسە خوازبێنی کرد. باوکی وتی کێشەی نییە و نەیبوو. کاتێك ڕۆشتەماڵەوە بینی نەخۆشی پێستی گرتووە.

## ئەو کەنیزانەی پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی کردە هاوسەری خۆی

یەکیان ماریە کچی شەمعونی قیبتی بوو و یەکی دیکە ڕێحانە کچی زەیدی قورەزی و بەوتەیەك نەزیری.

## کۆیلە ئازاد کراوەکانی پێغەمبەر(د.خ)

زەید کوڕی حارسە و کوڕەکەی ئوسامە کوڕی زەید. پێشتر باسی ئەوانمان کرد.

سوبانیش کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) بوو و ئازاد کرا. بەڵام تاکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) خزمەتی دەکرد. دوای ئەو ڕۆشتە شاری حمس و لەوێ ماڵێکی لێ بەجێماوە.

دەڵێن: سوبان لەساڵی پەنجا و چواری کۆچ لەسەردەمی خەلافەتی معاویە کۆچی دوایی کرد.

دەستەیەك وتوویانە لەشاری ڕەملە نیشتەجێ بوو بێ ئەوەی منداڵ یا نەوەی هەبێت.

شەقرانیش یەکێك بوو لەکۆیلەکانی پێغەمبەر(د.خ) و ناوی سالّح کوڕی عودەیە. سەبارەت بەو بۆچوونەکان جیاوازە.

عەبدوللە کوڕی داوودی خەریبی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) شەقرانی لە عەبدوللەی باوکی بۆ مایەوە. دەستەیەك وتوویانە نەژادی شەقران پارسییە و سالّح کوڕی حەول کوڕی مێهر کوڕی ئازەرجەشنس کوڕی مهربان کوڕی فیران کوڕی ڕۆستەم کوڕی فیروز کوڕی مای بەهرام کوڕی ڕەشتهەری بوو.

دەڵێن: یەکێك بوو لەجوتیارەکانی ڕەی.

مەسعەبی زوبەیری دەڵێت: شەقران کۆیلەی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بوو. ئەوی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی. چەندین منالّی هێنایە دنیا و دوابینیان ناوی موبا و لەمەدینە نیشتەجێ و نەوەکانی لەبەسرە بوون.

ڕوەیفع کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) و پێیان دەوت باوکی رافیع. ناوی ئەسلەم و بەوتەیەك ئیبراهیم بوو. سەبارەت بەو گێڕانەوەکان جیاوازن. دەستەیەك دەڵێن: کۆیلەی عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب بوو و بە پێغەمبەری بەخشی. دەستەیەکی دیکە وتوویانە باوکی رافیع کۆیلەی ئۆحەیحە سەعید کوڕی عاسی گەورە بوو. وەك میرات بۆ منالّەکانی مایەوە و سیان لەوان بەشەکەیان خۆیان بەخشی و هەر سێکیان لەبەدر کوژران. باوکی رافیع بەشداری شەڕی بەدری کرد. خالید کوڕی سەعید بەشی خۆی بە پێغەمبەر(د.خ) بەخشی و ئازادی کرد.

باوکی رافیع کوڕێکی بوو پێیان دەوت بەهی. ناوی رافیع و باوکی رافیع نازناوەکەی خۆی لەو وەرگرت. کوڕێکی دیکەی ناوی عوبەیدالله و دەبیری عەلی کوڕی ئەبی تالیب بوو.

کاتێك عەمرۆ کوڕی سەعید فەرمانڕەوایی مەدینەی گرتەدەست، بەهی بانگ کرد و وتی: موالی کێیت؟

بەهی وتی: موالی پێغەمبەر(د.خ). عەمرۆ سەد قامچی لێدا.

دووبارە وتی: موالی کێیت؟

بەهی وتی: موالی پێغەمبەر(د.خ). دووبارە سەد قامچی دیکەی لێدا.

لێی دەپرسی و ئەو دەیوت: موالی پێغەمبەر(د.خ). تا پێنسەد قامچی لێدا و پرسی: موالی کێیت؟ بەهی وتی: موالی ئێوەم.

سەلمانی فارسی یەکێك بوو لەکۆیلەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەنازناوی باوکی عەبدوللە.

لەگوندێك لەگوندەکانی ئیسفەهان و بەوتەیەك لەرامهورموز بوو. لەلایەن عەرەبەکانی کەلبەوە ئەسیر و ئەویان بەجوولەکەیەك لەوادی ئەلقورا فرۆشت. لەگەڵ جوولەکەکە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی بڕێك پارەی پێبدات و ئازادی بکات. پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان هاوکاریان کردو توانی ئازادی خۆی بکڕێتەوە.

دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسانی فارس دەڵێن: سەلمان لەویلایەتی شاپوور و ناوی مابە کوڕی بوزخشان کوڕی دەدیرەیە.

سەفینە یەکێکی دیکە لەکۆیلەکانی دایکی سەلمە بوو و ئازادی کرد بەو مەرجەی تا کۆتایی تەمەن خزمەتی پێغەمبەر(د.خ) بکات. ئەو ڕەشپێست بوو. سەبارەت بەناوەکەی بۆچوونەکان جیاوازن.

دەستەیەك ئەویان بەمێهران و دەستەیەك بەرەباح ناوی دەبەن.

بەوتەیەك ئەو لەعەجەمەکانی فارس و ناوی سەبیە کوڕی مارقیەیە.

ئەنس یەکێك بوو لەوان بەنازناوی باوکی موسەرەح و بەوتەیەك باوکی مەسروح. یەکێك بوو لەموالییەکانی سەرات و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) دادەنیشت، ڕێگەی پێدەدان تا بڕۆنە لای. باوکی موسەرەح لەبەدر و ئوحود و هەموو شەڕەکانی دیکە هاوڕێیەتی پێغەمبەری کرد.

دەڵێن: ئەو لەدایکێکی حەبەشی و باوکێکی فارسی چاوی بەدنیا هەڵهێنا. ناوی باوکی کردوی کوڕی ئەشرەنیدە کوڕی ئودهەر کوڕی مێهرادەر کوڕی کەحنکان لەمناڵەکانی مەهگوار کوڕی یومایە.

باوکی کەبشە: ناوی سەلیم و لەموالییەکانی مەککە بوو. بەوتەیەك موالی سەرزەمینی دووسە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کڕی و ئازادی کرد. باوکی کەبشە لەبەدر و ئوحود و شەڕەکانی دیکە هاوڕێیەتی پێغەمبەری کرد و لەساڵی سیانزەیەمی کۆچ لەیەکەم ساڵی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب، چاوی لەجیهان بەست.

باوکی موبهەبە. دەڵێن: یەکێکە لەموالییەکانی موزەینە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کڕی و ئازادی کرد.

ڕەباح کوڕی ئەسوەد کەمۆڵەتی بەخەڵکان دەدا بۆ ئەوەی بڕۆنە لای پێغەمبەر(د.خ).

فەزالە کەدوای پێغەمبەر(د.خ) لەشام نیشتەجێ بوو.

مودەعیم کەکۆیلەی روفاعە کوڕی زەیدی جوزامی بوو. ئەوی بە پێغەمبەر(د.خ)

بەخشی. ئەو، لەشەڕی وادی ئەلقورا هاورێیەتی پێغەمبەر(د.خ) دەکرد. تیرێکی نەناسراو هات و ئەوی کوشت.

باوکی زەمیرە: دەستەیەك لەرەچەڵەك ناسانی فارس وتوویانە لەعەجەمەکانی فارسە و لەمناڵەکانی گەشتاسب پاشا. ناوی واح کوڕی شەبیزەر کوڕی پیرویس کوڕی تاریشمە کوڕی ماهوش کوڕی باکمەهیرە.

دەستەیەك وتوویانە: لەیەکێك لەشەڕەکان ئەسیر و بەپێغەمبەر برا. پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد و لەمبارەوە نامەیەکی بۆ نووسی. ئەو، باوەگەورێی حسەین کوڕی عەبدوڵە کوڕی زەمیرە کوڕی ئەبی زەمیرە بوو. نامەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەدەستی نەوەکانی ئەودا ماوەتەوە. حسەین کوڕی عەبدوڵە نامەکەی هێنایە لای مەهدی. مەهدی نامەکەی وەرگرت و خستیە سەرچاوی و سێسەد دیناری پێبەخشی.

یەسار یەکێك لەکۆیلەکان لەخەڵکانی نەوبە و لەیەکێك لەشەڕەکان ئەسیر کرا. پێغەمبەر(د.خ) ئازادی کرد. ئەو کاتەی عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر مەڕومالأتەکەی پێغەمبەر(د.خ)، کوژرا.

مێهران یەکێکی دیکە لەکۆیلەکانەوە و چەندین حەدیسی لە پێغەمبەر(د.خ) گێڕاوەتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) خواجەیەکی بوو بەناوی مابوور. مەقووقس لەگەڵ دوو کەنیز پێشکەشی پێغەمبەری کرد. یەکیان ماریە و ئەوی کردە هاوسەری خۆی و ئەوی دیکەیان سیرن و پێغەمبەر(د.خ) بەخشی بەحسان کوڕی سابت و عەبدوڵە کوڕی حسان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

مەقوقس ئەم خواجەی لەگەڵ دوو کەنیزەکە ناردبوو تا لەرێگە پارێزگارییان لێ بکات. دەڵێن: ئەو وتبووی: پەیوەندی لەگەڵ ماریە هەیە. پێغەمبەر(د.خ) عەلی کوڕی ئەبی تالیبی نارد بۆ ئەوەی بیکوژێت. کاتێك عەلی بینی و لەمەبەستەکەی ئاگادار بوویەوە، جلەکانی داکەند و دەرکەوت ئامرازی پیاوەتی نییە. عەلی نەیکوشت.

کاتی گەمارۆ خستنە سەر تاییف، چوار کۆیلە لەو شارە هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەوانی ئازاد کرد. یەکیان ناوی ئەبوبەکرە بوو.

## دەبیرەکانی پێغەمبەر(د.خ)

دەڵێن: هەندێ کات عوسمان نامەکانی پێغەمبەری دەنووسی و هەندێ کات عەلی و خالید کوڕی سەعید و ئەبان کوڕی سەعید و عەلا کوڕی حەزرەمی.

بەوتەیەک: یەکەم کەس شتی بۆ نووسی ئەبی کوڕی کەعب بوو و بەنامادە نەبوونی ئەبی، زەید کوڕی سابت ئەو کارەی بۆ دەکرد.

عەبدوللە کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرحیش نامەکانی بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەنووسی. دواتر لەئیسلام پەشیمان بوویەوە و لەڕۆژی گرتنی مەککە، جارێکی دیکە باوەڕی هێنا. معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و حەنزەلەی ئەسەدی شتیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسیوە.

## ئەسپەکانی پێغەمبەر(د.خ)

محەممەد کوڕی یەحیا کوڕی سەهل دەڵێت: یەکەم ئەسپی پێغەمبەر(د.خ)، ئەسپێك بوو لەمەدینە و لەیەکێك لەخەڵکانی فەزارە بەدە ئەوقیە کڕی. ناوی ئەسپەکە زەرس و پێغەمبەر(د.خ) ناوینا سەکب. یەکەم جار سوار لەسەر ئەو ئەسپە بەشداری غەزای ئۆحۆدی کرد. لەشەڕی ئۆحۆد موسوڵمانان جگە لەئەسپەکەی پێغەمبەر(د.خ) ئەسپێکی دیکەیان بوو بەناوی مەلاویح کەئەسپی ئەبی بەردە کوڕی نەیار بوو.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: لە محەممەد کوڕی یەحیا سەبارەت بەمورتەجیز پرسیارم کرد، وتی: ئەسپێك بوو پێغەمبەر(د.خ) لەعەرەبێکی کڕی و خەزیمە کوڕی سابت شایەتی مامڵەکە وعەرەبەکە لەتایەفەی مناڵەکانی مورە بوو.

ئەبی کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سێ ئەسپی بوو: لەزاز و زەرب و لەخیف، لەزاز، مەقووقس پێشکەشی کرد، لەخیف رەبیعە کوڕی ئەبی بەرا و پێغەمبەر(د.خ) چەندین وشتری تالآنی مناڵەکانی کەلابی پێبەخشی. زەرب، قورو‌ە کوڕی عەمرۆ جوزامی بەپێغەمبەری بەخشی.

دەڵێت: تەمیمی رازی ئەسپێکی بەپێغەمبەر بەخشی بەناوی وەرد. پێغەمبەر(د.خ) ئەو ئەسپەی بەعومەر کوڕی خەتاب بەخشی.

دەستەیەك وتوویانە: جگە لەم ئەسپانە ئەسپێکی دیکەی بوو بەناوی یەعسوب.

## ئێسترەکانی پێغەمبەر(د.خ)

موسا کوڕی محەممەد دەڵێت: دوڵدولّ یەکەم ئێستر پێغەمبەر(د.خ) و موسوڵمانان بوو. مەقوقس لەگەڵ کەرێك بەناوی عەفیر پێشکەشی پێغەمبەری کرد. ئێسترەکە تا ڕۆژگاری معاویە ژیا.

زوهری دەڵێت: فەروە کوڕی عەمرۆ جوزامی دوڵدوڵی پێشکەشی پێغەمبەر(د.خ) کرد.

زامل کوڕی عەمرۆ دەڵێت: فەروە کوڕی عەمرۆ ئێسترێکی پێشکەشی پێغەمبەر(د.خ) کرد بەناوی فەزلە. پێغەمبەر(د.خ) بەئەبوبەکری بەخشی. کەرەکەی پێغەمبەر(د.خ) ناوی یەعفور و دیاری فەروە بوو و لەکاتی گەڕانەوە لەحەجیماڵئاوایی، تۆپی.

## وشترەکانی پێغەمبەر(د.خ)

موسا کوڕی محەممەدی تەمیمی دەڵێت: قەسوء یەکێك بوو لەوشترەکانی مناڵەکانی حورەیش. ئەبوبەکر ئەو وشترەو وشترێکی دیکەی بەهەشسەد درەم کڕی. پێغەمبەر(د.خ) بەچوارسەد درەم لەئەبوبەکری کڕییەوە و لای پێغەمبەر(د.خ) بوو تا ئەو کاتەی تۆپی. سوار لەسەر ئەو وشترە کۆچی کرد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) گەیشتە مەدینە، قەسوا چوار ساڵە و بەقەسوا و جودعا و عەزبا ناویان دەبرد.

یەعلی کوڕی موسەییب دەڵێت: ناوی وشترەکەی پێغەمبەر(د.خ) عەزبا و سووچێکی گوێچکەی بڕاو بوو.

## وشترە شیردەرەکانی پێغەمبەر(د.خ)

معاویە کوڕی عەبدوللە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) گایەلێك وشتری شیردەری هەبوو. ئەو گایەلەی لەبیشە پەلاماریاندا و تالانیان کرد. ژمارەیان بیست وشتر و بنەماڵەی پێغەمبەر(د.خ) لەشیری ئەو وشترانە ژیانیان بەسەر دەبرد. شەوانە دوو دەفری گەورە شیریان بۆ دەهێنا. غەزار و حەنا و سەمرا و عەریس و سەعدییە و بەغوم و یەسیرە و ریا لەوان بوون.

دایکی سەلمە دەڵێت: زۆربەی خواردنی ئێمە لەماڵی پێغەمبەر(د.خ) شیر بوو.

پێغەمبەر(د.خ) گایەلێك وشتری شیردەری لەبیشە و بەسەر ژنەكانی خۆی دابەشی كردبوو. وشترێك بەناوی عەریس و شیری زۆری بەئێمە دەبەخشی. وشترەكەی عایشە سەمرا و شیرەكەی دەدۆشی بەلاّم شیری وشترەكەی من فراوانتر بوو. شوان، وشترەكانی بۆ لەوەڕین لەلەوەڕگایەك لەدەوروبەری جەوانییە دەبرد و شەوانە دەیگەڕاندەوە بۆ ماڵ. شیری وشترەكانمان دەدۆشی. شیری وشترەكەی عایشە لەوەی من فراوانتر بوو.

جوبەیر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چەندین وشتری شیردەری لەزی ئەلجەدر و حەما بوو. شیری ئەوانیان بۆئێمە دەهێنا. یەكێك لەوان ناوی موهرە و سەعد كوڕی عوبادە بۆی ناردبوو لەوشترەكانی منالەكانی عەقیل و پڕ شیر. ریا و شەقرایش لەناویاندا دەبینرا و لەبازاری نەبت لەمنالەكانی عامری كوڕی، بەردە و سەمرا و عەریس و یەسیرە و حەنایش. ئەم وشترانەیان دەدۆشی و شەوانە دەیانبردەوە بۆ ماڵ. یەسار كۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) شوانی وشترەكان و تالاّنچییەكانی عەرەب، كوشتییان.

## بزنە شیردەرەكانی پێغەمبەر( د.خ )

ئیبراهیم كوڕی عەبدوللە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) حەوت بزنی شیردەری بوو: عەجوزە و زەمزم و سەقیا و برکە و وەرسە و ئەتلال و ئەتراف.

كوڕی عەباس دەڵێت: حەوت بزنی شیردەری بوو. كوڕی دایكی ئەیمەن ئەوانی دەلەوەڕاند.

## شمشێرەكانی پێغەمبەر( د.خ )

مەروان كوڕی ئەبی سەعیدی موعلی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەسیلاحەكانی منالەكانی قینقاع سێ شمشێری هەڵگرت: یەكیان كورت، یەكیان بەناوی بەتار و ئەوی دیكەیان حەتف. دوای ئەوە دوو شمشێری بەناوی رەسوب و مەخدەم دەستكەوت.

دەڵێن: كاتێك پێغەمبەر(د.خ) هاتە مەدینە، دوو شمشێری پێبوو یەكیان بەناوی عەزب و لەشەڕی بەدر بەو شمشێرە شەڕی كرد. زولفەقار شمشێری مونەبە كوڕی حەجاج و لەشەڕی بەدر وەك تالاّنی دەستی كەوت.

## کەوان و ڕمەکانی پێغەمبەر(د.خ)

مەروان کوڕی ئەبی سەعید دەڵێت: لەسیلاحەکانی مناڵەکانی قینقاع، سێ ڕم بەپێغەمبەر گەیشت لەگەڵ سێ کەوان: ڕوحا و بەیزا و سەفرا.

## زرێکانی پێغەمبەر(د.خ)

هەروەها مەروان کوڕی ئەبی سەعد دەڵێت: لەسیلاحەکانی مناڵەکانی قینقاع پێغەمبەر(د.خ) دوو زرێی بەرکەوت بەناوەکانی: سەعدییە و فەززە.

محەممەد کوڕی موسلیمە دەڵێت: لەشەڕی ئوحود پێغەمبەر(د.خ) دوو زرێی پۆشی، زرێی زات ئەلفزول و زرێی فەززە. لەشەڕی خەیبەریش ئەو دوو زرێی پۆشی.

## قەڵغانەکەی پێغەمبەر(د.خ)

مەکحول دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) زرێیەکی بوو و سەری قووچێکی تیا هەڵکەنرا بوو. پێغەمبەر(د.خ) حەزی لێ نەدەکرد و ڕۆژێك خواوەند ئەو نیگارەی سڕییەوە.

## ناوەکانی پێغەمبەر(د.خ)

ئەبوموسا دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چەندین ناوی بۆ خۆی باس دەکرد و هەندێکیان لەبیری ئێمەدا ماوە. فەرمووی: من محەممەد و ئەحمەد و موقەفا و حاشر و نەبی التوبە و مەلحەمەم.

موتعیم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەمنی فەرموو: من محەممەد و ئەحمەد و عاقیب و ماحیم.

زوهری دەڵێت: عاقیب یانی ئەوەی دوای ئەو کەس نییە و ماحی یانی ئەوەی خواوەند بەهۆی ئەوەوە کوفر لەناو دەبات.

هەروەها لەموتعیم دەگێڕنەوە: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: من محەممەد و ئەحمەد و ماحی و عاقیب و حاشرم و خەڵکان لەسەر هەنگاوەکانی من حەشر دەکرێن.

دەڵێت: لەسوفیانم پرسی: مانای حاشر چییە؟

وتی: کۆتایی پێغەمبەران.

## تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر(د.خ)

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) نەدرێژ بوو نەکورت. سەری گەورە و ڕیشی پڕ، دەست و پێی گەورە، ئێسقانی پان، ڕوخساری سووربباو. سنگی تووکن. کاتی ڕۆشتن لەسەر جەستەی لەنگەری دەگرت، وەك بڵێی لەسەرەوخواریدا دەهاتە خوار. دوای ئەو کەسی هاوشێوەی ئەوم نەبینیوە.

عەبدوللە کوڕی عیمران دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمزگەوتی کوفە دانیشتبوو، دەستی خستبووە سەر شمشێرەکەی خۆی. یەکێك لەئەنسارییەکان پێی وت: وەسفی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر(د.خ) بکە.

عەلی وتی: پێغەمبەر(د.خ) سووربباو و چاوانی گەورە و ڕەش و قژی نەرم و کوڵمی ساف و ڕیشی پڕ بوو. گەردنی وەك زیو سپی، ڕیزێك موو لەسەر سنگییەوە تا کەلەکەی. جگە لەسنگ و ژێر باڵی مووی دیکەی پێوە نەبوو. دەست و قاچی گەورە و کاتێك بەرێگەدا دەڕۆشت دەتووت بەسەرەو خواریدا دەڕوات و کاتێك سەیری شوێنێکی دەکرد، هەموو جەستەی دەچەرخاند، نەکورتە باڵا بوو نە باڵابەرز. نەلاواز بوو نە ڕژد، ئارەق لەسەر ڕوخساری وەك مرواری بوو. بۆنی ئارەقی لەهەموو بۆنێك خۆشتر بوو. پێش ئەو و دوای ئەو کەسی وەك ئەوم نەبینیوە.

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەچلساڵی بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا. دە ساڵ لەمەککە مایەوە و دە ساڵ لەمەدینە ژیانی بەسەر برد و لەتەمەنی شەست ساڵی چاوی لەجیهان بەست. لەسەروڕیشیدا بیست تاڵی سپی نەدەبینرا. پێغەمبەر(د.خ) نەباڵابەرز بوو نەکورتە باڵا، سپی و ئەسمەر نەبوو، مووی نەلوول بوو نەساف.

جەریری دەڵێت: لەگەڵ باوکی توفەیلدا بووم. بەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوە، وتی: جگە لەمن کەسێك کە پێغەمبەری بینیبێت، نەماوەتەوە.

وتم: ئەوت بینیوە؟

وتی: بەڵێ.

وتم: تایبەتمەندییەکانی چۆن بوو؟

وتی: سپی، نەقەڵەو بوو نە لاغر.

## خاتەمی پێغەمبەرایەتی لە پێغەمبەردا

باوکی زەید دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: باوکی زەید! وەرە پێش و پشتم بشێلە. پشتی خۆی رووت کردەوە. دەستم لەپشتیدا. پەنجەم خستە سەر خاتەم و زەختم لێکرد.

لێیان پرسی: خاتەم چی بوو؟

وتی: کەمێك تووك لەسەر شانی پێغەمبەر(د.خ).

لەباوکی سەعیدی خدریان پرسی: خاتەمی پێغەمبەر(د.خ) چی بوو؟

وتی: لەتە گۆشتێکی زیادە.

بوێری و جوامێری پێغەمبەر(د.خ)

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەهەمووان چاکتر، بەخشەندەتر و بوێرتر بوو. شەوێك لەمەدینە زەنگی مەترسی بەرز بوویەوە. خەڵکان بەرەو دەنگەکە رایان کرد و چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) کەوت کەسوار لەسەر ئەسپەکەی باوکی تەڵحە و شمشێری بەدەستەوە گرتبوو. خێراتر لەهەمووان بۆ لای دەنگەکە بەرێکەوت و دەیفەرموو: خەڵکینە، مەترسن. دووجار وتەکەی دووبارە کردەوە.

دوای ئەوە فەرمووی: ئەی باوکی تەڵحە ئەسپەکەی تۆ دەریایە. ئەسپەکەی باوکی تەڵحە خاو دەڕۆشت. دوای سەرکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) هیچ ئەسپێك پێشی نەکەوتەوە.

## گێڕانەوەکان سەبارەت بەمووی پێغەمبەر(د.خ)

و ئایا رەنگی دەکرد یا نە.

مەعاز دەڵێت: ڕۆشتمە لای عەبدوللە کوڕی بەسرە و پێم وت: ئایا پێغەمبەرت بینیوە؟ ئایا پێغەمبەر(د.خ) پیر بوو؟دەڵێت: عەبدوللە دەستی خستە سەرچەناکەی خۆی و وتی: مووی چەناکەی ئەو سپی ببوو.

کوڕی جوحەیفە دەڵێت: پێغەمبەرم(د.خ) بینی و مووی چەناکەی سپی ببوو.

پێیان وت: ئەو کاتە تۆ چیت دەکرد؟

وتی: تیرم دەتاشی.

لەئەنسیان پرسی: ئایا پێغەمبەر(د.خ) ریشی ڕەنگ دەکرد؟

وتی: مووی پێغەمبەر(د.خ) ئەوەندە سپی نەببوو بەڵام ئەبوبەکر و عومەر بەحەنا ڕەنگیان دەکرد.

ئەنس دەڵێت: زیاتر لەبیست تاڵ مووی سپی بەروخساری پێغەمبەرەوە نەبینرا.

جابر کوڕی سەمورە دەڵێت: شوێنەواری پیری بەپێغەمبەرەوە دیار نەبوو جگە لەچەند تاڵی سپی لەناوچاوی. کاتێك سەری خۆی چەور دەکرد، تاڵە سپییەکانی دەشاردەوە.

عەبدوللە کوڕی مەوهیب دەڵێت: هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) ڕۆشتە ماڵەکەی و چەندین تاڵی سپی پێغەمبەری هێنا.

باوکی ڕەمسە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەحەنا رەنگی دەکرد و موەکانی دەگەیشتە سەر شان یا بازووی.

دایکی هانی دەڵێت: پێغەمبەرم بینی، چوار پرچی هۆنیبوویەوە.

## وتار سەبارەت بەنەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) و ئەوەی لەمەرگی خۆی ئاگادار کرایەوە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: خواوەند فەرمووی:

((اذاجاء نصرالله و الفتح و رايت الناس يدخلون فى دين الله افواجا فسبح بحمد ربك و استغفره انه كان توابا.

واتاکەی: کاتێك هاوکاری خواوەند و سەرکەوتن گەیشت. خەڵکان دەبینی دەستە دەستە باوەڕ بەم دینە دێنن. بۆ وەسف کردنی پەروەردگار دۆعا بکە و بپاڕێرەوە و داوای لێخۆشبوونی لێبکە چوونکە ئەو بەخشندەیە.))

پێشتر باسمان کرد: پێغەمبەر(د.خ) لەحەجی ماڵئاوایی کەکۆتایی ئاگادارییەکان و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوو، ڕێ و ڕەسمەکانی فێری خەڵکان کرد و لەوتارەکەی پیشنیارە پێویستەکانی بەخەڵکان ڕاگەیاند. دواتر پێغەمبەر(د.خ) دوای کۆتایی هاتن لەڕێ ورەسمەکانی حەج بۆ مەدینە گەڕایەوە و پاشماوەی زیحەججە و موحەرەم و سەفەری لەو شارە بەسەر برد. ساڵی یانزەمی کۆچ دەستی پێکرد.

## گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی یانزەیەمی کۆچ

ئەبوجەعفەر دەڵێت:پێغەمبەر(د.خ) لەموحەڕەمی ساڵی یانزەیەك دەستەیەکی بۆ ڕەوانە کردن بۆ شام ئامادە کرد. سەرکردایەتی بەموالی و کوڕی مواليیەکەی، ئوسامە کوڕی زەید بەخشی.

عەباس کوڕی ئەبی ڕەبیعە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەئوسامەی فەرموو هێرش بکاتە سەر بەلقا و داروّمی فەلەستین. خەڵکان ئامادەو بڕیار بوو موهاجیرە سەرەتاییەکان ببنە هاوڕێی ئوسامە. لەوکاتەی خەڵکان خۆیان ئامادە دەکرد، نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) کەبەهۆیەوە گیانی سپارد، دەستی پێکرد.

باوکی مویەهەبە کۆیلەی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دوای تەواو بوون لەڕێوڕەسمەکانی حەج، بۆ مەدینە گەڕایەوە. بەدرێژای بەرێگەدا دەڕۆشت و دەستەیەکی بۆ بەرێکەوتن ئامادە کرد. سەرکردەکەیان ئوسامە کوڕی زەید بوو. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەسنوورەکانی شام کەبەشێك لەئەردەن بوو هێرش بکاتە سەر ئەبل زیتو. ڕیاکاران سەبارەت بەسەرکردایەتی ئوسامە گفتوگۆیان دەستپێکرد.

پێغەمبەر(د.خ) گرنگی بەوتەکانی ئەوان نەدا و فەرمووی: ئەو شیاوە بۆ سەرکردایەتی،سەبارەت بەباوکی ئەویش قسەیان دەکرد بەلاّم باوکیشی کەسێکی شیاو بوو.

کاتێك هەواڵی نەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) بلاّو بوویەوە، ئەسوەد لەیەمەن و موسەیلەمە لەیەمامە دەرکەوتن و پێغەمبەر(د.خ) لەکارەکانی ئەوان ئاگادار بوویەوە. دوای ئەوان تولەیحە لەدیاری ئەسەد دەرکەوت و ئەمە لەکاتی باش بوونەوەی پێغەمبەردا بوو. لەمانگی موحەڕەم نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) دەستی پێکرد.

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی موحەڕەم دەستی پێکرد.

واقدی دەڵێت: نەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) دوو ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی سەفەر دەستی پێکرد.

فیروزی دەیلەمی دەڵێت: یەکەم هەڵگەڕانەوە لەدین لەدەورانی پێغەمبەر(د.خ) ڕوویدا لەسەر دەستی زوئەلخومار عەبهەلە کوڕی کەعب کەپێیان دەوت ئەسوەد. ئەو دوای حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ هەموو خەڵکانی مەزحەج لەدین هەڵگەڕایەوە.

دەڵێت: ئەسوەد، کاهینێیکی جادووگەر و چاوبەست بوو. شتی سەیر و سەمەرەی نیشانی خەڵکان دەدا. هەرکەس وتەکانی دەبیست، کاریگەری لەسەر دادەنرا. سەرەتای دەرکەوتنی لەئەشکەوتی خوبان بوو. ماڵەکەی لەویّ و لەویّ چاوی بەدنیا هەڵهێنا و گەورە ببوو. خەڵکانی مەزحەج نامەیان بۆ نووسی و بەڵێنی نەجرانیان دانا. هێرشیان کردە سەر ئەو شارە و عەمرۆ کوڕی حەزم و خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسیان دەرپەڕاند. ئەسوەدیان لەجێگەی ئەوان دانیشاند. قەیس کوڕی عەبد یەغوس هێرشی کردە سەر فەروە کوڕی مەسیك لێپرسراوی مورادییەکان و ئەوی دەرکرد و جێگەکەی گرتەوە.

کاتێك ئەسوەد بەسەر نەجراندا زاڵ بوو، ڕێگەی سەنعای گرتەبەر و ئەو سەرزەمینەیشی داگیر کرد. هەواڵی داگیر کردنی سەنعایان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی. یەکەم جار لەلایەن فەروە کوڕی مەسیك لەکارەکانی ئەسوەد ئاگادار بوویەوە. موسوڵمانە ڕاستەقینەکانی مەزحەج پەیوەستی فەروە بوون و لەئەحسییە کۆبوونەوە. ئەسوەد نامەی بۆ نەنووسی و کەسی ڕەوانە نەکرد چوونکە کەس نەبوو ببێتە ئەرك بۆی و پاشایەتی یەمەنی بۆ دەستەبەر بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سوپاکەی ئوسامەی ئامادە دەکرد، بەڵام بەهۆی نەخۆشی و دەرکەوتنی ئەسوەد و موسەیلەمە سوپاکە بەرێنەکەوت. ڕیاکاران سەبارەت بەسەرکردایەتی ئوسامە قسەیان هێنایە سەرزمان تا ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە. لەبەر ئەمە و لەبەر ئەو خەوەی لەماڵەکەی عایشە بینی، هاتەدەر. سەری ئێشا، سەربەندێکی بەستبوو، فەرمووی: لەخەودا بینیم دوو تەوقی زێڕ لەبازووەکانمدایە. پەسەندم نەکرد، فووم لێکردن و هەڵفڕین. لێکدانەوەکەی دوو درۆزنەکەی یەمامە و یەمەنە. بیستوومە کەسانێك سەبارەت بەسەرکردایەتی ئوسامە قسە دەکەن. پێشتریش سەبارەت بەسەرکردایەتی باوکی قسەیان دەکرد. باوکی شیاوی سەرکردایەتی و خۆیشی شیاوی سەرکردایەتییە، سوپاکەی ئوسامە ڕەوانە بکەن.

فەرمووی: خواوەند بەنەحلەت بکات ئەو کەسانەی گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان دەکەنە مزگەوت.

ئوسامە بەرێکەوت و لەجورف ئوردوی لێدا. خەڵکان پەیوەستی بوون. لەم ناوەدا تولەیحە دەرکەوت. خەڵك دوودڵ و نەخۆشییەکی پێغەمبەر(د.خ) تەشەنەی سەند. نەڕۆشتن و تەنیا سەیری یەکیان دەکرد تا ئەو کاتەی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی

کرد.

حەزرەمی کوڕی عامری ئەسەدی دەڵێت: هەواڵ هات کەپێغەمبەر نەخۆش کەوتووە، دواتر ئاگادار بووینە کەموسەیلەمە دەستی بەسەر یەمامەدا گرتووە و ئەسوەد لەیەمەن دەسەلأتی گرتۆتەدەست. زۆری نەخایاند تۆلەیحە بانگەشەی پێغەمبەری کرد و لەسەمیرا ئوروودوی لێدا. خەڵکان بەگشتی شوێنی کەوتن و دەسەلأتی فراوان بوو. حوبالی برازای خۆی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) نارد تا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستێت. لەکارەکانی تولەیحە ئاگاداری کردەوە و وتی: ئەو کەسەی دێتە لای تولەیحە، زوئەلنونە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەوە ناوی فریشتەیە.

حوبال وتی: من کوڕی خوەیلدم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەند بتکوژێت بێ ئەوەی شەهید بیت.

حورەیس کوڕی موعلی دەڵێت: یەکەم کەس کەپێغەمبەری لەکارەکانی تولەیحە ئاگادار کردەوە، سەنان کوڕی ئەبی سەنان لێپرسراوی منالەکانی مالك و قوزاعی کوڕی عومەر لێپرسراوی منالەکانی حارس بوو.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ بانگەشەکەرانی پێغەمبەرایەتی بەهۆی نێردراوانەوە شەڕی کرد. کەسی بۆ لای چەند کەسێك لەگەورەکانی یەمەن نارد و فەرمانیدا هێرشیان بکەنە سەر و فەرمووی تا لەتایەفەی منالەکانی تەمیم و قەیس هاوکاری وەربگرن. کەسی بۆ لای تەمیمی و قەیسییەکان نارد تا هاوکارییان بکەن. ئەو کارەیان کرد و رێگەکان لەسەر بێ دین بەسترا. هاوەلأنی کەم بوونەوە و کاروبارەکانیان شلەژا و کەوتنە گیانی یەك. لەژیانی پێغەمبەر(د.خ) و یەك ڕۆژ پێش کۆچی دوایی ئەو، ئەسوەد کوژرا. بۆ لەناو بردنی تولەیحە و موسەیلەمە بەردەوام خەڵکانی ڕەوانە دەکرد. نەخۆشییەکەی نەبووە رێگر لەوەی کاروبارەکانی دینەکەی پشتگوێ بخات.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) وەبر کوڕی یەحسنی بۆ لای فیروز وجەشیشی دەیلەمی و دازویەی ئیستەخری ڕەوانە فەرموو.

جەریر کوڕی عەبدوڵلەی بۆ لای زی ئەلکەلاع و زی ئەلزەلیم نارد.

ئەقرەع کوڕی عەبدوڵلەی حەمیری بۆ لای زی رود و زی موڕان نارد.

فورات کوڕی حەییانی عێجلی بۆ لای سوامە کوڕی ئەسال نارد.

زیادی کوڕی حەنزەلەی تەمیمی عومەری بۆ لای قەیس کوڕی عاسم و زەبەرقان کوڕی بەدر نارد.

کوڕی شورەحبیلی بۆ لای سیرەی عەنبەری و وەکیعی دارمی و عەمرۆ کوڕی مەحجوبی عامری و عەمرۆ کوڕی خەفاجی نارد.

زەرار کوڕی ئەزوەری ئەسەدی بۆ لای عەوف زەرقانی لەتایەفەی منالەکانی سەیدا نارد و هەروەها ئەوی بۆ لای سەنانی ئەسەدی غەنەمی و قوزاعی دەیلەمی نارد.

نەعیم کوڕی مەسعودی ئەشجەعی بۆ لای زوئەلەحیە و کوڕی موشەیمەسە جوبەیری نارد.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) لەکۆتاییەکانی مانگی سەفەر دەستی پێکرد. لەو کاتەدا لەماڵی زێنەب کچی جەحش بوو.

باوکی مەویهەبە ئازاد کراوی پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: لەتاریکی شەو پێغەمبەر(د.خ) بانگی کردم و فەرمووی: ئەی باوکی مەویهەبە، راسپێردراوم بۆ دانیشتووانی بەقیع داوای لێخۆشبوون بکەم، لەگەڵم وەرە. لەگەڵی ڕۆشتم و کاتێك لەگۆڕستانەکە وەستا، فەرمووی: سلاو لەئێوە ئەی خەوتووانی ناو گۆڕ، ئەو حاڵەی ئێستاتان بەبەراوەرد لەگەڵ حاڵی خەڵکان خۆشحاڵکەرە، فیتنەکان وەك بەشەکانی شەوی تاریك بەدوای یەکدا دێن ودواییینیان خراپتر لەپێشینیانە.

پێغەمبەر(د.خ) سەیری کرد و فەرمووی: ئەی باوکی مەویهەبە کلیلی خەزێنەکانی دونیا و ژیانی هەمیشەییان بەمن بەخشییوە تا دوای ئەوە بڕۆمە بەهەشت. سەرپشکیان کردووم یا بمێنمەوە یا بڕۆمە لای خواوەند و بەهەشت. بەهەشتم هەڵبژارد.

وتم: دایك و باوکم قوربانت بن، سەرەتا کلیلی خەزێنەکانی دنیا و ژیانی هەمیشەیی و دواتر بەهەشت.

فەرمووی: نە سوێند بەخوا ئەی باوکی مەویهەبە، پێشکای خوا و بەهەشتم هەڵبژارد.

دەڵێت: داوای بەخشینی بۆ مردووانی بەقیعی کرد. نەخۆشییەکەی دوای گەڕانەوە دەستی پێکرد.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەبەقیع گەڕایەوە و منی بینی لەتاو ژانە سەر هاوارم دەکرد: ئەی هاوار سەرم.

فەرمووی: سوێند بەخوا ئەی عایشە، من دەبێت بڵێم ئەی هاوار سەرم.

فەرمووی: چ زیانێکت پێ دەبڕێت ئەگەر پێش من بمریت و خۆم کفن و دفنی تۆ بکەم، نوێژت لەسەر بخوێنم و بەخاکت بسپێرم.

وتم: سوێند بەخوا دوای ئەوە دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ و لەئامێزی یەکێك لەژنەکانت دەخەویت.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بزەیەکی گرت. سەری ژانی دەکرد و بەنۆرە دەڕۆشتە ماڵی ژنەکانی تا ئەوەی لەماڵی مەیموونە ژانە سەرەکەی زیادی کرد. ژنەکانی کۆکردەوە و رەزامەندی ئەوانی وەرگرت تا لەماڵەکەی من پەرەستاری لێبکەن. ئەوانیش رازی بوون. پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان دووان لەکەسەکانی خۆی کەیەکیان فەزڵ کوڕی عەباس بوو، هاتەدەر. قاچی بەسەر زەویدا رادەکێشا. سەری بەستبوو و لەماڵەکەی مندا کەوت.

عوبەیدالله دەڵێت: ئەم حەدیسەم بۆ کوڕی عەباس گێڕایەوە، وتی: دەزانی ئەو پیاوەیتر کێ بوو؟

وتم: نە.

وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب، بەڵام عایشە نەیدەویست زمانی خێر بۆ عەلی بکاتەوە.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بێهۆش و ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی: حەوت دەفر لەئاوی چاڵە جیاوازەکان بەسەر و روخساری مندا بپرژێنن تا بڕۆم و لەگەڵ خەڵکان قسە بکەم، ئەومان لەتەشتێکی حەفسە دانیشاند و ئاومان پیاکرد تا فەرمووی: بەس. بەس.

فەزڵ کوڕی عەباس دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) هاتە لای من، ڕۆشتینەدەر، سەری ئازاری دەکرد، سەری بەستبوو، پێی فەرمووم: ئەی فەزڵ دەستم بگرە. دەستم گرت تا لەسەر مینبەر دانیشت، فەرمووی: خەڵکان کۆبکەرەوە. کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، فەرمووی:

((ئەی خەڵکینە، پاکی خواوەند دێنمە سەرزمان، چەندین ماف ئێوە لای منە، ئەگەر قامچیم لەپشتی کەسێك داوە، ئەوە پشتی من، با بێت و قەرەبوو بکاتەوە، ئەگەر ئیهانەی کەسێکم کردووە، با بێت و قەرەبوو بکاتەوە، رق و کینە لەسرشتی مندا نییە و شیاوی من نییە، کەسێکم زیاتر لەهەمووان خۆش دەوێت کەبێت و مافەکەی خۆی وەربگرێتەوە یا حەڵاڵم بکات تا بەئاسوودەیی بۆ لای پەروەردگار بڕۆم. بەگومانم ئەمە

بەسەندە نییە و دەبێت چەند جارێك ئەمە دووبارە بکەمەوە.))

فەزڵ دەڵێت: لەمینبەر هاتەخوار و نوێژی نیمەڕۆی خوێند. گەڕایەوە و لەسەر مینبەر دانیشت و وتەکانی دووبارە کردەوە. یەکێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سێ درەمی من قەرزاریت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی فەزل سێ درەمی پێببەخشە. پێم وت: دانیشێت.

فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەر کەسێك شتێکی هەیە باسی بکات و نەڵێت دەبێتە هۆکاری ریسوایی دنیا چوونکە ریسوایی ئەو دنیا مەترسیدارترە.

پیاوێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، سێ درەمم لایە و بەناڕەوا لەتالآنییەکان هەڵمگرتووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ بەناڕەوا ئەو کارەت کرد؟

وتی: نیازمەند بووم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی فەزڵ سێ درەمی لێ وەربگرە.

دوای ئەوە فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەرکەس لەشتێکی ناخۆش بۆ خۆی دەترسێت، هەستێت تا دۆعای بۆ بکەم.

یەکێك هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، زمانم پیسە و زۆر دەخەوم.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا، راستی و ئیمانی پێببەخشە و ئەگر دەیەوێت، خەوتنی لێ بگرەوە.

پیاوێکی دیکە هەستا وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، من درۆزنم، دووڕووم، هیچ گوناحێك نەماوە ئەنجامی نەدەم.

عومەر کوڕی خەتاب هەستا و وتی: ئەی پیاو خۆتت ریوسا کرد.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی عومەر ریسوایی ئەم دنیا ئاسانترە لەریسوایی ئەو دنیا. فەرمووی: خواوەندا، راستی و ئیمانی پێببەخشە و بۆ بۆ ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان رێنوێنی بکە.

عومەر وتەیەکی هێنایە سەرزمان، پێغەمبەر(د.خ) بزەیەکی گرت و فەرمووی: عومەر لەگەڵ منە و من لەگەڵ عومەرەم و دوای من لەهەر شوێنێك بێت، راستی لەگەڵ ئەوە.

ئەیووب کوڕی بەشیر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سەری خۆی بەست و لەماڵەکەی هاتەدەر. لەسەر مینبەر دانیشت و سەرەتا سڵاوی بۆ ئەسحابەکانی ئۆحۆد نارد و داوای بەخشینی بۆ کردن. دوای ئەوە فەرمووی: ئەی خەڵکینە، خواوەند، یەکێك

لەبەندەکانی لەنێوان دنیا و ئەو دنیا سەرپشك کرد و ئەو گەڕانەوە بۆ لای خوای هەڵبژارد.

دەڵێت: ئەبوبەکر لەقسەکەی تێگەیشت و زانی مەبەستی خۆیەتی، دەستی بەگریان کرد و وتی: ئێمە گیانی خۆمان و منداڵەکانمان دەکەینە قوربانی تۆ.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەبوبەکر ئارام بە، سەیری ئەم دەرگایان بکەن کە بەرووی مزگەوتا کراوەتەوە، هەموویان ببەستن جگە لەوەی ماڵی ئەبوبەکر، هیچ کەس لەهاودەمی ئەو بەباشتر نازانم.

. محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەو ڕۆژەدا پێغەمبەر(د.خ) لەناو قسەکانی خۆی وتی: ئەگەر لەناو بەندەکان هاوڕێیەکەم هەڵدەبژارد، ئەبوبەکر یەکەم کەس دەبوو، بەڵام لەنێوان ئێمە هاودەنگی هەیە و برایەتی و ئیمان، تا ئەو کاتەی خواوەند ئێمەی لای خۆی کۆدەکاتەوە.

باوکی سەعیدی خدری دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر(د.خ) لەسەر مینەبەر دانیشت و فەرمووی: خواوەند بەندەیەکی سەرپشك کرد تا لەڕۆژییەکانی دنیا هەرچی دەخوازێت پێی ببەخشێت یا ئەوەی لای خواوەندە. ئەو پێشگای خواوەندی هەڵبژارد. ئەبوبەکر کاتێك ئەم قسەی بیست، گریا و وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە خۆمان و ماڵ و منداڵ دەکەینە قوربانی تۆ. ئێمە لەوتەکەی ئەو سەرمانسوڕما. خەڵکان وتیان: سەیری ئەم پیرە پیاوە بکەن. پێغەمبەر(د.خ) باسی بەندەیەك دەکات و ئەو دەڵێت ئێمە خۆمان و منداڵەکانمان دەکەینە قوربانی تۆ.

دەڵێت: ئەو کەسەی سەرپشك کرا، پێغەمبەر(د.خ) بوو، ئەبوبەکر باشتر لەئێمە ئەمەی دەزانی.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هاودەمی و سامانی ئەبوبەکر لەهەمووان بۆ من باشتر بوو، ئەگەر هاوڕێم هەڵدەبژارد، ئەبوبەکر یەکەم کەس دەبوو. بەڵام لەنێوان ئێمەدا برایەتی و موسوڵمانییە. لەمزگەوت هیچ دەرگایەك جگە لەدەرگاکەی ئەبوبەکر نەمێنێتەوە.

عەبدوللە کوڕی مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) و خۆشەویستی ئێمە یەك مانگ پێشتر، هەواڵی مەرگی خۆی پێداین و کاتێك، ماڵئاوایی نزیك کەوتەوە، ئێمەی لەماڵی عایشە کۆکردەوە. سەیری دەکردین، فرمێسك لەچاوەکانی قەتیس ما، فەرمووی: سلاو لەئێوە، خوا بتانبەخشێت، خوا پەناتان بدات، خوا بتانپارێزێت، خوا سودتان

پێیبەخشێت، خوا لێتان خۆش بێت، پێشنیار دەکەم لەخوا بترسن، لەخوا دەخوازم ئاگای لێتان بێت و ئێوە بەو دەسپێرم چوونکە من ئاگادارکەرەوە و مژدەدەری ئێوەم. بەرابەر بەندەکانی خوا یاخیگەری مەکەنە پیشە چوونکە خواوەند بەمن و ئێوەی فەرمووە:

((تلك الدار الاخرة نجعلها للدين لا يريدون علوافى الارض و لا فساد او العاقبة للمتقين.

واتاکەی: ئەو دنیامان کردە بەشی کەسانێك کە لەسەرزەوی خراپەکاری و فساد بلاو ناکەنەوە و ئەنجامەکان تایبەتە بەخۆپارێزان.))

هەروەها دەڵێت:

((اليس فى جهنم مثوى للمتكبرين.

واتاکەی: مەگەر جەهەننەم شوێنی خۆبەگەورەزانەکان نییە؟

وتمان: کاتی مەرگی تۆ چ کاتێکە؟

فەرمووی: دووری ئێوە و ڕۆشتن بۆ لای خواوەند و سدرە المنتهى نزیکە.

وتمان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کێ تۆ غوسل بدات؟

فەرمووی: کەسانی من، نزیکتر و نزیکتر.

وتمان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) کفنی تۆ چی بێت؟

فەرمووی: ئەگەر ویستتان جلەکانی خۆم لەگەڵ پارچەیەکی سپی میسر یا حیلەیەکی یەمەنی.

وتمان: ئەی پێغەمبەر(د.خ) کێ نوێژ لەسەر تۆ بخوێنێت؟

فەرمووی: ئارام بن، خوا بتانبەخشێت و سەبارەت بە پێغەمبەرەکەتان پاداشتی چاکەتان بداتەوە.

دەڵێت: ئێمە گریایین و پێغەمبەر(د.خ) گریا، فەرمووی: کاتێك منتان شۆرد و کفنتان کردم، لەم ماڵە لای جێگەکەم دامنێن و بڕۆنەدەر. کاژێرێك چاوەڕێ بن چوونکە یەکەم کەس کە نوێژ لەسەر من دەخوێنێت، هاورێکەم جبرەئیلە، دوای ئەو میکائیل و ئیسرافیل و ملك الموت لەگەڵ دەستەیەکی زۆر لەفریشتەکان نوێژ دەخوێنن. دواتر دەستە دەستە وەرنە لای من و نوێژ بخوێنن و سلاو و سلاوات بنێرن. بەگریان و شین ئازاری من مەدەن. سەرەتا پیاوانی بنەماڵەکەم سلاو و نوێژ لەسەر من بخوێنن و دواتر ژنانی بنەماڵەکەم و دوای ئەوان ئێوە لەلایەن منەوە سلاو بۆ خۆتان بنێرن کەشایەتی

دەدەم بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بەدینەکەم هێناوە، لەئێستاوە تا ڕۆژی کۆتایی سڵاویان بۆ دەنێرم.

وتمان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، کێ تۆ بخاتە ناو گۆڕەکەت؟

فەرمووی: کەسەکانم لەگەڵ فریشتە زۆرەکان. ئەوان ئێوە دەبینن بەڵام ئێوە نایانبینن.

کوڕی عەباس دەڵێت: ڕۆژی پێنجشەممە چ ڕۆژێك بوو! نەخۆشی پێغەمبەر(د.خ) دژوار و فەرمووی: کەرەستەکان بێنن تا وەسیەت بۆ ئێوە بنووسم بۆ ئەوەی دوای من هیچ کات گومڕا نەبن. کەسان بۆڵەبۆڵیان کرد و ئەو کارە لەخزمەت پێغەمبەر(د.خ) ڕەوا نەبوو.

وتیان: چی دەڵێت؟ دەبڕسکێنێت؟ لێی بپرسن. داوای ڕوونکردنەوەیان لێکرد.

فەرمووی: وازم لێ بێنن چوونکە ئەم حاڵەم لەوەی ئێوە باسی دەکەن زۆر باشترە. دواتر سێ پێشنیاری کرد: فەرمووی: ناباوەڕان لەدوورگەی عەرەب دەربکەن و دیاری بەنێردراوی هۆزەکان ببەخشن بەهەمان شێوە کەمن بەخشیم. سەبارەت بەسێیەمی بێدەنگ بوو یا بێژەرەکەی دەڵێت: لەبیرم کرد.

سەعید کوڕی جوبەیر ئەم حەدیسە لەکوڕی عەباس دەگێڕێتەوە بەم جیاوازییە کەوەك خۆی بەهەمان شێوەی هەیە، گۆڕان پێویستە ( لای پێغەمبەر(د.خ) بەهەمان شێوە بێت وەك خۆی) لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە.

گێڕانەوەیەکی دیکە لەسەعید کوڕی جوبەیر لەکوڕی عەباس: ڕۆژی پێنجشەممە چ ڕۆژێك بوو.

دەڵێت: فرمێسکیم بینی وەك دەنکی مرواری بەروخساریدا هاتەخوار. وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قەڵەم و مەرەکەب یا فەرمووی ئێسقانی شان و مەرەکەب بێنن تا وەسیەت بۆ ئێوە بنووسم بۆ ئەوەی دوای من گومڕا نەبن.

وتیان: پێغەمبەر(د.خ) دەبڕسکێنێت.

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) نەخۆش بوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب لای ئەو هاتەدەر. خەڵکان وتیان: ئەی باوکی حەسەن پێغەمبەر(د.خ) چۆنە؟

وتی: سپاس بۆ خوا باشترە.

عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب دەستی گرت و وتی: تۆ هێشتا گەنجیت، دەزانم

پێغەمبەر(د.خ) بەم نەخۆشییە دەمرێت، من روخساری منالەکانی عەبدولموتەلیب لەکاتی مەرگ دەناسمەوە، برۆ لای پێغەمبەر(د.خ) و سەبارەتب بەخەلافەت پرسیاری لێبکە. ئەگەر لەئێمەیە با بزانین و ئەگەر لەکەسانی دیکەیە با پێشنیاری خۆی بەئێمە بکات.

عەلی وتی: سوێند بەخوا ئەگەرلێی بپرسم و بەئێمەی نەسپێرێت هیچ کات خەڵکان ئەو کارە بەئێمە ناسپێرن. سوێند بەخوا هیچ کات ئەو پرسیارەی لێ ناپرسم.

گێڕانەوەیەکی دیکەی لەکوڕی عەباس بەم ناوەرۆکە ئاماژەی پێدراوە بەم جیاوازییە کەعەباس وتی: سوێند بەخوا مەرگ لەروخساری پێغەمبەر(د.خ) دەبینم بەهەمان شێوە کە لەروخساری منالەکانی عەبدولموتەلیب بینیوومە. با بڕۆینە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەگەر خەلافەت لەئێمەیە، بزانین و ئەگەر لەکەسانی دیکەیە، پێشنیارەکانی خۆیمان پێ بکات. پێغەمبەر(د.خ) نیمەڕۆی هەمان رۆژ، کۆچی دوایی کرد.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی نەخۆشیدا فەرمووی: حەوت دەفر لەئاوی حەوت چاڵی جیاواز بێنن و بیکەن بەمندا تا بڕۆم و لەگەڵ خەڵکان قسە بکەم.

دەڵێت: بەئاوی حەوت چاڵ پێغەمبەرمان شۆرد و کەمێك ئاسوودە بوو. هاتەدەر و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و وتارێکی پێشکەش کردن. داوای بەخشینی بۆ شەهیدەکانی ئوحود کرد و سەبارەت بەئەنسار پێشنیاری چاکەی کرد، فەرمووی: ئەی موهاجیرەکان، ئێوە فراوان دەبن بەڵام ئەنسار نا و بەهەمان شێوەی ئێستایان دەمێننەوە، ئەنسار پشتیوانی منن و پەنام بۆ ئەوان برد، رێزیان لێبگرن و لەخراپەکارانیان خۆش بن.

دوای ئەوە فەرمووی: یەکێك لەبەندەکانی سەرپشك کرا بڕواتە لای خواوەند یا لەدنیا بمێنێتەوە و گەڕانەوە بۆ لای خوای هەڵبژارد. تەنیا ئەبوبەکر تێگەیشت وبەکوڵ گریا. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر ئارام بە، هەموو ئەو دەرگایانەی بەرووی مزگەوتا دەکرێنەوە ببەستن جگە لەدەرگایماڵەکەی ئەبوبەکر چوونکە لەناو هاوەڵانم کەس بەباشتر لەو نازانم.

عایشە دەڵێت: لەکاتی نەخۆشی، دەرمانی لەدەوری دەمی پێغەمبەر(د.خ) دەدا، فەرمووبووی دەوا لەدەمی من نەدەن. ئێمە گومانمان کرد لەبەر ئەوەیە کەنەخۆش دەرمانی خۆش ناوێت، کاتێك هاتەخۆی، فەرمووی: دەبێت دەرمان لەدەمی ئێوە بدەن جگە لەعەباس کەئامادە نەبوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێک نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) تەشەنەی سەند و لەهۆش خۆی چوو، لەژنەکانی دایکی سەلمە و مەیموونە و چەند ژنێکی دیکە و لەناویان ئەسما کچی عەمیس لەدەوری کۆبوونەوە. عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب لەوێ بوو. بڕیاریاندا دەرمان لەدەمی پێغەمبەر(د.خ) بدەن. عەباس وتی: من ئەو کارە دەکەم.

کاتێک دەرمانیان لێدا، پێغەمبەر(د.خ) هاتەخۆی و فەرمووی: کێ ئەو کارەی کرد؟

وتیان: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، عەباسی مامت. فەرمووی: ئەمە دەرمانێکە ژنان لەحەبەشەوە هێناویانە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بۆ ئەو کارەتان کرد؟

عەباس وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ) دەترساین نەخۆشی (ذات الجنب) هەبێت.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: هەرگیز، خوا بەو نەخۆشییە ئازاری من نادات. هەرکەس لەمماڵەیە جگە لەمامم، ئەو دەرمانە لەدەمی بدات.

عایشە وتی: کاتێک بەپێغەمبەریان وت دەترساین ئەو نەخۆشییەت هەبێت، فەرمووی: ئەمە نەخۆشیی شەیتانە و خواوەند ئەو بەسەر مندا زاڵ ناکات.

کوڕی موحنەف دەڵێت: کاتێک نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) تەشەنەی سەند و لەهۆش چوو، ژنەکانی و کچەکەی و هەموو بنەماڵەکەی و لەناویان عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەدەوری کۆبوونەوە. ئەسما کوڕی عەمیس وتی: نەخۆشییەکەی ئەو ذات الجنبة، دەرمان لەدەمی بسوون و کاتێک ئەو کارەیان کرد، پێغەمبەر(د.خ) هاتە هۆش و فەرمووی: کێ ئەو کارەی کرد؟

وتیان: ئەسما کچی عەمیس چوونکە گومانی دەکرد ئەوە نەخۆشییەکەی تۆیە.

فەرمووی: لەو نەخۆشییە پەنا بۆ خوا دەبەم، لای خوا ڕێزدارتر لەوەم بەو نەخۆشییە گرفتارم بکات.

ئوسامە کوڕی زەید دەڵێت: کاتێک نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) سەخت بوو، گەڕامەوە بۆ مەدینە، خەڵکانیش هاتن. ڕۆشتینە لای پێغەمبەر(د.خ)، بێدەنگ بوو. دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. زانیم دۆعا بۆ من دەکات.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چەندین جار فەرموویووی: خواوەند گیانی هیچ پێغەمبەرێک ناگرێت مەگەر ئەوەی سەرپشکی بکات.

ئەرقەم کوڕی شورەحبیل دەڵێت: لەکوڕی عەباسم پرسی: ئایا پێغەمبەر(د.خ)

وەسیەتی کرد؟

وتی: نە.

وتم: چۆن وەسییەتی نەکرد؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: عەلی بانگ بکەن.

بەڵام عایشە وتی: ئەگەر کەسێك بەدوای ئەبوبەکردا بنێریت.

حەفسە وتی: کەسێك بەدوای عومەردا بنێرە.

هەموویان لای پێغەمبەر(د.خ) کۆبوونەوە و فەرمووی: بڕۆن ئەگەر کارم بەئێوە بێت کەسێك دەنێرم بەشوێنتانا.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: کاتی نوێژە؟

وتیان: بەڵێ.

فەرمووی: بەئەبوبەکر بڵێن پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات.

عایشە وتی: ئەو پیاوێکی دڵ ناسکە، با عومەر کوڕی خەتاب ئەو کارە بکات.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەعومەر بڵێن.

عومەر وتی: هیچ کات بەئامادە بوونی ئەبوبەکر پێشی ناکەوم.

ئەبوبەکر پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد. پێغەمبەر(د.خ) کەمێك باشتر بوو و ڕۆشتەدەر. کاتێك ئەبوبەکر هەستی بەهاتنی پێغەمبەر(د.خ) کرد، هێواش هێواش کشایە دواوە، پێغەمبەر(د.خ) جلەکانی ئەوی گرت و ناچاری کرد لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە.

عایشە دەڵێت: لەنەخۆشی پێغەمبەر(د.خ)، بانگیان فەرموو، فەرمووی: بەئەبوبەکر بڵێن لەگەڵ خەڵکان نوێژ بخوێنێت.

وتم: ئەو پیاوێکی دڵ ناسکە و ناتوانێت لەجێگەی تۆ بێستێت.

دووبارە فەرمووی: بەئەبوبەکر بڵێن لەگەڵ خەڵکان نوێژ بخوێنێت. قسەکەم دووبارە کردەوە، پێغەمبەر(د.خ) توڕە بوو و فەرمووی: ئێوە هاوڕێیانی یوسفن.

لەگێڕانەوەی کوڕی وەکیعدا هاتووە، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ژنان بەسەرهاتەکەی یوسفن، بڵێن ئەبوبەکر پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەسەر دەستی دوو پیاو ڕۆشتەدەر. قاچی بەسەر زەویدا رادەکێشا و کاتێك لەئەبوبەکر نزیك کەوتەوە، ئەبوبەکر کشایە دواوە، پێغەمبەر(د.خ) ئیشارەی پێکرد تا لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە و خۆی دانیشت و بەدانیشتانەوە نوێژی خوێند.

عایشە دەڵێت: ئەبوبەکر بەدوای نوێژەکەی پێغەمبەر(د.خ) نوێژی دەخوێند و خەڵکان بەدوای نوێژەکەی ئەبوبەکر.

واقدی دەڵێت: لەباوکی سەبرەم پرسی: ئەبوبەکر چەند جار پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد؟

وتی: حەفدە نوێژ.

وتم: کێ بەتۆی وت؟

وتی: ئەیووب کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی سەعسەعە لەیەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری بیستبوو.

عێکرەمە دەڵێت: ئەبوبەکر بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێشنوێژی بۆ خەڵکان کرد.

عایشە دەڵێت: لەسەرەمەرگدا پێغەمبەرم بینی، دەفرێك ئاو لەتەنیشتییەوە بوو، دەستی خۆی بۆ دەفرەکە دەبرد و ڕوخساری فێنك دەکردەوە و دەیفەرموو: خواوەندا بۆ سەختییەکان هاوکاریم بکە.

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: ئەو ڕۆژی دووشەممەی پێغەمبەری تیا مرد، کاتێك خەڵکان بۆ نوێژ ڕیزیان بەستبوو، بەرەو لای ئەوان بەرێکەوت. پەردەکەی لابردو دەرگای کردەوە و لەبەردەمماڵەکەی عایشە وەستا. زۆری نەمابوو موسوڵمانان لەخۆشی بینینی پێغەمبەر(د.خ) نوێژەکەیان بشکێنن، ڕێگەیان کرد و ئەو بەدەست ئیشارەی کرد تا بەردەوام بن. لەنوێژ کردنی ئەوان خۆشحاڵ و بزەیەك کەوتە سەر لێوی. هیچ کات پێغەمبەرەم لەو کاتەی باشتر نەبینیبوو. گەڕایەوە و خەڵکان ڕۆشتن. گومانیان کرد نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی پێهاتووە. ئەبوبەکر گەڕایەوە بۆ سەنح بۆ لای خێزانەکەی.

ئەبوبەکر کوڕی عەبدوللە دەڵێت: لەڕۆژی دووشەممە پێغەمبەر(د.خ) سەری خۆی بەستبوو، بۆ نوێژی بەیانی هاتەدەر، ئەبوبەکر لەگەڵ خەڵکان نوێژی دەخوێند. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) هات خەڵك ڕێگەیان کردەوە و ئەبوبەکر زانی ئەم کارەیان بۆ پێغەمبەر(د.خ) کردووە. لەجێگەکەی خۆی دوورکەوتەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکە.

پێغەمبەر(د.خ) لای ڕاستی ئوبەبەکر دانیشت و بەدانیشتنانەوە نوێژی خوێند. کاتێك کۆتاییان بەنوێژ هێنا، ڕووی کرد خەڵکان و دەنگی بەرز کردەوە بەشێوەیەك

لەدەرەوەی مزگەوتیش خەڵکان دەیانبیست. فەرمووی:

ئەی خەڵکینە، ئاگرەکان داگیرسان و فیتنەکان هاوشێوەی شەوی تاریک هاتن، سوێند بەخوا ناتوانن رەخنە لەمن بگرن چوونکە جگە لەوەی قورئان حەلاڵی کردووە بۆ ئێوە م حەلاڵ نەکرد و تەنیا ئەوەم لێ حەرام کردن کەقورئان حەرامی کرد.

کاتێک پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەوتەکانی هێنا، ئەبوبەکر پێی وت: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، دەبینم لەبەخشینەکانی خواوەند بەو شێوەی ئێمە دەخوازین. ئەمڕۆ سەرەی کچی خاریجەیە و من دەڕۆمە لای ئەو. پێغەمبەر(د.خ) بۆ ماڵەکەی گەڕایەوە و ئەبوبەکر بۆ سەنح.

عایشە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(د.خ) ئەو رۆژە لەنوێژ گەڕایەوە، لەداوێنی مندا خەوت. یەکێک لەبنەماڵەی ئەبوبەکر هات و سیواکێکی سەوزی لەدەستا بوو. پێغەمبەر(د.خ) سەیری دەستی ئەوی کرد. زانیم سیواکەکەی دەوێت. وەرمگرت و ساویم تانەرم بوو. دواتر دامە دەستی پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێت: زۆر بەسەختی سیواکەکەی بەکار دەهێنا. کەمتر لەو حاڵەدا بینیبووم. فریدا. هەستم کرد پێغەمبەر(د.خ) لەداوێنم سەنگین و قورس دەبێت. سەیری روخساریم کرد و بینیم چاوەکانی بریوەتە یەک جێگە و دەفەرمێت: هاوڕێ لەسەرەوەی بەهەشت.

وتم: سوێند بەو کەسەی تۆی بەراستی ڕەوانە فەرموو، سەرپشکیان کردی و هەڵتبژارد.

هەمان سات پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەسەر سینەی من و لەماڵەکەی من گیانی سپارد. مافی کەسم نەخوارد، نەزان و کەم ئەزموون بووم، پێغەمبەر(د.خ) لەداوێنی من مرد، سەری ئەوم خستە سەر سەرینێک و لەگەڵ ژنان دەستمان بەگریان و شین وڕۆڕۆ کرد.

## رۆژی مردنی پێغەمبەر(د.خ) وتەمەنی ئەو لەکاتی مردن

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەرۆژی مردنەکەی لەنێوان زاناکان جیاوازی نییە. رۆژی دووشەممەی مانگی رەبیع الاول بوو. بەڵام جیاوازی لەوەدایە کام دووشەممەیە.

دەستەیەك لەزمانی زاناکانی حیجاز دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) نیمەڕۆی دووشەممەی دووەمی رەبیع الاول کۆچی دوایی کرد و لەهەمان رۆژ لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان بەست.

واقدی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممەی دوانزەری رەبیع الاول چاوی لەجیهان بەست و نیمەڕۆی رۆژی دواتر(رۆژی سێ شەممە) لەکاتی ئاوا بوونی هەتاو، بەخاك سپێردرا.

باوکی هورەیرە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، عومەر کوڕی خەتاب هەستا و وتی: کەسانێك لەریاکاران گومانیان کردووە پێغەمبەر(د.خ) مردووە، سوێند بەخوا نەمردووە بەڵکو گەڕاوەتەوە بۆ لای خواوەند بەهەمان شێوە کەموسا کوڕی عیمران گەڕایەوە بۆ لای خواوەند و چل رۆژ لای خوا بوو و دوای ئەوەی خەڵکەکەی وتیان مردووە، گەڕایەوە بۆ ناویان، سوێند بەخوا پێغەمبەر(د.خ) دەگەڕێتەوە و دەست و پێی ئەوکەسانە دەبڕێت کەگومانیان کردووە پێغەمبەر(د.خ) مردووە.

دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە، هات و لەدەرگای مزگەوت دابەزی. عومەر لەگەڵ خەڵکان قسەی دەکرد. ئەبوبەکر گرنگی پێنەدا و رووی کردە ماڵی عایشە. جەستەی پێغەمبەر(د.خ) لەسووچێکدا و حیلەیەکی رەشیان پیادابوو. پۆشت و حیلەکەی لابرد. روخساری پێغەمبەری ماچ کردو وتی: دایك و باوکم قوربانی تۆبن، ئەو مەرگەی بریاری لێدرابوو، چێشتت و چیتر هیچ کات تامی مەرگ ناچێژیت.

بەپارچەکە ڕوخساری پێغەمبەری داپۆشی و هاتەدەر. عومەر لەقسەکانی بەردەوام بوو، پێی وت: ئەی عومەر ئارام بە و گوێ بگرە. بەڵام عومەر لەقسە کردن بەردەوام بوو.

کاتێك ئەبوبەکر بینی عومەر گوێ ناگرێت، رووی کردە خەڵکان. کاتێك خەڵکان قسەکانی ئەویان بیست، گوێیان لەعومەر کوڕی خەتاب نەگرت.

ئەبوبەکر سپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، هەرکەس محەممەدی دەپەرەست، محەممەد مرد و هەرکەس خوای دەپەرەستی، خوا زیندووە و نەمرە. دواتر

ئەم ئایەی خوێندەوە:

((وما محمد الا رسول الله قد خلت من قبله الرسل أفان مات لو قتل انقلبتم على اعقابكم و من ينقلب على عقيبه فلن يضر الله شيئاوسيجزى الله الشاكرين.

واتاكەی: محەممەد تەنیا نێردراوێكە و پێش ئەویش نێردراوەكان مردوون. ئایا ئەگەر بمرێت یا بكو ژریت پاشەكشێ دەكەن. هەركەس پاشەكشێ بكات، هیچ زیانێك لەخوا نادات و خوا پاداشتی چاكەكاران دەداتەوە.))

دەڵێت: سوێند بەخوا خەڵكان نەیاندەزانی ئەم ئایە بۆ پێغەمبەر(د.خ) هاتۆتەخوار تا ئەو رۆژەی ئەبوبەكر خوێندییەوە.

عومەر دەڵێت: كاتێك بیستم ئەبوبەكر ئەم ئایەی خوێندەوە، لەپێ كەوتم، قاچەكانم نەیاندەتوانی قورسایی جەستەم رابگرن و لەمردنی پێغەمبەر(د.خ) دڵنیا بووم.

ئیبراهیم دەڵێت: كاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەبوبەكر ئامادە نەبوو. دوای سێ رۆژ هات و كەس نەیوێرابوو روخساری پێغەمبەر(د.خ) بكاتەوە تا ئەوەی رەنگی پێستی سكی گۆڕا. ئەبوبەكر پۆششەكەی سەر روخساری پێغەمبەری لابرد و ناوچاوانی ماچ كرد، وتی: دایك و باوكم قوربانی تۆبن، لەژیان پاك و خاوێن بوویت و لەمەرگیش بەهەمان شێوە. دواتر پۆشتەدەر، سپاسی خوای كرد و وتی: هەركەس خوای دەپەرەستی، خواوەند زیندووە و نەمرە و هەركەس محەممەدی دەپەرەستی، محەممەد مرد. دواتر ئایەی و ما محمد الا رسول الله ی خوێندەوە.

عومەر دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) نەمردووە. هەڕەشەی كوشتنی لەوكەسانە دەكرد كەدەیانوت پێغەمبەر(د.خ) مردووە.

لەو كاتەدا ئەنسار لەسەقیفەی منداڵەكانی ساعیدە كۆبوونەوە تا لەگەڵ سەعد كوڕی عوبادە بەیعەت ببەستن. ئەبوبەكر ئاگادار بوویەوە ولەگەڵ عومەر و باوكی عوبەیدەی جەراح بۆ لای ئەوان بەرێكەوت و وتی:

چیتان دەوێت؟

وتیان: ئەمیرێك لەئێمە و ئەمیرێك لەئێوە.

ئەبوبەكر وتی: ئەمیرەكان لەئێمە بن و وەزیرەكان لەئێوە.

ئەبوبەكر وتی: من یەكێك لەم دوو پیاوە پەسەند دەكەم، عومەر یا باوكی عوبەیدەی جەراح. خەڵكانێك هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتیان: كەسێكی ئەمین لەگەڵ ئێمە

ڕەوانە بکە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەمینێکی ڕاستەقینە لەگەڵ ئێوە ڕەوانە دەکەم و باوکی عوبەیدەی جەراحی ڕەوانە فەرموو. من باوکی عوبەیدە بۆ ئێوە پەسەند دەکەم. لەم کاتەدا عومەر هەستا و وتی: کێ ڕازی دەبێت کەسێك دوا بخات کەپێغەمبەر ئەوی پێشخستووە. ئەمەی وت ولەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتی بەست و خەڵکانیش بەیعەتیان بەست. ئەنسار یا دەستەیەك لەئەنسار وتیان: ئێمە تەنیا لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب بەیعەت دەکەین.

زیاد کوڕی کولەیب دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە ماڵی عەلی کوڕی ئەبی تالیب. تەڵحە و زوبەیر و کەسانێك لەموهاجیرەکان لەوێ بوون. وتی: ئەگەر بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ ئەبوبەکر نەیێن، ماڵەکە دەسوتێنم. زوبەیر بەشمشێری دەرکێشرا پەلاماریدا بەڵام خزا و شمشێرەکە لەدەستی کەوتە خوار و هەستان و ئەویان گرت.

حەمید کوڕی عەبدولرەحمانی حەمیری دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەبوبەکر لەمەدینە نەبوو. کاتێك هات و روخساری پێغەمبەری کردەوە و ماچی کرد، وتی: دایك و باوکم قوربانت بن، لەژیان پاك و خاوێن بوویت و لەمەرگیش بەهەمان شێوە، سوێند بەخوای کەعبە محەممەد مردووە.

دواتر بەرەو مینبەر ڕۆشت. عومەر وەستا بوو، هەڕەشەی لەخەڵکان دەکرد و دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) زیندووە و نەمردووە. دەست و پێی ئەو کەسانە دەبڕێتەوە ئەم بوختانەی بۆ هەڵدەبەستن ولەداریان دەدات.

ئەبوبەکر دەستی بەقسە کرد وبەعومەری وت: بێدەنگ بە. بەڵام بێدەنگ نەبوو. ئەبوبەکر وتەکانی دەستپێکرد، وتی: خواوەند بەپێغەمبەری فەرموو:

((انك میت و انهم میتون، ثم انکم یوم القیامة عندر بکم تختصمون.

واتاکەی: تۆ شیاوی مردنیت و ئەوانیش شیاوی مردنن. و دواتر لەرۆژی پەسەڵان لەبەردەم پێشگای خواوەند گفتوگۆ دەکەن وئایەی و ما محمد الا رسول الله ی تا کۆتایی خوێندەوە. وتی: هەرکەس محەممەدی دەپەرەست، ئەو خوایەی دەیپەرەست، مرد و هەرکەس خواوەندی تاقانە دەپەرەستێت، خواوەند زیندووە و هیچ کات نامرێت.

دەڵێت: کەسانێك لەئەسحابی پێغەمبەرمان بینی و سوێندیان دەخوارد نەیاندەزانی ئەم ئایە هاتۆتەخوار تا ئەو کاتەی ئەبوبەکر خوێندییەوە. هەمان کات یەکێك بەخێرایی هات و وتی: ئەنسار لەژێر سایەوانی مناڵەکانی ساعیدە کۆبوونەوە تا بەیعەت لەگەڵ

کەسێکی خۆیان ببەستن و دەڵێن: ئەمیرێك لەئێمە و ئەمیرێك لەقورەیش.

دەڵێت: ئەبوبەکر و عومەر بەرێکەوتن و یەکتریان رادەکێشا تا گەیشتنە ئەو شوێنە. عومەر وستی قسە بکات بەڵام ئەبوبەکر رێگەی نەدا وعومەر وتی: لەیەك رۆژ دووجار نافەرمانی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ) ناکەم.

ئەبوبەکر قسەکردنی دەستپێکرد و هەموو ئەو ئایە و حەدیسانەی تایبەت بوو بەئەنسار، هێنایە سەرزمان و وتی: دەزانن پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر هەموو خەڵکان بەرێگەیەکدا برۆن و ئەنسار بەرێگەیەکی جیاواز، بەرێگەی ئەنساردا دەرۆم. تۆی ئەی سەعد ئامادە و دانیشتبوویت کە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: قورەیشییەکان لێپرسراوی ئەم کارەن و خەڵکانی چاکەکار شوێنکەوتەی چاکەکانیان بن و خراپەکاران شوێن خراپەکانیان دەکەون.

سەعد کوڕی عوبادە وتی: راست دەکەیت، ئێمە وەزیر و ئێوە ئەمیر.

عومەر وتی: ئەی ئەبوبەکر دەستت بێنە تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستم.

ئەبوبەکر وتی: نا تۆ دەستت بێنە چوونکە بۆ ئەم کارە بەهێزتر لەمنیت.

دەڵێت: عومەر بەهێزتر بوو، هەردووکیان دەیویست دەستی ئەوەی دیکەیان بکاتەوە و دەستی لێ بدات. عومەر دەستی ئەبوبەکری کردەوە و وتی: هێزی من لەگەڵ هێزی تۆدایە.

دەڵێت: خەڵکان بەیعەتیان بەست بەڵام عەلی و زوبەیر بەیعەتیان نەکرد. زوبەیر شمشێری دەرکێشا و وتی: نایکەمە کالان تا ئەو کاتەی بەیعەت لەگەڵ عەلی دەبەستن. ئەبوبەکر و عومەر لەم وتەیە ئاگادار بوونەوە و عومەر وتی: شمشێرەکەی زوبەیر بگرن و بیدەن لەبەرد.

دەڵێت: عومەر بۆ لای عەلی و زوبەیر رۆشت و نابەدڵخواز ئەوانی هێنا و وتی: یا بەدڵخواز بەیعەت بکەن یا نابەدڵ. ئەوان بەیعەتیان کرد.

## داستانی سەقیفە

کوڕی عەباس دەڵێت: قورئانم فێری عەبدولرەحمان کوڕی عەوف دەکرد، عومەر بۆ حەج رووی کردە مەککە، ئێمەیش لەگەڵی ڕۆشتین. لەمەنی بووین و عەبدولرەحمان هات و وتی: ئەمڕۆ سەروەری باوەڕدارانم بینی. کەسێك لای ئەو هەستا و وتی: بیستوومە فلاَن کەس دەیوت: ئەگەر سەروەری باوەڕداران بمرێت، لەگەڵ فلاَن کەس بەیعەت دەبەستم.

عومەر وتی: ئەمشەو قسە لەگەڵ خەڵکان دەکەم وئەو کەسانەی دەیانەوێت، کاروباری خەڵکان پەرێشان بکەن، ئاگادار دەکەمەوە.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەکاتی حەج پشێوی و ئاژاوە دروست دەبێت و زۆربەی ئامادەبووانی دانیشتەکەی تۆ لایەنگری ئەوان دەکەن، دەترسم لەقسەکانی تۆ تێنەگەن و بەشێوەی جیاواز لێکدانەوەی بۆ بکەن، چاوەڕێ بکە تا دەگەڕێیتەوە بۆ مەدینە چوونکە ماڵی کۆچ و سوونەتە. هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەئەنسار و موهاجیر لەوێ نیشتەجێن و لەوێ قسە بکە چوونکە بەباشی لەمەبەستەکەی تۆ دەگەن.

عومەر وتی: سوێند بەخوا یەکەم جار کە لەمەدینە قسەم بکەم، ئەو کارە دەکەم.

دەڵێت: کاتێك گەیشتینە مەدینە و ڕۆژی هەینی داهات، لەبەر ئەو قسانەی عەبدولرەحمان لای من باسی کردبوو، ڕۆشتمە مزگەوت و سەعید کوڕی زەیدم بینی. ئەو، زووتر لەمن ڕۆشتبوو بۆ مزگەوت. لەنزیك مینبەر لای ئەو دانیشتم. کاتێك خۆر ئاوا بوو، عومەر هات. کاتێك هات بەسەعیدم وت: ئەمڕۆ سەروەری باوەڕداران لەسەر ئەو مینبەرە وتارێك پێشکەش دەکات پێشتر ئەو کارەی نەکردووە.

سەعید توڕە بوو و وتی:چ وتارێك کەپێشتر باسی نەکردووە؟

کاتێك عومەر لەسەر مینبەر دانیشت، بانگیان فەرموو. کاتێك بانگ کۆتایی هات، عومەر هەستا و سپاسی خوای کرد و وتی: دەمەوێت وتارێکتان پیشکەش بکەم. هەرکەس تێدەگات بڕوات و کەسانی دیکەی لێ ئاگادار بکاتەوە و هەرکەس تێناگات مافی ئەوەی نییە بوختان بۆ من هەڵبەستێت. خواوەند محەممەدی بەراستی ڕەوانە فەرموو و کتێبەکەی خۆی بۆ ئەو ناردەخوار. یەکێك لەو شتانەی لەقورئاندا باسی کراوە بەردباران بوو و محەممەد بەردبارانی کرد و ئێمەیش دوای ئەو، بەردبارانمان کرد. دەترسم کاتێکی زۆر نەخایەنێت و کەسێك بڵێت بەردباران لەناو قورئاندا نابینین و

ئەوەی خواوەند ڕەوانەی کردووە، پشتگوێی بخەن و گومڕا بن. ئێمە وتمان: پشت مەکەنە سوونەتەی باوکانتان چوونکە هەڵگەڕانەوە لەسوونەتی ئەوان سەرچاوەی کوفرە. بیستوومە یەکێك لەئێوە وتوویەتی ئەگەر سەروەری باوەڕداران بمرێت، لەگەڵ فڵان کەس بەیعەت دەکەین. هیچ کەس فریو نەخوات و نەڵێت بەیعەت کردن لەگەڵ ئەبوبەکر لەناکاو بوو. بەمشێوە بوو بەڵام خواوەند شەڕی ئەو کەسە دوور بخاتەوە و کەس لەئێوە نییە هاوشێوەی ئەبوبەکر خەڵکان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن. داستانی ئێمە بەو شێوەیە کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد و عەلی و زوبەیر و کەسانێکی دیکە لەماڵی فاتیمە مانەوە، ئەنسار پێچەوانەی ئێمە جووڵانەوە، موهاجیرەکان لای ئەبوبەکر کۆبوونەوە و من پێم وت با بڕۆینە لای براکانمان لەئەنسار. ڕۆشتین و دوو پیاوی خۆپارێزمان بینی کە لەشەڕی بەدر ئامادە بوون، وتیان: ئەی دەستەی موهاجیرەکان بۆ کوێ دەڕۆن؟

وتمان: بۆ لای براکانمان لەئەنسار.

وتیان: بگەڕێنەوە و لەناو خۆتان کۆتایی بەم پرسە بێنن.

وتمان: سوێند بەخوا دەڕۆینە لای ئەوان.

دەڵێت: ڕۆشتینە لای ئەنسار کە لەسەقیفەی منداڵەکانی ساعیدە کۆببوونەوە. پیاوێك خۆی لەجل و بەرگەوە ئاڵاندبوو، وتم: ئەمە کێیە؟

وتیان: سەعد کوڕی عوبادە.

وتم: بۆ بەو شێوەیە؟

وتیان: نەخۆشە.

یەکێك لەئەنسار هەستا و سپاسی خوای کرد و وتی: ئێمە ئەنسار و دەستەی موسوڵمانین و ئێوە قورەیشییەکان دەستەی پێغەمبەر(د.خ). ئێمە لەخەڵکەکەی ئێوە زیانی زۆرمان پێبڕا.

دەڵێت: بینیم خەڵکان دەیانەوێت ئێمە پشتگوێ بخەن و جڵەوی کارەکان لەدەستی ئێمە دەربێنن. وتارێکم ئامادە کردبوو تا لەبەردەم ئەبوبەکر بیهێنمە سەرزمان. ڕێزی ئەوم دەگرت چوونکە بەئەزموونتر لەمن بوو. کاتێك ویستم دەست بەقسە بکەم، وتی: ئارام بە. نەمویست نافەرمانی ئەو بکەم. ئەبوبەکر هەستا و سپاسی خوای کرد و ئەوەی من دەمویست بیهێنمە سەرزمان، ئەو بەشێوەیەکی زۆر جوانتر باسی کرد، وتی: ئەی ئەنسارییەکان، هەرچەند باسی لەپێشی و گەورەیی خۆتان بکەن، شیاون، بەڵام

عەرەبەکان ئەم کارە تەنیا بۆ قورەیشییەکان دەزانن چوونکە شوێن و ڕەچەڵەکیان بەرزترە. من یەکێك لەم دوو پیاوە بۆ ئێوە پەسەند دەکەم. لەگەڵ هەرکامیان دەخوازن، بەیعەت ببەستن. دەستی من و دەستی باوکی عوبەیدەی جەراحی گرت. سوێند بەخوا لەوتەکانی ئەو تەنیا ئەمەم پەسەند نەکرد حەزم دەکرد بمکوژن بێ ئەوەی گوناحێکم کردبێت بەلاّم نەبمە سالاری ئەو خەڵکەکەی ئەبوبەکر لەناویاندایە. کاتێك ئەبوبەکر کۆتایی بەوتەکانی خۆی هێنا، یەکێك لەئەنسار هەستا و وتی: من پیاوێکی بەئەزموون و سارد و گەرمی ژیانم چێشتووە، ئەی قورەیشییەکان ئەمیرێك لەئێمە و ئەمیرێك لەئێوە.

دەڵێت: دەنگە دەنگ بەرز بوویەوە و لەجیاوازی و دووبەرەکی ترسام. بەئەبوبەکرم وت: دەستت بێنە پێش تابەیعەت لەگەڵ تۆ بکەم. دەستی هێنایە پێش و بەیعەتم لەگەڵ بەست. موهاجیرەکانیش بەیعەتیان بەست و بەدوای ئەو ئەنسارییەکان.

سەعد کوڕی عوبادە لەژێر دەست و پێی ئێمە مایەوە و یەکیان وتی: سەعد کوڕی عوبادەتان کوشت.

وتم: خواوەند سەعد کوڕی عوبادە بکوژێت.

سوێند بەخوا هیچ کارێك لەبەیعەت کردن لەگەڵ ئەبوبەکر سوودمەندتر نەبوو چوونکە دەترسام ئەگەر جیاببینەوە و بەیعەت لەئارادا نەبێت، ناچار بین نابەدڵخواز ببینە شوێنکەوتەی ئەوان یا دژایەتییان بکەین و بەمشێوەیە ئاژاوە سەرهەڵبدات.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: یەکێك لەو دوو پیاوەی عومەر و ئەبوبەکر لەکاتی ڕۆشتن بۆ سەقیفیە بینیان، عوەیم کوڕی ساعیدە و ئەوەی دیکەیان مەعن کوڕی عودەی عێجلی بوو.

عوەیم کوڕی ساعیدە ئەو کەسە بوو کاتێك بە پێغەمبەریان وت: ئەم ئایە سەبارەت بەچ کەسانێکە کەخوا دەفەرمێت:

((رجال يحبون ان يتطهروا و الله يحب المطهرين.

واتاکەی: پیاوانێك هەن حەز دەکەن پاکیزەیی بکەنە پیشە و خواوەند پاك وخاوێنانی خۆش دەوێت.))

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: عوەیم کوڕی ساعیدە یەکێکە لەوان.

مەعن ئەو کەسە بوو کاتێك خەڵکان بۆ پێغەمبەر(د.خ) دەگریان و دەیانوت: خۆزگە

پێش ئەو مردبووین چوونکە دەترسین دوای ئەو گرفتاری ئاژاوە و دووبەرەکی ببین.
وتی: سوێند بەخوا حەز ناکەم پێش ئەو مردبێتم چوونکە دەمەوێت دوای مردنیش وتەکانی پشتڕاست بکەمەوە بەهەمان شێوە کە لەکاتی ژیان پشتڕاستم کردەوە. مەعن لەرۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکر لەیەمامە لەکاتی شەر لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن، کوژرا.

زوهری دەڵێت: لەسەعید کوڕی زەیدیان پرسی: ئایا لەکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە بوویت؟

وتی: بەڵێ.

وتیان: چ کاتێك لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان کرد؟

وتی: هەمان رۆژی مردنی پێغەمبەر(د.خ).

پرسیان: ئایا کەس دژایەتی ئەوانی کرد؟

وتی: نا، تەنیا دەستەیەك لەئەنسار کە هەڵگەڕاوە بوون یا لەهەڵگەڕانەوە نزیك بوون و خواوەند رزگاری بەخشین.

پرسییان: ئایا هەموو موهاجیرەکان بەیعەتیان لەگەڵ کرد؟

وتی: بەڵێ، موهاجیرەکان بێ ئەوەی بانگیان بکەن، یەك لەدوای یەك بەیعەتیان لەگەڵ کرد.

حەبیب کوڕی ئەبی سابت دەڵێت: عەلی لەماڵەکەی خۆیدا بوو کەهاتن و وتیان: ئەبوبەکر بۆ بەیعەت کردن دانیشتووە، ئەو بەکراس و بێ ئەوەی عاباکەی بخاتە سەرشانی، رۆشتەدەر چوونکە پەلەی بوو و نەیدەویست لەبەیعەت کردن دوا کەوێت. لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتی کرد و لای دانیشت و کەسی نارد تا لەماڵەوە عاباکەیان بۆ هێنا.

زوهری دەڵێت: فاتیمە و عەباس رۆشتنە لای ئەبوبەکر و داوای میراتی پێغەمبەریان کرد. ئەوان زەوی فەدەك و بەشی خەیبەریان دەویست. ئەبوبەکر پێی وتن: لەپێغەمبەرم بیست کەفەرمووی: ئێمە میراتمان نییە و ئەوەی لەئێمە دەمێنێتەوە، خێرە. بنەماڵەی محەممەد تەنیا لەم ماڵە دەخۆن. من گۆڕانکاری لەفەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) ناکەم.

دەڵێت: دوای ئەوە فاتیمە خۆی لەئەبوبەکر دوور خستەوە و هیچ کات لەمبارەوە قسەی لەگەڵ نەکرد تا مرد. عەلی لەکاتی شەودا ئەوی بەخاك سپارد بێ ئەوەی ئەبوبەکر ئاگادار بکاتەوە.

عەلی لەکاتی ژیانی فاتیمە چەندین کەسی لەدەوردا بوو. کاتێك فاتیمە مرد، ئەو کەسانەیش لەدەوری عەلی بڵاوەیان لێکرد. مردنی فاتیمە شەش مانگ دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

یەکێك بەزوهری وت: عەلی بۆ ماوەی شەش مانگ بەیعەتی لەگەڵ ئەبوبەکر نەکرد؟

وتی: نە عەلی بەیعەتی کرد نە هیچ کام لەمناڵەکانی هاشم. کاتێك عەلی بینی خەڵك لەدەوری بڵاوەیان لێکردووە، ڕێگەی ئاشتی لەگەڵ ئەبوبەکر گرتەبەر وکەسی نارد بەشوێن ئەبوبەکر و پێی وت بەتەنیا بێت چوونکە حەزی نەدەکرد عومەر لەگەڵی بڕوات لەبەر ئەوەی لەتوڕەی عومەر دەترسا.

بەڵام عومەر وتی: بەتەنیا مەڕۆ.

ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا بەتەنیا دەڕۆم، مەگەر چی دەکەن.؟

دەڵێت: ئەبوبەکەر ڕۆشتتە لای عەلی و مناڵەکانی هاشم لەدەوری دانیشتبوون. عەلی هەستا و سپاسی خوای کرد و وتی: بەیعەت نەکردنی ئێمە لەگەڵ تۆ لەبەر ئەوە نییە تۆ بەکەسێکی گەورە نەزانین یا ڕژدی بەتۆ ببەین، بەڵام بۆ ئەم کارە مافێکمان بوو و لەبەرچاوتان نەگرت.. باسی خزمایەتی خۆی و مناڵەکانی هاشمی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کرد بەرادەیەك ئەبوبەکر دەستی بەگریان کرد.

کاتێك عەلی بێدەنگ بوو، ئەبوبەکر شایەتوومانی هێنایە سەرزمان وسپاسی خوای کرد، وتی: سوێند بەخوا خزمەکانی پێغەمبەرم زیاتر لەخزمەکانی خۆم خۆش دەوێت. سەبارەت بەو ماڵ و مڵکەی لەنێوان ئێمەدا کێشەی درووست کردووە، نییەتی خێرم بوو و بیستوومە پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: هیچ لەئێمە بەمیرات نابەن، هەرچیمان لێ بمێنێتەوە تەنیا بۆ خێرە، بنەماڵەی محەممەد تەنیا لەم ماڵە دەخۆن و من لەپەنای خوا، ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) ئەنجامی دابێت، ئەنجامی دەدەم.

عەلی وتی: کاتی بەیعەتی ئێمە لەگەڵ تۆ ئەمشەو بێت.

ئەبوبەکر نوێژی نیمەڕۆی خوێند و لەوتەکانی داوای بەخشینی لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد.

عەلی هەستا و باسی تایبەتمەندییەکان و لەپێشییەکانی ئەبوبەکری کرد و بەیعەتی لەگەڵ کرد. خەڵکان بەعەلییان وت: کارێکی چاکت کرد و پاداشتت دەستدەکەوێت.

دەڵێت: کاتێك عەلی بەیعەتی کرد، خەڵکان دووبارە لەدەوری کۆبوونەوە.

کوڕی جەڕ دەڵێت: ئەبوسوفیان بەعەلی وت: بۆ خەلافەت لەناو بچوکترین تایەفەی قوڕەیشدا بێت، سوێند بەخوا ئەگەر بخوازیت مەدینە پڕدەکەم لەسوارە شەڕکەرەکان.

عەلی وتی: ئەی ئەبوسوفیان، ماوەیەکی درێژ دوژمنایەتی ئیسلام و موسوڵمانانت کرد و هیچ زیانێکت لێ نەدان، ئەبوبەکر بۆ ئەم کارە شیاوە.

حیماد کوڕی سەلمە دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خەلافەتی گرتەدەست، ئەبوسوفیان وتی: ئێمە کارمان بەباوکی فوزەیل چییە، سوێند بەخوا دووکەڵێك دەبینم و تەنیا خوێن دایدەمرکێنێتەوە. ئەی بنەماڵەی عەبدمەناف، ئەبوبەکر کاری بەئێوە چییە، دو لاوازەکە، عەلی و عەباس لەکوێن.

هەروەها بەعەلی وت: ئەی باوکی حەسەن، دەستت بێنە پێش تابەیعەت لەگەڵ تۆ ببەستم. عەلی دەستی نەبرد و سەرکۆنەی کرد و وتی: تەنیا مەبەستی ئاژاوەگێڕیت لەسەردایە، سوێند بەخوا تەنیا خراپەی ئیسلامت دەوێت، ئێمە پێویستمان بەئامۆژگاری تۆ نییە.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەکر بەست، ئەبوسوفیان بەعەلی و عەباسی وت: ئێوە ریسوا و لاوازن.

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: بەیانی ئەو رۆژەی لەسەقیفە بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەکر بەست، رۆشتە سەر مینبەر و عومەر هەستایە سەر پێ وپێش ئەبوبەکر قسەی کرد. سپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، دوێنێکە وتەیەکم هێنایە سەرزمان، وتەی خۆم بوو و لەقورئاندا شتی لەو شێوەم نەبینیوە و پێغەمبەر(د.خ) بۆی باس نەکردبووم بەڵام گومانم کرد پێغەمبەر(د.خ) رێگە چارە بۆ کارەکانی ئێمە دەدۆزێتەوە و دوای هەمووان دەمرێت، خواوەند کتێبەکەی خۆی لەناو ئێوەدا هێشتەوە و ئێوە لەگەڵ باشترینی خۆتان کەهاورێی پێغەمبەر(د.خ) لەئەشکەوت و هاودەمی ئەو بوو، بەیعەت ببەستن. خەڵکان لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان بەست. ئەمە بەیعەتی گشتی بوو و دوای بەیعەتی سەقیفە ئەنجامدرا.

دوای ئەو، ئەبوبەکر وتارێکی پێشکەش کرد. بەئەندازەی پێویست سپای خوای هێنایە سەرزمان، وتی:

((ئەی خەڵکینە، من کەباشتر لەئێوە نیم بۆ هەڵسووڕاندنی کارەکانی ئێوە راسپێردراوم، ئەگەر چاکەم کرد، هاوکاریم بکەن و ئەگەر خراپەم کرد، رێگەی راستم نیشان بدەن، راستی ئەمانەت و درۆ خیانەت، لاوازی ئێوە لای من بەهێزە تا ئەو کاتەی

بەخواستی خوا مافەکەی بۆ دەگێڕمەوە. بەهێزی ئێوە لای من لاوازە تا ماف لێدەستێنم. پشت مەکەن جیهاد لەرێگەی خوا چوونکە هەر خەڵکێك پشت بکات جیهاد، زەلیل دەبێت. هیچ خراپەیەك لەناو خەڵکان بلاّو نابێتەوە مەگەر ئەوەی گرفتاری بەلاّ بن. تا ئەو کاتەی شوێنکەوتەی خواوەند و پێغەمبەرم، شوێنکەوتەی من بن و ئەگەر نافەرمانی ئەوانم کرد، هیچ ماف و دەسەلاّتێکم بەسەرتانەوە نییە، بۆ نوێژ هەستن، خوا بتانبەخشێت.))

کوڕی عەباس دەڵێت: لەسەردەمی خەلافەتی عومەر لەگەڵ ئەودا رێگەم دەبڕی، بۆ مەبەستێك دەڕۆشت و تەنیا منی لەگەڵ بووم. لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد و بەقامچی لەقاچی راستی خۆی دەدا.

دەڵێت: لەم کاتەدا هەستی بەبوونی من کرد و وتی: ئەی کوڕی عەباس، دەزانی بۆ دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) ئەو وتەم هێنایە سەرزمان؟

وتم: نا ئەی سەروەری باوەڕداران.

وتی: لەبەر ئەوەی ئەم ئایەم خوێندبوویەوە:

((وكذلك جعلناكم امة وسطا لتكونوا شهداء على الناس و يكون الرسول عليكم شهيدا.

واتاکەی: بەمشێوەیە ئێوەمان کردە دەستەیەکی میانڕەو تا بۆ خەڵکان شایەت بن و پێغەمبەر(د.خ) شایەتی ئێوە بێت.))

گومانم کرد لەناو ئۆمەتەکەی خۆی دەمێنێتەوە تا شایەتی کردەوەکانی ئەوان بێت. ئەو قسانەم لەبەر ئەم ئایەی هێنایە سەرزمان.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان کرد، سەرقاڵی کفن و دفنی پێغەمبەر(د.خ) بوون.

دەستەیەك وتوویانە:ئەم کارە لەرۆژی سێشەممە و رۆژی دوای مردنی ئەو ئەنجام درا. دەستەیەکی دیکە وتوویانە: پێغەمبەریان سێ رۆژ دوای مردن بەخاك سپارد. پێشتر ئاماژەمان بەحەدیسی یەکێك لەواندا.

کوڕی عەباس دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب و فەزڵ کوڕی عەباس و قیسەم کوڕی عەباس و ئوسامە کوڕی زەید و شەقران ئازاد کراوی دەستی پێغەمبەر(د.خ)، ئەویان شۆرد. ئەوس کوڕی خەولی، یەکێك لەمناڵەکانی عەوف کوڕی خەزەرج، بەعەلی کوڕی ئەبی تالیبی وت: ئەی عەلی سوێندت دەدەم ماف

ئێمە بۆ پێغەمبەر(د.خ) لەبەر چاو بگریت.

ئەوس یەکێك بوو لەشەڕکەرانی بەدر و عەلی وتی: وەرە ناو. ئەو لەکاتی شۆردنی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە بوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب پێغەمبەری بەسینەی خۆیەوە نووساند و عەباس و فەزڵ و قیسەم ئەویان دەسووڕاند و ئوسامە کوڕی زەید و شەقران ئاویان پیادەکرد و عەلی دەیشۆرد. پێغەمبەر(د.خ) کراسەکەی لەبەردا بوو. عەلی لەسەر کراسەکەوە دەستی لەپێغەمبەر دەدا و دەستی بەر جەستەی پێغەمبەر(د.خ) نەدەکەوت.

عەلی لەکاتی شۆردنی پێغەمبەر(د.خ) دەیوت: دایك و باوکم قوربانت بن، لەژیان و مەرگ پاك وخاوێنیت. ئەوەی لەمردووەکان دەبینرێت، لە پێغەمبەر(د.خ) نەبینرا.

عایشە دەڵێت: دەیانویست پێغەمبەر(د.خ) بشۆن و وتیان: نازانین ئایا پێغەمبەر(د.خ) وەك مردووەکانی دیکە رووت بکەینەوە یا بەجلەکانییەوە بیشۆین. کاتێك لەسەر ئەمە رێکنەکەوتن، خەویان لێکەوت. هەموویان چەناکەیان کەوتبووە سەرسنگیان. دواتر کەسێك کەنەیانزانی کێیە، لەسووچی ماڵی خواوە قسەی لەگەڵ کردن و وتی: پێغەمبەر(د.خ) بەجلەکانییەوە بشۆن.

دەڵێت: هەستان و بەجلەکانییەوە ئەویان شۆرد. لەسەر کراسەکەیەوە ئاویان پیادەکرد و دەستیان لێدەخست. کراسەکە رێگر بوو لەوەی دەستیان بەرجەستەی بکەوێت.

عایشە دەیوت: ئەگەر ئەوەی ئەمڕۆ دەیزانم، ئەو رۆژە دەمزانی، نەمدەهێشت کەس جگە لەژنەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئەو بشوات.

عەلی کوڕی حسەین دەڵێت: کاتێك لەغوسلی پێغەمبەر(د.خ) تەواو بوون، ئەویان لەسێ پارچەدا کفن کرد، دوو پارچەی سەحاری و حیلەیەکی رەش.

عێکرەمە دەڵێت: کاتێك ویستیان گۆڕی پێغەمبەر(د.خ) هەڵکەنن، باوکی عوبەیدە کوڕی جەراح بەشێوەی خەڵکانی مەککە گۆڕی هەڵدەکەند (ئەرزەکەی تەخت بوو)و باوکی تەڵحە زەید کوڕی سەهل بۆ خەڵکانی مەدینە گۆڕەی هەڵدەکەند (بەشێك لەگۆڕەکە چاڵتر لەبەشەکەی دیکە بوو) عەباس دوو کەسی بانگ کرد و بەیەکیانی وت: برۆ بەشوێن باوکی عوبەیدە. بەوی دیکەی وت: برۆ بەشوێن باوکی تەڵحە.،

ئەوی بەشوێن باوکی تەڵحەدا رۆشت، ئەوی هێنا و گۆڕی پێغەمبەری هاوشێوەی خەڵکانی مەدینە هەڵکەند.

کاتێك لەغوسلی پێغەمبەر(د.خ) تەواو بوون، ئەویان لەماڵەکەی خستە سەرتەخت. بۆچوونی موسوڵمانان سەبارەت بەشوێنی ناشتنی ئەوجیاواز بوو. کەسێك وتی: لەمزگەوت بەخاکی دەسپێرین. یەکیتر وتی: ئەو لەگەڵ ئەسحابەکانی بەخاك دەسپێرین.

بەڵام ئەبوبەکر وتی: بیستم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو: پێغەمبەر(د.خ) لەهەر شوێنێکا مرد، لەوێ بەخاکی بسپێرن. لەبەر ئەمە جێگەی پێغەمبەریان لابرد و گۆڕەکەیان لە سەر جێگەکەی بۆ هەڵکەند.

خەڵکان دەستە دەستە هاتن و لەسەر پێغەمبەر(د.خ) نوێژیان خوێند. کاتێك نوێژی پیاوان کۆتایی هات، ژنان هاتن و کاتێك ژنانیش تەواو بوون، تازەپێگەیشتووان هاتن. کەس بۆ نوێژ لەسەر جەستەی پێغەمبەر(د.خ) پێشنوێژی نەکرد. دواتر لەنیوەی شەوی چوارشەممە، بەخاکیان سپارد.

عایشە دەڵێت: نەماندەزانی کەی پێغەمبەر(د.خ) دفن دەکەن تا ئەوەی لەتاریکی شەوی چوارشەممە دەنگی پاچەکانمان بیست.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب و فەزڵ کوڕی عەباس و قیسەم کوڕی عەباس و شەقران کۆیلەی ئازاد کراوی پێغەمبەر(د.خ) ، قاچیان خستە ناو گۆڕەکەی. ئەوس کوڕی خەولی وتی: ئەی عەلی سوێندت دەدەم مافی ئێمەیش لەبەر چاو بگرە. عەلی وتی: وەرە. ئەوەیش ڕۆشتە ناو گۆڕەکەی پێغەمبەر(د.خ).

کاتێك پێغەمبەریان خستە سەر گۆڕ و خشتیان لەسەر دانا، شەقران قەتیفەیەکی هێنا کە پێغەمبەر(د.خ) لەسەری دادەنیشت و دەیپۆشی، خستیە ناو گۆڕەکە وتی: سوێند بەخوا دوای تۆ کەس لەبەری ناکات. قەتیفەکەی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەخاك سپارد.

موغەیرە کوڕی شوعبە دەیوت: دوایین کەس بووە دەستی لەجەستەی پێغەمبەر(د.خ) داوە. دەیوت: ئەنگوستیلەکەی خۆم خستە ناو گۆڕەکە و وتم: ئەنگوستیلەکەم کەوت. بەئەنقەست فڕمدا تا دەست لەجەستەی پێغەمبەر(د.خ) بدەم و دوایین کەس بم ئەو کارەم کردبێت.

عەبدوللە کوڕی حارس دەڵێت: لەسەردەمی عومەر، یا عوسمان، لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب عەمرەمان دەکرد. ئەو، لەماڵی خوشکەکەی دایکی هانی مایەوە و کاتێك لەعەمرە تەواو بووین، گەڕایەوە. ئاوم ئامادە کرد تا خۆی پێبشوات و کاتێك تەواو بوو،

کەسانێك لەخەڵکانی عێراق لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: ئەی باوکی حەسەن، هاتووین پرسیارێك بکەین و حەز دەکەین وەڵاممان بدەیتەوە.

وتی: پێم وابێت موغەیرە کوڕی شوعبە پێی وتن دوایین کەس بووە دەستی لە جەستەی پێغەمبەر(د.خ) داوە.

وتیان: بەڵێ، هاتووین ئەمە بپرسین.

وتی: درۆ دەکات، ئەو کەسەی دوای هەمووان دەستی لەجەستەی پێغەمبەردا، قیسەم کوڕی عەباس بوو.

عایشە دەڵێت: کاتێك نەخۆشییەکەی پێغەمبەر(د.خ) تەشەنی سەند، پارچەیەکی رەشی پێوە بوو. هەندێ کات دەیدا بەروخساریدا و هەندێ کات لایدەبرد و دەیفەرموو: خوا بکوژێت ئەوکەسانەی گۆڕی پێغەمبەرانی خۆیان دەکەنە مزگەوت. رێگەی ئەم کارەی لەخەڵکەکەی خۆی گرت.

عەبدوللە کوڕی عوتەبە دەڵێت: دوایین فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) ئەمە بوو: دوو دین لەدوورگەی عەرەبی جێگەی نابێتەوە.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دوانزەی رەبیع الاول ئەو رۆژەی گەیشتە مەدینە، مرد. دەورانی کۆچی ئەو دە ساڵی تەواو بوو.

## تەمەنی پێغەمبەر( د.خ ) لەکاتی مەرگ

لەمبارەوە بۆچوونەکان جیاوازە. دەستەیەك وتوویانە لەکاتی مەرگ تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.

یەکێك لەبێژەرانی ئەم وتەیە کوڕی عەباسە کەدەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) سیانزە ساڵ لەمەککە وەحی بۆ دەهات و دە ساڵ لەمەدینە و دوای ئەوە مرد.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: لەکاتی مەرگ، تەمەنی شەست ساڵ بوو.

یەکێك لەوان عوروە کوڕی زوبەیرە ودەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) چل ساڵە بوو بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێردرا و شەست ساڵە بوو کۆچی دوایی کرد.

عایشە دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) دەساڵ لەمەککە و قورئانی بۆ دەهاتەخوار. دە ساڵ لەمەدینە ژیانی بەسەر برد.

## رۆژ و مانگی مردنی پێغەمبەر( د.خ )

عەبدوللە کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەساڵی نۆیەمی کۆچ، ئەبوبەکری کردە سەرکردەی حاجییەکان و ڕێ و ڕەسمەکانی حەجی فێری خەڵکان کرد و ساڵی دواتر ساڵی دەیەمی کۆچ، پێغەمبەر(د.خ) حەجی ماڵئاوایی کرد و گەڕایەوە بۆ مەدینە و لەمانگی ڕەبیع الاول گیانی ئەسپەردە کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەرۆژی دووشەممە دوانزەی ڕەبیع الاول کۆچی دوایی کرد و لەشەوی چوارشەممە بەخاك سپێردرا.

عەمرە کچی عەبدولرەحمان دەڵێت: لەعایشەم بیست کەپێغەمبەر لەشەوی چوارشەممە بەخاك سپێردرا و ئێمە نەماندەزانی تا ئەو کاتەی دەنگی پاچەکانمان بیست.

## گفتوگۆی ئەنسار و موهاجیرەكان لەسەقیفیە سەبارەت بەخەلافەت

عەبدولله كوڕی عەبدولرەحمانی ئەنساری دەڵێت: كاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەنسار لەسەقیفەی مناڵەكانی ساعیدە كۆبوونەوە و وتیان: دوای محەممەد ئەم كارە بەسەعد كوڕی عوبادە دەسپێرین. سەعدیان هێنا كەنەخۆش بوو. كاتێك كۆبوونەوە، سەعد بەیەكێك لەكوڕەكان یا ئامۆزەكانی وت: لەبەر نەخۆشی ناتوانم وتەكانم بەگوێی هەموو خەڵكان بگەیێنم، گوێ لەقسەكانی من بگرە و بەدەنگی بەرز دووبارەیان بكەرەوە. ئەو قسەی دەكرد و ئەو پیاوە بەدەنگی بەرز دووبارەی دەكردەوە تا هاوەڵانی ببیستن.

سەعد دوای سپاس كردنی خواوەند وتی:

((ئەی ئەنسارییەكان، ئەو لەپێشی و مێژووەی ئێوە لەئیسلامدا هەتانە، هیچ كام لەهۆزەكانی عەرەب نییانە. محەممەد بۆ ماوەی دە و چەند ساڵ لەناو خەڵكەكەی خۆی مایەوە و پێشنیاری خواپەرەستی پێكردن و تەنیا ژمارەیەكی كەم باوەڕیان پێهێنا چوونكە تواناى بەرگری كردن لە پێغەمبەر(د.خ) و دینەكەی ئەویان نەبوو و نەیاندەتوانی ستەم لەخۆیان دوور بكەنەوە تا ئەوەی خواوەند ویستی لەپێشیتان پێببەخشێت وریزتان بگرێت. باوەڕ هێنان بەپێغەمبەری كردە رۆژی ئێوە و بەرگری كردن لە پێغەمبەر(د.خ) و شەڕكردن لەگەڵ دوژمنەكانی كەوتە ئەستۆی ئێوە. لەگەڵ دوژمنانی ئەو لەخودی و بێگانە شەڕتان كرد تا عەرەبەكان بەدڵخواز و نابەدڵ، ملكەچی فەرمانەكانی خواوەند بوون. خواوەند بەهاوكاری ئێوە ئەم سەرزەمینەی ملكەچی پێغەمبەر(د.خ) كرد و عەرەبەكان لەسێبەری شمشێری ئێوە باوەڕیان بەئیسلام هێنا. پێغەمبەر(د.خ) لەئێوە رازی و شادمان بوو. خواوەند ئەوی گەڕاندەوە بۆ لای خۆی، جڵەوی ئەم كارە بگرنە دەست و رێگە مەدەن كەسانیتر ئەو كارە بگرنە ئەستۆ چوونكە مافی ئێوەیە نەك كەسانی دیكە.))

هەمووان وتیان: بۆچوونەكەت پەسەندە، سەرپێچی فەرمانەكانی تۆ ناكەین و ئەم كارە بەتۆ دەسپێرین چوونكە بڕواپێكراوی موسوڵمانانیت. دواتر لەگەڵ یەك ناخاوتن و وتیان: ئەگەر موهاجیرەكانی قوڕەیش رازی نەبن و بڵێن ئێمە لەهاوەڵە كۆنەكانی پێغەمبەر(د.خ) و خزمەكانی ئەوین، بۆ دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەسەر ئەم كارە دژایەتی ئێمە دەكەن، چی بكەین؟

دەستەیەك لەوان وتیان: لەم شێوەدا دەڵێین: ئەمیرێك لەئێوە و ئەمیرێك لەئێمە. تەنیا بەوە رازی دەبین.

کاتێك سەعد کوڕی عوبادە ئەمەی بیست، وتی: ئەمە یەکەم لاوازییە.

عومەر ئاگادار بوویەوە و بەرەو ماڵی پێغەمبەر(د.خ) بەڕێکەوت. ئەبوبەکر لەوێ ولەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەرقاڵی کفن و دفن کردنی پێغەمبەر(د.خ) بوون. ئەبوبەکری بانگ کردەدەر.،

وتی: سەرقاڵم.

عومەر دووبارە کەسێکی نارد بەشوێن ئەبوبەکردا و پەیامیدا کارێك پێشهاتووەو بەناچاری دەبێت ئامادە بیت.

ئەبوبەکر ڕۆشتە لای عومەر و وتی: مەگەر نازانی ئەنسار لە سەقیفەی منداڵەکانی ساعیدە کۆبوونەتەوە و دەیانەوێت خەلافەت بەسەعد کوڕی عوبادە بسپێرن، ئەوەی لەهەموویان نەرمترە دەڵێت: ئەمیرێك لەئێوە و ئەمیرێك لەئێمە.

ئەبوبەکر و عومەر بەخێرایی بەرەو سەقیفە بەڕێکەوتن و لەرێگە باوکی عوبەیدەی جەراحیان بینی. ئەویشان لەگەڵ خۆیان برد. چاویان بەعاسم کوڕی عودەی و عوەیم کوڕی ساعیدە کەوت. پێیان وتن: بگەڕێنەوە چوونکە تەنیا ئەوە روودەدات کەئێوە خوازیاری بن. بەڵام ئەو سیانە وتیان: ناگەڕێینەوە. ڕۆشتن و گەیشتنە لای ئەنسارییەکان.

عومەر دەڵێت: کاتێك گەیشتین، وتەیەکەم ئامادە کردبوو و دەمویست باسی بکەم. ڕۆشتمە پێش تا قسە کردن دەسپێبکەم، ئەبوبەکر وتی: ڕێگە بدەم من قسە بکەم و دوای من چی دەخوازیت باسی بکە. ئەبوبەکر دەستی پێکرد.

دەڵێت: ئەوەی من دەمویست بیڵێم، ئەو هێنایە سەرزمان.

عەبدوڵلە کوڕی عەبدولرەحمان دەڵێت: ئەبوبەکر سەرەتا سپاسی خوای کرد، دواتر وتی:

((خواوەند محەممەدی وەك پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە فەرموو تاشایەتی ئۆمەتەکەی خۆی بێت بۆ ئەوەی خواوەند بپەرستن و بەتاقانەی بزانن. خەڵکان خوا جۆراوجۆرەکانیان دەپەرەستی و گومانیان دەکرد ئەم خوا دارین و بەردینانە، لای خواوەندی تاقانە شیفاعەتیان دەکات و سوودیان پێدەگەیێنێت.

ئەم ئایەی خوێندەوە:

((ویعبدون من دون الله ما لایضرهم و لا ینفعهم و یقولون هؤلاء شفعاؤنا عندالله.

واتاکەی: جیاواز لەخوا شتێکیان دەپەرەستی نەزیانی لێدەدان نەسوودیان پێدەبەخشێت و دەڵێن ئەمانە لای خواوەند شیفاعەتی ئێمە دەکەن.))

و وتیان: ((ما نعبدهم الا لیقربونا الی الله زلفی.

واتاکەی: نایانپەرەستین مەگەر ئەوەی لەخوا نزیکمان بکەنەوە.))

دواتر وتی: بۆ عەرەبەکان دژوار بوو دەستبەرداری دینی باوکانی خۆیان بن موهاجیرەکان لەخەڵکەکەی خۆی، وتەکانی ئەویان پشتڕاست کردەوە و باوەڕیان هێنا و شان بەشانی ئەو خۆڕاگریان کرد. ئەمە لەکاتێکدا بوو خەڵکی پێغەمبەر(د.خ) بەسەختی ئازار و بەدرۆزنیان دەزانی و هەمووان دژایەتییان دەکرد و دژی ئەودەجووڵانەوە. موهاجیرەکان لەئازار و ئەشکەنجەی نەیارەکانی خەڵکەکەی خۆیان نەترسان و یەکەم کەسان بوون لەسەرزەمین پەرەستشی خوایان کرد و باوەڕیان بە پێغەمبەر(د.خ) هێنا. ئەوان هاوڕێیان و خزمەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون و دوای ئەوزیاتر لەهەر کەسێکی دیکە ماف گرتنە دەستی خەلافەتییان هەیە وهەرکەس نەیاری ئەوان بکات، ستەمکارە.

ئێوە ئەی ئەنسارییەکان، کەس ناتوانێت حاشا لەچاکی و لەپێشییەکانی و پێشینەی درەوشاوەی ئێوە لەئیسلامدا بکات چوونکە خواوەند ئێوەی کردە ئەنساری دینەکەی خۆی و کۆچی موسوڵمانان بۆ لای ئێوە بوو. زۆربەی ژنان و هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەئێوەیە و دوای موهاجیرەکان کەس هاوتای ئێوە نییە. ئێمە دەبینە ئەمیری ئێوە و ئێوەیش وەزیرەکانی ئێمە. لەگەڵ ئێوە راوێژ دەکەین و بێ بۆچوونی و دەنگی ئێوە هیچ کارێك ئەنجام نادەین.

کاتێك ئەبوبەکر کۆتایی بەوتارەکەی هێنا، حوباب کوڕی مونزەر کوڕی جەموح هەستایە سەرپێ و وتی:

ئەی ئەنسارییەکان، ئەم کارە لەدەست مەدەن چوونکە ئەوان لەسێبەری ئێوەدان و بوێری دژایەتی کردنی ئێوەیان نییە و خەڵکان شوێن بۆچوون ومەبەستی ئێوە دەکەون چوونکە رێز و سامان و هێز و ئەزموون و بوێریتان هەیە. خەڵکان نیگەرانن لەمەبەستی ئێوە، دووبەرەکی لەناوتاندا دروست نەبێت چوونکە جڵەوی کارەکانتان لەدەست دەردەچێت. ئەوان تەنیا بەخواستەکەی خۆیان رازی دەبن، کەواتە، ئەمیرێك لەئێمە و ئەمیرێك لەوان.

عومەر وتی:

هەرگیز دوو کەس لەیەك شوێندا جێگەیان نابێتەوە. سوێند بەخوا عەرەبەکان رازی نابن خەلافەت بەئێوە بسپێرن چوونکە پێغەمبەر(د.خ) لەئێوە نییە، بەلآم عەرەبەکان رازی دەبەن بەوەی خەڵکەکەی پێغەمبەر(د.خ) جڵەوی کارەکان بگرنە دەست و ئێمە بۆ ئەم کارە بەڵگەی ئاشکرامان لەبەرابەر نەیارەکانمان هەیە، هەرکەس لەسەر جێگری پێغەمبەر(د.خ) و دەسەلآتەکەی ئەو دژایەتی ئێمە بکات، رێگە نارەوا و گومڕایی گرتۆتەبەر چوونکە ئێمە خزم وکەس و کاری ئەوین.

حوباب کوڕی مونزەر هەستا و وتی:

ئەی ئەنسارییەکان، ئاگاتان لەکاروبارەکانی خۆتان بێت و گوێ لەقسەی ئەمان مەگرن چوونکە بەشی ئێوە لەمکارەدا دەخۆن. ئەگەر بەمەبەستەکەی ئێوە رازی نەبوون، ئەوان لەسەرزەمینی خۆتان دەربکەن وجڵەوی کارەکان بگرنە دەست چوونکە ماف خۆتانە. لەسێبەری شمشێری ئێوە خەڵکان باوەڕیان بەم دینە هێناوە. من پیاوێکی بەئەزموونم و سارد و گەرمی رۆژگارم چێشتووە، ئەگەر دەخوازن سەر لەنوێ دەست پێدەکەینەوە.

عومەر وتی: ئەوسا خواوەند دەتکوژێت.

حوباب وتی: خواوەند تۆ دەکوژێت.

باوکی عوبەیدە وتی: ئەی ئەنسارییەکان، ئێوە یەکەم کەسانێ هاوکاری و پشتیوانی ئەم دینەتان کرد، یەکەم کەسان مەبن گۆڕانگاری لەم دینەدا دروست بکەن.

بیشر کوڕی سەعد کوڕی نەعمان باوکی بەشیر هەستایە سەرپێ و وتی:

ئەی ئەنسارییەکان، ئەگەر لەشەڕ لەگەڵ ناباوەڕان مێژوویەکی درەوشاوەمان هەیە، تەنیا بۆ رەزامەندی خوا ئەو کارەمان ئەنجامداوە. رەوا نییە لەبەر کارەکانمان ستەم لەکەسانی دیکە بکەین. لەوەی کردوومانە مەبەستی ئەم دنیاییمان نەبووە. بزانن محەممەد لەقورەیشە و کەسەکانی بۆ گرتنە دەستی خەلافەت لەپێشتر و شیاوترن. من هیچ کات لەسەر ئەم کارە دژایەتی ئەوان ناکەم. لەخوا بترسن و دەست لەدژایەتی وپێداگری هەڵبگرن.

ئەبوبەکر وتی:

ئەوە عومەر و باوکی عوبەیدە، لەگەڵ کامیان دەخوازن بەیعەت ببەستن.

عومەر و باوکی عوبەیدە وتیان:

سوێند بەخوا تا تۆبیت، ئەو کارە لەئەستۆ ناگرین چوونکە لەهەموو موهاجیرەکان لەپێشتر و هاورێی ئەشکەوتیت و دوای پێغەمبەر(د.خ) پێشنوێژیت بۆ خەڵکان کرد و نوێژ باشترین بەشی ئیسلامە. کەس لەپێشی تۆی نییە و شیاو نییە، دەستت بێنە پێش تا بەیعەتت لەگەڵ ببەستین.

کاتێك مەبەستی ئەوەیان کرد لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەت ببەستن، بیشر کوڕی سەعد پێشیان کەوت و بەیعەتی لەگەڵ کرد. حوباب کوڕی مونزەر هاواری کرد: ئەی بیشر، کارێکی ناپەسەندت ئەنجامدا، مەگەر رژدیت دەبرد بەوەی کوڕە مامەکەت جڵەوی کارەکان بگرێتەدەست.

وتی: نە، بەڵام نەمویست لەسەر ئەو مافەی خواوەند پێی بەخشیون، دژایەتی ئەمان بکەن.

کاتێك ئەوسییەکان کردەوەی بیشر کوڕی سەعدیان بینی و وتەی قورەیشییەکانیان بیست، زانیان خەزرەجییەکان دەیانویست سەعد کوڕی عوبادە جڵەوی کارەکان بگرێتەدەست کەلەخۆیان بوو. ئەسید کوڕی حەزیر یەکێك لەسەرکردەکانی پەیمانی عوقبەبە، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خەزرەجییەکان ئەم کارە بگرنە دەست، بەردەوام شانازی بەخۆیانەوە دەکەن و هیچ پشکێك بۆ ئێوە لەبەر چاو ناگرن. هەستن و لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەت ببەستن.

بەمشێوەیە ئەوسییەکان هەستان و بەیعەتیان بەست. مەبەستەکەی سەعد کوڕی عوبادە و خەزرەجییەکان، هەڵوەشایەوە.

ئەبوبەکر کوڕی محەممەدی خوزاعی دەڵێت: تایەفەی ئەسلەم هەموویان هاتن و لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان کرد. عومەر دەیوت: کاتێك ئەسلەمییەکانم بینی، لەسەرکەوتن دڵنیا بووم.

عەبدوللە کوڕی عەبدولرەحمان دەڵێت: خەڵك لەهەموو سووچ وکەنارەکانەوە بۆ بەیعەت لەگەڵ ئەبوبەکر هاتن و زۆری نەمابوو سەعد کوڕی عوبادە لەژێر قاچیان پێشێل بکەن. یەکێك لەهاوەڵانی وتی: ئاگادار بن سەعد پێشێڵ نەکەن.

عومەر وتی: بیکوژن تا خوا بیکوژێت. دواتر لەسەر سەری سەعد وەستا و وتی: دەمویست پێشێلت بکەم تا بازووت بشکێت.

سەعد ریشی عومەری گرت و وتی: سوێند بەخوا ئەگەر یەك تاڵیت دەردەکێشا، دانت

لەدەمدا نەدەما.

ئەبوبەکر وتی: عومەر ئارام بە، نەرم و نیانی شیاوترە. عومەر خۆی لێ دوور خستەوە.

سەعد دەڵێت: ئەگەر هێزی هەستانم دەبوو، لەناوگەڕەك و کۆڵانەکانی مەدینە دەنگێکی ئەوتۆت لەمن دەبیست کەخۆت و هاورێکانت لەم دیارە نەمێنن و تۆم بۆ لای کەسانێك دەگەڕاندەوە فەرمانبەر بیت نەك فەرماندار. من لێرە ببەن.

خەزرەجییەکان ئەویان بردەوە بۆ ماڵ و چەند رۆژ دواتر کەسیان نارد تا بێت و بەیعەت بکات.

وەڵامەکەی بەمشێوە بوو: سوێند بەخوا بەیعەت ناکەم تا هەموو تیرەکانی ناو تیردانەکەم بهاوێژم و سەری ڕمەکەم خوێناوی بکەم. تا ئەو جێگەی بتوانم لەگەڵ کەسانی بنەماڵەکەم شەڕتان لەگەڵ دەکەم. سوێند بەخوا ئەگەر جنۆکە و پەری بەیعەت لەگەڵ ئێوە بکەن، من نایکەم تا ئەو کاتەی دەگەڕێمەوە بەردەرگای خواوەند.

کاتێك ئەبوبەکریان لەوەڵامەکەی ئەو ئاگادار کردەوە، عومەر وتی: وازی لێ مەهێنە تا بەیعەت دەکات.

بیشر کوڕی سەعد وتی: لەئێستادا بەیعەت ناکات تا دەکوژرێت و ناکوژرێت مەگەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەکەسەکانی بکوژرێن. کارتان پێی نەبێت چوونکە زیانی بۆ ئێوە نییە لەبەر ئەوەی یەك کەسە.

بەبۆچوونەکەی بیشر رازی بوون و گرنگییان بەسەعد نەدا. ئەو بەشداری نوێژی جەماعەتی نەدەکردو لەناو کۆڕەکانی ئەوان نەدەبینرا. لەکاتی حەج بەتەنیا حەجی دەکرد. بەمشێوە بوو تا ئەو کاتەی ئەبوبەکر، کۆچی دوایی کرد.

زوحاك کوڕی خەلیفە دەڵێت: کاتێك حوباب کوڕی مونزەر لەسقیفە هەستا و شمشێری کێشا و ئەو قسانەی هێنایە سەرزمان، عومەر هێرشی کردە سەر و لەدەستیدا و شمشێرەکە لەدەستی کەوتەخوار. شمشێرەکەی هەڵگرتەوە و بەرەو سەعد رۆشت. خەڵکان لەدەوری سەعد کۆبوونەوە. خەڵك دەستە دەستە بەیعەتیان کرد و سەعدیش بەیعەتی کرد. رووداوێکی کتوپڕی هاوشێوەی دەورانی جاهلییەت بوو. ئەبوبەکر خۆڕاگری کرد و کاتێك سەعدیان پێشێل کرد، کەسێك وتی: سەعدتان کوشت.

عومەر وتی: خوا بیکوژێت چوونکە دووڕووە. دواتر بەشمشێر لەبەردێکی دا و کردی بەدوو لەت.

جابر دەڵێت: لەڕۆژی سەقیفە سەعد بەئەبوبەکری وت: ئێوە موهاجیرەکان رژدی بەئەمیری من دەبەن و تۆ، کەسەکانی منت بۆ بەیعەت ناچار کرد.

وتیان: ناچارمان کردیت تا پەیوەستی خەڵکان بیت، تا ئەو کاتەی بەیعەتت نەکردبوو، ئازاد بوویت بەڵام ئێستا کەپەیوەستی خەڵکان بوویت ئەگەر پەشیمان بییتەوە، دەتکوژین.

عاسم کوڕی عودەی دەڵێت: رۆژێك دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، جاڕچی ئەبوبەکر جاڕیدا، سوپاکەی ئوسامە بەرێکەوێت و کەس لەسوپاکەی لەمەدینە نەمێنێتەوە و هەمووان روو لەئوردوگای جورف بکەن.

ئەبوبەکر لەناو خەڵکان وتارێکی پێشکەش و سەرەتا سپاسی خوای کرد و وتی:

ئەی خەڵکینە، منیش وەك ئێوەم، نازانم، ئەگەری هەیە ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) دەیتوانی ئەنجامی بدات، لەمنیش چاوەڕێن؟ خواوەند محەممەدی لەناو خەڵکانی جیهان هەڵبژارد و لەگوناح و مەترسییەکان دووری خستەوە. من شوێنکەوتەم، نەك داهێنەر، ئەگەر بەرێگەی راستدا ڕۆشتم، هاوکاریم بکەن و ئەگەر هەڵەم کرد، بۆ رێگەی راستم بگەڕێننەوە. پێغەمبەر(د.خ) مرد وکەس لەم ئوممەتە، لێدانێکی قامچی زیاتر یا کەمتری، لای ئەو نەبوو. من شەیتانێکم هەیە و بۆ گوناحەکان ناچارم دەکات، کاتێك هاتە لای من خۆتان بەدوور بگرن بۆ ئەوەی لەکارەکانی ئێوە خۆم هەڵنەقورتێنم. ئێوە ماوەیەکی دیاریکراوتان هەیە و ئەندازەکەی نازانن. ئەگەر دەتوانن ئەم ماوەیە بەچاکە و کردەوەی چاکە بەسەر ببەن و ئەمکارە تەنیا بەهاوکاری خواوەند دەتوانن ئەنجامی بدەن. پێش ئەوەی ئەجەل دەستی ئێوە کورت بکاتەوە، هەوڵ بدەن. خەڵکانێك بوون ئەجەلیان لەبیر کردبوو و کردوەکانیان بۆ رەزامەندی خواوەند ئە نجام نەدەدا. ئاگادار بن ئەجەل هاوشێوەی لافاوی پشت سەرتانە. لەمەرگ بترسن و لەچارەنووسی باوك و منداڵەکانتان وانە وەربگرن. بەئەندازەیەك حەسوودی بەکاری زیندووان ببەن کەبە مردووەکانی دەبەن.

درێژەی بەوتەکانیدا. دووبارە سپاسی خوای کرد و وتی:

خواوەند بەکردەوەیەك رازی دەبێت بۆ رەزامەندی ئەو ئەنجام بدرێت. لەکردەوەکانی خۆتان تەنیا خواتان لەبیر بێت و بزانن هەر کردەویەکی پاك بەمەبەستی رەزامەندی

خواوەند، پەرەستشە و گوناحێکە لەخۆتانی دوور دەکەنەوە و باجێکە دەیدەن. خۆشییەکە لەم ژیانە تێپەرە بۆ جیهانی هەمیشەیی. بەندەکانی خوا، لەچارەنووسی مردووەکان وانە وەربگرن و سەبارەت بەو کەسانەی پێش ئێوە بوون، تێفکرن کەدوێنێ لەکوێ بوون و ئەمڕۆ لەکوێن. ستەمکاران لەکوێن و ئەوانەی باسی سەرکەوتنیان دەکرد، لەکوێن؟ ڕۆژگار ئەوانی لەناو برد و بوونە خاك. ئەو پاشایانەی زەوییان داگیر کرد و ئاوەدانیان کردەوە، چییان بەسەر هات؟ ڕۆشتن و لەبیر کران. خواوەند کردەوەکانی خۆیانی کردە قورسایی سەرشانیان و هەوا و هەوەسی لێسەندنەوە. ڕۆشتن و کردەوەکانیان مایەوە و دنیا بوو بەبەشی کەسانی دیکە و ئێمە دوای ئەوان ماوینەتەوە. ئەگەر لەچارەنووسی ئەوان وانە وەربگرین، ڕزگارمان دەبێت و ئەگەر لەخۆبایی بین، دەبینە هاوشێوەی ئەوان. ئەو جوان ڕوخسارانەی شانازییان بەجوانی خۆیان دەکرد، چییان بەسەر هات؟ بوونە خاك و کردەوەکانیان بۆتە هۆکاری پەشیمانی. ئەوانەی شارەکانیان ئاوەدان و دیوارەکانیان ڕاست کردەوە و شتی سەیریان هێنایە بوون، چییان بەسەرهات؟ هەموویان بۆ نەوەکانی خۆیان بەجێهێشت. ئێستاماڵەکانیان چۆڵە و لەتاریکی گۆڕدا بێ جووڵە کەوتوون. کوڕ و براکانی ئێوە بۆ کوێ ڕۆشتوون؟ ئەجەل یەخەی گرتن و بۆ بینینی کارنامەی کردەوەکانی خۆیان بەرێکەوتن و بۆ بەدبەختی یا بەختەوەری دوای مردن، خۆیان ئامادە کرد.

دڵنیا بن خواوەند شەریکی نییە و هەر چاکەیەك بەخەڵکانی ببەخشێت بەهۆی کردەوە چاکەکانی خۆیانەوەیە و هەر زیانێك بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆیانەوە.

بزانن، ئێوە بەندەکان و لێپرسینەوەتان لێدەکرێت و ئەوەی لای خواوەندە تەنیا بەپەرەستین بەدەست دێت. ئەوەی جەهەننەمی بەدواوە بێت، چاکە نییە و ئەوەی بەهەشتی بەدواوە بێت، خراپە نییە.

عوروە کوڕی زوبەیر وتی: کاتێك لەگەڵ ئەبوبەکر بەیعەتیان کرد و ئەنسارییەکان پەیوەستی خەڵکان بوون، وتی: سوپاکەی ئوسامە بەرێکەوێت. عەرەبەکان یا هەموو هۆزەکان و یا بەشێك لەوان لەدینی ئیسلام هەڵگەڕابوونەوە و دووڕووی ئەوان ئاشکرا بوو. جوولەکە و مەسیحییەکان سەریان بەرز کردەوە و موسوڵمانان هاوشێوەی ڕانە مەڕ لەشەویی بارانیدا بوون. پێغەمبەرەکەیان مردبوو و ژمارەیان کەم و دوژمنانیان فراوان بوون. بەئەبوبەکریان وت: هەموو موسوڵمانان ئەوانەن لەناو سوپاکەی ئوسامەدان و

دەبێت بڕۆن. خۆت دەزانی عەرەبەکان دژی تۆ ڕاست بوونەتەوە و ڕەوا نییە موسوڵمانان لەخۆت دوور بخەیتەوە.

ئەبوبەکر وتی: سوێند بەوخوایەی گیانی من لەدەستی ئەودایە، ئەگەر لەخواردنی دڕەندەکان بترسم، سوپاکەی ئوسامە بەهەمان شێوە کەپێغەمبەر(د.خ) فەرمانیداوە، دەبێت بڕوات و ئەگەر لەگوندەکان جگە لەخۆم کەس نەمێنێتەوە، ئەو سوپایە ڕەوانە دەکەم.

کوڕی عەباس دەڵێت: دواتر لەدەوروبەری مەدینە و ئەو هۆزانەی لەساڵی حۆدەیبییە ئامادە نەبوون، کەسانێك هاتن و لەگەڵ خەڵکان پەیوەستی سوپاکەی ئوسامە بوون. ئەبوبەکر پاشماوەی هۆزەکانی لەشوێنەکانی خۆیان هێشتەوە تا پارێزگار لەدیاری خۆیان بکەن.

حەسەنی بەسری دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) پێش مردن فەرمانیدا دەستەیەك لەخەڵکانی مەدینە و دەوروبەر بەرێکەون و ئوسامە کوڕی زەیدی وەك سەرکردەی ئەوان دیاریکرد. عومەریش لەناو سوپاکەی ئوسامەدا بوو. هێشتا سوپاکە لەخەندەك نەپەڕیبوونەوە پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد. ئوسامە خەڵکانی ڕاگرت و بەعومەری وت: بڕۆ لای جێگری پێغەمبەر(د.خ) و داوای لێبکە لەگەڵ خەڵکان بگەڕێمەوە چوونکە سەرکردەی خەڵکان لەناو سوپاکەی مندایە و دەترسم ناباوەڕان هێرش بکەنەسەر خەلیفە و موسوڵمانان.

ئەنسارییەکان وتیان: ئەگەر ئەبوبەکر بۆ ڕۆشتن پێداگری کرد پێی بڵێ کەسێکی بەتەمەنتر و بەئەزموتر بکاتە سەرکردەی ئێمە.

عومەر بەفەرمانی ئوسامە گەڕایەوە بۆ لای ئەبوبەکر و لەوتەکانی ئوسامە ئاگاداری کردەوە.

ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەناو سەگ و گورگەکاندا بم، گۆڕانکاری لەکاری پێغەمبەر(د.خ) ناکەم.

عومەر وتی: ئەنسار داوا دەکەن سەرکردایەتی خەڵکان بەکەسێکی بەتەمەنتر لەئوسامە بسپێریت.

ئەبوبەکر دانیشتبوو، کاتێك ئەمەی بیست، ڕیشی عومەری گرت و وتی:

ئەی کوڕی خەتاب، دایکت لەپرسەتا دانیشێت، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی وەك سەرکردەی خەڵکان دەستنیشان کردووە و تۆ دەڵێیت بیگۆڕم؟

عومەر گەڕایەوە بۆ لای خەڵکان وپرسییان: چیت کرد؟

وتی: بڕۆن، دایکتان لەپرسەتانا دانیشێت، لەخەلیفە سەبارەت بەوتەکانی ئێوە چیم بەسەر هات.!

ئەبوبەکر خۆی ڕۆشتە ئوردوگاکە و خەڵکانی بەرێکرد. ئەو، پیادە ڕێگەی دەبڕی و ئوسامە سوار. عەبدولرەحمان کوڕی عەوف چوارپێکەی ئەبوبەکری دەبرد.

ئوسامە بەئەبوبەکری وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)، یا تۆ سەرکەوە، یا من دادەبەزم.

وتی: سوێند بەخوا نەتۆ دادەبەزیت، نە من سەردەکەوم. دەمەوێت کاژێرێك لەرێگەی خوادا بەپێ بڕۆم و قاچم خۆڵاوی بێت، چوونکە هەر هەنگاوێك لەرێگەی خوا پاداشتی حەوتسەد کاری چاکەی هەیە و حەوتسەد گوناح دەشواتەوە.

کاتێك خەڵکانی بەرێکرد، بەئوسامەی وت: ئەگەر دەتوانیت، عومەر وەك هاوکاری من بەجێبێڵە. ئوسامە مۆڵەتی مانەوەی بەعومەردا.

ئەبوبەکر وتی:

ئەی خەڵکینە، بێستن تا دە شتتان پێ بڵێم بۆ ئەوەی هەمیشە لەبیرتان بێت:

خیانەت مەکەن، دەست بۆ تالأنییەکان مەبەن، نامەردی مەکەنە پیشە، ئەندامی کوژراوەکان مەبڕنەوە، منالْ و پیری پەککەوتە مەکوژن، دارخورما مەبڕنەوە و مەیسووتێنن، داری بەرهەمدار مەبڕنەوە، بزن و مانگا و وشتر تەنیا بۆ خواردن بکوژن، ڕووبەڕووی کەسانێك دەبنەوە لەخانەقا و سەومەعەکاندا دانیشتوون، تا ئەو کاتەی کاریان بەئێوە نەبووە، کارتان پێیان نەبێت، کەسانێك دەبینن دەفری جۆراوجۆری خواردنەکانتان بۆ دێنن، ئەگەر لێتان خوارد، ناوی خوا بێننە سەرزمان، کەسانێك دەبینن سەریان تاشییوە و لاجانەکانیان هێشتۆتەوە، بەشمشێر ئەوانە بکوژن، بەناوی خواوەند بەرێکەون و هیوادارم خواوەند لەزیان و بەڵاکان بتانپارێزێت.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: ئەبوبەکر بەرەو جورف بەرێکەوت و سەیری ئوسامە و سوپاکەی کرد. داوای لێکرد مۆڵەتی مانەوە بەعومەر بدات. ئوسامە مۆڵەتیدا و دواتر پێی وت: ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێکردوویت، ئەنجامی بدە، لەدیاری قوزاعەوە دەستپێبکە و دواتر بەرەو ئوبەل بەرێکەوە و بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی پێغەمبەر(د.خ) کەمتەرخەمی مەکە و لەبەر ئەوەی ئەنجامدانی فەرمانەکانی

دواکەوتووە، پەلە مەکە.

ئوسامە بەخێرایی هێرشی کردە سەر زولمەروە و مەسیل، دواتر بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی پێغەمبەر(د.خ)، سوپاکەی لەناو هۆزەکانی قوزاعەدا بڵاو کردەوە و هێرشی کردە سەر ئوبەل و تەندروست و لەگەڵ تالانییەکان گەڕایەوە. لەماوەی چل ڕۆژ ئەم کارانەی ئەنجامدا جگە لەماوەی ڕۆشتن وگەڕانەوەی ئەو.

## گێڕانەوەی کارەکانی درۆزنی عەنسی

کاتێك بازام باوەڕی هێنا و خەڵکانی یەمەن موسوڵمان بوون، پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە لێپرسراوی یەمەن وتا زیندوو بوو لەو پۆستەدا مایەوە وکەسی نەکردە هاوبەش و شەریك لەکارەکەیدا. کاتێك مرد، کاروباری یەمەنی لەناو دەستەیەك لەهاوەڵانی خۆی دابەش کرد. عوبەید کوڕی سەخری ئەنساری لەساڵی دەیەمی کۆچ و دوای حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ لێپرسراوانی یەمەن بەرێکەوت. دەڵێت: کاتێك بازام مرد، پێغەمبەر کارەکانی ئەوی لەنێوان عامر کوڕی شەهری هەمەدانی و عەبدوللە کوڕی قەیس، ئەبوموسا ئەشعەری، خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس و تاهیر کوڕی ئەبی هالی، یەعلی کوڕی ئومەییە و عەمرۆ کوڕی حەزمدا دابەش کرد. دیاری حەزەرمەوت و سەکاسەك و سەکوونی بەزیاد کوڕی لوبەیدی بەیازی و عوکاشە کوڕی سور کوڕی ئەسغەری سووری سپارد. مەعاز کوڕی جەبەلی وەك مامۆستای یەمەن و حەزەرمەوت دەستنیشان کرد.

عوبادە کوڕی قورسی لەیسی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆتایی بەحەجی ماڵئاوایی هێنا و بۆ مەدینە گەڕایەوە، ئەمارەتی یەمەنی لەناو چەندین کەسدا دابەش کرد وهەر ناوچەیەکی بەکەسێك سپارد. ئەمارەتی حەزەرمەوتی لەنێوان سێ کەسدا دابەش کرد: عەمرۆ کوڕی حەزمی لەناوچەی نەجران دانا، خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسی لەناوچەی نێوان نەجران و زەمع و زوبەید، عامر کوڕی شەهری کردە لێپرسراوی هەمەدان. کوڕی بازامی لەسەنعا دانا، تاهیر کوڕی ئەبی هالەی وەك لێپرسراوی عەك و ئەشعەرییەکان ڕەوانە و ئەبوموسای ئەشعەری لەمأرب دانا. یەعلی کوڕی ئومەییە کاروبارەکانی جوندی گرتەدەست و مەعاز مامۆستای خەڵکان و لەیەمەن و حەزەرمەوت دەڕۆشتە سنووری کاربەدەست و لێپرسراوانی پێغەمبەر(د.خ). سەکاسەك و سەکوون و حەزەرمەوت بەعوکاس کوڕی سور سپێردرا و عەبدوللە یا موهاجیر کاروبارەکانی

تایەفەی منداڵەکانی معاویە کوڕی کێندەی گرتەدەست. ئەو نەخۆش کەوت و نەڕۆشت تا ئەو کاتەی ئەبوبەکر ئەوی ڕەوانە کرد. زیاد کوڕی لوبەیدی بەیازی لێپرسراوی حەزەرمەوت بوو و کارەکانی موهاجیری رادەپەڕاند.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەم کەسانە کارەبەدەست و لێپرسراوی یەمەن بوون جگە لەو کەسانەی لەشەڕ لەگەڵ ئەسوەد کوژران یا مردن. بازام مردبوو و پێغەمبەر(د.خ) سنووری دەسەلاتی ئەوی لەنێوان کوڕەکەی و کەسانی دیکەدا دابەش کرد. ئەسوەد هێرشی کردە سەر شارەکەی و جەنگا و ئەوی کوشت.

کوڕی عەباس دەڵێت: یەکەم جار عامر کوڕی شەهری هەمەدانی لەناوچەی ژێر دەسەلاتی خۆی دژی ئەسوەدی عەنسی درۆزن ڕاپەڕی. خەڵکانی بۆ دژایەتی کردنی ئەو کۆکردەوە و فیروز و بازویە لە سنوری خۆیان ئەو کارەیان کرد. دواتر ئەو کەسانەی نامەی پێغەمبەر(د.خ) بەدەستیان گەشتبوو، هەوڵەکانی خۆیان چڕ کردەوە.

عوبەید کوڕی سەخر دەڵێت: کاتێك لەجوند بووین وخەڵکانمان بۆ شەڕ ناچار و نامەکانمان دەگۆڕییەوە، نامەیەك لەئەسوەدی عەنسی هات: ئەی دەستەی نەیاران ئەوەی لەسەرزەمینی ئێمە دەستتان بەسەر گرتووە و کۆتان کردۆتەوە، بیگەڕێننەوە چوونکە ماڤ خۆمانە.

بەنێردراومان وت: لەکوێوە هاتوویت؟

وتی: لەئەشکەوتی خەبان.

ئەسوەد بەرەو نەجران بەرێکەوت و دە رۆژ دواتر دەستی بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت. خەڵکانی مەزحەج ڕووبەڕووی بوونەوە. لەو کاتەی ئێمە سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێز و شەڕکەران بووین، کەسێك هات و وتی: ئەسوەد لەشەعووبە وشەهر بازام بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بەرێکەوتووە. ئەم ڕووداوە لەرۆژی بیستەمی دەرکەوتنی ئەسوەد بوو. چاوەڕوان بووین تا بزانین کێ شکست دەخوات. هەواڵمان پێگەیشت کەئەسوەد شەهری کوشتووەو دەستی بەسەر سەنعادا گرتووە. ئەمە لەرۆژی بیستم و پێنجەمی دەرکەوتنی ئەو بوو. مەعاز هەلات و لەمأرب پەیوەستی ئەبوموسا و لەوێوە بەرەو حەزەرمەوت بەرێکەوت. مەعاز لەسەکوون جێگر و ئەبوموسا لەسەکاسەك نزیك مەفوور جێگیر بوو. سارا لەنێوان ئەوان و مأربدا بوو. ئەمیرەکانی دیکەی یەمەن پەیوەستی تاهیر بوون جگە لەعەمرۆ و خالید کەرروویان لەمەدینە کرد. تاهیر لەدڵی سەرزەمینی

عەك و لەکوێستانی سەنعا بوو. ئەسوەد دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانی نێوان سوهەید، سارای حەزەرمەوت تا تاییف و بەحرەین و سنوورەکانی عەدەندا گرت و خەڵکانی یەمەن و عەك لەتەهامە شەڕیان لەگەڵ دەکرد. بەڵام هاوشێوەی ئاگر پێشڕەوی دەکرد و ئەو ڕۆژەی شەهر ڕووبەڕووی بوویەوە جگە لەپیادەکان حەوتسەد سوار لەناو سوپاکەیدا دەبینرا. قەیس کوڕی عەبدیەغوسی موڕادی و معاویە کوڕی قەیسی جونبی و یەزید کوڕی موحەرەم و یەزید کوڕی حەسینی حارسی و یەزید کوڕی ئەفکەلی ئەزدی سەرکردەکانی سوپاکەی بوون. دەسەڵاتی فراوان وپاشایەتییەکەی سەقامگیر و کەنارەکان ملکەچی بوون و عیسر و شەرجە و حەردە و غەلافیقە و عەدەن و جوند و دواتر سەنعاو ئۆحەیسە و عەلیبی داگیر کرد. موسوڵمانان ڕووبەڕووی بوونەوە و هەڵگەڕاوەکان پەشیمان بوونەوەی خۆیان ئاشکرا کرد. جێگری ئەو لەمەزحەج عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و کاری خۆی بەچەند کەسێك سپاردبوو. قەیس کوڕی عەبدیەغوس کاروبارەکانی سوپاکەی رادەپەڕاند. فیروز و دادزویەی بۆ چەندین کاری دیکە راسپارد و کاتێك سنووری دەسەڵاتەکەی فراوان بوو، بەشێوەیەکی سووك سەیری قەیس و فیروز و دادزویەی کرد و ژنی شەهری وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد کەکچە مامی فیروز بوو. ئێمە لەحەزەرمەوت بووین و دەترساین ئەسوەد هێرشمان بکاتەسەر یا سوپایەك ڕەوانە بکات یا ئەوەی لەحەزەرمەوت کەسێك دەرکەوێت و هاوشێوەی ئەسوەد بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات.

مەعاز لەمناڵەکانی بەکرە تایەفەیەك لەسەکوون ژنێکی مارە کرد بەناوی رەملە. مناڵەکانی زەنکبیل خاڵۆکانی بوون و بەهۆی خزمایەتی لەگەڵ مەعاز، خوازیاری پەیوەست بوون بەئێمە بوون. مەعاز ژنەکەی خۆش دەویست و لەناو دوعاکانی خۆی دەیوت: خواوەندا لەرۆژی هەستانەوە لەگەڵ مناڵەکانی زەنکبیل حەشرم بکە. هەندێ کات دەیوت: خواوەندا خەڵکانی سەکوون ببەخشە.

لەم کاتەدا نامەکانی پێغەمبەر(د.خ) هات و فەرمانی پێدەداین خەڵکان بۆ ئاکاوگیر کردنی ئەسوەد یا جەنگان لەگەڵ ئەو ئامادە بکەین و هەموو ئەو کەسانەی پێغەمبەر(د.خ) ناوی بردبوون، ئاگادار بکەینەوە. مەعاز ئەو کارەی کرد و بەمشێوەیە دەسەڵات و هێزمان زیادی کرد و لەسەرکەوتنی خۆمان دڵنیا بووینەوە.

جەشیش کوڕی دەیلەمی دەڵێت: وەبر کوڕی یەحنس نامەی پێغەمبەری هێنا و فەرمانی بەئێمەدەدا بۆ بەرگری کردن لەدینەکەی خۆمان و شەڕ لەگەڵ ئەسوەد خۆمان

ئامادە و هەوڵ بدەین بەشێوەیەکی لەناکاو یا لەکاتی شەڕدا بیکوژین. هەروەها رایسپاردین بەنوێنەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) هەموو باوەڕداران ئاگادار بکەینەوە. ئەو کارەمان کرد. بۆمان دەرکەوت ئەسوەد لەقەیس کوڕی عەبد یەغوس سەرکردەی سوپاکەی دڵی پیس کردووە و وتمان ئەو لەگیانی خۆی دەترسێت. پێشنیاری هاوکاریمان پێدا وهەموو شتێکمان بۆ باس کرد و لەفەرمانەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادارمان کردەوە. وەك بڵێی لەئاسمانەوە دۆزیمانەوە، ترساو خەمبار بوو. بەهاوکاری کردنی ئێمە رازی و کاتێك وەبر کوڕی یەحنس هات، نامەمان بۆ خەڵکان نووسی و دوامان لێکردن خۆیان ئامادە بکەن.

دەڵێت: شەیتان ئەسوەدی ئاگادار کردبوویەوە، کەسی بۆ لای قەیس نارد و وتی: ئەی قەیس، بزانە ئەمە چی دەڵێت. مەبەستی ئەو، شەیتان بوو کەبەفریشتە ناوی دەبرد.

قەیس وتی: چی دەڵێت؟

وتی: دەڵێت: رێزت لەقەیس گرت و هەموو کارەکانی خۆتت بەو سپارد و بۆ گەورەیی هاوشانی تۆیە، بەڵام ئێستا ئارەزوومەندی هاوکاری کردنی دوژمنە و دەیەوێت دەست بەسەر پاشایەتییەکەی تۆدا بگرێت و مەبەستی خیانەتی لەسەردایە، پێم دەڵێت: ئەی ئەسوەد، ئەی ئەسوەد، بیگرە و بیکوژە وگەرنە تۆ دەکوژێت.

قەیس سوێندی خوارد و وتی: بە ذی الخمار درۆ دەکات، تۆ لای من گەورەتر لەوەییت، بیر لەشتی خراپە بکەمەوە.

ئەسوەد وتی: ئایا فریشتەکە بەدرۆزن دەزانیت؟ فریشتە راست دەکات. بەڵام ئێستا زانیم لەمەبەستەکەی خۆت پەشیمان بوویتەوە.

کاتێك قەیس لای ئەسوەد هاتەدەر، هاتە لای ئێمە و وتی: ئەی جەشیش و ئەی فیروز و ئەی دازویە، ئەسوەد ئەوەی وت و منیش ئەمە، بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتمان: دەبێت ئاگامان لەخۆمان بێت.

لەم کاتەدا ئەسوەد ئێمەی بانگ کرد و وتی: مەگەر ئێوەم نەکردە گەورەی خەڵکەکەی خۆتان، ئەم باس و خواسانە چییە لەئێوە بەمن دەگات؟

وتمان: ئەمجارە لێمان خۆشبە.

وتی: خۆش دەبەم بەو مەرجەی دووبارەی نەکەنەوە.

بەدژواری رزگارمان بوو بەڵام بۆ گیانی خۆمان و قەیس دەترساین و هەستمان بەمەترسی دەکرد. ئاگادار بووینەوە عامر کوڕی شەمر و زی زود و زی موڕان و زو ئەلکەلاع و زی زولەیم دژایەتی ئەسوەد دەکەن و نامەیان بۆ ئێمە نووسی وپێشنیاری هاوکارییان پێکردین. وەڵاممان دانەوە: هیچ کارێك مەکەن تا ئاگادارتان دەکەینەوە. دژایەتی ئەوان لەنامەکانی پێغەمبەرەوە سەرچاوەی دەگرت.

پێغەمبەر(د.خ) نامەی بۆ خەڵکانی نەجران و ئاعەرەبەکان نووسیبوو. هاتن و لەیەك شوێن کۆبوونەوە.

کاتێك ئەسوەد ئاگادار بوویەوە و هەستی بەمەترسی کرد، نەماندەزانی چی بکەین. ڕۆشتمە لای ئەزاد هاوسەری ئەسوەد و وتم: ئەی ئامۆزا، ئاگاداری خەڵکەکەت لەم پیاوە چەندە زیانیان بەرکەوت، هاوسەری تۆ و کەسانی دیکەی کوشت و پاشماوەی خەڵکان و ژنانی ریسوا کرد. ئایا دژی ئەو بەشداری پیلانێك دەکەیت؟

وتی: بۆ کارێك؟

وتم: بۆ دەرکردنی.

وتی: یا کوشتنی.

وتم: یا کوشتنی.

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا کەس بەئەندازەی من لێی بێزا نییە، پابەندی فەرموودەکانی خواوەند نییە و لەحەرامەکانی ئەو دوور ناکەوێتەوە، کاتێك بڕیارتاندا، ئاگادارم بکەنەوە تا ڕێگە و چۆنییەتی کارەکەتان پێ بڵێم.

دەڵێت: کاتێك ڕۆشتمەدەر، فیروز و دازویە چاوەڕوانم بوون. قەیسیش هات. دەمانەویست ئەسوەد بکوژین. پێش ئەوەی قەیس لەگەڵ ئێمە دانیشێت، کەسێك پێی وت: پاشا تۆی دەوێت. ئەو لەگەڵ دەکەس لەخەڵکانی مەزحەج و هەمەدان ڕۆشتە لای پاشا. بەهۆی بوونی ئەوان ئەسوەد نەیتوانی بیکوژێت. ئەسوەد پێی وتبوو: لەترسی من پەنا بۆ ئەم پیاوانە دەبەیت؟ مەگەر لەهەواڵە راستەکان ئاگادارم نەکردیتەوە،نەموت فریشتە پێی وتووم: ئەگەر دەستی قەیس نەبڕیت، ئەو سەری تۆ دەبڕێت؟ قەیس گومانی کردبوو ئەسوەد دەیکوژێت، وتبووی: ڕەوا نییە تۆ بکوژم، تۆ پێغەمبەری خواییت، هەرچی دەخوازی فەرمان بدە تا لەم ترس و دوودڵییە رزگارم بێت، ئەگەر بەیەکجار بمکوژیت باشترە لەوەی هێدی هێدی خۆم بمرم.

ئەسوەد بەزەیی پیادا هاتەوە و نەیکوشت. هاتە لای ئێمە و داستانەکەی بۆ

گێڕاینەوە، وتی: کاری خۆتان ئەنجام بدەن. لەگەڵ کەسانی خۆی بەرێکەوت. ڕۆشتینە لای ئەسوەد. لەبەر دەرگاکەی سەد وشتر و مانگای لێ بوو. ئەسوەد هەستا و هێڵێکی کێشا و لەولای هێڵەکە وەستا. وشتر و مانگاکان نەبەسترابوونەوە، هیچیان لەهێڵەکە نەپەڕینەوە. بەکوشتنی ئەوان سەرقاڵ بوو. لێیدەدان و بەرەڵای دەکردن تا ڕابکات و بمرێت. شتێکی قێزەونتر و ڕۆژێکی مەترسیدارتر لەو ڕۆژەم نەبینیوە.

بەفیروزی وت: ئەی فیروز، ئایا ئەوەی سەبارەت بەتۆ دەیبیستم، ڕاستە. زوبینەکەی سووڕاند و وتی: دەمویست هاوشێوەی ئەو ئاژەڵانە تۆیش بکوژم.

فیروز وتی: ئێمەت وەك کەسانی نزیکی خۆت هەڵبژارد و لەپێشیت پێبەخشین. ئەگەر پێغەمبەر نەدەبوویت، حەزمان دەکرد لەخزمەتی تۆدابین چ بگات بەوەی بەختەوەری ئەم دنیا و ئەو دنیای ئێمە لەدەستی تۆدایە، ئەوەی سەبارەت بەئێمە دەیبیستی، باوەڕ مەکە. ئێمە ملکەچی فەرمانەکانی تۆین.

ئەسوەد وتی: گۆشتی ئەم ئاژەڵانە لەناو خەڵکان دابەش بکە. تۆ خەڵکانی ئێرە باشتر دەناسیت.

فیروز دەڵێت: خەڵکی سەنعا لەدەوری من کۆبوونەوە. وشترەم بەدەستەیەك بەخشی و بەبنەماڵەکان و گەورەکان گۆشتی مانگا.

جەشنس دەڵێت: پێش ئەوەی ئەسوەد بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، فیروز پەیوەستی بوو. کەسێك سەبارەت بەفیروز قسەی بۆ ئەسوەد دەکرد و فیروز بیستی ئەسوەد دەڵێت: بەیانی خۆی و کەسەکانی دەکوژم. بەیانی وەرە بۆ لای من. دواتر هەستی بەبوونی فیروز کرد، وتی: چیت کرد؟

فیروز لەدابەش کردنی گۆشتەکە ئاگاداری کردەوە.

ئەسوەد وتی: کارێك باشت کرد. ڕۆشتە ژوور.

دەڵێت: فیروز گەرایەوە بۆ لای ئێمە و لەمەبەستی ئەسوەد ئاگاداری کردینەوە. کەسمان بەدوای قەیسدا نارد و ئەویش هات. بڕیارماندا من بڕۆمە لای هاوسەری ئەسوەد و لەبڕیاری خۆمان ئاگاداری بکەمەوە تا ڕێگە و چۆنییەتی کارەکەمان نیشان بدات. کاتێك ئاگادارم کردەوە، وتی: زۆر بەوردی پاسەوانی ئەسوەد دەکەن و لەهەموو ئەم کۆشکەدا جگە لەماڵەکەی من هیچ شوێنێك نییە لەپاسەوانەکان پڕ نەکرابێت. پشتی ئەم ماڵە دەگاتە فلانە شوێن. لەکاتی شەو تونێل لێبدەن و دەتوانن

لەپاسەوانەکان بوگزەڕێن و هیچ لەمپەرێك بۆ کوشتنی ئەو نامێنێتەوە. لێرە رووناکی و سیلاحتان دەستدەکەوێت.

دەڵێت: هاتمەدەر، ئەسوەدم بینی و لەسەریدام. کەوتمە سەرزەوی. پیاوێکی بەهێز بوو. ژنەکەی قیژاندی: کوڕە مامەکەم هاتووە بۆ سەردانی من وتۆ لێی دەدەیت؟ قیژەی ژنەکە رێگر بوو لەوەی ئەسوەد بمکوژێت.

ئەسوەد بەژنەکەی وت: بێ باوك، بێدەنگ بە، ئەوم بەتۆ بەخشی. ژن ڕۆشت و من بۆ لای کەسەکانی خۆم گەڕامەوە و وتم: پێویستە ڕابکەین. بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە. سەرمانسوڕما بوو. نێردراوی ژنەکە هات و وتی: کارەکەی خۆتان ئەنجام بدەن، زۆرم قسە بۆکردووە و دڵنیا بووە.

جەشیش دەڵێت: بەفیروزم وت: بڕۆ و دڵنیا ببە. بەو بارودۆخەی هاتبووە پێش، ئەسوەد رێگەی ڕۆشتنی منی نەدەدا. ئەو ڕۆشت.

کاتێك لەگەڵ ژنەکە قسەی کرد، پێی وت: چۆن دەتوانین تونێل لەژێر ئەمماڵەدا لێبدەین کەپڕە لەکەل و پەل. دەبێت کەل وپەلەکان لاببەین. ڕۆشتن و کەل و پەلەکانیان لابرد و دەرگاکانیان بەست. فیروز لای ژنەکە بوو و ئەسوەد هات. ژنەکە باسی خزمایەتی خۆی و فیروزی کرد و وتی: مەحرەمییەتی. ئەسوەد قیژاندی و ئەوی دەرکرد. گەڕایەوە و ئێمەی ئاگادار کردەوە.

دەڵێت: شەو دەستمان بەکار کرد و لەگەڵ هاوەڵانی خۆمان هاوئاهەنگ بووین. بەخێرایی هەمەدانی و حەمیرییەکانمان ئاگادار کردەوە و تونێلمان لێدا و ڕۆشتینە ناو ماڵەکە. چرایەك لەژێر کاسەیەکدا بوو. فیروز پێش کەوت چوونکە لەهەمووان بوێرتر و بەهێزتر بوو. وتمان: سەیر بکە بزانە چی دەبینیت.

فیروز هاتەدەر. ئێمە لەگەڵیدا بووین و لەنێوان ئەو و پاسەوانەکان وەك لەمپەرێك وەستابووین تا لەماڵەکەی ئەسوەد نزیك کەوتینەوە. کاتێك لەماڵەکە نزیك کەوتینەوە، دەنگی پرخەپرخی بیست. ژنەکە دانیشتبوو. ئەسوەد لەدەرگاکە نزیك کەوتەوە و شەیتان ئەوی دانیشاند. لەزمانی ئەو قسەی دەکرد و بەهەمان شێوە کەدانیشتبوو، پرخەپرخی دەکرد، وتی: ئەی فیروز چ کارێکت بەمن هەیە.

فیروز ترسا ئەگەڕ بگەڕێتەوە، دەکوژرێت و ژنەکەیش دەکوژرێت. پەلاماری ئەسوەدیدا و سەری گرت و خوێنی ڕشت. ملی شکاند و بەئەژنۆی خۆی پشتی ورد وخاش کرد. ویستی بڕوات بەڵام ژن داوێنی گرت چوونکە گومانی دەکرد ئەوی

نەکوشتووە، وتی: بۆ کوێ دەڕۆیت؟

فیروز وتی: دەڕۆم و هاوڕێکانم لەکوشتنی ئەو ئاگادار دەکەمەوە.

فیروز هاتە لای ئێمە، ویستمان بڕۆین و سەری ببڕین، بەڵام شەیتان جوولەی خستە جەستەیەوە.

وتم: لەسەر سنگی دانیشن. دوو کەس لەسەر سنگی دانیشتن و ژن قژی ڕاکێشا. هاوارێك بەرز بوویەوە، پارچەیەکیان خستە دەمی و کێردیان بەقوڕگیدا هێنا. وەك گا خوڕخوڕی دەکرد. پاسەوانەکانی دەوری ماڵەکەی هاتن و وتیان: چی ڕوویداوە؟

ژن وتی: پێغەمبەر وەحی بۆ دێت، ئەسوەد بێدەنگ بوو.

دەڵێت: شەو باسی ئەوەمان دەکرد چۆن هاوەڵانی خۆمان ئاگادار بکەینەوە چوونکە جگە لەمن و قەیس و دازویە و فیروز کەسی دیکە ئاگادار نەبوو. بەباشمان زانی دروشمەکەی نێوان خۆمان بەدەنگی بەرز بڵێین، دوای ئەوە بانگ بوترێت.

کاتێك بەیانی داهات، دازویە بانگی فەرموو و دروشمەکەی هێنایە سەرزمان. موسوڵمانان و کافرەکان لەدەروی کۆبوونەوە. پاسەوانەکانیش هاتن. شایەتوومانم هێنایە سەرزمان و وتم ئەسوەد درۆزن بوو. سەری ئەوم خستە بەردەم خەڵکان. بۆ نوێژ ڕیزمان بەست.خەڵکان کۆبوونەوە و هاوارمان کرد: ئەی خەڵکانی سەنعا، هەرکەس یەکێك لەهاوەڵانی ئەسوەد ببینێت، بیگرێت و هەرکەس یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەی شوێنکەوتەی ئەوە، دەستبەسەری بکات. لەرێگا و لەکۆڵانەکاندا هاوارمان کرد. شوێنکەوتەکانی ئەسوەد منالی زۆریان گرت و سامانێکی زۆریان تالان کرد و ناوچەکەیان بەجێهێشت. حەفتا سوار و پیادە لەوان گیران و حەوتسەد ژن و منالی ئێمە کەوتە دەست ئەوان. نامەیان نووسی و ئێمە کەسمان نارد تا ئەسیرەکان بگۆڕینەوە. ئەو کارەیان کرد و ڕۆشتن و نەیانتوانی هیچ شتێك لەئێمە بەدەست بێنن و لەنێوان سەنعا و جوند سەرگەردان بوون. سەنعا ڕزگاری بوو و خواوەند دووبارە ڕێزی بەموسوڵمانەکان بەخشی. لەناو خۆمان گفتوگۆمان کرد و بڕیارماندا مەعاو پێشنوێژی خەڵکان بێت. ئەم هەواڵەمان بۆ پێغەمبەر(د.خ) نووسی. هێشتا پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی نەکردبوو.

دەڵێت: هەمان شەو پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار ببوویەوە. کاتێك نێردراوانی ئێمە گەیشتنە شوێنی مەبەست، پێغەمبەر(د.خ) بەرەبەیانی ئەو شەوە کۆچی دوایی کردبوو

و ئەبوبەکر وەڵامی نامەکەی ئێمەی دایەوە.

عەبدوڵله کوڕی عومەر دەڵێت: ئەو شەوەی ئەسوەدی عەنسی کوژرا، پێغەمبەر(د.خ) وەحی بۆ هات و مژدەی کوژرانی ئەوی بەئێمەدا، فەرمووی: دوێشەو عەنسی کوژرا و پیاوێکی پیرۆز لەبنەماڵەیەکی پیرۆز ئەوی کوشت.

وتمان: ئەو کێ بوو؟

فەرمووی: فیروز، سەرکەوتوو بیت فیروز.

فیروز دەڵێت: ئەسوەدمان کوشت و کارەکان بۆ دۆخی جاران گەڕایەوە. کەسمان بۆ لای مەعاز نارد و بڕیارماندا ئەو پێشنوێژی خەڵکان بێت. لەسەنعا پێشنوێژی بۆ ئێمە دەکرد. بەڵام تەنیا سێ ڕۆژ پێشنوێژی بۆ کردین. هیچ شتێکی ناخۆش ڕوویندا جگە لەوەی سوارەکانی ئەسوەد لەنێوان سەنعا و نەجران بوون و هەواڵی مەرگی پێغەمبەرمان پێگەیشت. بارودۆخ شێوا و جڵەوی کارەکانمان لەدەست دەرچوو، نەماندەزانی دەبێت چی بکەین.

عەبدوڵله کوڕی فیروزی دەیلەمی لەباوکی دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر(د.خ) کەسێکی بۆ لای ئێمە نارد بەناوی وەبر کوڕی یەحنسی ئەزدی. لای دازویەی فارسی دابەزی. ئەسوەد کاهین و شەیتانی لەگەڵدا بوو، دەرکەوت ودەستی بەسەر پاشایەتی یەمەندا گرت. پاشای ئەو سەرزەمینەی کوشت و ژنەکەی کردە هاوسەری خۆی. بازام پێشتر مردبوو و کوڕەکەی جێگەی ئەوی گرتەوە. ئەسوەد ئەوی کوشت و ژنەکەی کردە هاوسەری خۆی. من و دازویە و قەیس کوڕی مەکشوحی مورادی لای وەبر کوڕی یەحنس نێردراوەکەی پێغەمبەر(د.خ) کۆبووینەوە و سەبارەت بەکوشتنی ئەسوەد گفتوگۆمان کرد.

ئەسوەد فەرمانیدا و خەڵکانی سەنعا لەگۆڕەپانێك کۆبوونەوە. هات و لەناو ئەوان وەستا. ئەسپەکەی پاشایان هێنا. بەزوبین زەرەبەیەکی لێدا، ئەسپەکە بریندار و بەناو شارەکەدا دەسووڕایەوە تا ئەو کاتەی تۆپی.

ئەسوەد وتی: وشترەکانیان لەو دیوی هێڵەکە ڕاگرت. سەر و گەردنیان لەمدیوی هێڵەکە بوو. ئەو ئاژەڵانە هێڵەکەیان نەدەبزاند. هەموویانی بەزوبین کوشت و کاتێك لەم کارە تەواو بوو، زوبینی بەدەستەوە گرت. لەسەر زەوی خەوت، سەری بەرز کردەوە و وتی، یانی شەیتانەکەی دەڵێت: کوڕی مەکشوح یاخییە. سەری ببڕە. دواتر سەری خستە سەرزەوی و بەرزی کردەوە و وتی: دەڵێت: کوڕی دەیلەمی یاخییە، دەست و

پێی راستی ئەو ببڕە.

دەڵێت: کاتێك وتەکانی ئەومان بیست، بەخۆم وت: سوێند بەخوا دەترسم بانگم بکات و هاوشێوەی ئەو وشترانە بمکوژێت. لەناو خەڵکان خۆم شاردەوە بۆ ئەوەی نەمبینێت. لەگۆڕەپانەکە هاتمەدەر و نەمدەزانی دەبێت چی بکەم. کاتێك لەماڵەوە نزیك کەوتمەوە، یەکێك لەکەسانی ئەسوەد منی بینی و وتی: پاشا تۆی دەوێت و تۆ هەڵدێیت! بگەڕێرەوە! منی گەڕاندەوە و لەکوشتنی خۆم دەترسام.

دەڵێت: هەمیشە خەنجەرم پێبوو، دەستم خستە سەر خەنجەرەکەم و ڕۆشتم، مەبەستی ئەوەم کرد هێرشی بکەمەسەر و خوێنی بڕێژم. کاتێك نزیك بوومەوە، مەترسی لەروخساری مندا بینی و وتی: لەشوێنەکەی خۆت بێستە. وەستام.

وتی: تۆ گەورەتر لەهەموو خەڵکانی ئێرەیت وسەرکردەکانی خەڵك باشتر دەناسیت، گۆشتی وشترەکان لەناو ئەواندا دابەش بکە. سوار بوو ورۆشت. بەدابەش کردنی گۆشت لەناو خەڵکانی سەنعا سەرقاڵ بووم، ئەوکەسەی منی گرت، هات و وتی: بەشی منیش لەم گۆشتە بدە.

وتم: سوێند بەخوا یەك لەتت پێنادەم، مەگەر ئەو کەسە نیت کیشات بەمندا؟

ئەو تووڕە ڕۆشت و ئەسوەدی لەوتەکانی من ئاگادار کردەوە.

کاتێك لەدابەش کردنی گۆشت تەواو بووم، ڕۆشتمە لای ئەسوەد، کاتێك نزیك بوومەوە، بیستم ئەو پیاوە سکاڵا لەمن دەکات، ئەسوەد پێی وت: سوێند بەخوا دەیکوژم.

وتم: فەرمانەکەتم ئەنجامدا و گۆشتم لەناو خەڵکان دابەش کرد.

وتی: کارێکی باشت کرد. ڕۆشت و منیش گەڕامەوە.

کەسمان بۆ لای ژنی پاشا نارد و وتمان دەمانەوێت پاشا بکوژین، چی بکەین؟

کەسی نارد و وتی: وەرنە لای من.

ڕۆشتینە لای ژنی و پاشا و کەنیزێکی لەبەر دەرگا دانا تا ئەگەر ئەسوەد هات ئاگادارمان بکاتەوە. من و ئەو ڕۆشتینە ژوور و ئەمە دوایین ماڵ بوو، تونێلێکمان لێدا و بەپەردە دامانپۆشی. وتم: ئەمشەو دەیکوژم.

ژن وتی: وەرن.

لەناکاو ئەسوەد لەناو ماڵەکەی دەرکەوت و رژدی پێبردم. پەلاماریدا و دەستی

بەلێدانی من کرد. خۆم دەرباز کرد و گەڕامەوە بۆ لای هاورێکانم. دڵنیا بووم مەترسیمان لەسەرە.

لەم کاتەدا نێردراوی ژنەکە هات و وتی: لەوەی بینیتان بێ هیوا مەبن، کاتێك ڕۆشتیت، بەئەسوەدم وت: مەگەر نالێت ئێوە پیاوێکی ئازاد و خاوەنم شکۆن؟

وتی: بۆ نا.

وتم: براکەم هاتبووە لام بۆ ئەوەی ئەحوالم بپرسێت ورێزی خۆی بۆ تۆ دەربڕێت. تۆ پەلامارتدا و لەماڵەکەت دەرتکرد، ئەمە جوامێری تۆیە؟ زۆرم قسەم بۆ کرد و شەرمەزار بوو، وتی: برات بوو؟.

وتم: بەڵێ.

وتی: نەمەدەزانی.

ژن وتبووی ئەمشەو بۆ کوشتنی وەرن.

دەیلەمی دەڵێت: دوای ئەوە ئارام بووینەوە و هێز و ورەمان دەستکەوت. شەوانە من و دازویە و قەیس لەرێگەی تونێلەکەوە ڕۆشتینە ناو ماڵەکەی. بەقەیسم وت: تۆ سوارچاکی عەرەبیت، برۆ و ئەو پیاوە بکوژە.

قەیس وتی: لەکاتی شەڕ لەرز دامدەگرێت، دەترسم لێیدەم بەلام نەتوانم بیکوژم، تۆ لەهەمووان بەهێزتر و گەنجتریت.

دەڵێت: شمشێرەکەم لەبەردەم ئەواندا و ڕۆشتمە ژوور تا بزانم سەری ئەسوەد لەکوێیە. چراکە داگیرسابوو و ئەو لەسەر جێگەکەی بەشێوەیەك خەوتبوو نەمزانی سەری لەکوێدایە و قاچی کامەیە؟ ژنەکەی دانشتبوو و دەنکی هەناری دەرخوارد دەدا تاخەوی لێکەوت. ئیشارەم لەژنەکەی کرد بۆ ئەوەی بزانم سەری لەکوێدایە، سەری نیشاندام. ڕۆشتمە سەر سەری وەستام نەمزانی روخساریم بینی یا نە. لەناکاو چاوی کردەوە و منی بینی. بەخۆم وت: ئەگەر برۆم و شمشێرەکەم بێنم ترسی ئەوە هەیە هاوار بکات و پاسەوانەکانی بانگ بکات.

شەیتانی ئەسوەد ئەوی لەبوونی من ئاگادار کردەوە و هەڵیساند. ئەسوەد گێژ و شەیتان لەسەر زمانی ئەو قسەی لەگەڵ من دەکرد. سەیری دەکردم و پرخە پرخی دەکرد. بەدوودەست کێشام بەسەریدا و دواتر بەدەستێك ڕیشی و بەدەستەکەیترم سەریم گرت و ملیم شکاند. ویستم بۆ لای هاورێکانم بگەڕێمەوە بەلام ژنەکەی داوێنی منی گرت و وتی: خوشکەکەتان و خێزخوازەکاتان بەجێ دێڵیت؟

وتم: سوێند بەخوا کوشتم و لەدەست ئەو ئاسوودە بوویت. گەڕامەوە بۆ لای دوو هاوڕێکەم و ئاگادارم کردنەوە.

وتیان: بگەڕێرەوە و سەری بڕە.

گەڕامەوە، ئەسوەد قسەی دەکرد و هیچ حاڵی نەبووم، دەمیم بەست و سەریم بڕی. بۆ لای دوو هاوڕێکەم گەڕامەوە و پێکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵ. وەبر کوڕی یەحنسی ئەزدی لەوێ بوو. پێکەوە ڕۆشتینە سەر شوێنێکی بەرز و وەبر کوڕی یەحنس بانگیدا. هاوارمان کرد: خواوەند ئەسوەدی درۆزنی کوشت. خەڵك کۆبوونەوە و سەری ئەسوەدمان نیشاندان.

کاتێك هاوەڵانی ئەسوەد ئەمەیان بینی، سوار ئەسپەکانی خۆیان بوون. هەرکام منالێکی کەم تەمەنیان لەخەڵکانی ئەوێ لەبەردەم خۆیان سوا کرد. بەبراکەم وت لەناو خەڵکان جاڕ بدات: هەرکەسێك لەوان دەتوانن بیگرن، مەگەر نابینن چی لەمناڵەکانی ئێمە دەکەن؟ خەڵك پەلاماریاندا و حەفتا کەس لەوانمان گرت. ئەوان سی و نۆ کەسیان لەئێمە برد و کاتێك لەشار ڕۆشتنەدەر، هەستیان بەنەبوونی حەفتا کەسەکەی خۆیان کرد، هاتن و وتیان: هاوڕێکانی ئێمە ئازاد بکەن.

وتمان: مناڵەکانی ئێمە ئازاد بکەن.

ئەوان مناڵەکان و ئێمەیش پیاوەکانی ئەوانمان ئازاد کرد.

دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) بەهاوەڵانی خۆی فەرمووبوو: خواوەند ئەسوەدی عەنسی درۆزنی کوشت. ئەو بەدەستی یەکێك لەبرا موسوڵمانەکانی ئێوە کوژرا.

دۆخی ژیانی ئێمە دوای کوژرانی ئەسوەد بۆ دۆخی پێشتر گەڕایەوە و سەرکردەی خەڵکان ئاسوودە بوون و دووبارە موسوڵمانەکان ڕێزیان پێبەخشرایەوە.

عوبەید کوڕی سەخر دەڵێت: سەرەتای دەرکەوتنی ئەسوەد تا کوژرانی ئەو، سێ مانگی خایاند.

زوحاك کوڕی فیروز دەڵێت: لەو کاتەوەی ئەسوەد لەئەشکەوتی خوبان دەرکەوت تا ئەو کاتەی کوژرا، چوار مانگی خایاند. زۆربەی کارەکانی ئەو بەنهێنی ئەنجامدران.

عەمرۆ کوڕی شەبە دەڵێت: ئەبوبەکر سوپاکەی ئوسامەی لەکۆتایی رەبیع الاول ڕەوانە کرد و هەواڵی کوژرانی ئەسوەدی عەنسی لەکۆتاییەکانی رەبیع الاول دوای بەرێکەوتنی سوپاکەی ئوسامە بەئەبوبەکر گەیشت. ئەمە یەکەم سەرکەوتن بوو

ئەبوبەکری لێ ئاگادار کرایەوە.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا، یانی ساڵی یانزەیەم، لەنیوەی مانگی موحەرەم نێردراوانی هۆزی نەخەع بەسەرکردایەتی زەرارە کوڕی عومەر هاتنە لای پێغەمبەر(د.خ). ئەوان دوایین نێردراو بوون، پێغەمبەر(د.خ) ئەوانی بینی.

لەم ساڵەدا فاتیمە کچی پێغەمبەر(د.خ) لەشەوی سێ شەممە، سێیەم ڕۆژی مانگی رەمەزان، چاوی لەجیهان بەست. تەمەنی لەکاتی مردن بیست و نۆساڵ بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: مردنی فاتیمە، سێ مانگ دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

بەڵام بەوتەی عوروە کوڕی زوبەیر فاتیمە شەش مانگ دوای مەرگی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد.

واقدی دەڵێت: ئەمەیان لای ئێمە بڕواپێکراوترە.

دەڵێت: ئەسما کچی عەمیس و عەلی کوڕی ئەبی تالیب فاتیمەیان شۆرد.

عەمرە کچی عەبدولرەحمان دەڵێت: عەباس کوڕی عەبدولموتەلیب نوێژی لەسەر فاتیمە خوێند.

جویریە کوڕی ئەسما دەڵێت: عەباس و عەلی و فەزل ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەی فاتیمەی کچی پێغەمبەر(د.خ).

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەبدوللە کوڕی ئەبوبەکر مرد. ئەو، لەکاتی گەمارۆ خستنە سەر تاییف، لەلایەن باوکی میحجەن تیرێکی بەرکەوت و برینەکەی چاك نەبوویەوە تا ئەوەی لەمانگی شەوال مرد.

باوکی زەید دەڵێت: لەم ساڵە کەخەڵکان بەیعەتیان لەگەڵ ئەبوبەکر کرد، پارسەکان یەزدگێردیان وەك پاشای خۆیان هەڵبژارد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا ئەبوبەکر لەگەڵ خاریجە کوڕی حوسنی فەزاری شەڕی کرد.

باوکی زەید دەڵێت: دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، ئەبوبەکر سوپاکەی ئوسامەی بۆ سەرزەمینی شام، ئەو شوێنەی زەید کوڕی حارسەی باوکی لەوێ کوژرا، ڕەوانە کرد. خۆی لەمەدینە مایەوە بێ ئەوەی گرفتاری هیچ شەڕێك بێت. نێردراوانی هۆزەکانی عەرەب، ئەوانەی هەڵگەڕابوونەوە، دەهاتنە لای و دەیانویست بەنوێژ رازی بن بەڵام زەکات نەدەن، بەڵام ئەبوبەکر رازی نەبوو و چاوەڕانی کرد تا سوپاکەی ئوسامە دوای حەفتا ڕۆژ گەڕایەوە. ئەبوبەکر ئەوانی لەمەدینە جێگیر و خۆی بەرێکەوت. بەوتەیەك

جێگری ئەو لەمەدینە سەنانی زەموری بوو. ئەبوبەکر بەرێکەوت تا لەجومادی الاول و بەوتەیەک لەجومادی الاخر لەزی ئەلقسە دابەزی.

پێغەمبەر(د.خ) نەوفل کوڕی معاویەی دوئەلی بۆ وەرگرتنی زەکات ڕەوانە کردبوو. خاریجە کوڕی حوسن لەشەربە ئەوی بینی و هەموو زەکاتەکانی بۆ منداڵەکانی فەزارە گەڕاندەوە. نەوفل پێش گەڕانەوەی سوپاکەی ئوسامە، گەڕایەوە بۆ مەدینە بۆ لای ئەبوبەکر.

یەکەم جەنگی دەورانی هەڵگەڕانەوە، شەڕی عەبسی و لەیەمەن ڕوویدا. دوای ئەو شەڕی خاریجە کوڕی حوسن فەزاری ومەنزور کوڕی زەبان کوڕی سەیار و هۆزی غەتەفان بوو کەموسوڵمانان ناکاوگیر کران و ئەبوبەکر پەنای بۆ دارستانێک برد و لەوێ خۆی شاردەوە. دواتر خواوەند ناباوەڕانی شکستدا.

موجالید کوڕی سەعید دەڵێت: کاتێک سوپاکەی ئوسامە بەرێکەوت، کوفر سەری بەرز کردەوە و ئاژاوە سەریهەڵدا. هەموو هۆزەکان جگە لەسەقیف و قوڕیش بەگشتی یا زۆرینەیان لەدین هەڵگەڕانەوە.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر(د.خ) مرد و سوپاکەی ئوسامە بەرێکەوت، هەموو هۆزەکان یا دەستەیەکیان لەدین هەڵگەڕانەوە. موسەیلەمە و تولەیحە دەرکەوتن و دەسەڵاتیان فراوان بوو. خەڵکانی تەی و ئەسەد لەدەوری تولەیحە کۆبوونەوە. خەڵکانی غەتەفان جگە لەتایەفەی ئەشجەع و دەستەیەکی دیکە لەدین هەڵگەڕانەوە و بەیعەتیان لەگەڵ ئەو کرد. خەڵکی هەوازین دوودڵ بوون بەڵام زەکاتیان نەدەدا جگە لەسەقیف و تایەفەی جەدیلە و کەسانی دیکە. دەستەیەک لەمناڵەکانی سولەیەم لەدین هەڵگەڕابوونەوە. خەڵکان بەزۆری پەشیمان ببونەوە.

دەڵێت: نێردراوانی پێغەمبەر(د.خ) لەیەمەن و یەمامە و دیاری منداڵەکانی ئەسەد و نێردراوانی ئەو کەسانەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ ئەوان سەبارەت بەئەسوەد و موسەیلەمە و تولەیحە نامەی نووسیبوو، بەهەواڵ و نامەکانەوە هاتن. نامەکانیان تەسلیمی ئەبوبەکر و ئەویان لەدەنگ و باسەکان ئاگادار کردەوە. ئەبوبەکر وتی: بمێننەوە تا نێردراوەکانی گەورەکانی ئێوە هەواڵی ناخۆشتر و تاڵتر لەمە بێنن. زۆری نەخایاند نامەی سەرکردەکان لەهەموو ناوچەکانەوە گەیشت کەهەموو یادەستەیەک لەمناڵەکانی فلان پەیمانەکەی خۆیان شکاندووە و بەشێوازی جۆراوجۆر دژایەتی موسوڵمانان دەکەن.

ئەبوبەکریش هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) بەنامە شەڕی لەگەڵ نەیاران و نێردراوانی بەنامەوە ڕەوانە دەکرد و بەدوای ئەوان کەسانی دیکەی دەنارد و بۆ شەڕ کردن لەگەڵ ئەوان چاوەڕوانی گەڕانەوەی سوپاکەی ئوسامە بوو. یەکەم شەڕی ئەو لەگەڵ هۆزی عەبەس و زوبیان بوو کەپێش گەڕانەوەی ئوسامە ڕوویدا.

زەید کوڕی ئەسلەم دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، لێپرسراوی ئەو لەسەر هۆزی قوزاعە و کەلب، ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی ئەسبەحی کەلبی لەمناڵەکانی عەبدوللە بوو. لێپرسراوی تایەفەی قین، عەمرۆ کوڕی حەکەم و لێپرسراوی تایەفەی هوزەیم، معاویە کوڕی فلانی وائلی بوو.

دەڵێت: وەدیعەی کەلبی لەگەڵ دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی خۆی لەکەلبییەکان، لەئیسلام هەڵگەڕانەوە. ئەمرۆ ئەلەقیس پەشیمان نەبوویەوە. زەمیل کوڕی قوتەبی قینی لەگەڵ دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی خۆی لەخەڵکی قین هەڵگەڕانەوە جگە لەعەمرۆ، معاویە لەگەڵ دەستەیەك لەشوێنکەوتەکانی خۆی لەسەعدی هوزەیم هەڵگەڕانەوە. ئەبوبەکر بۆ ئەمرۆ ئەلەقیس کوڕی فلان کەدواتر بوو بەباوەگەوریی سەکینە کچی حسەین کوڕی عەلی، نامەی نووسی تا هێرش بکاتە سەر وەدیعە. نامەی بۆ عەمرۆیش نووسی کەشەڕی لەگەڵ زەمیلدا کرد و هەروەها نامەی بۆ معاویەی عوزری نووسی.

کاتێك ئوسامە گەیشتە سەرزەمینی قوزاعە، سوارەکانی خۆی نارد و فەرمانیدا لەشەڕی هەڵگەڕاوەکان هاوکاری موسوڵمانان بکەن. هەڵگەڕاوەکان بەرەو دوومە هەڵاتن و لەدەوری وەدیعە کۆبوونەوە. سوپاکەی ئوسامە گەڕایەوە و ئەو هێرشی کردە سەر کەمقەتین و دەستی بەسەر تایەفەی مناڵەکانی زەبیبی جوزام و مناڵەکانی خەلیلی لەخم و هاوەڵانیان لەهۆزی جوزام و لەخمدا گرت و تەندروست و لەگەڵ تاڵانییەکان گەڕایەوە.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، زۆرینەی خەڵکانی ئەسەد و تەی و غەتەفان لەدەوری تولەیحە کۆبوونەوە. تەنیا ژمارەیەکی کەم لەوان موسوڵمانییەتی خۆیان پاراست. خەڵکی ئەسەد لەسەمیرا کۆبوونەوە و فەزارە و دەستەیەك لەغەتەفانییەکان لەباشووری تیبە کۆبوونەوە. خەڵکانی تەی لەسنووری سەرزەمینەکەی خۆیان کۆبوونەوە. خەڵکی سەعلەبە کوڕی سەعد و مورە و عەبەس لەئەبرەقی ڕەبزە ئوردویان لێدا و دەستەیەك لەمناڵەکانی کەنانە پەیوەستیان بوون و لەبەر ئەوەی شوێنی مانەوە نەبوو، بوون بەدوو دەستە. دەستەیەکیان لەئەبرەق مایەوە

و دەستەیەکیان روویان کردە زوئەلقسە. تولەیحە حوبالی بۆ هاوکاری ئەوان نارد و سەرکردەی منالەکانی ئەسەدی زوئەلقسە و دەستەی لەیسییەکان و دەیلییەکان و مەلەجییەکان پەیوەستی ئەوان بوون. سەرکردەی خەڵکان لەئەبرەق عەوف کوڕی فلان کوڕی سەنا و سەرکردەی سەعلەبە و عەبەس، حارس کوڕی قەلانی سەبعی بوو. ئەم خەڵکانە کەسانێکیان بۆ مەدینە نارد و لای ماڵی سەرکردەکان دابەزین جگە لەعەباس کەکەسی لا نەبوو. قسەیان لەگەڵ ئەبوبەکر کرد بۆ ئەوەی نوێژ بخوێنن بەلام زەکات نەدەن. ئەبوبەکر رازی نەبوو، وتی: ئەگەر ئەژنۆبەندی وشترێکم پێبدەن، لەسەر ئەوە شەڕ دەکەم. ئەژنۆ بەندی وشترەکان، زەکات یا زەکاتدەران بوو کەبەوشتر دەیاندا.

نێردراوانی هۆزە هەڵگەڕاوەکان لەئیسلام لەمەدینە گەڕانەوە بۆ لای کەسەکانی خۆیان و ئاگاداریان کردنەوە: مەدینە شەڕکەری زۆری لێ نییە و بیریان لە هێرش بۆ سەر مەدینە کردەوە.

ئەبوبەکر دوای ئەوەی نێردراوان گەڕانەوە، عەلی و زوبەیر و تەڵحە و عەبدوللە کوڕی مەسعودی لەسەر رێگەکانی مەدینە دانا، خەڵکانی مەدینەی لەمزگەوت کۆکردەوە و وتی: خەڵکانی دەوروبەر ئامێزیان بۆ کوفر کردۆتەوە و نێردراوەکان هەستیان بەژمارەی کەمی ئێوە کرد، ئاشکرا نییە بەشەو هێرش دێنن یا بەرۆژ چوونکە نزیکترین تایەفە تا ئێرە، زیاتر لەیەك رۆژ رێگە نییە. ئەوان هیوادار بوون بەمەرجەکانیان رازی بین و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەستین، بەلام رازی نەبووین، خۆتان ئامادە بکەن.

سێ رۆژ تێپەڕی و عەرەبە هەڵگەڕاوەکان شەوانە هێرشیان کردە سەر مەدینە. دەستەیەك لەزی حەسی مانەوە تا پشتیوان بن، هێرشبەران شەوانە کاتێك دەگیشتنە سەر رێگاکان، رووبەرووی شەڕکەران بوونەوە. ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە و کەسی ڕەوانە کرد تا لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە. لەگەڵ دانیشتووانی مزگەوت کەهەموویان وشتر سوار بوون، بەرێکەوت و شەڕیان لەگەڵ دوژمن کرد. دوژمن هەڵات و وشتر سوارە موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن تا گەیشتنە زی حەسی. هێزە پشتیوانەکان هاتنەدەر، مەشکەی پڕ بایان خستە بەردەمی وشترەکان و وشترەکان ڕەمیان کرد.چوونکە وشترەکان بەمەشکەی پڕ با ڕەم دەکەن. نەیانتوانی جڵەوی وشترەکان بگرن تا گەڕانەوە بۆ مەدینە. بەلام کەس لەموسوڵمانان لەوشترەکەی نەکەوتە خوار و نەکوژرا.

خوتەیل کوڕی ئەوس لەمبارەوە هۆنراویەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

(( بار و وشترەکەی من فیدای منالەکانی زەبیان بێت

بەهۆی بوێری ئەو شەوەی ئەبوبەکر لەرێخەلاّن هێرشی دەبرد

داوای لەکەسان کرد و وەلاّمیان دایەوە.

خواوەند سوپایەکی هەیە و کاتێك رووبەرووی دەبنەوە

بوێری ئەوان دەبێتە هۆی سەرسوڕمان))

عەبدوللە لەیسی کەخەڵکەکەی لەئیسلام هەڵگەڕابوونەوە، لەگەڵ تالاّنچییەکان هاتبوونە زو ئەلقسە و زی حەسی، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( تا پێغەمبەر(د.خ) لەناوماندا بوو شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بووین

ئەی بەندەکانی خواوەند، ئەبوبەکر چ کارەیە؟

ئایا کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، ئەبوبەکر بوو بەمیرات هەڵگری.

سوێند بەخوا ئەمە شیاو نییە بۆ رازی بوون

بۆ بەداوای نێردراوەکانی ئێمە رازی نەبوون

وله دەرئەنجامەکانی نەترسان

ئەوەی نێردراوانی ئێمە داویان دەکرد و پێی رازی نەبوون

بۆ من وەك خورما شیرن و بگرە شیرنتر لەخورمایە.))

تالاّنچییەکان گومانیان کرد موسوڵمانەکان لاواز بوون. کەسیان بۆ لای دانیشتووانی زوئەلقسە نارد و ئاگاداریان کردنەوە. ئەوان بەبڕوا کردن بەقسەی ئەوان هاتن و ئاگاداری مەبەست و ئیرادەی خواوەند نەبوون.

ئەبوبەکر شەوی بەئامادە کردنی کەرەستە پێویستەکان بەسەر برد و کۆتاییەکانی شەو لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت. نەعمان کوڕی موقرین فەرماندەی باڵی راست و عەبدوللە کوڕی موقرین فەرماندەی باڵی چەپ بوو. سوەید کوڕی موقرین لەدوای سوپا و سوارەکانی سوپا لەگەڵ ئەودابوون. بەرەبەیان رووبەرووی دوژمنان بوونەوە. دوژمنان کاتێك ئاگادار بوونەوە کەشمشێری موسوڵمانان دەستی بەکار کردبوو. کاتێك هەتاو هەلات. پاشەکشێیان بەدوژمن کرد و زۆربەی وشترەکانی ئەوانیان گرت و حوبال کوژرا. ئەبوبەکر لەگەڵ سوپاکەی تا زوئەلقسە شوێن دوژمن کەوت و نەعمان کوڕی موقرین و دەستەیەکی لەوێ دانا و بۆ مەدینە گەڕایەوە. ئەمە یەکەم سەرکەوتنی موسوڵمانان لەشەڕی هەڵگەڕاوەکان بوو.

منداڵەکانی زەبیان و عەبەس هێرشیان کردە سەر موسوڵمانەکانی خۆیان و خوێنیان رشتبوون. هۆزەکانی دەوروبەریش ئەو کارەیان ئەنجامدا. شەڕی ئەبوبەکر بوو بەهۆی سەرفەرازی موسوڵمانان و سوێندی خوارد ژمارەیەکی زۆر لەناباوەڕان دەکوژێت و لەهەر هۆزێك بەو ئەندازەی لەموسوڵمانەکانیان کوشتوو، یا زیاتر خەڵکیان لێ دەکوژێت.

زیاد کوڕی حەنزەلەی تەمیمی لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

(( کاتێك رووبەروویان بووینەوە

هێرشمان کردە سەر منداڵەکانی عەبەس لەسەرزەمینی خۆیان

و منداڵەکانی زەبیانمان لەشوێنەکانی خۆیان دوور خستەوە.))

ئەبوبەکر ئەو کارەی کردو موسوڵمانان بۆ دینەکەی خۆیان پێداگر بوون. ناباوەڕانی خەڵکان و هۆزەکان شکستیان خوارد و زەکاتی وشترەکانی سەفوان و زەبەرقان و عودی، یەك لەدوای یەك دەگەیشتە مەدینە. زەکاتی سەفوان لەسەرەتای شەو و زەبەرقان لەنیوە شەو و زەکاتی عودەی لەکۆتاییەکانی شەو گەیشت. سەعد کوڕی ئەبی وەقاس مژدەی سەفوان و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف مژدەی زەبەرقان و عەبدوللە کوڕی مەسعود مژدەی زەکاتی عودەی برد.

دەڵێت: کاتێك وشترەکانی زەکات لەدوورەوە دەرکەوتن، خەڵکان وتیان: مەترسییە. بەڵام ئەبوبەکر وتی: مژدەیە. هەموی مژدەیە و خێر و خۆشی.

ئەم رووداوە دوای شەست رۆژ لەڕۆشتنی سوپاکەی ئوسامە روویدا. چەند رۆژ دواتر ئوسامە گەیشتە مەدینە. سەفەرەکەی دوو مانگ و چەند رۆژی خایاند. ئەبوبەکر ئەوی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا و فەرمانی بەخۆی و سوپاکەیدا بحەسێنەوە و شەکەتی چوارپێکانیان بڕەوێنەوە. لەگەڵ دەستەیەکی دیکە بەرەو زوئەلقسە رۆشت. ئەو کەسانەی بۆ پاسەوانی کردنی رێگاکان راسپێردرابوون، لەگەڵیدا ڕۆشتن.

موسوڵمانان بەئەبوبەکریان وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)، سوێندت دەدەین بەخوا خۆت نەخەیتە مەترسییەوە، چوونکە ئەگەر بکوژرێت، بارودۆخ دەشلەژێت، مانەوەی تۆ لەمەدینە بۆ خەڵکان باشتر و بۆ دوژمنان مەترسیدارترە، کەسێك ڕەوانە بکە و ئەگەر کوژرا کەسێکی دیکە.

وتی: سوێند بەخوا ئەو کارە ناکەم و هاوشێوەی ئێوە لەگۆڕەپانی جەنگ بەشدار

دەبم. لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرە زونەلقسە و زی حەسی ڕۆشت. نەعمان و عەبدوللە و سوەید فەرماندەی باڵەکانی راست و چەپ و کۆتایی سوپاکەی بوون. بەرێکەوتن و لەئەبرەق هێرشیان کردە سەر خەڵکانی رەبزە و کوشتاریان کرد. خواوەند شکستی بەحارس کوڕی عەوف بەخشی و حەتیئە ئەسیر کرا. عەبەس و مناڵەکانی بەکر هەڵاتن. ئەبوبەکر چەند رۆژێك لەئەبرەق مایەوە و وتی: ڕەوا نییە مناڵەکانی زەبیان بەسەر ئەم سەرزەمینەدا زاڵ بن چوونکە خواوەند وەك تالأنی بەئێمەی بەخشیوە.

کاتێك هەڵگەڕاوەکان شکستیان خوارد و پەشیمان بوونەوە. بەخشران. مناڵەکانی سەعلەبە کە لەئەبرەق نیشتەجێ بوون هاتن تا لەوێ بمێننەوە بەلأم رێگەیان لێگرتن. دواتر لەمەدینە ڕۆشتنە لای ئەبوبەکر و وتیان: بۆ رێگە نادەن لەسەرزەمینی خۆمان نیشتەجێ ببین؟

ئەبوبەکر وتی: درۆ دەکەن، سەرزەمینی ئێوە نییە، تالأنی ئێمەیە. بەداواکەیان رازی نەبوو و ئەبرەقی کردە شوێنی لەوەڕینی ئەسپی موسوڵمانان و سەرزەمینی رەبزەی کردە لەوەڕگەی موسوڵمانان. دواتر لەوەڕگەی چوارپێکان بوو بەزەکات بەهۆی نەوەی لەنێوان خەڵکان و لێپرسراوانی کۆکردنەوەی زەکات دووبەرەکی روویدا و بەم کارە نەو کێشەیە چارەسەر کرا.

کاتێك هۆزی عەبەس و زەبیان شکستیان خوارد. بۆ لای تولەیحە بەرێکەوتن کە لەسەمیراوە رووی کردبووە بوزاخە و لەوی نیشتەجێ بوو.

عەبدولرەحمان کوڕی کەعب دەڵێت کاتێك ئوسامە کوڕی زەید گەڕایەوە. ئەبوبەکر ئەوی لەمەدینە وەك جێگری خۆی دانا و خۆی بەرێکەوت تا لەگەڵ مناڵەکانی عەبەس و زەبیان و دەستەیەك لەمناڵەکانی عەبدمەنات بجەنگێت. لەئەبرەق رووبەروویان بوویەوە و شەڕی دەستپێکرد. خواوەند ئەوانی شکستدا و بلأوەیان لێکرد.

کاتێك سوپاکەی ئوسامە حەسایەوە. نەوانەی لەدەوری مەدینە بوون، کۆبوونەوە و ئەبوبەکر هێرشی کردە سەر زو نەلقسە کە تا مەدینە یەك مەنزڵە. لەوێ یانزە دەستەی دیاریکرد و ئالأکانی بەست بەسەرکردەی هەر دەستەیەکی وت، موسوڵمانەکانی سەر رێگە کەتوانای شەڕ کردنیان هەیە، پەیوەستی خویان بکەن و کەسانێك بۆ بەرگری کردن لەسەرزەمینەکەیان بهێڵنەوە

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك سوپاکەی نوسامە حەسایەوە و ماڵ و زەکاتە فراوانەکان گەیشتنە مەدینە. ئەبوبەکر دەستەکانی دیاری کرد و ئالأکانی بەست:

ئالآیەکی بۆ خالید کوڕی وەلید بەست و فەرمانی پێدا بۆ شەڕی تولەیحە کوڕی خوەیلد بەرێکەوێت و کاتێك لەو تەواو بوو هێرش بکاتە سەر مالك نەویرە لەبەتاح و ئەگەر خۆڕاگری کرد، شەڕی لەگەڵ بکات.

بۆ عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل ئالآیەکی بەست و بۆ شەڕی موسەیلەمە ڕەوانەی کرد.

ئالآیەکی بۆ موهاجیر کوڕی ئومەییە بەست و ئەوی بۆ شەڕی ئەسوەدی عەنسی نارد و وتی: ئەمیرەکانی یەمەن دژی قەیس کوڕی مەکشوح و هاودەستە یەمەنییەکانی ئەو هاوکاری بکات، دواتر رووبکاتە هۆزی کێندە لەحەزرەمەوت.

ئالآیەکی بۆ خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس بەست و ئەوی بۆ شەڕی قوزاعە و وەدیعە و حارس ڕەوانە کرد.

ئالآیەکی بۆ حوزەیفە کوڕی موحسنی غەلفانی بەست و بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکانی دەبا ڕەوانەی کرد.

ئالآیەکی بۆ عەرەفجە کوڕی هەرسیمە بەست و بۆ شەڕی دەستەی موهرە ڕەوانەی کرد و وتی: عەرەفجە و حوزەیفە پێکەوە بن و لەسنووری کارەکانی هەرکام، ئەو کەسە سەرکردە بێت.

شورەحبیل کوڕی حەسەنەی بەدوای عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل نارد و وتی: کاتێك لەیەمامە تەواو بوون لەگەڵ سوارەکانی خۆت رووبکەرە قوزاعە و لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان بجەنگە.

ئالآیەکی بۆ تەریفە کوڕی حاجز بەست و ئەوی بۆ شەڕ لەگەڵ تایەفەی مناڵەکانی سولەیم و هاوپەیمانەکانیان لەهەوازین ڕەوانە کرد.

ئالآیەکی بۆ سوەید کوڕی موقرین بەست و ئەوی بۆ تەهامەی یەمەن ڕەوانە کرد.

ئالآیەکی بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی بەست و ئەوی بۆ بەحرەین نارد.

ئەم سەرکردانە لەزو ئەلقسەوە بەرێکەوتن. هەرکام لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ شوێنی مەبەست بەرێکەوتن. ئەبوبەکر فەرمانەکانی خۆی بۆ ئەوان نووسی هەروەها نامەی بۆ هەڵگەڕاوەکانیش نارد.

عەبدولرەحمان کوڕی کەعب دەڵێت: ئەبوبەکر نامەی بۆ خەڵکانی قەحزەم ناردو نامەکانی بۆ هەموو هۆزە هەڵگەڕاوەکان وەك یەك بوو بەم ناوەرۆکە:

بسم الله الرحمان الرحيم.

لەئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ) بۆ هەموو ئەو کەسانەی نامەکەی منیان بەدەست دەگات، لەتاك و کۆ، موسوڵمان و هەڵگەڕاوە لەدین.

سلاو لەو کەسەی شوێنکەوتەی رزگاری بێت و دوای رزگاری بۆ سەر رێگەی تاریکی و گومڕایی نەگەڕێتەوە. سپاس و وەسفی خوای تاقانە دەکەم و شایەتی دەدەم جگە لەخوای تاقانە هیچ خوایەك بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە. بەوەی بۆی هێناین، باوەڕدارم و هەرکەس باوەڕی نەبێت، بەکافری دەزانین و شەڕی لەگەڵ دەکەین.

بەڵام دواتر، خواوەند محەممەدی وەك مژدەدەر و ئاگادارکەرەوەی خەڵکان و بانگەشەی خواپەرەستی بۆ لای خەڵکەکەی خۆی ڕەوانە فەرموو. چرایەکی رووناك بوو تا هەموو زیندووەکان ئاگادار بکاتەوە و وتاری راست بەسەر وتەی ناباوەڕان سەرکەوێت، خواوەند باوەڕدارانی رێنوێنی و پێغەمبەر(د.خ) بەمۆڵەت وەرگرتن لەخوا شەڕی لەگەڵ ناباوەڕان کرد تا بەدڵخواز یا نابەدڵ باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

پێغەمبەر(د.خ) مرد، فەرمانەکانی خوای ئەنجامدا و ئامۆژیاری خەڵکەکەی خۆی کرد و ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجامدا. خواوەند لەکتێبەکەی ئەم پێشهاتەی بۆ هەموو باوەڕداران روون کردۆتەوە و دەفەرمێت:

((انك میت و انهم میتون.

وتاکەی: تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن.))

هەروەها دەفەرمێت: ((وما جعلنا لبشر من قبلك الخلد افان مت فهم الخالدون.

واتاکەی: پێش تۆ نەمریمان بەکەس نەبەخشیوە، چۆن تۆ بمرێت و نەیارەکانت نەمر بن.))

هەروەها بەباوەڕداران دەفەرمێت:

((وما محمد الارسول قد خلت من قبله الرسل افان مات اوقتل انقلبتم علی اعقابکم و من ینقلب علی عقبیه فلن یضر الله شیئا و سیجزی الله الشاکرین.

واتاکەی: محەممەد تەنیا نێردراوێکە و پێش ئەویش نێردراوەکان مردوون، ئایا ئەگەر بمرێت یا بکوژرێت پاشەکشێ دەکەن، هەرکەس پەشیمان ببێتەوە هیچ زیانێك لەخوا نادات و خوا پاداشتی سپاسکەران دەداتەوە.))

((هەرکەس محەممەدی دەپەرەست، محەممەد مرد و هەرکەس خوای تاقانەی دەپەرەست، خوا چاودێری ئەوە، زیندوو و نەمر و هەمیشەیی، کەهیچ کات خەوی

لێناکەوێت، ئاگای لەکارەکانی خۆیەتی و تۆڵە لەدوژمنەکەی خۆی دەستێنێت و سزای دەدات.))

پێشنیارتان پێدەکەم لەخوا بترسن و بەشی خۆتان لەدینی خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) هەڵبگرن. باوەڕدار بن و دەستدرێژی مەکەنە سەر دینی خواوەند، چوونکە هەرکەس خواوەند ڕێگەی نیشان نەدات، گومڕا دەبێت و هەرکەس نەیپارێزێت، زیانەکانی بەسەردا دەبارێت و هەرکەس بەزەیی خوا نەیگرێتەوە، ریسوا دەبێت. هەرکەس خوا ڕێگەی نیشان بدات، رزگاری دەبێت و هەرکەس گومڕا بکات، لەگومڕایی خۆیدا دەمێنێتەوە. دەفەرمێت:

((من يهد الله فهو المهتدى و من يضلل فلن تجدلهوليا مرشدا.

واتاکەی: خواوەند ڕێگە نیشان هەرکەسێك بدات، رزگاری بووە و هەرکەس گومڕا بکات، خۆشەویست و پێشەوایەك بۆ ئەو نابینیت. لەدنیا بەکردەوەکانی رازی نابین مەگەر بۆ رەزامەندی خواوەند ئەنجام بدرێت و لەو دنیا بۆی قەرەبوو ناکرێتەوە.))

ئاگادار بوومە کەسانێك لەئێوە دوای باوەڕ هێنان بەئیسلام و ئەنجامدانی ئەرکەکانی، لەرووی غروور و ملکەچ بوون بۆ شەیتان، لەدینی خۆتان پەشیمان بوونەتەوە. خواوەند دەفەرمێت:

((واذ قلنا للملائكة اسجد والادم فسجدوا الا ابليس كان من الجن ففسق عن امرربه أفتتخذونه و ذريته اولياء من دونى و هم لكم عدوبلس للظالمين بدلا.

واتاکەی: کاتێك بەفریشتەکانمان وت: سوجدە بۆ ئادەم ببەن، هەموویان سوجدەیان برد جگە لەئیبلیس کە لەجنۆکەکان بوو و سەرپێچی فەرمانی پەروەدگاری کرد. بۆ ئەو و منداڵەکانی دەکەنە هاورێی خۆتان لەکاتێکدا دوژمنی منن؟ بۆ خراپەکاران چ قەرەبوو کردنەوەیەکی خراپە.))

هەروەها دەفەرمێت: (( ان الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدوا انما يدعو حزبه ليكونوا من اصحاب السعير.

واتاکەی:. بەراستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، ئێوەیش ئەو بکەنە دوژمنی خۆتان چوونکە شەیتانییەکان تەنیا داواتان لێدەکەن ببنە یەکێك لەهاوەڵانی ئاگر.))

من، فلاّن کەسم بەسوپایەك لەموهاجیر و ئەنسارەکان بۆ لای ئێوە ناردووە و فەرمانم پێداون شەڕ لەگەڵ کەس نەکەن وکەس نەکوژن مەگەر ئەوەی پێشنیاری

خواپەرەستیتان پێبکەن. هەرکەس بەپێشنیاری ئەوان رازی و وەڵامیان بداتەوە و خۆی لەکوفر دووربخاتەوە، رازی بن و هەرکەس رازی نەبوو، فەرمانم پێداون لەگەڵی بجەنگن و هەرکەس لەوانیان بەردەست کەوێت نەهێڵن زیندوو بێت و بەئاگر بیسووتێنن و بێ چەند و چوون بیکوژن و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر بکەن. تەنیا بەداوای موسوڵمانەکان رازی ببن. هەرکەس گوێرایەڵ بێت سوودی پێدەبرێت و هەرکەس نەبێت، زیان.

مۆڵەتم بەنێردراوەکانی خۆمداوە، ئەم نامەیە لەکۆبوونەوەی ئێوەدا بخوێننەوە.

پێشنیاری ئیسلام بانگە و کاتێك موسوڵمانەکان بانگیان فەرموو، دەستیان لێ هەڵبگرن و ئەگەر بانگیان نەدا هێرشیان بکەنەسەر. کاتێك بانگیان فەرموو، پرسیاری چۆنییەتی ئەو کارەیان لێ بپرسن و ئەگەر رازی نەبوون، وەڵام بدەنەوە، هێرشیان بکەنەسەر و ئەگەر رازی بوون، لێیان رازی بن و بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کوتیان لەگەڵ بکەن.

ئەبوبەکر نێردراو و نامەکانی خۆی پێش سوپاکەی رەوانە کرد. دوای ئەوان سەرکردەکان بەرێکەوتن. فەرمانەکانی ئەبوبەکریان پێبوو. دەقی فەرمانەکان بەمشێوەیە:

بسم الله الحرمان الرحیم.

ئەم فەرمانی ئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەرە بۆ فلان کەس کە بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکان رەوانەی دەکات و فەرمانی پێدەدات تا ئەو جێگە دەتوانێت لەئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆی بەئاشکرا و نهێنی لەخوا بترسێت. فەرمان دەدات لەرێگەی خوادا تێبکۆشێت و لەگەڵ نافەرمانەکان و هەڵگەڕاوەکان و ئەوانەی باوەش بۆ ئارەزووە شەیتانییەکان دەکەنەوە، بجەنگێت، سەرەتا پێشنیاری ئیسلامیان پێبکات، ئەگەر رازی بوون، دەستیان لێ هەڵگرێت و ئەگەر رازی نەبوون، هێرشیان بکاتەسەر تا تەسلیم دەبن. دواتر ئەرکەکانیان بیر بخاتەوە و ئەوەی دەبێت وەریبگرن، وەریبگرێت و موسوڵمانان لەچاوەڕوانیدا نەهێڵێتەوە و لەشەڕ کردن لەگەڵ کافرەکان دوور نەخاتەوە. هەرکەس ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگار بوو، وەك موسوڵمان لەقەڵەمی بدات و لەکارە خێرەکان هاوکاریان بێت و هەرکەس بەخوا ناباوەڕ بێت شەڕی لەگەڵ بکات تا باوەڕ بەخوا دێنێت. ئەگەر رازی بوو، دەستی لێ هەڵگرێت و حسێبی دڵی لەگەڵ خوایە، هەرکەس بەپێشنیارەکانی خواوەند رازی نەبێت بکوژرێت و لەهەر شوێنێك بێت و بگاتە هەر شوێنێك شەڕیان لەگەڵ بکات. تەنیا لەکاتی باوەڕهێنان لێیان خۆش ببێت. ئەوەی

باوەڕی هێنا، فێرکارییە دینییەکانی فێربکات و ئەگەر ڕازی نەبوون، شەڕیان لەگەڵ بکەن تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنتان پێدەبەخشێت. تاڵانییەکان لەنێوان موسوڵمانان دابەش و پێنج یەك بۆ ئێمە بنێرێت.

دەبێت ڕێگەی هەڵپەکاری لەشەڕکەرانی خۆی بگرێت و خەڵکانی دیکە تێکەڵاو بەوان نەکات تا ئەو کاتەی دەیانناسن ودڵنیا دەبن سیخوڕ نین ولەلایەن ئەوانە مەترسی لەسەر موسوڵمانان نەبێت. دەبێت لەگەڵ موسوڵمانان بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس وکەوت بکات و بەشێوەیەکی شیاو لەگەڵیان بدوێت.

## وتار سەبارەت بەخەڵکانی غەتەفان کەپەیوەستی تولەیحە بوون و سەرئەنجامی ئەو

سەهل کوڕی یوسف دەڵێت: کاتێك خەڵکی عەبەس و زەبیان و هاوپەیمانەکانیان روویان لەبوزاحە کرد، تولەیحە کەسی بۆ لای هۆزی جەدیلە و غەوس نارد تا پەیوەستی ببن. دەستەیەك لەم دوو هۆزە بەخێرایی وەڵامیان دایەوە و بەخەڵکەکەی خۆیان وت پەیوەستی تولەیحە دەبن.

ئەبوبەکر پێش ڕەوانە کردنی خالید، لەزو ئەلقسەوە عودەی بۆلای خەڵکەکەی نارد و وتی: فریایان بکەوە بۆ ئەوەی لەناو نەچن. عودەی ڕۆشت بەو مەبەستەی گفتوگۆیان بکات و ڕێگەی خراپەکاریان لێ بگرێت.

خالید بەدوای عودەی بەڕێکەوت. ئەبوبەکر فەرمانی پێدا سەرەتا لەهۆزی تەی دەست پێبکات کە لەئەکناف ژیانیان بەسەر دەبرد، دواتر بەرەو بزواخە بڕوات و دوای ئەو بەتاح و کاتێك لەم ئەرکانەی تەواو بوو، چاوەڕوان بێت تا فەرمانی بۆ دەنێرێت.

ئەبوبەکر وای نیشاندا بەرەو خەیبەر دەڕوات و لەوێوە پەیوەستی خالید دەبێت تا لەئەکنافی سولەمی پەیوەستی یەك ببن. خالید بەڕێکەوت و بەدەوری بوزاخەدا سووڕایەوە و رووی کردە ئەجا. وای نیشاندا مەبەستی ئەوەی هەیە هێرش بکاتە سەر خەیبەر و دواتر شەڕ لەگەڵ خەڵکانی تەی دەکات، خەڵکانی تەی لەسەرزەمینی خۆیان مانەوە و پەیوەستی تولەیحە نەبوون. عودەی گەیشتە سەرزەمینەکەی وپێشنیاری پەیوەست بوون بەموسوڵمانانی پێکردن، بەڵام وتیان: هیچ کات لەگەڵ باوکی فوزەیل، بەیعەت نابەستین.

عودەی وتی: خەڵکانێکی بەهێزن و بۆ شەڕی ئێوە هاتوون، خۆتان دەزانن.

وتیان: بڕۆ سوپاکە لەئێمە دووربخەرەوە تا ئەو کەسانەی پەیوەستی تولەیحە بوون، بگەڕێنینەوە چوونکە ئەگەر دژایەتی تولەیحە بکەین، ئەوان دەکوژێت یا وەك بارمتە لای خۆی گلیان دەداتەوە.

عودەی ڕۆشتە لای خالید لەسەنح و وتی: ئەی خالید، سێ ڕۆژ چاوەڕێ بکە تا پێنسەد پیاوی شەڕکەر پەیوەستی سوپاکەت ببێت و بتوانی بەهاوکاری ئەوان شەڕی

دوژمنەکانت بکەیت. ئەمە باشترە لەوەی بەخێرایی ڕەوانەی جەهەننەمیان بکەیت.

خالید ڕازی بوو.

عودەی بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە. کەسیان بۆ بوزاخە نارد تا خەڵکەکەیان بگەڕێنەوە بەو بیانووەی لەبەرابەر موسوڵمانان هاوکاریان بکەن چوونکە جیاواز لەوە تولەیحە بەگەڕانەوەی ئەوان ڕازی نەدەبوو. عودەی بۆ لای خالید گەڕایەوە و لەباوەڕهێنانی خەڵکەکەی ئاگاداری کردەوە.

خالید بەرەو ئەنسەر بەڕێکەوت. دەیویست هێرش بکاتە سەر تایەفەی جەدیلە. عودەی پێی وت: هۆزی تەی وەك وەك مەلێکە و تایەفەی جەدیلە یەکێك لەباڵەکانییەتی، چەند ڕۆژ مۆڵەتیان پێبدە ئەگەری هەیە خواوەند جەدیلە ڕزگار بکات بەهەمان شێوە کەغەوسی ڕزگاری کرد.

خالید ڕازی بوو.

عودەی ڕۆشتە لای خەڵکان و قسەی بۆ کردن. بەیعەتیان لەگەڵ بەست و خالیدی لەباوەڕهێنانی ئەوان ئاگادار کردەوە. هەزار سوار لەوان پەیوەستی سوپای موسوڵمانان بوو. ئەمە وەك خێرێکی گەورەی سەرزەمینی تەی، لەقەڵەمدرا.

بەڵام بەوتەی هوشام کوڕی کەلبی، کاتێك سوپاکەی ئوسامە گەڕایەوە، ئەبوبەکر شەڕی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان دەستپێکرد. لەگەڵ سوپاکەی ڕووی کردە زو ئەلقسە لەیەك مەنزڵی مەدینە لەسەر ڕێگەی نەجد. لەوێ سوپای ڕازاندەوە و خالید کوڕی وەلیدی کردە سەرکردەی سوپاکە. سابت کوڕی قەیسی وەك سەرکردەی ئەنسار دەستنیشان کرد و بەخالیدی وت لەگەڵ تولەیحە و عوێەیینە کوڕی حوسن لەبوزاخە یەکێك لەچاڵاوەکانی مناڵەکانی ئەسەد، شەڕ دەسپێبکات. بەرووکەش بەخالیدی وت لەگەڵ سوپاکەی خۆم لەخەیبەر پەیوەستی تۆ دەبم. ئەمە تەنیا فریو بوو بۆ ئەوەی دوژمن بترسێنێت چونکە هەموو خەڵکانی لەگەڵ خالید ڕەوانە کرد.

ئەبوبەکر بۆ مەدینە گەڕایەوە و خالید کوڕی وەلید ملی ڕێگەی گرتەبەر و کاتێك لەدوژمن نزیك کەوتەوە، عوکاشە کوڕی موحسین و سابت کوڕی ئەقرەمی عیجلی هاوپەیمانی ئەنساری وەك پێشەنگ نارد و کاتێك لێیان نزیك کەوتنەوە، تولەیحە و سەلمەی برای هاتنەدەر و پرسیاریان کرد بەڵام سەلمە لەناکاو سابتی کوشت و کاتێك تولەیحە کارەکەی ئەوی بینی هاواری کرد: لەکوشتنی ئەم پیاوە هاوکاریم بکە چوونکە

ئەو دەمکوژێت. دووبراکە یەکیان گرت و عوکاشەیشیان کوشت و ڕۆشتن.

کاتێك خالید و سوپاکەی لای کوژراوی سابت کوڕی ئەقرەم گوزەریان کرد هەستیان پێنەکرد تا ئەو کاتەی لەژێر سمی ئەسپەکانیان پێشێل کران. ئەم ڕووداوە بۆ موسوڵمانان دژوار و کاتێك بەوردی سەیریان کرد، جەستەی کوژراوی عوکاشەیشیان دۆزییەوە، وتیان: دووان لەسەرکردەی موسوڵمانان و سوارچاکەکان کوژران. خالید ڕووی کردە هۆزی تەی.

هوشام لەعودەی کوڕی حاتەم دەگێڕێتەوە: کەسم بۆ لای خالید نارد و پەیاممدا: وەرە بۆ لای من و چەند ڕۆژێك بمێنەرەوە تا نێردراوان بۆ لای هۆزەکانی تەی بنێرم و زیاتر لەسوپاکەی خۆت، شەڕکەر کۆبکەمەوە و شان بەشانی تۆ هێرش بکەمە سەر دوژمنان.

هەروەها هوشام لەیەکێك لەئەنسار دەگێڕێتەوە: کاتێك خالید نالاندنی موسوڵمانەکانی بۆ کوژرانی سابت و عوکاشە بینی، وتی: دەتانەوێت بڕۆینە لای یەکێك لەهۆزە عەرەبەکان کەهێز و شەڕکەری فراوانیان هەیە و کەسیان لەدین پەشیمان نەبوونەتەوە؟

وتیان: چ هۆزێك؟

وتی: هۆزی تەی.

وتیان: خوا سەرکەوتنت پێببەخشێت، بۆچوونەکەت پەسەندە. خالید سوپاکەی برد و لەسەرزەمینی تەی دابەزی.

جەدیل کوڕی خوبابی نەبهانی دەڵێت: خالید لەئەرك دابەزی کەشاری هۆزی سەلمییە.

باوکی مێخنەف دەڵێت: خالید لەئەجا دابەزی و بۆ شەڕ ریزی بەست. بەرێکەوت لەبوزاخە ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە و تایەفەی منالەکانی عامر لەگەڵ هەموو سەرکردە و گەورەکانی خۆیان لەنزیك ئەوێ جێگیر و چاوەڕوان بوون تا بزانن شەڕ لەبەرژەوەندی کێ کۆتایی پێدێت.

سەعد کوڕی موجاهید لەیەکێك لەپیرەکانی خەڵکەکەی دەگێڕێتەوە: بەخالیدمان وت: ئێمە ڕووبەڕوی تایەفەی قەیس دەبینەوە چوونکە لەگەڵ منالەکانی ئەسەد پەیمانمان هەیە.

خالید وتی: سوێند بەخوا قەیس لەهۆزەکانی دیکە لاوازتر نییە، کامیان هەڵدەبژێرن،

هەڵیبژێرن و شەڕیان لەگەڵ بکەن.

عودەی وتی: ئەگەر خزمە نزیکەکانی من لەدین پەشیمان ببنەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەم، ئێستا بۆ پەیمانەکەمان لەگەڵ منداڵەکانی ئەسەد، شەڕیان لەگەڵ نەکەین؟ سوێند بەخوا دەجەنگین.

خالید وتی: شەڕ کردن لەگەڵ ئەم دوو دەستەیە جیهادە، دژایەتی بۆچوونی هاوەڵانی خۆت مەکە، برۆ لای خەڵکەکەت و بیانبە بۆ شەڕی ئەو کەسانەی خوازیارن پێی.

عەبدولسەلام کوڕی سوەید دەڵێت: پێشی هاتنی خالید، سوارەکانی تەی رووبەرووی سوارەکانی منداڵەکانی ئەسەد و فەزارە دەبوونەوە و جوێنیان بەیەك دەدا. بەڵام شەڕیان نەدەکرد و منداڵەکانی ئەسەد و فەزارە دەیانوت: سوێند بەخوا هیچ کات لەگەڵ ابوالفضیل بەیعەت نابەستین.

سوارەکانی تەی دەیانوت: ئەوەندە شەڕتان لەگەڵ دەکات تا بەابوالعجلی اکبر ناوی ببەن.

عوبەیداللە کوڕی عەبدوللە دەڵێت: کاتێك شەڕ دەستیپێکرد، عوێیەینە لەگەڵ حەوتسەد کەس لەمنداڵەکانی فەزارە لەبەرژەوەندی تولەیحە دەجەنگا. تولەیحە لەخێوەتەکەی عابایەکی لەخۆیەوە ئاڵاندبوو و پێشگۆیی دەکرد. شەرکەران سەرقاڵی شەڕ کردن بوون. کاتێك شەرەکە بەرەو دژواری ڕۆشت و عوێیەینە ورەی رووخا، رووی کردە تولەیحە و وتی: ئایا جبرەئیل هێشتا نەهاتۆتە لای تۆ؟

تولەیحە وتی: نا.

عوێیەینە گەڕایەوە و جەنگی کرد. دووبارە تێکشکاو و بێ ورە گەڕایەوە و وتی: ئەی بێ باوك، جبرەئیل هێشتا نەهاتووە؟

تولەیحە وتی: نا، سوێند بەخوا هێشتا نەهاتووە.

عوێیەینە وتی: تا کەی؟ سوێند بەخوا شکستمان خوارد.

عوێیەینە دووبارە رووی کردە گۆڕەپانی شەڕ. دوای ماوەیەك شەڕ کردن گەڕایەوە بۆ لای تولەیحە و وتی: جبرەئیل هات؟

وتی: بەڵێ.

پرسی: چی پێ وتی؟

وتی: پێی وتم: ان لك رحا كرحاه و حديثا لا تنساه. واتاكەی: تۆیش ئاشێكی وەك ئاشەكەی ئەوت هەیە و بەسەرهاتێك كەهیچ كات لەبیری ناكەیت. وەك لاسایی كردنەوەی ئایەكانی قورئان، ئەمەی هێنایە سەرزمان.

عۆیەیینە وتی: وابزانم خوایش دەزانێت بەسەرهاتەكەی تۆ لەبیر ناكەین، ئەی منالەكانی فەزارە با بڕۆین ئەمە درۆزنە.

منالەكانی فەزارە گۆڕەپانیان بەجێهشت و خەڵكان هەلاتن و لەدەوری تولەیحە كۆبوونەوە و وتیان: چی بكەین.

تولەیحە ئەسپەكەی خۆی و بۆ ژنەكەی، نەوار، وشترێكی ئامادە كردبوو، كاتێك خەڵكان لەدەوری كۆبوونەوە و وتیان: چی بكەین؟ هەستا و پەڕییە سەر ئەسپەكەی خۆی و لەگەڵ ژنەكەی ملی رێگەی گرتەبەر و وتی: هەركەس دەتوانێت هەڵبێت و گیانی خۆی دەرباز بكات.

تولەیحە لەرێگەی حەوشیەوە بەرەو شام ڕۆشت. دەستەكانی ئەو بلاوبوونەوە و ژمارەیەكی زۆریان لێ كوژرا. منالەكانی عامر لەگەڵ سەركردە و گەورەكانی خۆیان لەو نزیكانە بوون و كاتێك خواوەند شكستی بەتولەیحە و سوپاكەی بەخشی، هاتن و وتیان: دەگەڕێینەوە سەر دینی ئیسلام و باوەڕ بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) دەهێنین و بەفەرمانەكانی خواوەند سەبارەت بەماڵ و گیانی خۆمان رازین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆكاری هەڵگەڕانەوەی عۆیەیینە و هۆزی غەتەفان و دەستەیەك لەخەڵكانی تەی لەگێڕانەوەی عومارە كوڕی فلانی ئەسەدی باسی كراوە و دەڵێت: هێشتا پێغەمبەر(د.خ) زیندوو بوو كەتولەیحە لەدین هەڵگەڕایەوە و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی كرد. پێغەمبەر(د.خ) زەرار كوڕی ئەزوری بۆ لای كاربەدەستانی خۆی لەهۆزی منالەكانی ئەسەد نارد و فەرمووی: شەڕی هەڵگەڕاوەكان بكەن. ئەوان هێرشیان كردە سەر و ئەویان ترسان. موسوڵمانان لەواریدات ئوردویان لێدا و ناباوەڕان لەسەمیرا. ژمارەی موسوڵمانان بەردەوام زیادی دەكرد و ناباوەڕان كەم دەبوونەوە. زەرار مەبەستی تولەیحەی كرد و زۆری نەمابوو ئەسیری بكات، بەلام زەرەبەیەكی لەشمشێرەكەی ئەودا و كاریگەری دانەنا. ئەم هەواڵە بلاو بوویەوە.

لەم كاتەدا هەواڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) بەموسوڵمانان گەشت و خەڵكان بەهۆی ئەو زەربەوە وتیان: سیلاح كاریگەری لەسەر تولەیحە دانانێت. لەو كاتەوە بەردەوام ژمارەی موسوڵمانان كەمی دەكرد و لەدەوری تولەیحە كۆدەبوونەوە و دەسەلاتی زیادی كرد.

عەوف جوزمی ناسراو بەزوئەلخومار هات و لەنزیك ئێمە سەنگەری گرت و سەمامە کوڕی ئەوسی لامی تایی کەسی بۆ لای ئەو نارد و وتی: پێنسەد کەس لەتایەفەی جەدیلەم لەگەڵدایە، ئەگەر پێشهاتێك بۆ ئێوە روویدا، ئێمە لەقردووده و ئەنسەر لەنزیك ریخەلانین. موهەلهیل کوڕی زەید کەسی نارد و وتی تایەفەی غەوسم لەگەڵدایە و ئەگەر بەلایەکتان بەسەرهات، لەئەکناف لەنزیك فید نیشتەجێین.

هۆکاری ئەوەی خوازیاری پەیوەست بوون بەعەوف کوڕی زوئەلخومار بوون لەوێوە سەرچاوەی دەگرت کە لەرۆژگاری جاهلییەت لەنێوان ئەسەد و غەتەفان و تەی پەیمانێك واژۆ کرابوو. لەنزیك دەرکەوتنی پێغەمبەر(د.خ)، غەتەفان وئەسەد دژی تەی یەکیان گرت و ئەو هۆزەیان لەسەرزەمینەکەی خۆیان دەرکرد. عەوف ئەمەی پەسەند نەکرد و پەیمانەکەی لەگەڵ غەتەفان هەڵوەشاندەوە. دوو هۆزەکەی تەی ڕۆشتن. عەوف کەسی بەدوای ئەوندا نارد و پەیمانەکەی خۆی لەگەڵ ئەواندا تازە کردەوە و هاوکاری کردن تا بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە. ئەم کارە لای غەتەفانییەکان ناخۆش و ناپەسەند بوو.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، عوێەیینە کوڕی حوسن بەغەتەفانییەکانی وت: سوێند بەخوا لەو کاتەوەی پەیمانەکەمان لەگەڵ مناڵەکانی ئەسەد هەڵوەشاوەتەوە، سنووری سەرزەمینەکەی خۆمان نازانین، من پەیمانەکەی نێوانمان تازە دەکەمەوە و دەبمە شوێنکەوتەی تولەیحە. سوێند بەخوا ئەگەر شوێنکەوتەی پێغەمبەرێك لەهاوپەیمانەکانی خۆمان بین باشترە لەوەی پێغەمبەرەکەمان خەڵکی قورەیش بێت، ئێستا محەممەد مردوو و تولەیحە زیندووە. خەڵکانی غەتەفان بۆچوونەکەی ئەویان پەسەند کرد.

کاتێك غەتەفانییەکان بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ تولەیحە بڕیاریاندا، زەرار و قوزاعی و سەنان و هەموو ئەوکەسانەی بەنوێنەرایەتی پێغەمبەر(د.خ) لەناو مناڵەکانی ئەسەددا بوون، بۆ لای ئەبوبەکر هەڵاتن و لەرووداوەکە ئاگاداریان کردەوەو پێیان وت بەوردی ئاگای لەبارودۆخ بێت و هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوان بوون، بڵاوەیان لێکرد.

زەرار کوڕی ئەزور دەڵێت: جگە لە پێغەمبەر(د.خ) کەسم وەك ئەبوبەکر بۆ شەڕ ئامادە نەبینیوە، ئێمە لەپێشهاتەکان ئاگادارمان کردەوە بەلام وەك بڵێی هەواڵێکی خۆشی دەبیست نەك ناخۆش.

نێردراوانی ئەسەد و غەتەفان و هەوازین وتەی هاتنە لای ئەبوبەکر و نێردراوانی

قوزاعە ڕۆشتنە لای ئوسامە کوڕی زەیدو ئەوانی بردە لای ئەبوبەکر. هەموو نێردراوەکان لەمەدینە کۆبوونەوە و لای سەرکردەی موسوڵمانان دابەزین. ئەمە دوای دەرۆژ لەمردنی پێغەمبەر(د.خ) بوو. دەیانویست بەنوێژ رازی بن بەڵام زەکات نەدەن. هەموو ئەو موسوڵمانانەی نێردراوان لەماڵی ئەوان بوون، دەیانویست بەم داوایە رازی بن تا دەرفەتێکی گونجاویان دەست دەکەوێت. لەسەرکردەی موسوڵمانان تەنیا عەباس کەسی لەنێردراوان لەماڵی خۆیدا جێگە نەکردەوە بەڵام کاتێك ڕۆشتنە لای ئەبوبەکر بەداواکەیان رازی نەبوو و وتی: دەبێت ئەوەی بەپێغەمبەریان دەدا، بیدەن. ئەوانیش رازی نەبوون. ئەبوبەکر یەك رۆژ مۆڵەتی پێدان. نێردراوەکان بەخێرایی گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان.

عەمرۆ کوڕی شوعەیب دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەحەجی ماڵئاوایی دەگەڕایەوە، عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ جەیفر نارد. کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، عەمرۆ لەعەممان بوو و ڕۆشت تا گەیشتە بەحرەین و بینی مونزەر کوڕی ساوی رۆژەکانی کۆتایی ژیانی خۆی بەسەر دەبات، مونزەر پێی وت: سەبارەت بەسامانەکەم پێشنیارێکی بەسوودم پێبکە.

عەمرۆ وتی: ماڵێك بکە بەخێر تا لەدوای تۆ بمێنێتەوە. مونزەر ئەو کارەی کرد.

عەمرۆ ڕۆشت و لەسەرزەمینی مناڵەکانی تەمیم تێپەڕی و گەیشتە دیاری مناڵەکانی عامر، لای قورە کوڕی هوبەیرە دابەزی. قورە دوودڵ ومناڵەکانی عامر جگە لەدەستەیەکی کەمیان هاوشێوەی قورە بوون. عەمرۆ بۆ مەدینە گەڕایەوە و قوڕەیشییەکان لەدەوری کۆبوونەوە و پرسیاریان کرد. عەمرۆ وتی: لەدەباوە تا نزیك مەدینە ئوردوویان لێداوە.

قوڕەیشییەکان بڵاوەیان کرد و هەرچەند کەسێك دەستەیەکیان پێکەوەنا. عومەر کوڕی خەتاب هات و ویستی سڵاو لەعەمرۆ بکات. لای یەکێك لەدەستەکانی تێپەڕی کەسەبارەت بەوتەکانی عەمرۆ کوڕی عاس گفتوگۆیان دەکرد. عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبەیر و عەبدولرەحمان و سەعد لەناو ئەو دەستەیەدا دەبینران. کاتێك عومەر نزیك کەوتەوە، بێدەنگ بوون. عومەر پرسی: چییان دەوت؟ بەڵام وەڵامیان نەدایەوە.

عومەر وتی: سوێند بەخوا دزانم سەبارەت بەچی گفتوگۆتان دەکرد.

تەڵحە تورە بوو و وتی: ئەی کوڕی خەتاب، لەغەیبەوە قسە دەکەیت؟

عومەر وتی: جگە لەخوا کەس غەیب نازانێت بەڵام گومان دەکەم سەبارەت بەمەترسی

عەرەبەکان بۆ سەر قورەیشییەکان قسەتان دەکرد.

وتیان: راست دەکەیت.

وتی: لەمە مەترسن، بەبڕوای من ئێوە زیاتر بۆ عەرەبەکان مەترسین. سوێند بەخوا ئێوە ئەی قورەیشییەکان ئەگەر لەکونێکەوە بڕۆنە ژوور، عەرەبەکان بەدواتانا دێن، سەبارەت بەخەڵکی عەرەب لەخوا بترسن. دوای ئەوە ڕۆشتە لای عەمرۆ کوڕی عاس و سڵاوی لێکرد.

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، بەرەو عەممان ڕۆشتبوو و لەرێگەی گەڕانەوە لای قورە کوڕی هوبەیرە دابەزی. قورە ڕێزی گرت و مەڕێکی بۆ سەر بڕی. کاتێك عەمرۆ مەبەستی ڕۆشتنی کرد، پێی وت: فلان کەس، عەرەبەکان باجتان پێنادەن، ئەگەر چاو لەگرتنی سامانی ئەوان بپۆشن، ملکەچی ئێوە دەبن و گەرنە دژی ئێوە یەکدەگرن.

عەمرۆ پێی وت: مەگەر کافر بوویت؟

لەبەر ئەوەی ئوردوی منداڵەکانی عامر لەدەوری قورە بوو، نەیویست بڵێت ئەوان شوێنکەوتەی ئەون بۆ ئەوەی شەڕ دروست نەبێت، وتی: ئێمە تالانیتان پێدەدەین، ئەم قسەی کرد وەك بڵێی موسوڵمانە. دواتر وتی: کاتێك لەنێوان ئێمە و خۆتان دیاری بکەن.

عەمرۆ وتی: هەڕەشەمان لێدەکەیت، کاتی و شوێنی دیاریکراو بۆ تۆ ماڵی دایکت بێت. سوێند بەخوا بەسوپایەك هێرش دەکەمە سەرتۆ.

کاتێك عەمرۆ گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەم داستانەی بۆ ئەبوبەکر و موسوڵمانان باس کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك خالید توانی شکست بەمنداڵەکانی عامر بێنێت و بەیعەتی لێوەرگرتن، عۆیەیینە کوڕی حوسن و قورە کوڕی هوبەیرەی بەبەستراوی بۆ لای ئەبوبەکر ڕەوانە کرد. کاتێك گەیشتنە لای ئەبوبەکر، قورە وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)، موسوڵمان بووم، عەمرۆ کوڕی عاس شایەتی منە چوونکە لەناوچەکەی من گوزەری کرد و ڕێزم لێگرت و پشتیوانی خۆم بۆ دەربڕی.

دەڵێت: ئەبوبەکر عەمرۆ کوڕی عاسی بانگ کرد و وتی: لەکارەکانی ئەمە ئاگاداریت؟

عەمرۆ کوڕی عاس داستانەکەی بۆ ئەبوبەکر گێڕایەوە و کاتێك ویستی وتەکانی

سەبارەت بەزەکات باس بکات، قورە وتی: خوا بتبەخشێت، بەسە.

عەمرۆ وتی: نە، دەبێت هەموو قسەکانت بگێڕمەوە. هەمووی گێڕایەوە. ئەبوبەکر ئەوی بەخشی و خوێنی نەڕشت.

عوبەیداللە کوڕی عەبدوللە دەڵێت: عۆیەیینە کوڕی حوسنیان لەمەدینە بینی، دوو دەستی بەگەردنییەوە بەسترابوو. منداڵەکانی مەدینە بەلقی دارخورما لێیان دەدا و دەیانوت: ئەی دوژمنی خوا، بۆ دوای ئەوەی باوەڕت هێنا، پەشیمان بوویتەوە.

عۆیەیینە دەیوت: سوێند بەخوا هەرگیز باوەڕم نەهێنابوو.

ئەبوبەکر ئەویشی بەخشی و نەیکوشت.

سەهل کوڕی یوسف دەڵێت: موسوڵمانەکان لەمناڵەکانی ئەسەد کەسێکیان ئەسیر و لەغومر بردیانە لای خالید. ئەو لەکارەکانی تولەیحە ئاگادار بوو. خالید وتی: لەتولەیحە و ئەوەی باسی دەکرد، بدوێ.

ئەسیری ئەسەدی وتی: لەو ئایانەی بۆ ئەو دەهاتە خوار، ئەمانە بوون: و الحمام و اليمام، و الصرد الصوام، قد ضمن قبلكم باعوام، ليبلغن ملكنا العراق و الشام.

واتاکەی: سوێند بەکۆتر و قووشی بەرۆژوو، ساڵەکانی پێشوو بەڵێنیان داوە پاشایەتی ئێمە بەعێراق و شام دەگات.

سەعید کوڕی عوبەید دەڵێت: کاتێك دانیشتووانی غومر روویان کردە بوزاخە، تولەیحە لەناو ئەوان هەستا و وتی:

((امرت ان تصنعوارحاذات عرى، يرمى الله بها من رمى، يهوى عليها من هوى.

واتاکەی: پێیان وتووم ئاشێك دروست بکەن کەدەسکی هەبێت و خواوەند هەرکەس بخوازێت بۆ ئەوێی فرێدەدات و کەسانێك دەکەونە ئەوێ.))

سوپای رازاندەوە ووتی: دوو سوار لەمناڵەکانی نەسر کوڕی قەعین بنێرن تا هەواڵەکانتان بۆ بێنن. سەعید و سەلمە بۆ ئەم مەبەستە بەرێکەوتن.

عەبدولرەحمان کوڕی کەعب لەیەکێك لەئەنساری بەشدار لەشەڕی بوزاخە دەگێڕێتەوە: خالید لەوێ ژن و منالی ئەسیری دەستنەکەوت چوونکە ژن ومناڵەکانییان لەشوێنێکی دیکە دانابوو.

باوکی یەعقوب دەڵێت: مناڵ و ژنەکانی مناڵەکانی ئەسەد لەنێوان موسقیب و فەلج و مناڵ و ژنی مناڵەکانی تایەفەی قەیس لەنێوان فەلج و واستدا بوون. کاتێك شکستیان خوارد و هەموویان باوەڕیان بەئیسلام هێنا چوونکە لەئەسیر کرانی ژن و مناڵەکانیان

دەترسان. بەموسوڵمان بوونی خۆیان مەترسیان لەخۆیان وژن و منداڵەکانیان دوورخستەوە.

تولەیحە ڕۆشت تا لەنەقەع لای تایەفەی کەلب دابەزی و لەوێ موسوڵمان بوو. لەنێوان ئەوان ژیانی بەسەر برد تا ئەو کاتەی ئەبوبەکر مرد.

تولەیحە کاتێك باوەڕی هێنا کە لەموسوڵمان بوونی ئەسەد و غەتەفان و منداڵەکانی عامر ئاگادار بوویەوە.

دوای ئەوە بەمەبەستی عەمرە ڕووی لەمەککە کرد. ئەبوبەکر هێشتا زیندوو بوو کەلای مەدینە تێپەڕی.

بەئەبوبەکریان وت: ئەوە تولەیحەیە.

وتی: چی بکەم. کارتان پێی نەبێت خواوەند ڕێگەی ڕاستی نیشان داوە.

تولەیحە ڕووی کردە مەککە و حەجی عەمرەی بەجێهێنا. عومەر خەلافەتی گرتبووە دەست و بۆ بەیعەت کردن لەگەڵ عومەر گەڕایەوە بۆ مەدینە.

عومەر پێی وت: تۆ بکوژی عوکاشە و سابتیت، سوێند بەخوا هیچ کات تۆم خۆش ناوێت.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئایا گرنگە خواوەند لەسەر دەستی من شەهید بوونی بەدوو کەس بەخشیوە و منی بەدەستی ئەوان ریسوا نەکرد.

کاتێك عومەر لەگەڵ تولەیحە بەیعەتی کرد، پێی وت: ئەی خراپەکار، لەکاهینی چیت بۆ ماوەتەوە؟

وتی: هیچ.

تولەیحە بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە و لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی ڕووی کردە عێراق.

## گێڕانەوەی هەڵگەڕانەوەی سولەیم و هەوازین و عامر

عەبدوللە دەڵێت: منداڵەکانی عامر دوودڵ بوون و چاوەڕوان بوون بزانن تایەفەی ئەسەد و غەتەفان چی دەکەن. کاتێك ئەو دوو هۆزە گرفتاری شکست بوون، منداڵەکانی عامر لەگەڵ سەرکردە و گەورەکانی خۆیان مانەوە. قورە کوڕی هوبەیرە لەگەڵ تایەفەی کەعب و هاوپەیمانەکانی بوو و عەلقەمە کوڕی عەلاسە لەگەڵ تایەفەی کەلاب و هاوپەیمانەکانی.

عەلقەمە پێشتر لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەر(د.خ) باوەڕی هێنا و لەڕۆژگاری ئەودا، لەدین هەڵگەڕایەوە. دوای گرتنی تاییف ڕووی کردە شام و کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، بەخێرایی گەڕایەوە و لەگەڵ تایەفەی کەعب ئوردوی لێدا بەڵام دوودڵ بوو.

کاتێك ئەبوبەکر لەکارەکانی ئاگادار بوویەوە، دەستەیەکی بەسەرکردایەتی قەعقاع کوڕی عەمرۆ ڕەوانە و پێی وت: هێرش بکەسەر عەلقەمە ئەگەری هەیە بتوانی بیکوژێت یا ئەسیری بکەیت. دڵنیابە چارەی دڕان، دوورینەوەیە. ئەوەی دەتوانی ئەنجامی بدە.

قەعقاع ڕۆشت و لەسەر ئاوێك کەعەلقەمە لەوێ نیشتەجێ بوو، هێرشی کردە سەر خەڵکان. هێشتا عەلقەمە دوودڵ بوو. سوار لەسەر ئەسپەکەی خۆی هەڵات. ژن و منداڵی ئەو کەسانەی لەوێ بوون، باوەڕیان بەئیسلام هێنا و خۆی لەزیان و مەترسییەکانی موسوڵمانان دەرباز کرد. ژن و منداڵەکەی عەلقەمە وتیان: هاودڵ و بڕوایان بەکارەکانی ئەو نەبووە و لەماڵەوە دانیشتوون.

وتیان: ئێمە بۆ بەگوناحی ئەو بسووتێین؟ ئەبوبەکر ئەوانی ئازاد کرد. دوای ئەمە، عەلقەمەیش باوەڕی هێنا.

کوڕی سیرین دەڵێت: دوای شکستی خەڵکان لەبوزاخە منداڵەکانی عامر وتیان: دووبارە باوەڕ بەئیسلام دێنینەوە. خالید بەهەمان شێوە کە لەگەڵ خەڵکانی ئەسەد و غەتەفان و تەی نیشتەجێی بوزاخە بەیعەتی کرد، بەیعەتی لەوانیش وەرگرت.

خالید، بەتەسلیم بوونی خەڵکانی ئەسەد و غەتەفان و هەوازین و سولەیم و تەی ڕازی نەبوو تا ئەو کاتەی هەموو ئەو کەسانەی، موسوڵمانانیان کوشتبوو یا سوتاندبوویان، بێنن و کاتێك هێنایان، بەخۆبەدەستەوەدانی ئەوان ڕازی بوو جگە لەقورە کوڕی هوبەیرە و چەند کەسێکی دیکە لەهاوڕێکانی. ئەوانی بەستەوە و ئەندامی

ئەو کەسانەی بڕی کەهێرشیان کردبووە سەر موسوڵمانەکان و دەستەیەکی بەردباران کرد و لەبەرزایی کێوەکانەوە فڕیدانەخوار. دەستەیەکی خستە ناو چاڵەکان و تیربارانی کردن.

قەعقاع، قوڕە و ئەسیرەکانی دیکەی بۆ مەدینە نارد و نامەی بۆ ئەبوبەکر نووسی کە منالەکانی عامر دوای هەڵگەڕانەوە باوەڕیان هێنا. من بەتەسلیم بوونی کەس ڕازی نەبووم تا ئەو کەسانە بێنن کەئازاب و ئەشکەنجە و موسوڵمانانیان کوشتبوو و بەوەحشیانەترین شێوە ئەوانم کوشت و قوڕە و هاوەڵانیم بۆ لای تۆ ڕەوانە کرد.

باوکی عەمرۆ کوڕی نافیع دەڵێت: ئەبوبەکر نامەی بۆ خالید نووسی: ئەو نیعمەتەی خواوەند بەتۆی بەخشیوە ببێتە هۆکارێك بۆ خێر، لەکردەوەکانی خۆت خوات لەبیر بێت چوونکە خواوەند لەگەڵ چاکەکارانە، بۆ ئەنجامدانی مەبەستە خواییەکان تێبکۆشە و سستی لەخۆت نیشان مەدە، هەرکەسێك لەبکوژی موسوڵمانان دەستکەوت، بیکوژە تا ببێتە وانەیەك بۆ کەسانی دیکە، لەهەڵگەڕاوەکان ئەوانەی پەشیمان بوونەوە و دژایەتی خوایان کرۆدتە پیشە، ئەگەر خوازیار بوویت و بەباشت زانی، بیانکوژە.

خالید یەك مانگ لەبوزاخە مایەوە و بۆ دۆزینەوەی موسوڵمان کوژەکان خۆی بەهەر کون و قوژبێنکدا دەکرد. دەستەیەکی سووتاند و دەستەیەکی بەبەرد کوشت و دەستەیەکی لەبەرزایی کێوەکان خستەخوار. قوڕە و هاوەڵانی بۆ مەدینە نارد و لەگەڵ ئەوان هاوشێوەی عوێەیینە هەڵسوکەوتی نەکرد چوونکە بارودۆخی کارەکانیان جیاواز بوو.

باوکی یەعقوب دەڵێت: هەڵاتووانی غەتەفان لەزەفەر کۆبوونەوە. دایکی ڕەمل، سەلمیٚ کچی مالك کوڕی حوزەیفە لەویٚ بوو. ئەو، هاوشێوەی دایکی قورفە، دایکی خۆی بوو. دایکی قورفە هاوسەری مالك کوڕی حوزەیفەیە و قورفە و حیکمە و جوراشە و وەزمل و حەسین و شەریك و عبد و زەفرە و معاویە و حەملە و قەیس و لای بۆ هێنایە دنیا. حیکمە لەکاتی هێرشی عوێەیینە کوڕی حوسن بۆ سەر گایلەکەی مەدینە لەسەر دەستی باوکی قتادە کوژرا.

هەڵاتووان لەدەوری سەلمیٚ کۆبوونەوە. هاوشێوەی دایکی ڕێز و شکۆی پێبڕابوو. وشترەکانی دایکی قورفە لای ئەو ڕادەگیران. ئەو، خەڵکانی هاندا و وتی: دەبێت بجەنگن. کەسێکی بۆ لای خەڵکان نارد و پێشنیاری شەڕ لەگەڵ خالیدی پێکردن.

کاتێك کۆبوونەوە و هێزیان زیادی کرد، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان لەهەموو ناوچەکانەوە پەیوەستیان بوون.

موسوڵمانان لەرۆژگاری دایکی قورفە سەلمیٰ یان ئەسیر کردبوو. ئەو بەعایشە بڕا و ئازادی کرد بەڵام بۆ ماوەیەك لای عایشە مایەوە و دواتر بۆ ناو کەسەکانی خۆی گەڕایەوە.

رۆژێك پێغەمبەر(د.خ) لەماڵی عایشەدا بوو، فەرمووی: سەگەکانی حەواب بۆ یەکێك لەئێوە بانگ دەڵێن. ئەمە بۆ سەلمیٰ روویدا. لەو کاتەدا لەدین هەڵگەڕابوویەوە و دەیویست تۆڵە بکاتەوە. لەزەفەرەوە رووی کردە حەوأب تا خەڵکان کۆبکاتەوە. هەموو هەڵاتووانی هۆزەکانی غەتەفان و سولەیم و ئەسەد و تەی لەدوری کۆبوونەوە.

کاتێك خالید لەکارەکانی ئەو ئاگادار بوویەوە و زانی دەیەوێت تۆڵە بکاتەوە و زەکات وەردەگرێت و خەڵك بۆ شەر هان دەدات، بۆ لەناوبردنی بەرێکەوت. سەلمیٰ دەسەڵاتی فراوان ببوو. خالید رووبەرووی شەڕکەرەکانی بوویەوە و شەڕێکی دژوار و خوێناوی دەستی پێکرد. لەکاتی شەڕەکە سەلمیٰ سوار لەسەر وشترەکەی دایکی بەهەمان رێز و شکۆوە وەستابوو، دەیانوت: هەرکەس ڕەم بەوشترەکەی بکات سەد درەم خەڵات وەردەگرێت. ئەمە بۆ رێز گرتن لەو بوو.

لەم شەڕەدا چەندین بنەماڵە لەتایەفەی خاسی و هاربە و غەنەم لەناچوون وژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی تایەفەی کاهیل کوژران.

شەڕەکە قورس بوو. دەستەیەك لەسوارەکانی ئیسلام دەوری وشترەکەیان گرت و کوشتیان. سەد پیاو لەدەوری وشترەکە کوژرا. هەواڵی سەرکەوتنی ئەم شەڕە بیست رۆژ دوای قورە گەیشتە مەدینە.

سەهل دەڵێت: بەسەرهاتی ناعیر و جەوە بەو شێوەیە کە ئەیاس کوڕی عەبدیالەیل هاتە لای ئەبوبەکر و وتی: بەسیلاح هاوکاری و بۆ شەڕ لەگەڵ کام دەستەی هەڵگەڕاوان دەخوازیت، ڕەوانەم بکە.

ئەبوبەکر سیلاح و فەرمانی خۆی پێدا بەڵام ئەو دژی موسوڵمانان وەستایەوە و لەجەوا جێگیر بوو. نەجبە کوڕی ئەبی مەیسائی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر موسوڵمانەکان. ئەو، هێرشی کردە سەر تایەفەی سولەیم و عامر و هەوازین.

کاتێك ئەبوبەکر لەکارەکەی ئاگادار بوویەوە، کەسی بۆ لای تورەیفە کوڕی حاجیز نارد و فەرمانی پێدا شەڕکەران کۆبکاتەوە و بۆ شەڕی ئەیسا بەرێکەوێت. عەبدوڵڵە

کوڕی قەیسی خوزاعی وەك پشتیوانی ئەو ڕەوانە کرد. تورەیفە فەرمانەکەی ئەبوبەکری ئەنجامدا و شوێن نەجبە کەوت. ئەو هەڵات و لەجەوا ڕووبەڕوو بوونەوە و شەڕ دەستی پێکرد. نەجبە کوژرا و ئەیسا هەڵات بەڵام تورەیفە خۆی پێگەیاند و ئەسیری کرد و بۆ مەدینەی نارد. ئەبوبەکر فەرمانیدا لەنوێژگەی مەدینە چیلکە و چەوێڵێکی زۆریان کۆکردەوە و ئاگرێکی بڵێسەداریان هەڵگیرساند. فەرمانیدا دەست و پێی ببەستنەوە و بیخەنە ناو ئاگرەکە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەسەرهاتی ئەیاس لەگێڕانەوەی عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر بەمشێوەیە: یەکێك لەمناڵەکانی سولەیم بەناوی ئەیاس کوڕی عەبدوللە هاتە لای ئەبوبەکر و وتی: موسوڵمانم و دەمەوێت لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان شەڕ بکەم، چوارپێ و سیلاحم پێبدە. ئەبوبەکر چوارپێ و سیلاحی پێدا. ڕۆشت و دەستدرێژی دەکرد سەر موسوڵمان و هەڵگەڕاوە لەدین و سامانی ئەوانی دەگرت. هەرکەس بەرگری بکردایە، دەیکوشت.

دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی شورەید بەناوی نەجبە کوڕی ئەبی مەیسای لەگەڵدا بوو. کاتێك ئەبوبەکر لەکارەکانی ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ تورەیفە کوڕی حاجیز نووسی: دوژمنی خوا ئەیاس کوڕی عەبدوللە هاتە لای من، وەك موسوڵمان خۆی ناساند و داوای هاوکاری کرد تا شەڕ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان بکات. من چوارپێ و سیلاحم پێدا و ئەمێستاکە دڵنیام دوژمنی خوا دەستدرێژی دەکاتە سەر موسوڵمان و ناباوەڕ و سامانی ئەوان تالآن دەکات و خوێنی خەڵکان دەرێژێت. لەگەڵ موسوڵمانەکانی هاورێت بیدۆزەرەوە و خوێنییە بڕێژە یا ئەسیر و ڕەوانەی مەدینە بکە.

دەڵێت: تورەیفە بەرێکەوت و کاتێك هەر دوو دەستەکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، تیرهاویشتن دەستی پێکرد. تیرێك بەرنەجبە کوڕی ئەبی مەیسا کەوت و کوژرا. کاتێك ئەیاس پێداگری موسوڵمانانی بینی، بەتورەیفەی وت: تۆ گەورەتر لەمن نیت، تۆ لەلایەن ئەبوبەکرەوە سالاریت پێبەخشراوە منیش بەهەمان شێوە.

تورەیفە وتی: ئەگەر دڵنیایی، سیلاح دانێ و لەگەڵ من بۆ لای ئەبوبەکر وەرە.

ئەیاس لەگەڵ تورەیفە هاتە لای ئەبوبەکر. ئەبوبەکر فەرمانیدا: بیبە بۆ بەقیع و بەئاگر بیسووتێنە.

تورەیفە ئەیاسی بۆ نوێژگە برد و ئاگرێکی گەورەی داگیرساند و ئەیاسی خستە ناو

ئاگرەکە.

هەروەها عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: دەستەیەك لەتیرەی سولەیەم لەئیسلام هەڵگەڕانەوە و دەستەیەکی دیکە بەسەرکردایەتی مەعن کوڕی حاجیز باوەڕی خۆیان پاراست. کاتێك خالید کوڕی وەلید بەرەو لای تولەیحە و هاورێکانی بەرێکەوت، نامەی بۆ مەعن کوڕی حاجیز نووسی تا لەگەڵ موسوڵمانەکانی شوێنکەوتەی خۆی پەیوەستی ببێت. ئەو بەرێکەوت و تورەیفەی برای وەك جێگری خۆی دانا. باوکی شەجەرە کوڕی عەبدولعوزا کەدایکی خەنسای شاعیر بوو، لەناو هەڵگەڕاوەکانی سولەیم دەبینرا و کاتێك لەئیسلام هەڵگەڕایەوە، هۆنراوەیەکی نووسی. بەڵام دواتر پەشیمان بوویەوە و لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە مەدینە.

عەبدولرەحمان کوڕی قەیسی سولەمی دەڵێت: کاتێك باوکی شەجەرە هاتە مەدینە، وشترەکەی خۆی لەگەڕەکی مناڵەکانی قورەیزە خەواند و دواتر بۆ لای عومەر بەرێکەوت. کاتێك گەیشت عومەر زەکاتی بەسەر هەژاراندا دابەش کرد، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەمنیش بدە، نیازمەندم.

عومەر وتی: تۆ کێیت؟

وتی: باوکی شەجەرە کوڕی عەبدولعوزا سولەمی.

عومەر وتی: ئەی دوژمنی خوا، مەگەر ئەو کەسە نیت لەهۆنراوەکەی خۆتا دەڵێیت:

ڕمەکەم لەسوپاکەی خالید تێراو کرد و هیوادرام دوای ئەوە ساڵانێکی درێژ بژیم.

ئەمەی وت و بەقامچەی کەوتە گیانی. باوکی شەجەرە هەڵات و خۆی لەعومەر شاردەوە. سوار لەسەر وشترەکەی خۆی بۆ سەرزەمینی مناڵەکانی سولەیم گەڕایەوە.

## منداڵەکانی تەمیم و بەسەرهاتی سەجاح کچی حارس کوڕی سوەید

بەسەرهاتی منداڵەکانی تەمیم بەمشێوەیە: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، لێپرسراوانی خۆی بۆ ئەوان دانابوو: زەبەرقان کوڕی بەدر لێپرسراوی تایەفەی رەباب و عەوف و ئەبنا ، سەهم کوڕی مەنجاب و قەیس کوڕی عاسم لێپرسراوانی موقاعیس و بەتوون، سەفوان کوڕی سەفوان و سەبرە کوڕی عەمرۆ، لێپرسراوانی منداڵەکانی عەمرۆ، سەفوان لێپرسراوی بەهدی و سەبرە لێپرسراوی خەزم بوو کەدوو هۆزە لەهۆزەکانی منداڵەکانی تەمیم. وەکیع کوڕی مالیك و مالك کوڕی نەویرە لێپرسراوانی منداڵەکانی حەنزەلە بوون. وەکیع لێپرسراوی منداڵەکانی مالك و مالك لێپرسراوی منداڵەکانی یەربوع.

کاتێك سەفوان لەمردنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، زەکاتی منداڵەکانی عەمرۆی بردە لای ئەبوبەکر. خۆی و سەبرە لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکات بوون. سەبرە لەو سەرزەمینە مایەوە لەترسی ئەوەی نەکا پێشهاتێك رووبدات.

قەیس چاوەڕوان بوو تا بزانێت زەبەرقان چی دەکات. چوونکە زەبەرقان رێگەی ناسازگاری لەگەڵ ئەو دەگرتەبەر و هەرکاتێك دەرفەتێکی دەست کەوتایە، بۆ شکاندنی رێز و گەورەیی ئەو هەوڵیدەدا.

قەیس لەو کاتەی چاوەڕوان بوو بۆ ئەوەی بزانێت زەبەرقان بۆ دژایەتی کردنی ئەو چی دەکات، دەیوت: زەبەرقان من دەخاتە گێژاوەوە، نازانم چی بکەم، ئەگەر ملکەچی فەرمانەکانی ئەبوبەکر بم و وشترەکانی زەکاتی بۆ ببەم، ئەو وشترەکان دەکوژێت و لەناو منداڵەکانی سەعد بڵاوی دەکاتەوە و بەمشێوەیە رێز و پێگەی خۆی بەرزتر دەکات وئەگەر وشترەکانی زەکات بکوژم و لەناو منداڵەکانی سەعد دابەشی بکەم، ئەو، زەکات دەباتە لای ئەبوبەکر و پێگەی ئەو لای ئەبوبەکر بەرز دەبێتەوە.

سەرئەنجام قەیس بڕیاریدا، زەکات لەناو خەڵکانی موقاعیس و بەتوون دابەش بکات. ئەو کارەی کرد و زەبەرقان بڕیاریدا زەکات ببات بۆ مەدینە. ئەو زەکاتەی لەباب و عەوف و ئەبنا کۆی کردبوویەوە، بردی بۆ مەدینە.

هۆزەکان کەوتنە گیانی یەك و ئاژاوەکان سەریان هەڵدا. قەیس لەکارەکەی خۆی پەشیمان بوویەوە و کاتێك عەلا کوڕی حەزرەمی هات، زەکاتی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەو بەرەو مەدینە بەرێکەوت.

لەم کاتەدا تایەفەی عەوف و ئەبنا سەرقاڵی شەڕ کردن لەگەڵ تایەفەی بەتوون بوون و تایەفەی رەباب لەگەڵ موقاعیس شەڕی دەکرد، خەزم لەگەڵ مالك و بەهدی لەگەڵ یەربوع دەجەنگا.

سەرکردەی خەزم، سەبرە کوڕی عەمرۆ جێگری سەفوان بوو و سەرکردەی بەهدی و رەباب، حەسین کوڕی نەیار. سالاری زەبیە، عەبدوللە کوڕی سەفوان و سالاری عەبدمەنات عسمە کوڕی ئەبیرە، سەرکردەی عەوف و ئەبنا، عەوف کوڕی بلادی حەشمی و سەرکردەی بەتوون، یەعرف کوڕی خەفاف بوو.

سەمامە کوڕی ئەسال هاوکاری لەمناڵەکانی تەمیمەوە بۆ دەهات و کاتێك ئەم ئاژاوە سەری هەڵدا، گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. سەمامە مایەوە تا ئەو کاتەی عێکرەمە گەیشت بێ ئەوەی هیچ کارێك بکات.

لەو کاتەدا کەخەڵکانی سەرزەمینی مناڵەکانی تەمیم سەرقاڵی شەڕ لەناوخۆیان و موسوڵمانان لەبەرابەر هەڵگەڕاوەکان دوودڵ بوون، سەجاح کچی حارس لەجەزیرەوە هات.

خەڵکی سەجاح لەمناڵەکانی تەغلەبن، هۆزەکانی رەبیعەیشی لەگەڵدا بوو. هوزەیل کوڕی عیمران سەرکردەی مناڵەکانی تەغلەب بوو. عوقفە کوڕی هیلال سالاری نەمل، زیاد کوڕی فلأن سالاری ئەیاد و سەلیل کوڕی قەیس سالاری مناڵەکانی شەیبان بوو.

بۆ خەڵکانی تەمیم هاتنی قەیس و هاوەڵانی لەشەڕەکانیان گەورەتر بەرچاو دەکەوت. سەجاح کچی حارس کوڕی سوەید یەکێك لەمناڵەکانی تەغلەبە و دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەجەزیرە، لەنێوان مناڵەکانی تەغلەب، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و تایەفەی هوزەیل بەداواکەی رازی و لەمەسحییەت هەڵگەڕانەوە. سەرکردەکانیان بەرێکەوتن تا لەگەڵ ئەبوبەکر و موسوڵمانان بجەنگن.

کاتێك سەجاح گەیشتە حوزن، کەسی بۆ لای مالك نەویرە نارد وپێشنیاری هاوکاری پێکرد، مالك رازی و سەرنجی سەجاح بۆ لای هۆزەکانی تەمیم راکێشا. سەجاح رازی و وتی: تۆ دەزانی و ئەو کەسانەی مەبەستتە چوونکە من ژنێك لەمناڵەکانی یەربوعم و ئەگەر پاشایەتیمان دەستکەوێت، دەبێتە هی تۆ. کەسی بۆ لای مناڵەکانی مالك کوڕی حەنزەلە نارد و پێشنیاری هاوکاری و هاوپەیمانی پێکردن. عەتارد کوڕی حاجب لەگەڵ سەرکردەکانی مناڵەکانی مالك هەلاتن و لەتایەفەی مناڵەکانی عەنبەر لای سەبرە کوڕی عەمرۆ دابەزین چوونکە کردەوەکانی وەکیعیان پەسەند نەدەکرد. سەرکردەکانی

منالەکانی یەربوع ڕۆشتن و لەتایەفەی منالەکانی مازن لای حەسین کوڕی نەیار نیشتەجێ بوون چوونکە کردەوەکانی مالکیان پەسەند نەدەکرد.

کاتێ نێردراوەکانی سەجاح گەیشتنە لای منالەکانی مالك و پێشنیاری هاوکاریان پێدان، وەکیع رازی بوو. ئەو و مالك و سەجاح کۆبوونەوە و پەیمانی ئاشتییان واژۆ و بۆ شەڕ لەگەڵ کەسانی دیکە بڕیارياندا، وتیان: لەکام تایەفەوە دەست پێبکەین لەخەزم یا بەهدی یا عەوف یا ئەبنا یا رەباب؟ باسی قەیسیان نەکرد چوونکە دوودڵی ئەویان هەست پێکرد و چاوەڕوان بوون هاوکارییان بکات.

سەجاح هاوشێوەی قورئان قسەی دەکرد، وتی: ((اعدو الركاب و استعدو اللنهاب، ثم اغيروا على الرباب، فليس دونهم حجاب.

واتاکەی: سوارەکان ئامادە و بۆ تالآنی حازر و هێرش بکەنە سەر رەباب چوونکە هیچ لەمپەرێك لەسەر ڕێگە نییە.))

سەجاح لەئەحفار دابەزی و بەهاوەڵانی خۆی وت: دەهنا پارێزەری منالەکانی تەمیمە و خەڵکانی رەباب کاتێك بکەونە تەنگانەوە ڕوودەکەنە دەجانی و دەهانی، دەبێت دەستەیەك لەئێوە ئەو ناوچەیە کۆنترۆڵ بکەن. مالك کوڕی نەویرە رووی کردە دەجانی و لەوێ جێگیر بوو. خەڵکانی رەباب ئەمەیان بیست و هۆزی زەببە و عەبدمەنات پەیوەستی سەجاح بوون، وەکیع و بەشیر، سەرکردایەتی منالەکانی بەکر و منالەکانی زەببەیان گرتەئەستۆ و سەعلەبە کوڕی سەعد وەك سەرکردەی خەڵکی عوققە هەڵبژێردرا وهوزەیل وەك سەرکردەی عەبدمەنات.

وەکیع و بەشیر و منالەکانی بەکر ڕوویەڕووی منالەکانی زەببە بوونەوە و شکستیان خوارد و سەماعە و وەکیع و قەعقاع ئەسیر کران و کەسانێکی زۆر کوژرا. قەیس کوڕی عاسم لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و تیایدا لەکردەوەکانی خۆی پەشیمانی دەردەبڕێت.

سەجاح و هوزەیل و عێقە، منالەکانی بەکریان گەڕاندەوە بەهۆی ئەو ڕێککەوتنەی پێشتر لەنێوان سەجاح و وەکیع واژۆ کرابوو، عێقە خاڵی بەشیر بوو. سەجاح وتی: لەگەڵ خەڵکانی رەباب ڕێککەون تا ئەسیرەکانی ئێوە ئازاد و ئێوە خوێنبایی کوژراوەکانی ئەوان بدەن. ئەو کارەیان کرد.

لەتایەفەی عەمرۆ و سەعد و رەباب کەسی پەیوەستی سەجاح نەبوو و لە ناو ئەوان

تەنیا چاوەڕوانی هاوکاری خەڵکانی قەیس بوون تا ئەو کاتەی لەوتەکانی خۆیان وەسفی منداڵەکانی زەبیەیان کرد. لەمنداڵەکانی حەنزەلە جگە لەوەکیع و مالك کەس هاوکاری سەجاحی نەکرد.

سەجاح لەگەڵ سوپای خەڵکانی جەزیرە بەمەبەستی هێرش کردنە سەر مەدینە بەرێکەوت تا گەیشتە نەباج. ئەوس کوڕی خەزیمەی هوجەیمی لەگەڵ شوێنکەوتەکانی خۆی لەمنداڵەکانی عەمرۆ، هێرشیان کردن سەر. هوزەیل ئەسیر کرا ویەکێك لەمنداڵەکانی مازن بەناوی ناشزە ئەوی ئەسیر کرد. عێقە لەسەردەستی عەبدەی هوجەیمی ئەسیرکرا. دواتر بۆ گۆڕینەوەی ئەسیرەکان رێککەوتن بەو مەرجەی سوپاکەی سەجاح ئەو ناوچەیە بەجێبێڵێت و لەوێوە نەڕۆن. سەجاحیان گەڕاندەوە و لەخۆی و هوزەیل و عێقە پەیمانیان وەرگرت بگەڕێنەوە و نەخوازن لەناو سەرزەمینەکەی ئەوانەوە گوزەر بکەن. ئەو کارەیان کرد.

هوزەیل ڕق و کینەی مازنی لەدڵدا بوو تا ئەو کاتەی عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و هێرشی کردە سەر سەفار شوێنی نیشتەجێ بوونی منداڵەکانی مازن. منداڵەکانی مازن ئەویان کوشت و لەسەفار فڕیاندا.

کاتێك هوزەیل و عێقە گەڕانەوە بۆ لای سەجاح و سەرکردەی خەڵکانی جەزیرە کۆبوونەوە، پێیان وت: دەبێت چی بکەین، مالك و وەکیع لەگەڵ خەڵکەکەیان بڕیاریاندا هاوکاری ئێمە نەکەن و نایانەوێت لەسەرزەمینەکەی ئەوانەوە بڕۆین. ئێمەیش پەیمانمان لەگەڵ بەستوون.

سەجاح وتی: بەرەو یەمامە دەڕۆین.

وتیان: خەڵکی یەمامە هێزی زۆریان هەیە و موسەیلەمە دەسەڵاتی فراوان بووە.

سەجاح وتی: ((علیكم بالیمامة، ودفوا دفیف الحمامة، فانها غزوة صرامة، لا یلحقكم بعدها ملامة.

واتاکەی: بەرەو یەمامە بڕۆن و هاوشێوەی کۆتر باڵەکانتان بکەنەوە چوونکە غەزایەکە بڕیاری لەسەردراوە و دوای ئەوە کەس سەرکۆنەی ئێوە ناکات.

دواتر مەبەستی منداڵەکانی حەنیفەی کرد و کاتێك موسەیلەمە ئاگادار بویەوە، لێی ترسا چوونکە دەیزانی ئەگەر سەرقاڵی شەڕ کردن لەگەڵ سەجاح ببێت، سەمامە یا شورەحبیل کوڕی حەسەنە یا هۆزەکانی دەوروبەر بەسەر حوجردا زاڵ دەبن.

لەبەر ئەمە دیاری بۆ ناردو داوای ئەمانی کرد تا بڕواتە لای و سەجاح لەسەر ئاوەکان

دابەزێت. ئەمان و مۆڵەتی بەموسەیلەمەدا.

موسەیلەمە لەگەڵ چل کەس لەمناڵەکانی حەنیفە ڕۆشتە لای سەجاح. ئەو لەکاروباری مەسیحییەت شارەزا و زانست لەمەسیحییەکانی تەغلەب فێر ببوو.

موسەیلەمە پێی وت: نیوەی زەوی تایبەت بەئێمە، ئەگەر قوڕەیشییەکان دادپەروەر دەبوون، نیوەی زەوی تایبەت دەبوو بەوان، بەلاَم ئێستا خواوەند نیوەکەی قوڕەیشی بەتۆ بەخشی لەکاتێکدا ئەگەر قوڕەیش دەیویست بەوانی دەبەخشی.

سەجاح وتی: ((لایرد النصف الا من جنف، فاحمل النصف الی خیل تراها کالسهف.

واتاکەی: نیوە کەسێك پێی رازی نابێت کەستەمگەر بێت، نیوەی بدە بەو سوپایەی خوازیاریەتی)).

موسەیلەمە وتی:

((سمع الله لمن سمع، و اطمعه بالخیر اذ طمع، و لا زال امره فی کل ماسر نفسه یجتمع، رآکم ربکم فحیاکم، ومن وحشة خلاکم، ویوم دینه انجاکم فاحیاکم، علینا من صلوات معشر ابرار، واتاکەی: اشقیاء و لا فجار. یقومون اللیل و یصومون النهار. لربکم الکبار، رب الغیوم و الامطار.

واتاکەی: خواوەند لەشوێنکەوتەکانی خۆی بیست و کاتێك چاوی تەماحی بڕییە خێر، هیوای پێبەخشی و بەردەوام کارەکانی بەرەو باشی دەڕۆن. خواوەند بینی و پێی بەخشین و لەترسەکان رزگاری کردن تا لەڕۆژی جەزا رزگارتان بکات و زیندوو بکاتەوە، سلاَوی دەستەی چاکەکاران، نەخراپەکار و ستەمکاران، لەئێمە بێت. ئەوانەی شەو هەڵدەستن و لەڕۆژ بەڕۆژوو دەبن بۆ خواوەندی گەورە کەخواوەندی هەورەکان وبارانەکانە.))

هەروەها وتی:

((لما رایت وجوهم حسنت، و ابشار هم صفت، وایدیهم طفلت، قلت لهم الا النساء تاتون،و لا: الخمر تشربون، و لکنکم معشر ابرار تصومون، یوما و تکلفون یوما، فسبحان الله اذا جاءت الحیاة کیف تحیون، و الی الملك السماء ترقون، فلو انها حبة خردلة لقام علیها شهید، یعلم ما فی الصدور و اکثر الناس فیها الثبور.

واتاکەی: کاتێك بینیم دەموچاویان جوان و روخسارەکانیان پاکی و دەستەکانیان نەرم بوو، پێم وتن: نەتێکەڵ بەژنەکان بن و نەشەراب بخۆنەوە چوونکە ئێوە پیاوە

چاکەکارەکانن، ڕۆژێك بەڕۆژو و ڕۆژێك ڕۆژو دەشکێنن، وەسفی خوا بکەن کەکاتێك ژیان دێت چۆن زیندوو دەبنەوە و بۆ لای پاشای ئاسمانەکان بەرز دەبنەوە، ئەگەر یەك دانەی خەردەلّ بێت، شایەتێکی دەستدەکەوێت تا نیهێنی دلّەکان بزانن و زۆر کەسان لەمیارەوە رژدی دەبەن.))

یەکێك لەو شتانەی موسەیلەمە لەسەر خەڵکانی فەرز کردبوو ئەوەیە : هەرکەس منالّێکی بۆ هاتە دنیا لەگەلّ ژنان جووت نەبێت تا ئەو منالّە دەمرێت و دووبارە بەدوای منالّێکی دیکەوە بێت و دووبارە خۆی لەژنان دوور بخاتەوە. بەمشێوەیە ژنانی لەوکەسانەی منالّی نێرینەیان بوو، حەرام کرد.

ئەبوجەعفەر دەلّێت: لەگێڕانەوەیەکی دیکە سەجاح لای موسەیلەمە دابەزی و دەرگای قەلاّکەی لەسەر داخست، سەجاح وتی: دابەزە.

موسەیلمە وتی: هاورێکانی خۆت دوور بخەرەوە. سەجاح ئەوکارەی کرد.

موسەیلەمە وتی: خێوەتێك هەلّدەن و بخوور بسووتێنن ئەگەری هەیە حەزی بجوولّێت.

سەجاح ڕۆشتە ناو خێوەتەکە، موسەیلەمە لەقەلاّکەی هاتەخوار و وتی: دەکەس لێرەدا بێستێت و دەکەس لەوێ، دواتر لەگەلّ سەجاح قسەی کرد و وتی: وەحی چیت بۆ هاتووە؟

سەجاح وتی: مەگەر دەبێت ژنەکان قسە دەسپێبکەن، ئەی وەحی بۆ تۆ چی هاتووە؟

موسەیلەمە وتی: ((الم ترالی ربك کیف فعل بالحبلی، اخرج منها نسمە تسعی، من بین صفاق وحشي.

واتاکەی: مەگەر نەتبینی خواوەند لەگەلّ ژنی دووگیان چی کرد، بوونەورێکی زیندووی لەو هێنایەدەر لەنێوان بەندە و وەحشییەکان.))

سەجاح وتی: چیتر؟

وتی: وەحیم بۆ هاتووە کە: ((ان الله خلق النساء افراجا، و جعل الرجال لهن ازواجا، فنولج فیهن قعسا ایلاجا، ثم نخرجها اذانشاء اخراجا فینتجن لنا سخالا انتاجا.

واتاکەی: خواوەند (شەرمی) ژنەکانی ئافراند و پیاوانی کردە جووتی ئەوان تا شتێکی بخەینە ناو و کاتێك بمانەوێت دەریبێنین، بێچووەکانمان بۆ دێنن.))

سەجاح وتی: شایەتی دەدەم کەتۆ پێغەمبەریت.

وتی: دەتەوێت تۆ بکەمە هاوسەری خۆم و بەهاوکاری خەڵکەکەی خۆم و خەڵکەکەی تۆ، عەرەبەکان بخۆم؟

سەجاح وتی: بەڵێ.

موسەیلەمە وتی: هەستە بادەست پێبکەین.

((شوێن خەوی تۆیان ئامادە کردووە

ئەگەر بخوازیت دەڕۆینە ماڵ

و ئەگەر بتەوێت لەژوورێکا دادەنیشین

ئەگەر بخوازیت بەپشتا دەتخەم

و ئەگەر بخوازیت لەسەر چوار دەست و پێ

ئەگەر بخوازیت، لێی دەخەم

و ئەگەر بخوازیت هەمووی تێدەخەم.))

سەجاح وتی: هەمووی.

وتی: بەمشێوەیە وەحی بۆ منیش هاتۆتەخوار.

سێ ڕۆژ پێکەوە بوون. دواتر سەجاح بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە. وتیان: چ دەنگ و باسێکت پێیە؟

وتی: ئەو لەسەر راستییە و من بوومە شوێنکەوتەو هاوسەری ئەو.

وتیان: هیچی وەك مارەیی تۆ دیاری کرد؟

وتی: نە.

وتیان: بگەڕێرەوە، شیاو نییە بۆ کەسێکی وەك تۆ مارەییت نەبێت.

سەجاح گەڕایەوە و کاتێك موسەیلەمە ئەوی بینی، دەرگای قەڵاکانی بەست و وتی: چیت دەوێت؟

وتی: مارەیی بۆ من دیاری بکە.

موسەیلەمە وتی: بانگدەری تۆ کێیە؟

وتی: شەبس کوڕی ڕێبعی ریاحی.

وتی: با بێتە لای من.

کاتێك شیبس هات، پێی وت: لەناو هاوەڵانی خۆت جاڕبدە کەموسەیلەمە کوڕی حەبیب، پێغەمبەری خوا، دوو ڕەکعەت لەو نوێژانەی محەممەد فەرزی کردووە، لەسەر

ئێوەی هەڵدەگرێت، نوێژی خەوتنان و نوێژی بەیانی.

دەڵێت: لەهاوەڵانی سەجاح، زەبەرقان کوڕی بەدر و عەتارد کوڕی حاجب و کەسانی هاوشێوەی ئەوان بوون.

کەلبی دەڵێت: لەپیرەکانی مناڵەکانی تەمیمم بیست: مناڵەکانی تەمیمی ریخەلان نوێژی خەوتنان و بەیانی ناکەن.

سەجاح لەگەڵ هاوەڵانی خۆی، زەبەرقان و عەتارد کوڕی حاجب و عەمرۆ کوڕی ئەهتەم و غەیلان کوڕی خەرەشە و شیبس کوڕی ڕێبعی، بەرێکەوت.

عەتارد کوڕی حاجب هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

پێغەمبەری ئێمە ژنێکە و دەیگێڕین.

بەلام پێغەمبەری خەڵکانی دیکە، پیاون.))

حەکیم کوڕی عەیاش ئەعوەری کەلبی بۆ رەخنە گرتن لەموزەرییەکان بەهۆی سەجاح و ئامۆژگارییەکانی رەبیعە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((دینێکی بەهێزیان بۆ ئێوە هێنا

بەلام ئێوە کەسێکتان هێنا کەئایاتی (مصحف)ی حەکیم هەڵدەوەشێنێتەوە))

موسەیلەمە و سەجاح بڕیاریاندا نیوەی بەرهەمی یەمامەی بۆ بنێرێت، بەلام سەجاح رازی نەبوو مەگەر ئەوەی بەرهەمی ساڵی داهاتوو لەپێشەوە بدات.

موسەیلمە وتی: کەسانێك دانێ تا بەرهەمەکان بۆ تۆ بێنن. سەجاح بەرەو جەزیرە ڕۆشت و هوزەیل و عێقەی بەجێهێشت تا بەرهەمەکان وەربگرن.

لەم کاتەدا خالید کوڕی وەلید لەیەمامە نزیك کەوتەوە و هەموویان بلاوەیان لێکرد. سەجاح لەناو مناڵەکانی تەغلەب مایەوە تا ئەوەی لەرۆژگاری خەلافەتی خۆی، معاویە ئەوانی گواستەوە.

خەڵکی عێراق دوای عەلی کوڕی ئەبی تالیب تەسلیمی معاویە بوون، ئەو، شوێنکەوتەکانی عەلی لەکوفە دەرکرد و خەڵکانی شوێنکەوتەی خۆی لەجەزیرە و بەسرە و شام لەجێگەی ئەوان نیشتەجێ کرد. ئەوانیان بە(نواقل) ناوبرد. بۆ نموونە قەعقاع کوڕی عەمرۆ کوڕی مالکی بۆ ئیلیای فەلەستین نارد و وتی لەشوێنی مناڵەکانی عەقافن، نیشتەجێ ببێت و بۆ شوێنی مناڵەکانی تەمیم ئەوان بگوێزێتەوە. ئەوانی لەجەزیرەوە بۆ کوفە نارد و لەشوێنەکەی قەعقاع جێگیری کردن.

لەهاوەڵانی سەجاح، زەبەرقان و ئەقرەع هاتنە لای ئەبوبەکر و وتیان: خەراجی

بەحرەین بۆ ئێمە دانێ و بەڵێن دەدەین کەس لەخەڵکەکەی ئێمە لەدین پەشیمان نەبێتەوە.

ئەبوبەکر ئەو کارەی کرد و نامەیەکی بۆ ئەوان نووسی. تەڵحە کوڕی عوبەیداللە لەنێوان ئەوان هاتوچۆی دەکرد و چەند کەسێکیان کردە شایەت. عومەر کوڕی خەتاب یەکێك بوو لەشایەتەکان. کاتێك نامەکەیان نیشاندا، حاشای لێکرد و نامەکەی دڕاند و لەناوی برد. تەڵحە توڕە بوو، ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و وتی: تۆ ئەمیریت یا عومەر؟

ئەبوبەکر وتی: عومەر ئەمیرە بەڵام فەرمانەکانی من ئەنجام دەدات. تەڵحە بێدەنگ بوو.

دوای ئەوە ئەقرەع و زەبەرقان لەهەموو جەنگەکان تا جەنگی یەمامە لەناو سوپاکەی خالید کوڕی وەلیددا بوون. ئەوسا ئەقرەع هاوڕێ لەگەڵ شورەحبیل بەرەو دوومە بەڕێکەوت.

بەتاح و ڕووداوەکانی

بەتاح

کوڕی عەتییە کوڕی بیلال دەڵێت: کاتێك سەجاح ڕووی کردە جەزیرە، مالك کوڕی نەویرە لەکردەوەکانی خۆی پەشیمان بوویەوە و لەکارەکانی خۆی سەریسوڕما. وەکیع و سەماعەیش هەستیان بەقێزەونی کردەوەکانی خۆیان کردو بۆ ڕێگەی ڕاست گەڕانەوە. زەکاتیان ئامادە کرد و بردیانە لای خالید، بەوانی وت: بۆ لەگەڵ ئەو خەڵکە یەکتان گرت؟

وتیان: بۆ تۆڵە سەندنەوە لەمناڵەکانی زەببە، چوونکە دەرفەتێکی باشمان دەستکەوتبوو.

بەمشێوەیە لەدیاری مناڵەکانی حەنزەلە هیچ شتێکی ناخۆش و ناسازگار نەمایەوە،

مەگەر مالیك كوڕی نەویرە و شوێنكەوتەكانی لەبەتاح. مالك لەكارەكانی خۆی گێژ وپەرێشان و نەیدەزانی دەبێت چی بكات.

عەمرۆ كوڕی شوعەیب دەڵێت: كاتێك خالید مەبەستی بەرێكەوتنی كرد، لەزەفەر ڕۆشتەدەر، كاروباری ئەسەد و هەوازین و غەتەفان و تەی، ساماندرابوو. ئەو، بەرەو بەتاح بەرێكەوت. مالك كوڕی نەویرە لەوێ بوو. بەڵام دوودڵی لەناو ئەنسارییەكان دەركەوت و لەخالید جیابوونەوە و وتیان: ئەمە فەرمانی خەلیفە نییە، خەلیفە فەرمانی پێداین كاتێك لەبوزاخە تەواو بووین و ئەم سەرزەمینە ئارامی گرت، بمێنینەوە تا فەرمانەكانی دەگات.

خالید وتی: ئەگەر ئەو فەرمانەی بەئێوەداوە، فەرمانی بەمنداوە بڕۆم، سەركردەی سوپا منم وهەواڵەكان بەدەستی من دەگات، دەرفەتێك پێش هاتووە و ئەگەر بمەوێت ئەو ئاگادار بكەمەوە، لەدەستمان دەڕوات، بۆیە ئاگاداری ناكەمەوە و ئەم دەرفەتە دەقۆزمەوە.

هەروەها ئەگەر ڕووداوێك ڕوویدات و خەلیفە فەرمانی لەبارەوە نەدابێت، دەبێت بزانم باشترین ڕێگە چارە چییە و ئەو كارە بكەین. ئێستا مالك كوڕی نەویرە ڕووبەڕووی ئێمەیە و من لەگەڵ موهاجیرەكان بۆ شەڕی ئەو دەڕۆم، ئێوە بۆ كارێك كەناخوازن، ناچار ناكەم.

خالید ڕۆشت و ئەنسار پەشیمان بوونەوە و ڕەخنەیان لەیەك گرت و وتیان: ئەگەر موهاجیرەكان تالآنییان دەستكەوێت، ئێوە بێ بەش دەبەن و ئەگەر بەڵایەك بەسەر ئەواندا بێت، خەڵكان بێزاری خۆیان لەئێوە دەردەبڕن.

ئەنسار بڕیاریاندا پەیوەستی خالید بن. كەسیان نارد تا چاوەڕێیان بكات. دوای گەیشتنی ئەوان خالید بەرێكەوت تا گەیشتە بەتاح بەڵام كەسی لەوێ نەبینی.

سوەید كوڕی موسعەبەی ڕیاحی دەڵێت: كاتێك خالید كوڕی وەلید گەیشتە بەتاح، كەسی لێ نەبوو، مالك كاتێك دوودڵ بوو، بڵاوەی بەخەڵكان كرد و ڕێگەی كۆبوونەوەی لێگرتن، وتبووی: ئەی منالەكانی یەربوع، ئێمە نافەرمانین ئەمیرەكانی خۆمان كرد كەپێشنیاری ئەو دینەیان بەئێمە كرد، بەڵام ڕێگەی باوەڕهێنانمان لەخەڵكان گرت، نەمانتوانی سەركەوین و هیچ كارێكمان بۆ نەكرا، من بەوردی لەم كارە ڕاماوم و دڵنیام ئەوان سەركەوتن بەدەست دێنن و ئەم كارە ناكەوێتە دەست كەس جگە لەوان، دژایەتی ئەوكەسانە مەكەن كەسەركەوتن باوەشی بۆ كردوونەتەوە، بڵاوەی لێبكەن.

بەمشێوەیە خەڵکان لەبەتاح بلاوەیان لێکرد و مالك گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

کاتێك خالید گەیشتە بەتاح، دەستەکانی بۆ ئەم لاولانارد و فەرمانی پێدان پێشنیاری ئیسلام بەخەڵکان بکەن، هەرکەس رازی نەبوو بیهێنن و ئەگەر بەهاتن رازی نەبوو، خوێنی برێژن.

یەکێك لەفەرمانەکانی ئەبوبەکر ئەوە بوو: کاتێك لەشوێنێك دابەزین، بانگ بدەن و بۆ نوێژ ریز ببەستن، ئەگەر خەڵکی ئەو ناوچە بانگیاندا و بۆ نوێژ ریزیان بەست، دەستیان لێ هەڵبگرن و ئەگەر ئەو کارەیان نەکرد، هێرشیان بکەنەسەر و بیانکوژن یا بیانسووتێنن، ئەگەر باوەڕیان هێنا، پرسیاریان لێبکەن، ئەگەر باوەڕیان بەزەکات هەیە، لێیان وەربگرن و ئەگەر حاشایان لەزەکات کرد، بێ چەند و چوون لەناویان ببەن.

نێردراوانی خالید، مالك کوڕی نەویرە و چەند کەسێك لەمناڵەکانی سەعلەبە کوڕی یەربوع لەتیرەی عاسم و عوبەید و عەرین و جەعفەریان بردە لای خالید. بەلام سەبارەت بەم دەستەیە لەناو نێردراوان باوکی قتادەیش ل دەبینرا، جیاوازی و کێشە دروست بوو. باوکی قتادە و دەستەیەکی دیکە شایەتیاندا مناڵەکانی یەربوع بانگیان داوە و بۆ نوێژ ریزیان بەستووە. لەبەر بوونی کێشە، خالید فەرمانیدا ئەوان رابگرن. شەوێك سارد بوو، سات لەدوای سات ساردتر دەبوو. خالید فەرمانی بەکەسێکدا تا جاڕ بدات: ئەسیرەکانی خۆتان گەرم بکەنەوە و وشەی (ادفئوا) کەجاڕچی بەکاری برد، لەزمانی خەڵکانی کەنانە بەمانای (بیانکوژنە). کەسان گومانیان کرد خالید فەرمانی کوشتنی ئەسیرەکانی داوە و هەموویان کوشت. زەرار کوڕی ئەزوەر مالك کوڕی نەویرەی کوشت. خالید بەدەنگەدەنگی خەڵکان لەخێوەتەکەی هاتەدەر بەلام ئەسیرەکان کوژرابوون، وتی: خواوەند، مەبەستەکانی خۆی دێنێتەدی.

سەبارەت بەکوژرانی ئەسیرەکان کێشە و ئاژاوە دروست بوو. باوکی قتادە بەخالیدی وت: فەرمانی تۆ بوو. خالید بەشێوەیەکی توند وەلامی دایەوە. باوکی قتادە توڕە بۆ مەدینە گەڕایەوە و ئەبوبەکری بینی. ئەبوبەکر لێی توڕە و عومەر سەبارەت بەو قسەی لەگەڵ کرد بەلام رازی نەبوو تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە بۆ لای خالید. باوکی قتادە گەڕایەوە و لەگەڵ سوپاکەی خالید جارێکی دیکە هاتەوە بۆ ناو مەدینە.

دوای کوژرانی ئەسیرەکان، خالید دایکی تەمیم، خوشکی مینهال ژنی مالك کوڕی نەویرەی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد. عەرەبەکان ژن هێنان لەکاتی شەڕیان بەکارێکی

قێزەون دەزانی.

عومەر سەبارەت بەکارەکانی خالید لەگەڵ ئەبوبەکر قسەی کرد و وتی: خالید زوو دەست بۆ شمشێر دەبات، ئەگەر ئەم کارەی بەناڕەوا کردووە، دەبێت قیساس بکرێت.

ئەبوبەکر هیچ کات کاربەدەست وسوپاییەکانی خۆی قیساس نەدەکرد و لەوەڵامی عومەردا وتی: عومەر ئارام بە! هەڵەیەکی کردووە، چیتر ئەوەندە رەخنەی لێمەگرە.

ئەبوبەکر خوێنبایی مالکی دا و فەرمانی گەڕانەوەی بۆ خالید نووسی. کاتێك هات و بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، ئەبوبەکر بەپاساوەکەی رازی بوو بەڵام بۆ ژن هێنانەکەی کەعەرەبەکان بەکارێکی قێزەونیان دەزانی، سەرکۆنەی کرد.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: دەستەیەك لەنێردراوانی خالید شایەتییاندا کاتێك بانگیان فەرموو و بۆ نوێژ ریزیان بەست، خەڵکەکەی مالك کوڕی نەویرە ئەوکارەیان کرد و دستەیەکی دیکە شایەتی پێچەوانەیاندا و لەبەر ئەمە کوژران.

دەڵێت: دوای ئەوە موتەممەم کوڕی نەویرە برای مالك هات و داوای خوێنی براکەی و ئازادی ئەسیرەکانی لەئەبوبەکر کرد. ئەبوبەکر فەرمانی ئازاد کردنی ئەسیرەکانی بۆ نووسی.

دەڵێت: عومەر پێداگری دەکرد بۆ ئەوەی ئەبوبەکر خالید لەسەر کار لاببات و دەیوت: زوو دەست بۆ شمشێر دەبات.

بەڵام ئەبوبەکر دەیوت: نا، عومەر! شمشێرێك کەخوا بۆ ناباوەڕانی لەکالآن دەرهێنا، نایکەمە کالآن.

سوەید دەڵێت: مالك کوڕی نەویرە لەهەموو کوژراوان زیاتر تووکن بوو. موسوڵمانەکان بەسەری کوژراوەکان کوچکاوریان دروست کرد، پێستی سەری هەموویان سووتا جگە لەسەری مالك کوڕی نەویرە. قازانی سەر ئاگرەکە کوڵا بەڵام سەری ئەو نەسووتا لەبەر ئەوەی قژی زۆر بوو و قژی زۆر، پێستی سەری ئەوی لەگەرمی پاراست.

دەڵێت: موتەممەم کوڕی نەویرە سەبارەت بەمالك هۆنراوەیەکی خوێندەوە و باسی بچووکی سکی ئەوی دەکرد. عومەر کاتێك مالك هاتبووە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەوی بینیبوو، دەیوت: موتەممەم، بەمشێوە بوو؟

موتەممەم دەیوت: بەڵێ بەو شێوە بوو کەباسی دەکەم.

عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: یەکێك لەفەرمانەکانی ئەبوبەکر بۆ سوپاکەی

ئەمە بوو: کاتێك گەیشتنە سەرزەمین یا ناوچەیەك و دەنگی بانگتان بیست، دەستیان لێ هەڵبگرن، لەخەڵکان هۆکاری نارەزایی ئەوان بپرسن و ئەگەر بانگتان نەبیست، هێرشیان بکەنەسەر و بیانکوژن و بەئاگر بیانسووتێنن.

دەڵێت: یەکێك لەو کەسانەی شایەتییان بۆ موسوڵمان بوونی مالك کوڕی نەویرە دا، باوکی قتادە، حارس کوڕی ڕێبعی سولەمی بوو کەدواتر لەگەڵ خوا پەیمانی بەست هیچ کات لەگەڵ خالید کوڕی وەلید بۆ شەڕ نەڕوات.

باوکی قتادە دەیوت: لەکاتی شەو سوپای موسوڵمانان گەیشتنە لای خەڵکی مالك کوڕی نەویرە و ئەوان سیلاحیان هەڵگرت، وتمان: موسوڵمانین.

وتیان: ئێمەیش موسوڵمانین.

وتمان: بۆ سیلاحتان هەڵگرت؟

وتیان: ئێوە بۆ هەڵتان گرتووە؟

وتمان: ئەگەر موسوڵمانان سیلاحەکانتان دانێن.

دەڵێت: سیلاحیان دانا و نوێژمان کرد و ئەوان نوێژیان خوێند.

بیانوی خالید کوڕی وەلید بۆ کوشتنی مالك ئەمە بوو، بەخالیدی وتبوو: گومان دەکەم هاورێکەت ئەمە و ئەوەی باس کردووە.

خالید وتی: کەواتە ئەو بەهاورێی خۆت نازانیت؟ ئەو ئەسیرەکانی دیکەی کوشت.

دەڵێت: کاتێك عومەر لەکوژرانی ئەوان ئاگادار بوویەوە، لەمبارەوە قسەی لەگەڵ ئەبوبەکر کرد و وتی: دوژمنی خوا هێرشی کردە سەر پیاوێکی موسوڵمان و کوشتی، دوای ئەوە پەڕییە سەر ژنەکەی.

دەڵێت: خالید گەڕایەوە بۆ مەدینە و بەرەبەیان ڕۆشتە ناو مزگەوت، عابایەکی لەبەردابوو، کەژەنگی ئاسنی پێوە دەبینرا، دەستارێکی لەسەردا بوو کەسەد تیری تیا چەقیبوو.

کاتێك خالید ڕۆشتە ناو مزگەوت، عومەر هەستا و تیرەکانی لەدەستارەکەی دەرهێنا و لەت و پەتی کرد و وتی: درۆ دەکەیت، ئەمە ریاکارییە؟ پیاوێکی موسوڵمانت کوشت و پەڕیتە سەر ژنەکەی. بەردبارانت دەکەم.

خالید بێدەنگ و وەڵامی عومەری نەدەدایەوە. گومانی کرد بۆچوونی ئەبوبەکریش هاوشێوەی عومەرە. کاتێك ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و داستانەکەی خۆی باس کرد،

ئەبوبەکر بەپاساوەکەی رازی و سەبارەت بەرووداوەکانی شەڕ لێی خۆش بوو.

دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خالیدی بەخشی، ولەمزگەوت هاتەدەر، بەعومەری وت: ئەی کوڕی دایکی شەهلە وەرە.

عومەر زانی ئەبوبەکر ئەوی بەخشیوە و وەڵامی نەدایەوە و گەڕایەوە بۆماڵەکەی خۆی.

دەڵێت: ئەو کەسەی مالك کوڕی نەویرەی کوشت، زەرارە کوڕی ئەزوەری ئەسەدی بوو.

### پاشماوەی بەسەرهاتی موسەیلەمەی
### درۆزن و شوێنکەوتەکانی لەخەڵکی یەمامە

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهلی بۆ شەڕ لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزن ڕەوانە کرد و شورەحبیلی بەدوای ئەودا نارد. عێکرەمە لەڕۆشتن پەلەی کرد تا پێش شورەحبیل بکەوێتەوە و ناوبانگی ئەم کارە بەخۆی ببرێت. لەگەڵ شوێنکەوتەکانی موسەیلمە شەڕی کرد و شکستی خوارد، شورەحبیل کاتێك ئاگادار بوویەوە، لەرێگا مایەوە و عێکرەمە رووداوەکەی لەنامەیەکدا بۆ ئەبوبەکر نووسی.

دەڵێت: ئەبوبەکر لەوەلامی عێکرەمە نووسی: ئەی کوڕی دایکی عێکرەمە! بەمشێوەیە نەتبینم وبۆ لای من نەگەڕێیتەوە چوونکە خەڵکان لاواز دەبن. بڕۆ بۆ هاوکاری حوزەیفە و عەرەفجە بجەنگە و هاوڕێ لەگەڵ ئەوان شەڕ لەگەڵ خەڵکانی عەممان و موهرە بکە. ئەگەر نەیانویست لەگەڵ سوپاکەی خۆت بەرێکەوە و کاروباری ئەو خەڵکانەی لەرێگە رووبەروویان دەبنەوە، رێکبخە و بڕۆن تا لەیەمەن و حەزەرمەوت پەیوەستی موهاجیر کوڕی ئومەییە دەبیت.

هەروەها نامەی بۆ شورەحبیل نارد: تا گەیشتنی فەرمانەکانم لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە. چەند رۆژ پێش ئەوەی خالیدی بۆ یەمامە بنێرێت نامەی بۆ شورەحبیل نووسی: کاتێك خالید هات و بەخواستی خوا لەوێ تەواو بوون، بەرەو قوزاعە بڕۆ و

لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عاس، لەگەڵ ناباوەڕان و هەڵگەڕاوەکانی ئەو دیارە بجەنگە.

کاتێك خالید لەبەتاحەوە گەڕایەوە مەدینە و ئەبوبەکر بەپاسا‌وەکەی ڕازی بوو، ئەوی بۆ شەڕی موسەیلەمە ڕەوانە کرد و فەرمانیدا هەموو شەڕکەران پەیوەستی سوپاکەی بین.

سەرکردەی ئەنسار سابت کوڕی قەیس و بەرا کوڕی فلان و سەرکردەی موهاجیرەکان باوکی حوەزەیفە و زەید. هەرکام لەهۆزەکانی دیکە سەرکردەی خۆیان بوو. خالید بەخێرایی بۆ لای سوپاکەی لەبەتاح گەڕایەوە و چاوەڕوانی پەیوەست بوونی سوپاکەی مەدینەی دەکرد. کاتێك هاتن، بەرەو یەمامە بەرێکەوت. لەو کاتەدا منداڵەکانی حەنیفە ژمارەیان فراوان بوو.

باوکی عەمرۆ کوڕی عەلا دەڵێت: لەو کاتە منداڵەکانی حەنیفە نیشتەجێی گوند و ساراکان، نزیکەی چل هەزار شەڕکەریان بوو. کاتێك خالید لەوان نزیك کەوتەوە، دەستی بەسەر ئەسپەکانی تایبەت بەعێقە هوزەیل و زیاددا گرت. ئەوان شتێکیان لەموسەیلەمە وەرگرت ولەوێ مابوونەوە تا سەجاح پەیوەستی ئەو بکەن. خالید نامەی بۆ منداڵەکانی تەمیم نووسی و ئەوانیان دەرپەڕاند و لەدوورگەی عەرەب دەریان کردن.

شورەحبیل کوڕی حەسەنە بەهەمان شێوەی عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل، پەلەی کرد و پێش ئەوەی خالید بگات شەڕی لەگەڵ موسەیلەمە دەستی پێکرد و شکستی خوارد و گۆڕەپانی بەجێهێشت. کاتێك خالید بنیی، سەرکۆنەی کرد.

خالید ئەسپی ئەو کەسانەی گرتبوو کەخاوەنەکانیان لەدەوروبەری یەمامە بوون چوونکە دەترسا لەوەی لەپشتەوە هێرشی بکەنەسەر.

جابر کوڕی فلان دەڵێت: ئەبوبەکر سەڵیتی بۆ هاوکاری خالید ڕەوانە کرد تا پشتەوەی بۆ بپارێزێت بۆ ئەوەی کەس لەدواوە هێرشی نەکاتەسەر. کاتێك لەخالید نزیك کەوتەوە، ئاشکرا بوو ئەو سوارانەی ڕوویان لەو سەرزەمینە کردووە، بڵاوە بوونەتەوە و هەڵاتوون. سەڵیت پشت سەری موسوڵمانەکانی دەپاراست.

ئەبوبەکر دەیوت: من شەڕکەرانی بەدر بۆ کارەکان ڕاناسپێرم و ڕێگەیان پێدەدەم لەگەڵ کردەوەکانی خۆیان بۆ لای پەروەردگار بڕۆن چوونکە مانەوەی ئەوان لەشەڕ کردنیان سوودمەندتر و باشترە. بەڵام عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: سوێند بەخوا لەکارەکاندا بەشدارییان پێدەکەم تا هاودڵی من بن.

ئەسالی حەنەفی دەڵێت: موسویلەمە لەگەڵ خەڵکان بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوتی دەکرد و دەیویست سەرنجی ئەوان راکێشێت و گرنگی نەدەدا بەوەی خەڵکان لەکارە قێزەونەکانی ئەو ئاگادار ببنەوە. نەهار ئەلرەجال کوڕی عەنفوە لەگەڵ ئەودا بوو، نەهار ڕۆشتبووە لای پێغەمبەر(د.خ) و قورئان وزانستەکانی فیقهی دینی خوێندبوو. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی نارد تا ببێتە مامۆستای خەڵکانی یەمامە و دژی موسەیلەمە هانیان بدات. بەڵام فیتنەی ئەو بۆ منداڵەکانی حەنیفە گەورەتر لەفیتنەکەی موسەیلەمە بوو چوونکە شایەتی دەدا لە پێغەمبەری بیستووە کە موسەیلەمەی کردۆتە شەریکی پێغەمبەرایەتی خۆی. لەبەر ئەمە منداڵەکانی حەنیفە وتەکانی موسەیلەمەیان پشتڕاست کردەوە و ملکەچی فەرمانەکانی بوون و پێیان وت نامە بۆ پێغەمبەر(د.خ) بنووسێت و ئەگەر پێغەمبەر(د.خ) بەداواکەی رازی نەبێت، بۆ شەڕ کردن دژی پێغەمبەر(د.خ) هاوکاری دەکەن.

لەبەر ئەمە نەهار هەرچی دەوت، موسەیلەمە پێی رازی و وتەکانی بەکار دەبرد.

موسەیلەمە بەناوی پێغەمبەر(د.خ) بانگی دەدا و لەبانگدا شایەتی دەدا کە محەممەد نێردراوی خواوەندە. بانگدەری ئەو عەبدوللە کوڕی نەواحە بوو. حوجەیر کوڕی عومەیر پێشنوێژی خەڵکانی دەکرد و شایەتوومانی دەهێنایە سەرزمان و کاتێك حوجەیر شایەتوومانی دەهێنا، موسەیلەمە پێی دەوت: حوجەیر، ئاشکرا بیڵێ ئەو دەنگی خۆی بەرز دەکردەوە.

بەمشێوەیە موسەیلەمە بۆ کارەکەی خۆی و پشت راست کردنەوەی نەهار هەوڵی دەدا و موسوڵمانانی گومڕا دەکرد. رێزی و پێگەی لای خەڵکان فراوان بوو.

دەڵێت: موسەیلەمە لەیەمامە حەرەمێکی دیاری کرد و خەڵکانی ناچار کرد رێزی بگرن. خەڵك رازی بوون و حەرەم پێگەی بەرز بوویەوە. گوندەکانی هۆزەکانی هاوپەیمان لەتیرەی منداڵەکانی ئەسید لەناو حەرەمەکەدا بوو. هۆزە ئاماژە پێدراوەکان: سەیحان و نەمارە و نەمر و حار و منداڵەکانی جەروە بوون و ئەگەر ساڵێکی بەبەرەکەت و بەبەرهەم بوایە، داهاتی خەڵکانی یەمامەیان تاڵان و پەنایان بۆ حەرەم دەبرد و ئەگەر کەسێك شوێنیان دەکەوت، کاتێك دەرۆشتنە ناو حەرەم، دەستی لێ هەڵدەگرتن. ئەگەر کەس شوێنیان نەدەکەوت، بەمەبەستەکەی خۆیان دەگەیشتن. ئەم کارە ئەوەندە دووبارە بوویە کەخەڵکان ناچار بوون دژی ئەوان داوای هاوکاری لەموسەیلمە بکەن.

بەڵام موسەیلەمە دەیوت: چاوەڕوانم سەبارەت بەئێوە و ئەوان لەئاسمانەوە وەحی

بێت. دواتر وتی:

((و الليل الاطحم، و الذئب الادلم، و الجذع الازلم، ما انتهك اسيد من محرم.

واتاکەی: سوێند بەشەوی تاریك و گورگی ڕەش و بێچووە وشتری گوێ بڕاو، خەڵکانی ئەسید ڕێزی حەرەمیان نەشکاندووە.))

خەڵکان وتیان: مەگەر تاڵان کردن لەحەرەم و بەفیڕۆدانی سامانی حەرام، شکاندنی ڕێزی حەرەم نییە؟

مناڵەکانی ئەسید درێژەیان بەتاڵان کردنی خۆیاندا و خەڵکان داوای هاوکارییان لەموسەیلەمە کرد و وتی: چاوەڕوانە تا وەحی بێت. وتی: ((و الليل الدامس، و الذئب الهامس، ما قطعت اسيد من رطب و لا يابس.

واتاکەی: سوێند بەشەوی تاریك و گورگی دڕەندە، ئەسید تەڕ و وشکیان نەبڕیوەتەوە.))

وتیان: دار خورماکانی ئێمە تەڕە کەبڕیویانەتەوە و ماڵەکانی ئێمە وشکە کەوێرانیان کردووە.

موسەیلەمە وتی: بڕۆن، چوونکە هیچ مافێکتان نییە.

یەکێك لەو شتانەی وەك وەحی ئاسمانی بۆ خەڵکانی دەخوێندەوە:

(( ان بنى تميم قوم طهر لقاح، لا مكروه لهم و لااتاوه، نجاورهم ما حيينا با حسان، نمنعهم من كل انسان، فاذا متنا فامرهم الى الرحمان.

واتاکەی: مناڵەکانی تەمیم نەتەوەیەکی پاك و بەرهەمیان دەبێت و لەزیان و خەراج بەدوورن، تا ئەو کاتەی زیندووین، دراوسێیەکی چاك دەبین بۆ ئەوان، وئەوان لەهەمووان دەپارێزین و کاتێك مردین، کاری ئەوان لەگەڵ ڕەحمانە.))

هەروەها دەڵێت:

((والشاة و الوانها، و اعجبها السود و البانها، و الشاه السود او اللبن الابيض، لنه لعجب محض، و قد حرم المذق، فما لكم لا تمجعون.

واتاکەی: سوێند بەبزن و ڕەنگەکانی، سەرسوڕهێنەرتەر لەهەموو بزنی ڕەش و شیرەکەی، ئەو بزنە ڕەشە و شیرەکەی سپی و ئەمە سەرسوڕهێنەرە، ئاو تێکەڵ بەشیر کردن ڕەوا نییە، بۆ شیر و خورما ناخۆن.))

هەروەها دەڵێت:

((یا ضفدع بن ضفدعین، نقی ما تنقین، اعلاك فی الماء و اسفلك فی الطین، لا الشارب تمنعین و اعلاك فی الماء تكدرین.

واتاکەی: ئەی قرپۆکی مناڵی دوو قرپۆك، ئەوەی هەڵیدەبژێری پاکە و خاوێن، سەرەوەت لەئاودایە و خوارەوە لەگەڵ، نەرێگە لەئاوخۆر دەگریت و نە ئاو قوڕاوی دەکەیت.))

هەروەها دەڵێت:

((و المبذرات زرعا، و الحاصدات حصدا، و الذاریات قمحا و الطاحنات طحنا، و الخابزات خبزا، و الثاردات ثردا، و اللاقمات لقما، اهالة و سمنا. لقد فضلتم علی اهل الوبر، و ما سبقكم اهل المدر، ریفكم فامنعوه، و المعتر فاووه و الباغی فناووه.

واتاکەی: تۆچێنەرە وەرزێرەکان، دروێنەکەرانی دروێنەکەر، بووجاڕانی گەنم بەبادەر، ئاشەوانە هاڕەڕەکان، نانەوا نان کەرەکان، تریتکەران، پاروو گرانی پاروو، لەچەوری تواوە و ڕۆن، ئێوەیان پێش خێوەت نشینەکان خستووە و شارنشینەکانیان پێش ئێوە نەخستووە، بەرگری لەگوندەکەی خۆتان بکەن و پەنای هەژاران بدەن و لەگەڵ ستەمگەر دوژمن بن.))

دەڵێت: ژنێك لەمناڵەکانی حەنیفە بەناوی دایکی هەیسەم هات و وتی: دارخورماکانی ئێمە بەرزە و چاڵەکانمان قووڵە، بۆ دارخورما و چاڵەکانی ئێمە دۆعا بکە بەهەمان شێوە کە محەممەد بۆ خەڵکی هەزمان دۆعاری کرد.

موسەیلەمە وتی: نەهار، ئەم ژنە دەڵێت چی؟

نەهار وتی: خەڵکی هەزمان ڕۆشتنە لای محەممەد و لەقووڵی چاڵەکان و بەرزی دارخورماکانیان سکاڵایان کرد. محەممەد بۆیان پاڕایەوە و ئاو لەچاڵەکان هەڵقوڵی و دارخورماکان سەریان شۆڕ کرد و لقەکانیان کەوتە سەرزەوی و لەوێوە بڕان و دارخورما بچووکەکان بەریان گرت.

موسەیلەمە وتی: سەبارەت بەچاڵەکانی چی کرد؟

وتی: داوای سەتڵێك ئاوی کرد و دۆعای بەسەردا خوێند. دواتر شتێکی خستە دەمی، تامی کرد و ڕۆی کردە ناو سەتڵەکە. سەتڵەکەیان بردو ڕشتیانە ناو چاڵەکە و دارخورماکانی خۆیان پێ ئاودا و دارەکان بەو شێوە گۆران کەباسم کرد.

کاتێك موسەیلەمە ئەمەی بیست، داوای سەتڵێك ئاوی کرد و دۆعای بەسەردا

خوێند. دواتر شتێکی خستە دەمی و تامی کرد و ڕۆی کردە ناو سەتڵەکە. سەتڵەکەیان برد و ڕشتیانە ناو چاڵاوەکەی خۆیان، ئاوی چاڵەکان و دارخورماکان وشکیان کرد و دوای کوژرانی موسەیلمە بابەتەکە لای خەڵکان ئاشکرا بوو.

ئەهار بەموسەیلەمەی وت: بەرەکەت بەمناڵەکانی حەنیفە ببەخشە.

وتی: بەرەکەت چییە؟

وتی: خەڵکی حیجاز کاتێک مناڵێکیان دەبوو، دەیانبردە لای پێغەمبەر(د.خ)، ئەو، پەنجەی دەخستە ناو دەمیان و دەستی بەسەر سەریاندا دەهێنا.

بەڵام هەر مناڵێکیان بردە لای موسەیلەمە، پەنجەی خستە دەمی و دەستی بەسەریدا هێنا، لەکۆتاییەدا مناڵەکە بێ تووک و زمانی دەگیرا. ئەم ڕووداوەیان دوای کوژرانی موسەیلەمە ئاشکرا کرد.

بەموسەیلەمەیان وت: بڕۆ ناو باخی خەڵکان و نوێژی لێ بخوێنە بەهەمان شێوەی پێغەمبەر(د.خ). ئەو، ڕۆشتە ناو یەکێک لەباخەکانی یەمامە و ئەهار بەخاوەن باخەکەی وت: بۆ ئاوی دەستنوێژی رەحمان بەباخەکەی خۆت ئادەیت تا تێراو بێت و بەرهەمی زیاد بکات بەهەمان شێوە کەمناڵەکانی مەهرییە یەکێک لەبنەماڵەکانی حەنیفە ئەو کارەیان کرد.

یەکێک لەمناڵەکانی مەهریە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئاوی دەستنوێژی ئەوی هەڵگرت و هێنای بۆ یەمامە و ڕشتییە ناو چاڵەکەی خۆی. بەئاوی چاڵەکە زەوی ئاودا. ئەو زەوییە پێشتر بیابانێکی بێ بەرهەم بوو بەڵام دوای ئەو کارە بەردەوام تێراو و سەرسەوزە.

موسەیلەمە ئەو کارەی کرد بەڵام ئەو زەوییە بایر و هیچی لێ نەڕوا.

جارێک پیاوێك ڕۆشتە لای و وتی: بۆ زەوییەکەی من دۆعا بکە چوونکە سوێرەڵانە بەهەمان شێوە کە محەممەد بۆ زەوی سەلما دۆعای کرد.

موسەیلەمە وتی: ئەهار ئەمە چی دەڵێت؟

وتی: سەلما ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، زەوییەکەی سوێرەڵان بوو. پێغەمبەر(د.خ) دۆعای بۆ کرد و سەتەڵێك ئاوی پێدا و تفی دەمی خۆی تێکرد و کاتێك ئاوەکەی ڕشتە ناو چاڵاوەکەی خۆی و زەوییەکەی ئاودا، زەوییەکەی گۆڕا.

موسەیلەمە ئەو کارەی کرد و پیاوەکە ڕۆشت و ئاوی کردە ناو چاڵاوەکەی.

زەوییەکەی ئاودا وەهەرگیز وشك نەبوویەوە و بەرهەمی نەدا.

جارێك ژنێك ڕۆشتە لای موسەیلەمە و ئەوی برد بۆ باخی دارخورماکەی خۆی تا دۆعای بۆ بکات. لەڕۆژی شەڕی عەقربە هەموو لقی دارخورماکان وشکی کرد.

خەڵکی شوێنکەوتەی موسەیلەمە ئەمانەیان دەزانی بەڵام بەدبەختی بەسەر ئەواندا زاڵ ببوو.

عومەیر کوڕی تەڵحەی نەمری دەڵێت: باوکم لەیەمامە بوو، وتبووی: موسەیلەمە لەکوێیە؟

وتبوویان: بڵێ پێغەمبەری خوا.

وتبووی: نا، تا ئەو کاتەی دەیبینم.

کاتێك ڕۆشتە لای وتی: تۆ موسەیلەمەییت؟

وتبووی: بەڵێ.

وتبووی: کێ دێتە لای تۆ؟

وتبووی: ڕەحمان.

وتبووی: لەنووردا یا لەتاریکی؟

وتبووی: لەتاریکی.

وتبووی: شایەتی دەدەم تۆ درۆزن و محەممەد نێردراوی خواوەندە بەڵام درۆزنی ڕەبیعەم زیار لەراستگۆی موزێر خۆش دەوێت.

دەڵێت: باوکم لەشەڕی عەقربا لەگەڵ موسەیلەمە کوژرا.

کەلبیش ئەم گێڕانەوەیە باس دەکات بەڵام ڕستەی کۆتایی بەمشێوەیە: درۆزنی ڕەبیعەم زیاتر لەراستگۆی موزێر خۆش دەوێت.

عوبەید کوڕی عومەیر دەڵێت: کاتێك موسەیلەمە لەنزیك بوونەوەی خالید ئاگادار بوویەوە، لەعقربا ئوردوی لێدا و داوای هاوکاری خەڵکانی کرد. خەڵکان لەدەروی کۆبوونەوە. موجاعە کوڕی مەرارە لەگەڵ دەستەیەك ڕۆشتەدەر تا تۆڵە لەمناڵەکانی عامر و تەمیم بستێنێت چوونکە دەترسا ئەم دەرفەتەی لەدەست بڕوات. تۆڵەکەیان تایبەت بوو بەخەولە کچی جەعفەر لەبەر ئەوەی لای ئەوان بوو و ڕێگەیان نەدا بیبینن. تۆڵەی ئەو لەمناڵەکانی تەمیم لەبەر ئەو وشترانە بوو کەلەوانیانە سەندبوو.

خالید کوڕی وەلید شورەحبیل کوڕی حەسەنەی پەیوەستی سوپاکەی خۆی کرد و سەرکردایەتی پێشەنگی سوپاکەی بە خالید کوڕی فلانی مەخزومی سپارد و باوکی

حوزەیفەی کردە سەرکردەی باڵەکانی سوپاکەی.

موسەیلەمەیش دوو باڵی سوپاکەی خۆی بەمەحکەم و ڕەجاڵ سپارد.

خالید لەگەڵ شورەحبیل هات و کاتێك گەیشتنە دووری یەك مەنزڵ لەئوردووگاکەی موسەیلەمە، سوپاکەی ئەو، هێرشیان کردە سەر دەستەیەکی خەوتوو. بەوتەیەك چل کەس و بەوتەیەك شەست کەس بوون. ئەوان شەڕکەرانی موجاعە بوون. خەویان لێکەوتبوو چوونکە لەسەرزەمینی مناڵەکانی عامر گەڕابوونەوە و خەولە کچی جەعفەریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. شەوانە لەیەمامە نزیك کەوتنەوە و سوپاکەی خالید کاتێك ئەوانیان گرت کەجڵەوی ئەسپەکانیان لەژێر سەردابوو و لەهاتنی سوپای موسوڵمانان ئاگادار نەبوون. کاتێك ئەوانیان لەخەو هەستان، پرسیان: ئێوە کێن؟

وتیان: ئەوە موجاعەیە و ئەوە حەنیفە.

وتیان: خوا بتانکوژێت.

ئەمەیان وت و ئەوانیان بەستەوە. چاوەڕێ بوون تا خالید هات و هەموویانیان بردە لای ئەو. خالید گومانی کرد ئەوان بۆ پێشوازی هاتوون تا قسەی لەگەڵ بکەن، وتی: کەی لەهاتنی ئێمە ئاگادار بوونەوە؟

وتیان: لەهاتنی تۆ بێ ئاگا بووین، هاتبووین تۆڵەی خۆمان لەمناڵەکانی عامر و تەمیم بستێنینەوە. ئەگەر هەستیان بەگومانەکەی خالید دەکرد، بەشێوەیەکی دیکە وەڵامیان دەدایەوە.

خالید فەرمانی کوشتنی هەموویانی دەرکرد و هەموویان لەبەردەم موجاعە کوڕی مەرارە گیانیان سپارد و وتیان: ئەگەر بۆ خەڵکانی یەمامە خێر یا شەڕت دەوێت ئەوە مەکوژە.

خالید هەموویان کوشت و موجاعەی بەئەسیری هێشتەوە.

باوکی هورەیرە دەڵێت: ئەبوبەکر ڕەجاڵی بانگ و ڕاسپاردەکانی خۆی پێ وت و ئەوی بۆ لای خەڵکانی یەمامە نارد و گومانی کرد ئەو پیاوێکی ڕاستگۆیە. بەداواکارییەکەی ئەبوبەکر ڕازی بوو.

دەڵێت: من و پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ دەستەیەك کە ڕەجاڵ کوڕی عەنفوە لەناویاندا دەبینرا، دانیشتبووین. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: لەنێوان ئێوە کەسێك دانیشتووە کەددانەکانی لەجەهەننەم لەئۆحۆد گەورەترە. هەموو ئامادەبووانی ئەو دانیشتنە مردن و

من و ڕەجاڵ ماینەوە. لەسەرئەنجامی خۆم دەترسام تا ئەو کاتەی ڕەجاڵ لەگەڵ موسەیلەمە یەکی گرت و شایەتی بۆ پێغەمبەرایەتی ئەودا و فیتنەکەی لەفیتنەی موسەیلەمە گەورەتر بوو. ئەبوبەکر خالیدی بۆ لەناو بردنی ئەوان ڕەوانە کرد. خالید ڕۆشت تا گەیشتە بەرزاییەکانی یەمامە. موجاعە کوڕی مەرارە سەرکردەی مناڵەکانی حەنیفە ڕووبەڕوویان بوونەوە و دەیانویست بۆ تۆڵە سەندنەوە هێرش بکەنە سەر مناڵەکانی عامر. دەستەی مواجە بیست و سێ سوار وپیادە بوون. شەو خەوتبوون و خالید لەکاتی خەو هێرشی کردە سەریان و وتی: کەی لەهاتنی ئێمە ئاگادار بوونەوە؟

وتیان: لەهاتنی ئێوە بێ ئاگا بووین، ئێمە بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لەمناڵەکانی عامر هاتووین.

خالید فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد و موجاعەی هێشتەوە. دواتر بەرەو یەمامە بەڕێکەوت و موسەیلەمە و مناڵەکانی حەنیفە لەهاتنی ئەو ئاگادار بیوونەوە و لەعقربا ئوردوویان لێدابوو. عقربا لەنزیک یەمامە و گوندەکان لەپشت سەری ئاباوەڕانەوە بوو.

لەعقربا، شورەحبیل کوڕی حەسەنە وتی: ئەی مناڵەکانی حەنیفە، ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەت و جوامێرییە، ئەگەر ئەمڕۆ شکست بخۆن، ژنەکانتان ئەسیر وبێ مارە کردن لەگەڵیان دەخەون، بۆ پاراستنی کەسەکانی خۆتان بجەنگن و ژنەکانی خۆتان بپارێزن. لەعقربا شەڕیان کرد.

ئاڵای موهاجیرەکان لەدەستی سالم موالی ئەبی حوزەیفەدا بوو، پێیان وت: لەتۆ دەترسین؟

وتی: کەواتە حافزێکی (ئەوەی قورئانی لەبەرە) خراپم.

ئاڵای ئەنسار لەدەستی سابت کوڕی قەیس و هۆزەکانی عەرەب هەرکام ئاڵایەکیان بوو.

موجاعە ئەسیر و لەخێوەتەکەی دایکی تەمیمدا بوو، موسوڵمانان هێرشیان برد و کەسانێك لەمناڵەکانی حەنیفە هاتنە ناو خێوەتەکەی دایکی تەمیم و مەبەستی کوشتنی ئەویان کرد بەڵام موجاعە ڕێگەی ئەو کارەی گرت و وتی: من پەنام داوە چوونکە ژنێکی ئازادەیە. ڕێگەی نەدا دایکی تەمیم بکوژن.

دوای ئەوە موسوڵمانان گەڕانەوە و هێرشیان برد. مناڵەکانی حەنیفە شکستیان خوارد و مەحکەم کوڕی توفەیل وتی: ئەی مناڵەکانی حەنیفە، بڕۆنە ناو باخەکان، من پارێزگاری لەدواوەی سوپاکە دەکەم. کاژێریك جەنگا و خواوەند کوشتی. ئەو لەسەر

دەستی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر کوژرا.

ناباوەڕان ڕۆشتنە ناو باخەکە و وەحشی موسەیلەمەی کوشت. یەکێك لەئەنسار لەکوشتنی ئەو شەریك بوو.

محەممەد کوڕی ئیسحاق گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە بەم جیاوازییە: بەرەبەیان خالید کوڕی وەلید موجاعە و ئەسیرەکانی دیکەی بانگ کرد و وتی: ئەی منالەکانی حەنیفە چی دەڵێن؟

وتیان: دەڵێین: پێغەمبەرێك لەئێمە و پێغەمبەرێك لەئێوە.

کاتێك ئەمەی بیست، فەرمانی کوشتنی ئەوانی دەرکرد. کاتێك یەکێك لەوان بەناوی ساریە کوڕی عامر لەگەڵ موجاعە مایەوە، ساریە بەخالیدی وت: ئەگەر بۆ ئەم گوندە خێر یا شەڕت دەوێت، ئەم پیاوە، یانی موجاعە مەکوژە.

خالید فەرمانیدا و موجاعەیان بەستەوە و ئەوی بەدایکی تەمیم، هاوسەرەکەی، خۆی سپارد و پێی وت: چاکەی لەگەڵ بکە.

خالید بەرێکەوت و لەنزیك یەمامە لەسەر تەپۆڵکەیەکی ئەزۆر بەرز دابەزی و ئوردووی لێدا. خەڵکانی یەمامە لەگەڵ موسەیلەمە هاتنەدەر و رەجاڵ فەرماندەی پێشەنگەکانیان بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق رەجال بە (ح) بێ نوقتە ناوی هاتووە، دەڵێت: رەحاڵ کوڕی عەنفوە کوڕی نەهشەل یەکێك لەمنالەکانی حەنیفە بوو. موسوڵمان و سورەی بەقەرەی لەبەر و کاتێك گەڕایەوە بۆ یەمامە، شایەتی دا پێغەمبەر(د.خ) موسەیلەمەی لەکارەکەی خۆیدا کردۆتە شەریك. فیتنەی ئەو بۆ خەڵکانی یەمامە لەفیتنەکەی موسەیلەمە گەورەتر بوو.

دەڵێت: موسوڵمانان بەدوای رەحاڵدا دەگەڕان و هیواداربوون بەهۆی موسوڵمانی رەخنە لەکاری خەڵکانی یەمامە دروست بکات بەڵام ئەو وەك فەرماندەی منالەکانی حەنیفە بۆ شەڕی موسوڵمانان هات.

لەو کاتەدا خالید کوڕی وەلید لەسەر تەختەکەی خۆی دانیشتبوو. سەرکردەی خەڵکان و خەڵکان ریزیان بەستبوو. ئەو، لەناو منالەکانی حەنیفە بروسەکەی شمشێری بینی و وتی: ئەی موسوڵمانان، مژدەتان لێ بێت خواوەند شەڕی دوژمنی لەسەر شانی ئێوە لابرد و بەخواستی خوا دووبەرەکی لەناو ئەواندا دروست بوو.

موجاعە لەپشت سەرییەوە بوو، بەجوانی سەیری کرد و وتی: سوێند بەخوا وانییە، ئەوە شمشێری هیندییە و بۆ ئەوەی نەشکێت دەیخەنە بەرخۆر تا نەرم ببێت. قسەکەی ئەو راست بوو.

دەڵێت: کاتێک موسوڵمانان شەڕیان دەستپێکرد، یەکەم کەس رووبەڕوویان بوویەوە، رەحال کوڕی عەنفوە بوو و خواوەند ئەوی کوشت.

باوکی هورەیرە دەڵێت: رۆژێك من و رەحاڵ کوڕی عەنفوە لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبووین. پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەی ئامادەبووان لێرە، لەجەهەننەم دانی یەکێك لەئێوە لەئوحود گەورەترە.

دەڵێت: هەمووی کەسانی ئامادەبوو لەو دانیشتنە مردن و من و رەحاڵ ماینەوە. بەردەوام دەترسام تا ئەوەی بیستم رەحاڵ دژی موسوڵمانان راپەڕیوە و دڵنیا بووم و زانیم ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) باسی کرد، راست و رەوایە.

دەڵێت: موسوڵمانان رووبەڕووی دوژمن بوونەوە. هیچ کات لەبەرابەر عەرەبەکان شەڕێکی ئەوەندە سەختیان نەبینیبوو. منداڵەکانی حەنیفە تا نزیك خالید و موجاعە پێشڕەوییان کرد. خالید لەخێوەتەکەی خۆی هاتەدەر و دەستەیەك لەدوژمنان رۆشتنە ناو خێوەتەکەی. دایکی تەمیم و موجاعە لەناو خێوەتەکەدا بوون. یەکێك لەوان بەشمشێر پەلاماری دایکی تەمیمیدا، موجاعە وتی: وازی لیَ بێنە، من پەنام پێداوە، ئەو ژنێکی ئازادەیە، برۆن و لەگەڵ پیاوەکان شەڕ بکەن. ئەوان خێوەتەکەیان بەشمشێر دڕاند.

موسوڵمانان یەکیان بانگ کرد. سابت کوڕی قەیس وتی: ئەی موسوڵمانان خۆتان لەسەر تەممەڵی راهێناوە، خواوەندا، من لەوەی ئەوان دەیپەرەستن (خەڵکانی یەمامە) بێزارم و لەکردەوەی ئەمانیش (موسوڵمانان) بێزارم. ئەمەی وت و بەشمشێرەکەی خۆی هێرشی کرد تا کوژرا.

کاتێك موسوڵمانان لەشوێنەکانی خۆیان پاشەکشێیان کرد، زەید کوڕی خەتاب وتی: لێرە بۆ کویَ دەڕۆن؟ شەڕی کرد تا کوژرا.

بەراو کوڕی مالك برای ئەنس هەستا. کاتێك بەشداری جەنگی دەکرد، تای لێدەهات و دەبوا پیاوان لەسەر پشتی دانیشن و لەژێر ئەوان بلەرزێت تا جلەکانی خۆی تەڕ دەکات، کاتێك ژەهراوەکەی دەهاتەدەر، هاوشێوەی شێر دەینەڕاند. کاتێك شەڕ گەیشتە ئەم قۆناغە، چەند کەسێك لەسەر پشتی دانیشتن و کاتێك جلەکانی خۆی تەڕ کرد،

هەستا و وتی: ئەی موسوڵمانەکان بۆ کوێ دەڕۆن. من بەرا کوڕی مالکم لەدەوری من کۆببنەوە. دەستەیەك لەوان گەڕانەوە و شەڕیان لەگەڵ دوژمن کرد تا ئەوانیان شکست پێهێنا و تا لای مەحکەم کوڕی توفەیل داوەری یەمامە پێشڕەوییان کرد. مەحکەم کاتێك شەری لەنزیك خۆیەوە بینی، وتی: ئەی منداڵەکانی حەنیفە، سوێند بەخوا ژنەکانی ئێوە بەزۆر دەبەن وبێ ئەوەی مارەیان بکەن، لەگەڵیان دەخەون، هەموو هێزی خۆتان بخەنە کار. ئەمەی وت و پیاوانە شەڕی کرد. عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر تیرێکی بۆ هاویشت و لەقورگی چەقی و کوژرا.

موسوڵمانان هێرشیان برد و دوژمن بۆ لای باخەکە پاشەکشێی کرد. لەبەر ئەمە بەشەڕی باخ ناوی دەبەن. دوژمنی خوا، موسەیلەمەی درۆزن لەوێ بوو. بەرا کوڕی مالك وتی: ئەی موسوڵمانان من بۆ ناو باخەکە هەڵدەن.

وتیان: هەرگیز ئەو کارە ناکەین.؟

بەرا وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا هەڵمەدن.

موسوڵمانان ئەویان گرت و خستیانە سەر دیوارەکە، پەڕییە ناو باخەکە و شەڕی دەستپێکرد تا توانی دەرگا بۆ موسوڵمانان بکاتەوە. موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو باخەکە و موسەیلەمە کوژرا. وەحشی موالی جوبەیر کوڕی موتعیم ئەوی کوشت. یەکێك لەئەنسارییەکان لەکوشتنی ئەو بەشدار بوو. هەرکام زەربەیەکیان لێدا. وەحشی بەزوبینەکەی خۆی و پیاوی ئەنساری بەشمشێر. وەحشی وتی: تەنیا خوا دەزانێت کاممان ئەومان کوشتووە.

عەبدوللە کوڕی عومەر دەڵێت: ئەو ڕۆژە بیستم کەسێك هاواری دەکرد: ئەو کۆیلە ڕەشە موسەیلەمەی کوشت.

عوبەید کوڕی عومەیر دەڵێت: ڕەجاڵ کوڕی عەنفوە لەبەرابەر زەید کوڕی خەتابدا بوو. کاتێك دوو ریزەکە لەیەك نزیك کەوتنەوە، زەید وتی: ڕەجاڵ پەشیمان ببەرەوە چوونکە لەدین هەڵگەڕاویتەوە و دینەکەی ئێمە بۆ ئەم دنیا و ئەو دنیات باشترە.

ڕەجاڵ رازی نەبوو و شەڕیان کرد. ڕەجاڵ کوژراو ئەو کەسانەی شارەزای کارەکانی موسەیلەمە بوون، کوژران. موسوڵمانان یەکتریان هاندا و هەردوولا هێرشیان هێنا. موسوڵمانان پاشەکشێیان کرد تا گەیشتنە ئوردوگای خۆیان و دوژمن گەیشتە ناو ئوردوگاکەیان. تەنانەت خێوەتەکانیان بڕی و دەستی موجاعەیان کردەوە و ویستیان

دایکی تەمیم بکوژن بەڵام موجاعەی پەنای پێدا و وتی: باشترین ژنی ناو ماڵە.

لەم کاتەدا زەید و خالید و باوکی حوزەیفە هانی یەکتریاندا و لەگەڵ خەڵك قسەیان کرد. بایەکی تەپوتۆزاوی هەڵیکرد. زەید وتی: سوێند بەخوا قسە ناکەم تا دوژمن شکست دەدەین یا دەکوژرێم، ئەی خەڵکینە، دانەکانتان لەیەك گیر بکەن و شمشێر بوەشێنن. ئەو کارەیان کرد و دوژمن بەپاشەکشێ ناچار بوو. زەید کوژرا و سابت کوڕی قەیس قسەی کرد و وتی: ئەی موسوڵمانەکان، ئێوە حزبی خوان و ئەوان حزبی شەیتان. رێز و گەورەیی تایبەت بەخوا و پێغەمبەر(د.خ) و حزبەکەی ئەوە. هاوشێوەی من بجەنگن. هێرشی کردە سەر دوژمن.

باوکی حوزەیفە وتی: ئەی شوێنکەوتەکانی قورئان، قورئان بەکردەوەکانی خۆتان برازێننەوە. هێرشی برد و کوژرا.

خالید کوڕی وەلید هێرشی برد و بەپارێزەرانی خۆت وت: لەپشتەوە لێم نەدەن. کاتێك گەیشتە بەرابەر موسەیلەمە، چاوەڕوانی دەرفەتی بوو، موسەیلەمە سەیری دەکرد.

سالم کوڕی عەبدوللە دەڵێت: کاتێك ئەو رۆژە ئاڵاکەیان پێدام، وتم: نازانم بۆ ئاڵاکەتان بەمن سپاردووە، لەوانەیە گومان بکەن حافزی قورئانم، ئەویش وەك ئاڵاداری پێشوو خۆڕاگری دەکات تا دەکوژرێت؟

وتاین: بەڵێ، بزانین چی دەکەیت؟

وتی: خراپترین حافزی قورئان بم ئەگەر خۆڕاگری نەکەم. ئەو کەسەی پێش ئەو ئاڵاکەی هەڵگرت، عەبدوللە کوڕی حەفس کوڕی غانم بوو.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك موجاعە بەمناڵەکانی حەنیفە کەدەیانویست دایکی تەمیم بکوژن، وتی: شەڕ لەگەڵ پیاوەکان بکەن. دەستەیەك لەموسوڵمانان یەکتریان هاندا و گیانی خۆیان بەخشی. هەموویان کوژران. کەسانێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) قسەیان کرد. زەید کوڕی خەتاب وتی: سوێند بەخوا قسە ناکەم تا سەرکەوتن بەدەست دەهێنم یا دەکوژرێم. ئێوەیش وەك من بن. ئەمەی وت و خۆی و هاوەڵانی هێرشیان کردە سەر دوژمن.

سابت کوڕی قەیس وتی: ئەی موسوڵمانەکان بەشێوەیەکی خراپ خۆتان راهێناوە، ئەی موسوڵمانەکان سەیری من بکەن تا چۆنییەتی هێرش کردنتان فێر بکەم.

زەید کوڕی خەتاب لەم شەڕەدا کوژرا.

سالم دەڵێت: کاتێك زەید کوڕی خەتاب لەشەڕی یەمامە کوژرا، عومەر بە عەبدوڵڵەی کوڕی وت: بۆ پێش زەید نەکوژراییت، زەید کوژرا و تۆ زیندوویت؟

عەبدوڵڵە وتی: حەزم دەکرد شەهید بکرێم بەڵام هێشتا تەمەنم ماوە و خواوەند بەشەهید بوون ڕێزی لەو گرت.

سەهل دەڵێت: عومەر بە عەبدوڵڵەی وت: کاتێك زەید کوژرا، تۆ بۆ گەڕایتەوە، بۆ ڕوخساری خۆت لەمن دانەشارد؟

عەبدوڵڵە وتی: زەید داوای شەهید بوونی لەخواوەند کرد و پێی بەخشی. منیش هەوڵمدا و داوام کرد بەڵام خواوەند پێی نەبەخشیم.

عوبەید کوڕی عومەیر دەڵێت: لەشەڕی یەمامە موهاجیرەکان و ئەنسار سارانشینەکانیان بەترسەنۆك ناوبرد و سارانشینان ئەوانیان بەترسەنۆك لەقەڵەم نەدا. وتیان: ڕیزەکانی خۆتان جیابکەنەوە چوونکە لەمەلاّتن شەرم دەکەین و بزانین کێ گوڕەپان بەجێدێڵێت. ئەو کارەیان کرد.

خەڵکانی حەزەری وتیان: ئەی خەڵکانی سارا نشین، ئێمە شێوازی جەنگی حەزەرییەکان باشتر لەئێوە دەزانین.

سارانشینەکان وتیان: حەزەرییەکان ناتوانن بجەنگن و نازانن جەنگ چییە، ئەگەر ڕیزەکانی خۆتان جیابکەنەوە دەزانن لەکوێوە زیانمان پێدەگات.

کاتێك ڕیزەکانیان جیاکردەوە، شەڕێکی قورستر و مەترسیدارتر لەشەڕی ئەو ڕۆژە نەبینرا و کەس نەیزانی کام دەستەیە بوێری زیاتریان لەخۆیان نیشاندا بەڵام کوژراو و زیانی موهاجیر و ئەنسارەکان لەسارانشینەکان زیاتر بوو.

لەگەرماوگەرمی شەڕەکە عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر تیرێکی لەمەحکەمدا. مەحکەم سەرقاڵی قسە کردن بوو کەتیرەکە لەقوڕگی چەقی وکوژرا. زەید کوڕی خەتاب رەجالْ کوڕی عەنفوەی کوشت.

یەکێك لەمناڵەکانی سوحەیم لەشەڕی یەمامە هاوڕێی خالید کوڕی وەلید بوو، دەڵێت: کاتێ شەڕەکە دژوار و ساتێك لەزیانی موسوڵمانان و ساتێك لەزیانی دوژمن، خالید وتی: ئەی خەڵکینە ڕیزەکان جیابکەنەوە تا بوێری هەردەستەیەکمان بۆ دەرکەوێت و بزانین لەکوێوە زیانمان پێدەگات. خەڵکانی حەزەری و سارانشین و هۆزەکانی دیکە ڕیزەکانی خۆیان جیاکردەوە. هەردەستەیەك ئاڵای خۆی بەرز کردەوە و

شەڕیان دەسپێکرد.

سارانشینەکان وتیان: ئێستا لاواز و زەلیلەکان زیاتریان لێ دەکوژرێت. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانی حەزەر کوژرا و موسەیلەمە خۆڕاگری کرد. ناباوەڕان لەدەوری ئەو پەپکەیان خواردبوو. خالید زانی تا ئەو کاتەی موسەیلەمە زیندوو بێت، شەر درێژە دەکێشێت. منداڵەکانی حەنیفە لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر بوو، لەکوژران نەدەترسان.

لەبەر ئەمە خالید خۆی ڕۆشتەپێش. لەبەردەم ریزەکانی دوژمن وەستا و داوای شەڕکەری کرد. ناوی خوای هێنایە سەرزمان و وتی: من کوڕی وەلید ئەلعودم، من کوڕی عامر و زەیدم. دروشمی موسوڵمانەکانی (یا محەممەد)ی هێنایە سەرزمان و بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد. هەرکەس رووبەرووی بوویەوە، کوژرا.

خالید هۆنراوەی دەخوێند و دەیوت: من کوڕی شێخەکانم و شمشێرێکی تیژم لەدەستایە. هەرکەس رووبەرووی بوویەوە، کەوتە سەرزەوی. موسوڵمانەکان ورەیان بەرز بوویەوە و سەرقاڵی کوشتار دوژمن بوون بەشێوەیەك خالید لەموسەیلەمە نزیك کەوتەوە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووبووی: موسەیلەمە شەیتانێکی هەیە و بەردەوام گوێڕایەڵی فەرمانەکانییەتی. کاتێك شەیتانەکەی بەسەریدا زاڵ بێت، کەف دەکەوێتە سەر لێوی و سووچی لێوەکانی دەلەرێتەوە و هەر کاتێك مەبەستی ئەنجامدانی کارێکی چاکە بکات، شەیتانەکەی رێگەی لێدەگرێت. هەرکاتێك ئەوتان بینی، بیکوژن.

کاتێك خالید لەموسەیلەمە نزیك کەوتەوە، بینی خۆڕاگر و کافرەکان دەوریان گرتووە. خالید زانی تا موسەیلەمە نەکوژرێت، شەڕ بەردەوامە. موسەیلەمەی بانگ کرد بەشێوەیەك لەبەردەستیا بوو، کاتێك موسەیلەمە هات، پێشنیاری پێکرد و وتی: ئەگەر نیوەی زەوی بەتۆ بدەین، کام نیوەی دەدەی بەئێمە.؟ کاتێك موسەیلەمە دەیویست قسەبکات، ئاوڕی دەدایەوە و بۆچوونی شەیتانەکەی وەردەگرت. جارێك کەئاوڕی دایەوە، خالید پەلاماریدا بەڵام هەڵات. شکست لەناو دوژمندا بڵاو بوویەوە و خالید کەسانی بۆ شەڕ هاندەدا و دیوت: ئەمانیان نەدەن. موسوڵمانان بەگوڕ و تینێکی ترەوە هێرشیان برد.

کاتێك خەڵك لەدەوری موسەیلەمە هەڵاتن، کەسانێك پێیان وت: بەڵێنەکانت چییان بەسەر هات؟

وتی: بەرگری لەکەسەکانی خۆتان بکەن.

دەڵێت: دواتر بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی منداڵەکانی حەنیفە رووبکەنە باخەکە. وەحشی خۆی پێگەیاند. کەف کەوتبووە سەر لێوی و لەتوڕەییدا ئاگای لەخۆی نەبوو. زوبینەکەی بۆ هاویشت و لەپێ کەوت. موسوڵمانەکان ڕژانە سەر دەرگا و دیواری باخەکە. لەگۆڕەپان و لەباخەکەدا نزیکەی دەهەزار کەس کوژرا.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان ریزەکانی خۆیان جیاکردەوە و خۆڕاگریان کرد، منداڵەکانی حەنیفە پاشەکشێ و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن. دوژمنیان کوشتار و تا نزیك باخی مەرگ ڕاویان نان.

دەڵێت: سەبارەت بەکوشتنی موسەیلەمە لەناو باخەکەدا کێشەیان بۆ دروست بوو. کەسانێك وتیان: ئەو لەباخەکەدا کوژرا، دوژمنان پەنایان بۆ باخەکە برد و موسوڵمانان چواردەروی باخەکەیان گرت. بەرا کوڕی مالك هاواری کرد ئەی موسوڵمانان بمخەنە سەر دیواری باخەکە. ئەو کارەیان کرد و کاتێك سەیری ناو باخەکەی کرد، ترسا و لەرز دایگرت و وتی: دامگرن. جارێکی دیکە وتی: بمخەنە سەر دیوارەکە. دواتر وتی: ئەی هاوار. لەبەر ئەوەی شوێنێکی مەترسیدار بوو. دووبارە وتی: بمخەنە سەر دیوارەکە. کاتێك ڕۆشتە سەردیواری باخەکە بەدوای دەرگای باخەکە گەڕا. لەبەردەرگاکە هێرشی کردە سەردوژمن. موسوڵمانان دەرگای باخەکەیان کردەوە و ڕۆشتنە ناو باخەکە. دواتر دەرگاکەیان داخست و کلیلەکەیان فڕێدا. شەڕێکی مەترسیداریان دەستپێکرد کەهاوشێوەی نەبینراوە. هەموو کافرەکان لەناو باخەکەدا کوژران. موسەیلەمە کوژرا. منداڵەکانی حەنیف بەموسەیلەمەیان وتبوو: بەڵێنەکانی تۆ چییان بەسەر هات؟

موسەیلەمە وتی: بەرگری لەکەسەکانی خۆتان بکەن.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێ وتیان کۆیلە ڕەشەکە موسەیلەمەی کوشت، خالید موجاعەی لەگەڵ خۆی هێنا تا موسەیلەمە و سەرکردەکانی دوژمنی نیشان بدات. کاتێك لای ڕەجاڵ تێپەڕی، نیشانیدا.

دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان موسەیلەمەیان کوشت و خالیدیان ئاگادار کردەوە، ئەو، لەگەڵ موجاعەی دەستبەستراو ڕۆشت تا موسەیلەمەی نیشان بدات. موجاعە کوژراوەکانی نیشانی خالید دەدا تا گەیشتە مەحکەم کوڕی توفەیل کەپیاوێکی چوارشانە و قۆز بوو. کاتێك خالید ئەوی بینی، وتی: ئەمە موسەیلەمەیە.

موجاعە وتی: نا، بەڵام سوێند بەخوا باشتر و ڕێزدارتر لەموسەیلەمەیە. ئەمە داوەری

یەمامەیە.

دەڵێت: کوژراوەکانی نیشانی خالید دەدا تا ڕۆشتە ناو باخەکە. کوژراوەکانیان ژێرورو کرد. کورتە باڵایەکی ڕەنگ زەردی لووت قنجی بینی و موجاعە وتی: ئەمە پکەبەرەکەی ئێوەیە و لەدەستی ڕزگارتان بوو.

خالید وتی: ئەمە بوو ئەو کارانەی دەکرد.

موجاعە وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا خەڵکان بەپەلە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێوە هاتن و زۆربەیان لەقەڵاکاندا ماونەتەوە.

خالید وتی: دەڵێی چی؟

وتی: ئەمە واقیعە. با بەنوێنەرایەتی خەڵکەکەی خۆم لەگەڵ تۆ پەیمانی ئاشتی ببەستم.

زوحاک دەڵێت: یەکێك لەمناڵەکانی عامر کوڕی حەنیفە بەناوی ئەغلەب کوڕی عامر لەهەموو خەڵکان مل ئەستوورتر بوو. لەڕۆژی یەمامە کاتێك ناباوەڕان شکستیان خوارد و موسوڵمانان گەمارۆیان خستنەسەر، خۆڕاگری کرد. کاتێك موسوڵمانان کوژراوەکانیان دەپشکنی، یەکێك لەئەنسار بەنازناوی باوکی بەسیرە لەگەڵ چەند کەسێك لای ئەو گوزەریان کرد. کاتێك باوکی ئەغلەبیان لەناو کوژراوەکاندا بینی، گومانیان کرد کوژراوە. وتیان: ئەی باوکی بەسیر، گومانت کردووە و گومان دەکەیت، شمشێرەکەت زۆر تیژە، ئێستا گەردنی ئەغلەب بپەڕێنە، ئەگەر ئەو کارەی کرد، ئەوەی سەبارەت بەشمشێرەکەت باسی دەکەیت، ڕاستە.

باوکی بەسیر کاتێك ئەم قسەی بیست، شمشێری دەرکێشا و ڕووی کردە ئەغلەب چوونکە گومانیان دەکرد مردووە. کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، ئەغلەب لەشوێنەکەی خۆی بەرز بوویەوە و بەڕێکەوت. باوکی بەسیر شوێنی کەوت و دەیوت: من باوکی بەسیری ئەنساریم. ئەغلەب ڕۆشت و دوورییەکی زۆر لەباوکی بەسیر دوورکەوتەوە. باوکی بەسیر هەرکاتێك ئەو قسەی دەهێنایە سەرزمان، ئەغلەب پێی دەوت: ڕاکردنی برا کافرەکەی خۆتت پێ چۆنە. لێی دوورکەوتەوە.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك خالید لەموسەیلەمە و سوپاکەی کۆتایی هات، عەبدوڵڵە کوڕی عومەر و عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبی بەکر پێیان وت: لەگەڵ سوپاکە دەڕۆین و لەنزیك قەڵاکان دادەبەزین.

خالید وتی: با سوارەکان بنێرم تا ئەوانەی لەدەرەوەی قەڵاکانن کۆبکەمەوە. دواتر

سەبارەت بەقەڵاکان بڕیار دەدەم.

خالید سوارەکانی نارد و ئەوەی ماڵ و ژن و منداڵیان بینی، کۆیان کردەوە و لەئۆردووگا دایاننان. دوای ئەوە فەرمانی بەڕێکەوتنیدا تا لەنزیک قەڵاکان دابەزێت. موجاعە وتی: سوێند بەخوا خەڵکان بەپەلە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تۆ هاتوون و ناو قەڵاکان لێوانلێوە لەپیاوە شەڕکەرەکان، با سەبارەت بەپاشماوەی ئەوان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تۆ ببەستم.

لەگەڵ خالید پەیمانی ئاشتی بەست کەدەست بەسەر سامانەکاندا بگرن بەڵام کەس نەکوژن. موجاعە وتی: دەڕۆم و لەگەڵ خەڵکەکەم ڕاوێژ دەکەم و دواتر بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە.

ئەمەی وت و بەرەو قەڵاکان بەڕێکەوت کەجگە لەپیر و پەککەوتە و ژن و منداڵ کەسی تیا نەمابوو. ژنانی چەکدار کرد و فەرمانی پێدان قژی خۆیان بشارنەوە و لەسەرەوەی قەڵاکانەوە خۆیان نیشانی سوپای موسوڵمانان بدەن تا دەگەڕێتەوە.

گەڕایەوە بۆ لای خالید و وتی: بەئاشتییەکەی من ڕازی نەبوون و دەستەیەك لەوان بۆچوونەکەی منیان پەسەند نەکرد و ڕۆشتوونەتە سەر دیواری قەڵاکان. کاری ئەوان پەیوەندی بەمنەوە نییە.

خالید سەیری قەڵاکانی کرد و لەبەر زۆری خەڵکان، ڕەش بەرچاو دەکەوت. موسوڵمانان لەشەڕ هیلاك وبێزار و ماوەیەکی زۆر بەسەر مانەوەی ئەوان تێدەپەڕی و دەیانخواست تەندروست و سەرکەوتوو بگەڕێنەوە. نەیاندەزانی ئەگەر پیاوە شەڕکەرەکانی ناو قەڵاکان شەڕ دەسپێبکەن، دەرئەنجامیان بەکوێ دەگات. لەموهاجیر و ئەنسار و دانیشتوانی مەدینە شەشسەد کەس کوژرا بوو، سێسەد کەسیان لەموهاجیر و ئەوانی دیکە لەئەنسار و شوێنکەوتەکان.

دەڵێت: لەڕۆژی یەمامە، سابت کوڕی قەیس کوژرا. بەشمشێری یەکێك لەناباوەڕان مرد. قاچی قرتابوو. قاچە قرتاوەکەی هەڵگرت و کێشای بەبکوژەکەی خۆیدا و ئەویشی کوشت.

لەمناڵەکانی حەنیفە لەدەشتی عقربا حەوت هەزار کەس و لەناو باخەکەیشدا حەوت هەزار کەس کوژرا.

زەرار کوڕی ئەزوەر سەبارەت بەڕۆژی شەڕی یەمامە هۆنراویەکی هۆنییەوە بەم

ناوەڕۆکە:

((ئەگەر لەبای باشوور بپرسن باسی ڕۆژی عقربا و مەلهەم دەکات

ئەو کاتەی خوێن لەدۆڵەکەدا ڕەوان بوو

و بەردەکان بەخوێنی خەڵکان سوور

لەو کاتەدا تیر ورم کەڵکی نەبوو

تەنیا شمشێری دەوری دەبینی

ئەگەر کافرەکان بەرێگەیەکی دیکەدا بڕۆن

من موسوڵمان و شوێنکەوتەی دینم

جیهاد دەکەم چوونکە جیهاد باشترین دەرفەتە و

خواوەند باشتر ئاگای لەدڵی پیاوی تێکۆشەر هەیە.))

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك موجاعە بەخالیدی وت سەبارەت بەخەڵکەکەی خۆم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تۆ دەبەستم، شەڕ ئەوی بێزار و هیلاك کردبوو، ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەی موسوڵمانان کوژرا بوون و خوازیار بوو پەیمانی ئاشتی ببەستێت. لەگەڵ موجاعە پەیمانی بەست تا زێڕ و زیو و سیلاح وەربگرێت و نیوەی ئەسیرەکان لەگەڵ خۆی ببات. موجاعە وتی: دەڕۆمە لای خەڵکەکەی خۆم و ڕاوێژیان لەگەڵ دەکەم.

ئەمەی وت و ڕۆشت. بەژنانی وت: سیلاح هەڵگرن و بڕۆنە سەر دیوارەکان. ژنان ئەو کارەیان کرد و موجاعە بۆ لای خالید گەڕایەوە و وتی: بەپەیمانی ئاشتی ڕازی نەبوون. ئەگەر دەخوازێت کارێك بکە تا ڕازییان بکەم.

خالید وتی: چی بکەم؟

موجاعە وتی: یەك لەسەر چوار ئەسیرەکان بەجێبێڵیت و تەنیا یەك لەسەر چواریان ببەیت.

خالید وتی: بەو مەرجە پەیمانی ئاشتیت لەگەڵ دەبەستم.

کاتێك پەیمانی ئاشتی مۆر کرا و دەرگای قەڵاکانیان کردەوە، جگە لەژن و مناڵ کەسی تیا نەبوو.

خالید بەموجاعەی وت: فریوتدام.

موجاعە وتی: ئەوان خەڵکەکەی منن، دەمتوانی چی بکەم.

سەهل کوڕی یوسف دەڵێت: دوای شەڕی یەمامە موجاعە بەخالیدی وت: ئەگەر دەخوازیت نیوەی ئەسیرەکان لەگەڵ هەموو زێڕ و زیو و سیلاحەکان هەڵبگریت، ڕازی

دەبم بەوەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تۆ ببەستم.

دەڵێت: خالید رازی بوو و بریاردرا زێڕ و زیو و نیوەی ئەسیرەکان وەربگرێت لەگەڵ یەك باخ لەهەر گوندێك بەهەڵبژاردنی خالید و یەك زەوی کشتوکاڵی بەهەڵبژاردنی خۆی، بەپێی ئەم بەندانە پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد. خالید ئازادی کرد و وتی: تا سێ ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە، ئەگەر رازی نەبوون، هێرش دەکەمە سەرتان و جگە لەکوشتار هیچ نامێنێتەوە و بەهیچ شتێك رازی نابم.

موجاعە بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و وتی: بەپەیمانی ئاشتی رازی بن. بەڵام سەلمە کوڕی عومەیری حەنەفی وتی: سوێند بەخوا رازی نابین، خەڵکی گوندەکان و کۆیلەکانی خۆمان کۆدەکەینەوە و دەجەنگین. پەیمانی ئاشتی لەگەڵ کەس نابەستین چوونکە قەڵاکان تۆکمە و بەهێزن و خواردن و توێشووی فراوانمان هەیە و جیاواز لەوە، زستان بەرێوەیە.

موجاعە وتی: تۆ پیاوێکی شوومیت و لەوەی توانیوومە دوژمن فریو بدەم و پەیمانی ئاشتی مۆر بکەم، لەخۆت بایی بوویت، مەگەر کەس ماوە بتوانین پشتی پێ ببەستین بۆ ئەوەی بەرگریمان لێ بکات؟ بۆیە ئەم کارەم کرد، بۆ ئەوەی وەك چۆن شورەحبیل باسی کردووە، لەناو نەچین.

موجاعە لەگەڵ شەش کەس گەڕایەوە بۆ لای خالید و وتی: بەبەدبەختی توانیم رازییان بکەم، پەیمانی ئاشتی بنووسە.

دەڵێت: پەیمانی ئاشتییان بەمشێوەیە نووسی:

((ئەمە مەرجەکانی ئاشتییە لەنێوان خالید کوڕی وەلید و سەلمە کوڕی عومەیر و فلان و فلان. بریاردرا زێڕ و زیو و یەك نیوەی ئەسیر و سیلاح و چوارپێ وەربگرێت و لەهەرگوندێك باخێك و زەوییەکی کوشتوکاڵی بەو مەرجەی باوەڕ بەئیسلام بێنن و کاتێك باوەڕیان هێنا، لەئەمانی خوادا دەبن، خالید کوڕی وەلید و ئەبوبەکر و هەموو موسوڵمانان پێبەندی وەفا بەپەیمانەکە دەبن.))

باوکی هورەیرە دەڵێت: کاتێك موجاعە لەگەڵ خالید پەیمانی ئاشتی واژۆ کرد، بەندەکانی ئاشتی ئەوە بوو کەخالید هەموو زێڕ و زیو و سیلاحەکان وەربگرێت و لەهەر ناوچەیەك باخێك هەڵبژێرێت و نیوەی ئەسیرەکان لەگەڵ خۆی ببات بەڵام خەڵك رازی نەبوون. خالید وتی: تا سێ ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە.

دەڵێت: سەلمە کوڕی عومەیر وتی: ئەی منداڵەکانی حەنیفە، بۆ پاراستی کەسەکانی خۆتان بجەنگن و بەئاشتی رازی مەبن، قەڵاکەمان بەهێز و توێشووی زۆرمان هەیە و زستان بەڕێوەیە.

بەڵام موجاعە وتی: ئەی منداڵەکانی حەنیفە، گوێ لەوتەکانی سەلمە مەگرن چوونکە پیاوێکی شوومە و ملکەچی فەرمانەکانی من بن چوونکە دوای ئەو بەڵای شورەحبیل کوڕی حەسەنە وتی بەسەر ئێوەدا دەبارێت و ژنەکانتان بەئەسیری دەبەن و بێ ئەوەی مارەیان بکەن، لەگەڵیان دەخەون. خەڵکان گوێیان لەقسەکەیان گرت و بەوتەکانی سەلمە رازی نەبوون و ملکەچی خۆیان بۆ پەیمانی ئاشتی نیشاندا.

ئەبوبەکر بەسەلامە کوڕی وەقش نامەیەکی بۆ خالید کوڕی وەلید نارد و فەرمانی پێدەدا، ئەگەر خواوەند بەسەر منداڵەکانی حەنیفە سەرکەوتنی پێبەخشی، هەموو نێرینە باڵغەکان بکوژێت. سەلامە کاتێك نامەکەی ئەبوبەکری هێنا کەخالید پەیمانی ئاشتی مۆر کردبوو. منداڵەکانی حەنیفە بۆ بەیعەت و دەربڕینی بێزاری لەکردەوەکانی خۆیان ڕۆشتنە ئوردووگاکەی خالید. کاتێك کۆبوونەوە سەلمە کوڕی عومەیر بەموجاعەی وت: داوای مۆڵەت لەخالید بکە تا سەبارەت بەداواکارییەکەی خۆم قسە بکەم. سەلمە دەیویست بەشێوەیەکی لەناکاو خالید بکوژێت.

کاتێك موجاعە لەگەڵ خالید قسەی کرد، مۆڵەتی پێدا. سەلمە کوڕی عومەیر شمشێر بەدەست هات تا مەبەستەکەی خۆی ئەنجام بدات، خالید پرسی: ئەوە کێیە دێت؟

موجاعە وتی: ئەو کەسەی سەبارەت بەو قسەم لەگەڵ تۆ کرد و مۆڵەتی هاتنت پێدا.

خالید وتی: رێگەی مەدەن نزیك بکەوێتەوە. سەلمەیان دەرکرد و کاتێك ئەویان پشکنی، شمشێرەکەیان دۆزییەوە. بەنەحلەتیان کرد و بەستییانەوە. وتیان: دەتویست خەڵکەکەی خۆت لەناو ببەیت، سوێند بەخوا دەتویست منداڵەکانی حەنیفە لەناو بچن و ژن و منداڵەکانیان ئەسیر بکرێت، ئەگەر خالید بزانێت شمشێرت پێ بووە، بێ گومان دەتکوژێت. ئەگەری هەیە ئەگەر لەمەبەستەکەی تۆ ئاگادار ببێتەوە، لەسزای کردەوەکەی تۆ هەموو پیاوەکانی منداڵەکانی حەنیفە بکوژێت و ژنان ئەسیر نەکات. چوونکە دەڵێت تۆ بەرەزامەندی و ئاگاداری ئێمە ئەو کارەت کردووە.

ئەویان بەستەوە و لەقەڵاکە رایانگرت. منداڵەکانی حەنیفە دەستە دەستە بۆ دەربڕینی بێزاری لەکردەوەکانی خۆیان و بەیعەت کردن دەڕۆشتنە لای خالید. سەلمە بەڵێنی دا هیچ کارێك نەکات و لێی خۆش بن بەڵام رازی نەبوون چوونکە باوەڕیان پێ نەدەکرد.

شەو، سەلمە لەقەڵاکە هەڵات و ڕۆشتە ناو ئۆردوگاکەی خالید. پاسەوانەکان هاواریان لێکرد و منداڵەکانی حەنیفە نیگەران بوون و شوێنی کەوتن. لەباخێکدا ئەویان گرت. سەلمە بەشمشێر پەلاماریدان و خەڵکانی بەردباران کرد. دواتر شمشێرەکەی بەقوڕگی خۆیدا هێنا و دەمارەکانی خۆی بڕی و کەوتە ناو چاڵێك و مرد.

زوحاك کوڕی یەربوع لەباوکی دەگێڕێتەوە: خالید سەبارەت بەهەموو منداڵەکانی حەنیفە ڕێزی لەپەیمانی ئاشتی گرت جگە لەو کەسانەی لەسەرەتای جەنگ لەعەرز و قورا ئەسیر کرابوون. ئەوانی بۆ لای ئەبوبەکر نارد و دابەش ببوون. ژمارەیان پێنسەد کەس و لەمنداڵەکانی حەنیفە یا قەیس کوڕی سەعلەبە یا تیرەی یەشکر بوون.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خالید بەموجاعەی وت: کچەکەی خۆت بکەرە هاوسەری من.

موجاعە وتی: ئارام بە پیاو، لای ئەبوبەکر گێژاو بۆ خۆت دروست دەکەیت.

خالید وتی: ئەی پیاو، دەڵێم کچەکەی خۆت بکەرە هاوسەری من.

موجاعە بەناچاری بەوتەکەی رازی و کچەکەی کردە هاوسەری خالید. کاتێك ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە، نامەیەکی بۆ نووسی کەبۆنی خوێنی لێدەهات، بەم ناوەرۆکە:

(( بەمەرگی خۆم ئەی کوڕی دایکی خالید، تۆ ئاسوودەیت و لەگەڵ ژنان دەخەویت و ڕووبەڕووی خێوەتەکەی تۆ خوێنی هەزار و دووسەد پیاوی موسوڵمان ڕژاوە کەهێشتا وشك نەبۆتەوە.))

خالید نامەکەی بینی و وتی: سوێند بەخوا ئەمە کاری چەپلەرە. مەبەستی عومەر کوڕی خەتاب بوو.

خالید دەستەیەکی لەمنداڵەکانی حەنیفە بۆ لای ئەبوبەکر نارد. کاتێك ڕۆشتنە لای ئەبوبەکر، پێی وتن: هاوار لەئێوە، کێ بوو ئێوەی گومڕا کرد؟

وتیان: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)، بەسەرهاتەکەی ئێمە دەزانیت. پیاوێکی ناپیرۆز لەعەشیرەیەکی شووم.

ئەبوبەکر وتی: دەزانم، پێشنیاری چی پێدەکردن؟

وتیان: دەیوت: ((یاصفدع نقی نقی، لا الشارب تمنعین و لا الماء تکدرین، لنانصف الارض ولقریش نصف الارض و لکن قریشا قوم یعتدون.

واتاكەی: ئەی قریۆكی پاكی پاك، كە رێگە لەئاوخۆر ناگریت و ئاوەكە قوڕاوی ناكەیت، نیوەی زەوی هی ئێمەیە و نیوەی زەوی تایبەتە بەقورەیش بەڵام قوڕەیشییەكان خەڵكانێكی ستەمگەرن.))

وتی: سبحان الله، هاوار لەئێوە، ئەم وتەیە شیاوی باس كردن نییە، ئێوەیان بەرەو چی دەبرد؟

خالید كوڕی وەلید تا كاتی تەواو بوون لەكاروباری یەمامە لەئەباز نیشتەجێ بوو كەیەكێك لەدۆڵەكانی یەمامەیە. دوای ئەوە رووی لەدۆڵێكی دیكە كرد بەناوی وەبر و لەوێ دابەزی.

## خەڵکانی بەحرەین و هەڵگەڕانەوەی حەتەم

و ئەو كەسانەی لەبەحرەین لەدەوری كۆبوونەوە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەسەرهاتی هەڵگەڕانەوەی ئەو دەستە لەخەڵكانی بەحرەین بەپێی گێڕانەوەی یەعقوب كوڕی ئیبراهیم بەمشێوەیە: عەلا كوڕی حەزرەمی رووی كردە بەحرەین. پێغەمبەر(د.خ) و مونزەر كوڕی ساوی لەیەك مانگدا نەخۆش كەوتوون و مونزەر ماوەیەكی كەم دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، مرد و خەڵكی بەحرەین لەدین هەڵگەڕانەوە بەڵام تایەفەی عەبدقەیس لەسەر باوەڕەكەی خۆیان پێداگریان كرد و تایەفەی بەكر لەئیسلام پەشیمان بوونەوە. ئەو كەسەی رێگەی نەدا تایەفەی عەبدقەیس لەئیسلام پەشیمان ببنەوە، جارود بوو.

حەسەن كوڕی ئەبی حەسەن دەڵێت: جارود ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ). پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: ئەی جارورد باوەڕ بێنە.

وتی: ئێستا دینی خۆم هەیە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: دینەكەی تۆ هیچ نییە و راست نییە.

جاروود وتی: ئەگەر باوەڕ بێنم ئەنجامی باوەڕهێنانی من لەئەستۆی تۆدابێت؟

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵێ.

جارود باوەڕی هێنا و لەمەدینە مایەوە. زانستی دین فێر بوو و كاتێك مەبەستی ڕۆشتنی كرد، وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، چوارپێیەكم دەست دەكەوێت بۆ ئەوەی بۆ دیاری خۆم بگەڕێمەوە؟

فەرمووی: ئەی جاروود، نیمە.

جارود وتی: دەتوانین لەرێگە چوارپێ بەرەڵاکان هەڵیگرین؟

فەرمووی: ئاگرێکی سووتێنەرە، لێی نزیك نەبیتەوە.

کاتێك جارود بۆ لای خەڵکەکەی خۆی گەڕایەوە، پێشنیاری ئیسلامی پێکردن و هەمووان بەپێشنیارەکەی رازی بوون. زۆری نەخایاند، پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوای کرد و منالەکانی عەبدقەیس وتیان: ئەگەر محەممەد پێغەمبەری خوا دەبوو، نەدەمرد. لەدین هەڵگەڕانەوە و کاتێك جارود لەمەبەستی خەڵکەکەی ئاگادار بوویەوە، کەسی نارد و خەڵکانی کۆکردەوە. قسەی لەگەڵ کردن و وتی: ئەی منالەکانی عەبدقەیس، شتێك دەپرسم، ئەگەر دەزانن وەڵام بدەنەوە و ئەگەر نازانن هیچ مەڵێن.

وتیان: بپرسە.

وتی: دەزانن، خواوەند لەکۆندا پێغەمبەری ڕەوانە کردووە؟

وتیان:بەڵێ.

وتی: دەزانن یا بینیوتانە؟

وتیان: نا، دەزانین.

وتی: پێغەمبەرانی کۆن چییان بەسەر هاتووە؟

وتیان: هەموویان مردوون.

وتی: محەممەدیش وەك پێغەمبەرە کۆنەکان مرد. شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی خوا و سالار و سەرکردەی ئێمەیە.

خەڵك وتیان: ئێمەیش شایەتی دەدەین خوایەك جگە لەخوای تاقانە نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە.

منالەکانی عەبدقەیس ئیسلامی خۆیان پاراست و هیچ کارێکیان نەکرد. کەس کاری بەوان نەبوو و خەڵکەکەی دیکەی رەبیعەیان لەگەڵ مونزەر و موسوڵمانان بەتەنیا جێهێشت. مونزەر تا دوایین ساتەکانی ژیان سەرقاڵی کاری ئەوان بوو. کاتێك مرد، هاوەڵانی ئەویان لەدوجا گەمارۆدا و عەلا ئەوانی رزگار کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەڵام گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەم ڕووداوە بەمشێوەیە: کاتێك خالید کوڕی وەلید لەیەمامە تەواو بوو، ئەبوبەکر عەلا کوڕی حەزرەمی ڕەوانە کرد. عەلا ئەو کەسەیە پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بۆ لای مونزەر کوڕی

ساوی نارد و لێپرسراوی پێغەمبەر(د.خ) بوو. لەوێ مایەوە و دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)، مونزەر کوڕی ساوی لەبەحرەین مرد. لەو کاتەدا عەمرۆ کوڕی عاس لە عەممان و بەدیاری مونزەر کوڕی ساوی گوزەری کرد. ئەو لەسەرە مەرگ لەعەمرۆی پرسی، پێغەمبەر(د.خ) بۆ پیاوی موسوڵمان لەکاتی مەرگ چەندەی لەماڵی ئەو دەستنیشان دەکرد؟

عەمرۆ کوڕی عاس وتی: یەك لەسەر سێی سامانەکەی تایبەت بوو بەخۆی.

مونزەر وتی: بەبڕوای تۆ بەیەك لەسەر سێی سامانەکەم چی بکەم؟

عەمرۆ دەڵێت: پێم وت: یەك لەسەر سێ لەناو کەس و کارەکەی خۆت دابەش بکە و ئەگەر دەخوازیت وەقفی بکە تا دوای خۆت بۆ کەسان بمێنێتەوە.

وتی: حەز ناکەم ماڵەکەم وەقف و یاساغ بکەم، هاوشێوەی ئەو ئاژەڵانەی لەرۆژگاری جاهلییەت یاساغ دەکران، دابەشی بکە و بیدە بەوکەسانەی خۆم دەوێت تا بەدڵخوازی خۆیان خەرجی بکەن.

دەڵێت: عەمرۆ هەمیشە بەرێزەوە وتەکانی ئەوی دەگێڕایەوە.

خەڵکانی رەبیعە لەبەحرەین هاوشێوەی عەرەبەکانی دیکە هەڵگەڕانەوە جگە لەجارود کوڕی عەمرۆ کوڕی حەنش و خەڵکەکەی. جارود کاتێك لەمردنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوویەوە، قسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و هەرکەس ئەم وتەیە دووبارە نەکاتەوە، بەکافری دەزانم.

بەڵام خەڵکانی رەبیعە لەبەحرەین کۆبوونەوە و لەدین هەڵگەڕانەوە و وتیان: دووبارە پاشایەتی بۆ مناڵەکانی مونزەر دەگەڕێنینەوە. مونزەر کوڕی نەعمان کوڕی مونزەریان وەك پاشا هەڵبژارد. نازناوەکەی غرور بوو. کاتێك باوەڕی هێنا و خەڵکانیش باوەڕیان هێنا و بەشمشێر بەسەر ئەواندا سەرکەوتبوو، وتبووی: من غرور نیم بەڵکو مەغرورم.

عومەیر کوڕی فلانی عەبدی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، حەتەم کوڕی زەبیعەی قەیسی لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی بەکر کوڕی وائل کەهاوشێوەی خۆی لەدین هەڵگەڕابوونەوە و ئەوانەی هەر لەسەرەتاوە باوەڕیان نەهێنابوو، بەرێکەوت و لەقەتیف و حوجر نیشتەجێ بوون. خەڵکانی خەت و زەت و سەیابجەی نیشتەجێی ئەو ناوچەی فریودا و کەسانێکی بۆ دارین نارد و شوێنی کەوتن و گەمارۆی خستە سەر خەڵکانی عەبدقەیس کەنەیاری بوون و هاوکاری مونزەر و موسوڵمانەکانیان

دەکرد. کەسی بۆ لای غرور کوڕی سوەید برای نەعمان کوڕی مونزەر نارد و ئەوی بۆ جەواسا ڕەوانە کرد و وتی: خۆڕاگری بکە چوونکە ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنم هاوشێوەی مونزەر دەبیتە پاشای حیرە. هەروەها کەسانێکی بۆ جەواسا نارد و گەمارۆی خستەسەر. گەمارۆکە دەرێژەی کێشا. لەناو موسوڵمانە گەمارۆدراوەکان، موسوڵمانێکی خۆپارێز دەبینرا بەناوی عەبدوللە کوڕی حەزف لەمناڵەکانی بەکر کوڕی کەلاب. خۆی و گەمارۆدراوەکان برسییەتی تەنگی پێ هەڵچنی و زۆری نەمابوو هەموویان بمرن. عەبدوڵلە کوڕی حەزف لەمبارەوە هۆنراویەکی هۆنییەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

((ئەبوبەکر و هەموو جوامێرەکانی مەدینە ئاگادار بکەنەوە
ئایا لەبارودۆخی ئەو خەڵکەی لەجەواسا گەمارۆ دراوان، ئاگادارن
خوێنیان لەدۆڵەکاندا ڕژاوە
و هاوشێوەی تیشکی هەتاو بەرچاوی بینەران دەکەوێت
ئێمە پشت بەڕەحمان دەبەستین
و شیاوە خۆڕاگر بین.))

مەنجاب راشد دەڵێت: ئەبوبەکر عەلا کوڕی حەزرەمی بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکانی بەحرەین نارد، کاتێك لەیەمامە نزیك کەوتەوە، سەمامە کوڕی ئەسال لەگەڵ موسوڵمانەکانی مناڵەکانی حەنیفە لەمناڵەکانی سەحیم و خەڵکی گوندەکان لەتیرەکانی دیکەی مناڵەکانی حەنیفە پەیوەستیان بوون. ئەو پیاوێکی دوودڵ بوو. عێکرەمە بەرەو عەممان و مەهرە بەرێکەوتبوو. فەرمانی بەشورەحبیل دابوو لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە. لەوێوە رووی کردە دومە و لەگەڵ عەمرۆ کوڕی عاس لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی قوزاعە شەڕیان کرد.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی عاس رووبەرووی سەعد وەیلی بوویەوە و عێکرەمە بۆ رووبەروو بوونەوەی مناڵەکانی کەلب نارد. کاتێك لەئێمە نزیك کەوتەوە کە لەسەرەوەی سەرزەمینەکەبووین. هەموو سوارەکانی هۆزی رەباب و عەمرۆ کوڕی تەمیم ئەویان بەجێهێشت. لەگەڵ ئەو نزیك بوونەوە بەڵام هۆزی مناڵەکانی حەنزەلە دوودڵ بوون. مالك کوڕی نەویرە لەبەتاح و دەستەیەکی لەگەڵدا بوو و لەگەڵ ئێمەدا چەندین جار شەڕی کرد. وەکیع کوڕی مالك لەقەرعا و دەستەیەکی لەگەڵدا بوو و شەڕی لەگەڵ

تایەفەی عەمرۆ دەکرد. هۆزی سەعد کوڕی زەید مەنات دوو دەستە بوون: تایەفەی عەوف و ئەبنا شوێنکەوتەکانی زەبەرقان کوڕی بەدر و لەئیسلام پەشیمان نەبوونەوە و بەرگریان لێکرد و تایەفەی موقاع و بەتوون بێ جووڵە چاوەڕوانی بارودۆخیان دەکرد جگە لەقەیس کوڕی عاسم چوونکە کاتێك زەبەرقان کوڕی بەدر زەکاتی عەوف و ئەبنای بۆ مەدینە برد، ئەو زەکاتەی کۆی کردبوویەوە، لەنێوان خەڵکانی موقاعیس و بەتوون دابەشی کرد. کاتێك قەیس کوڕی عاسم بینی تایەفەی رەباب و عەمرۆ پەیوەستی عەلا بوون، لەکردەوەی خۆی پەشیمان بوویەوە و بەشێك لەزەکاتەکەی بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی برد. عەلا رێزی گرت. لەخەڵکەی عەمرۆ کوڕی سەعد، بەئەندازەی سوپاکەی عەلا، پەیوەستی سوپاکەی عەلا بوون. ئێمەی لەرێگەی دەهناوە برد و کاتێك گەیشتینە ناوەڕاستی دەهنا، حەنانات و عەرافات لەچەپ و راستی ئێمەدا بوون. خواوەند مەبەستی ئەوەی کرد مۆجیزە و تواناکانی خۆیمان نیشان بدات. عەلا دابەزی و فەرمانی بەخەڵکاندا دابەزن. لەتاریکی شەو وشترەکان ڕایان کرد. نە وشتر نەخێوەت نەتوێشوومان بۆ نەمایەوە. باری وشترەکان لەناو ریخەڵانەکەدا بلاو بوویەوە. هێشتا بارەکان نەکرابوونەوە. خەمبار و دڵتەنگ بووین و وەسیەتمان دەکرد. جارچی عەلا جاریدا: کۆببنەوە. کاتێك کۆبووینەوە، وتی: بۆ واتان لێهاتووە و ترساون؟

وتیان: سەرکۆنەمان مەکە چوونکە کاتێك بەیانی هەتاو هەڵبێت، هەموان لەناو دەچین.

وتی: ئەی خەڵکینە مەترسن، مەگەر موسوڵمان نین؟ مەگەر بەرێگەی خوادا ناڕۆن؟ مەگەر هاوەڵانی خوا نین؟

وتیان: بەڵێ.

وتی: کەواتە بزانن خواوەند کەسانی وەك ئێوە هیچ کات پشتگوێ ناخات.

بۆ بەیانی، بانگی نوێژیان فەرموو، عەلا پێشنوێژی بۆ کردین. دەستەیەکمان دەستنوێژمان بوو و دەستەیەك (تەیەمموم)مان کرد. کاتێك نوێژی خوێند، کەوتە سەرچۆك و خەڵکانیش بەهەمان شێوە، دۆعایان کرد و لەرووناکی تیشکی هەتاو، تراوێلکەیەك درەوشایەوە. عەلای سەیری خەڵکان کرد و وتی: کەسێك بڕوات بزانێت ئەوە چییە؟

کەسێك ڕۆشت و گەڕایەوە، وتی: تراوێلکەیە.

عەلا و خەڵکان سەرقاڵی پاڕانەوە و دۆعا کردن بوون. دووبارە تراوێلکەیەك

درەوشایەوە، دوای ئەوەی جارێکی دیکە تراوێلکە درەوشایەوە. کەسێك ڕۆشت و وتی: ئاوە.

عەلا لەگەڵ خەڵکان هەستا. بەرەو ئاوەکە ڕۆشتین. خواردمانەوە و خۆمان شۆرد، کاتێك دنیا بەتەواوی ڕووناك بوویەوە، وشترەکانمان گەڕانەوە. هەرکەسێك بارەکەی خۆی هەڵگرت. هیچ شتێك کەم نەبوو، خۆمان و وشترەکان ئاومان خوارد و بەرێکەوتین.

دەڵێت: باوکی هورەیرە هاورێی من بوو. کاتێك ڕۆشتین، وتی: شوێنی ئاوەکە دەزانی؟

وتم: باشتر لەهەموو عەرەبەکان شارەزای ئەم سەرزەمینەم.

وتی: با پێکەوە تا لای ئاوەکە بڕۆین.

دەڵێت: ڕۆشتین بەڵام نەکانییەك بوونی بوو نەشوێنەوارێك لەناو دەبینرا. پێم وتم: ئەگەر کانییەکە ون نەدەبوو، دەموت ئێرە شوێنەکەیەتی، پێشتر هەرگیز ئاوم لێرە نەبینیوە.

لەم کاتەدا دەفرێك ئاوم بینی، باوکی هورەیرە پێی وتم: ئەی باوکی سەهم، سوێند بەخوا ئێرە هەمان شوێنە و بۆ ئەم دەفرە گەڕامەوە. دەفرەکەی خۆم پڕکردبوو و لای کانییەکە بەجێم هێشت.

دەڵێت: ئەمە یەکێك لەبەخششەکانی خواوەند و مۆجیزەکانی ئەو بوو.

سپاسی خوامان کرد و بەرێکەوتین تا گەیشتینە هیجر. دەڵێت: عەلا کەسی بۆ لای جارود وکەسێکی دیکە نارد  تا لەگەڵ خەڵکی عەبدقەیس لەناوچەی خۆیان ڕووبەڕووی حەتەم ڕیز ببەستن. هەموو موسوڵمانەکان لەدەوری عەلا کۆبوونەوە. موسوڵمانان و ناباوەڕان خەندەکیان لێدا و ڕۆژەکان شەڕیان دەکرد و ئێواران دەگەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. یەك مانگ بەمشێوەیە تێپەڕی. شەوێك موسوڵمانان لەئوردووگای ناباوەڕانەوە دەنگە دەنگ و قەرەباڵغییان بیست.

عەلا وتی: کێ دەتوانێت هەواڵمان بۆ بێنێت؟

عەبدوڵلە کوڕی حەزف کە دایکی لەتایەفەی منداڵەکانی عیجل بوو، وتی: من هەواڵتان بۆ دێنم.

ئەمەی وت و ڕۆشت و کاتێك لەخەندەکی دوژمن نزیك کەوتەوە، ئەویان گرت و وتیان: کێیت؟ ناوی خۆی وت و بانگی ئەبجەری کرد. ئەبجەر کوڕی بوجەیر هات و

ئەوی ناسییەوە، وتی: چیت دەوێت؟

وتی: رێگە مەدە لەناوبچم، کاتێک سوپای عیجل و تیم اللات و قەیس و کەسانی تر لەدەوری منن، بۆ بکوژرێم، ئێوە لێرە بن و ببمە گاڵتەجاری دەستی کەسانی دیکە.

بوجەیر ئەوی رزگار کرد و وتی: سوێند بەخوا خوشکەزایەکی خراپیت.

عەبدوللە وتی: واز لەو قسە بێنە و خواردنم بۆ بێنە، خەریکە لەبرسانا دەمرم. بوجەیر خواردنی پێدا،وتی: توێشوو و چواریێم پێ بدە تا برۆم بەدوای کاری خۆمدا. لەگەڵ کەسێک قسەی دەکرد، مەستی شەراب بوو. بوجەیر ئەو کارەی کرد و وشترەکەی خۆی پێدا و ئەوی پەڕاندەوە.

عەبدوللە کوڕی حەزف بۆ ئوردوگای موسوڵمانان گەڕایەوە و ئاگاداری کردنەوە، ناباوەڕان هەموویان سەرخۆشن. موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر ئوردووگاکەیان و شمشێریان لەناو ئەواندا سووڕاند. ناباوەڕان بۆ هەڵاتن روویان لەخەندەکە کرد و دەستەیەکیان لەناوچوون. دەستەیەکیان رزگاریان بوو. دەستەیەکیان سەروسوڕما کوژران یا ئەسیر کران. موسوڵمانان دەستیان بەسەر کەل و پەلەکانی ناو ئوردووگاکەدا گرت. هەڵاتووان تەنیا سیلاح و جل و بەرگیان لەگەڵ خۆیان برد. ئەبجەر یەکێک بوو لەهەڵاتووان، حەتەم سەرسوڕماو بەرەو ئەسپەکەی ڕۆشت تا سوار بێت. موسوڵمانان لەناو ئوردووگاکەدا بوون. ویستی سوار ئەسپەکەی بێت، نەیتوانی. عەفیف کوڕی مونتزەری تەمیمی لای ئەو تێپەڕی و داوای هاوکاری کرد، دەیوت: کەسێک لەمناڵەکانی قەیس لێرە نییە هاوکاری من بکات.

کاتێک هاواری کرد، عەفیف دەنگی ئەوی ناسییەوە و وتی: قاچت بدە بەمن تاسوارت کەم. کاتێک حەتەم قاچی خۆی پێدا، بەشمشێر لێیدا و قاچی لەڕانییەوە قرتاند و بەرەڵای کرد.

حەتەم وتی: رزگارم کە.

عەفیف وتی: دەخوازم نەمریت بۆ ئەوەی بەئازارەوە بمریت.

ژمارەیەک لەهاوەڵانی عەفیف ئەو شەوە کوژران. حەتەم لەشوێنکەیدا کەوتبوو، هەرکەس لەموسوڵمانان لای ئەو تێدەپەڕی، دەیوت: دەخوازیت حەتەم بکوژیت. ئەم قسەی بەکەسانێک دەوت کەئەویان نەدەناسی. قەیس کوڕی عاسم لای ئەو تێپەڕی و کاتێک ئەم قسەی حەتەمی بیست، ڕۆشت و خوێنی ڕشت. کاتێک بینی قاچی قرتاوە، وتی: ئەگەر دەمزانی، نەمدەکوشت.

کاتێك موسوڵمانان دەستیان بەسەر خەندەکی دوژمندا گرت، شوێن هەڵاتووان کەوتن. قەیس کوڕی عاسم خۆی بەئەبجەر گەیاند بەڵام ئەسپەکەی ئەبجەر لەئەسپەکەی ئەو تیژڕەوتر بوو. قەیس چوونکە دەترسا لێی دوور بکەوێتەوە، زەرەبەیەکی لەقاچی دا و دەماری قاچی قرتاند. بەڵام مایەوە و شەل بوو.

عەفیف کوڕی مونزەر غروور کوڕی سوەیدی ئەسیر کرد. تایەفەی رەباب سەبارەت بەو قسەیان لەگەڵ عەفیف کرد چوونکە باوکی غروور خوشکەزای تیم بوو. ویستیان پەنای پێبدات، عەفیف بەعەلا کوڕی حەزرەمی وت: پەنام بەم کەسە داوە.

عەلا وتی: کێیە؟

وتی: غروور.

عەلا وتی: تۆ ئەم خەڵکەت مەغروور کردووە؟

وتی: ئەی پاشا، من کەس مەغروور ناکەم، خۆم مەغرووروم.

عەلا وتی: باوەڕ بێنە. غروور باوەڕی هێنا و لەهیجر مایەوە. غروور ناوی بوو نەك نازناو.

عەفیف، مونزەر کوڕی سوەید کوڕی مونزەری کوشت.

بەرەبەیان عەلا تالآنییەکانی دابەش کرد. ئەوکەسانەی بوێرانە جەنگابوون وەك عەفیف کوڕی مونزەر و قەیس کوڕی عاسم و سەمامە کوڕی ئەسال، جل و بەرگی گرانبای پێبەخشین. سەمامە جل و بەرگێکی ڕەش نەخشێنراو کەحەتەم شانازی پێوە دەکرد، یا چەند دستەیەك جل وبەرگی دیکەی کڕییەوە.

زۆربەی هەڵاتووان روویان لەدارین کرد و و بەکەشتی خۆیان گەیاندە ئەو سەرزەمینە. دەستەیەکی دیکەیان بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان گەڕانەوە. عەلا کوڕی حەزەرەمی بۆ ئەو دەستە لەخەڵکانی بەکر کوڕی وائل کەباوەڕی خۆیان پاراستبوو، سەبارەت بەوان نامەی نووسی و کەسی بۆ لای عوتەیبە کوڕی نەهاس و عامر کوڕی عەبدئەسوەد نارد تا شوێن هەڵگەڕاوەکان بکەون و فەرمانی بەموسەممەعدا پشتیوان و هاوکاری ئەوان بێت. کەسی بۆ لای خەسفەی تیمی و موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی نارد و ڕێگەیان لەهەڵگەڕاوەکان بەست. دەستەیەکیان دووبارە باوەڕیان هێنایەوە و دەستەیەکیان رازی نەبوون و پێداگرییان لەسەر کوفر و ناباوەڕی کرد.ڕێگەیان بەوان نەدا و گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. بەکەشتی روویان لەدارین کرد و خواوەند

ئەوانی لەو سەرزەمینە کۆکردەوە.

عەلا لەئوردووگای ناباوەڕان مایەوە تا وەڵامی نامەکانی لەخەڵکانی بەکر کوڕی وائل بۆ هاتەوە. زانی هاوکاری و پشتیوانی دینی خوایان کردووە. کاتێك هەواڵەکان بەدڵخوزای دڵ و دڵنیا بوو لەپشت سەرییەوە زیان بەخەڵکانی بەحرەین ناگات، فەرمانی بەخەڵکاندا بەرەو دارین بەرێکەون. ئەوانی کۆکردەوە و وتارێکی پێشکەش کردن، وتی: خواوەند ئەحزاب و شەیتانەکان و هەڵاتووانی لەدەریا کۆکردۆتەوە و لەوشکانی مۆجیزەکانی خۆی نیشانی ئێوەدا، دەریایش بەهەمان شێوە دەبێت.

هێرش بکەنە سەر دوژمن و دەریا ببڕن چوونکە خواوەند ئەوانی کۆکردۆتەوە.

وتیان: ئەو کارە دەکەین و دوای ئەوەی لەبەڵاکەی دەهنا رزگارمان بوو، چیتر لەهیچ ناترسین.

عەلا بەرێکەوت و خەڵکەکەی بەرێکەوتن. کاتێك گەیشتنە کەنارەکانی دەریا، سوار وپیادە لەدەریایاندا، دۆعایان دەکرد. دۆعاکەیان ئەمە بوو:

((یا ارحم الراحمین، یا کریم، یا حلیم، یا احد، یا صمد، یاحی، یا محیی الموتی، یاحی یا قیوم، لا اله الا انت یا ربنا)) بەفەرمانی خواوەند هەموویان لەناو پەڕینەوە وەك بڵێی لەسەر زەوییەکی پان و بەرین رێگە دەبڕن. ئاوەکە تا سەرپێی وشترەکانی دەگرت لەکاتێکدا لەکەنارەکانەوە تا دارین بۆ کەشتییەکان رێگەی یەك و شەو رۆژ بوو!!!!

کاتێك گەیشتنە دارین، رووبەرووی دوژمن بوونەوەو شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. کەس لەوان نەمایەوە و ژن و منداڵەکانی دوژمنیان ئەسیر کرد و سامانەکانیان هێنا. بەشی سوار لەتالآنییەکان شەش هەزار و پیادەکان دوو هەزار بوو. کاتێك لەشەڕ تەواو بوون، لەهەمان رێگەی هاتنەوە، گەڕانەوە. عەفیف کوڕی مونزەر لەمبارەوە هۆنراوەیەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((مەگەر نەتبینی خواوەند دەریای دەستەمۆ کرد
بەڵایەکی گەورەی بەسەر کافرەکاندا هێنا
لەخوای دەریا پاڕاینەوە
و ئەو پێشهاتێك و مۆجیزەیەکی سەیری نیشاندایـن
سەرسوڕهێنەرتر لەوەی پیشیانی رابردووانی دابوو.))

کاتێك عەلا بۆ بەحرەین گەڕایەوە و دەسەڵات و هێزی ئیسلام زیاد و گەشەی کرد و موسوڵمانان پێگە و شکۆ و ناباوەڕان لاواز و ریسوا بوون، پڕوپاگەندەی ناڕاستیان بڵاو

کردەوە و وتیان: مەفروق شەیبان و تەغلەب و نەمری کۆکردۆتەوە.

موسوڵمانەکان وتیان: خەڵکانی لەهازیم ڕێگەیان لێدەگرن.

لەو کاتەدا تایەفەی لەهازیم خوازیاری هاوکاری کردنی عەلا بوون.

عەبدوللە کوڕی حەزف سەبارەت بەپڕوپاگەندەی خەڵکان هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((ئێمە لەمەفروق و بنەماڵەکەی مەترسێنن

ئەگەر هێرش بکاتە سەر ئێمە، بەڵاکەی حەتەمی بەسەردێت

تایەفەی بەکر هەرچەندە زۆر بن

لەریزی ئەو کەسانەن کەدەڕۆنە جەهەننەم.))

دەڵێت: عەلا لەگەڵ خەڵکان گەڕایەوە جگە لەوکەسانەی دەیانویست لەوێ نیشتەجێ بن. ئێمە لەگەڵ سەمامە کوڕی ئەسال هاتین تا گەیشتینە ئاوەکەی قەیس کوڕی سەعلەبە. سەمامەیان بینی جل و بەرگی نەخشێنراوی لەبەردابوو. کەسێکیان نارد و وتیان: لێی بپرسە ئەو جل و بەرگەی لەکوێوە هێناوە، ئایا ئەو حەتەمی کوشتووە یاکەسێکی دیکە؟

کاتێك ئەو پیاوە گەڕایەوە و سەبارەت بەجل و بەرگ و حەتەم پرسیاری کرد، وەڵامی دایەوە: وەك تاڵانی وەرمگرتووە.

وتی: ئایا تۆ حەتەمت کوشت؟

وتی: نە، بەڵام حەزم دەکرد بیکوژم.

وتی: ئەی بۆ ئەم جلانەی ئەو بەرتۆ کوتووە؟

وتی: پێم وتیت تاڵانییە.

ئەو پیاوە گەڕایەوە و خەڵکەکەی لەوەڵامی سەمامە ئاگادار کردەوە. لەدەوری کۆبوونەوە و سەمامە پرسی چیتان دەوێت؟

وتیان: تۆ حەتەمت کوشتووە.

وتی: درۆ دەکەن من نەمکوشتووە، ئەم جل و بەرەگە تاڵانییە.

وتیان: ئەوت کوشتووە و جلەکانی ئەوت وەك تاڵانی هەڵگرتووە.

وتی: ئەم جلانەی لەبەردا نەبوو، جلەکان لەشوێنی مانەوەی ئەو دانرابوو.

وتیان: درۆ دەکەیت و خوێنیان ڕشت.

دەڵێت: راهیبێك لەهیجر لەگەڵ موسوڵمانان بوو و کوژرا.

وتیان: هۆکاری موسوڵمانی تۆ چییە؟

وتی: سێ شت چوونکە دەترسام ئەگەر دوای روودانی ئەوان باوەڕ نەهێنم، خواوەند دەمسڕێتەوە: ئەو کانییەی لەریخەڵان دەرکەوت و کرانەوەی رێگە لەدەریا وئەو دۆعای لە کاتی بەرەبەیان لەئۆردووگای موسوڵمانان بیستم.

وتیان: دۆعاکەی چی بوو؟

وتی: ((اللهم انت الرحمان الرحیم، لا اله غیرك و البدیع لیس قبلك شیئی، و الدائم غیر الغافل، و الحی الذی لا یموت و خالق ما یری و ما لایری، و کل یوم انت فی شأن و علمت اللهم کل شیئی بغیر تعلم.

واتاکەی: خواوەندا، تۆ بەخشندە و مێهرەبانی و جگە لەتۆ خوایەك نییە، داهێنەری وپێش تۆ هیچ نەبووە، پایەداریت و بێ ئاگا نابیت، زیندوویت و هیچ کات نامریت، ئافرێنەری بینراو و نەبینراوەکان و هەر رۆژ لەپێگەیەکی دیکەدایت، هەموو شتێك بێ فێر بوون دەزانی.))

کاتێك ئەمانەم بینی و ئەم دۆعایەم بیست، زانیم هۆکاری هاوکاری کردنی فریشتەکان بۆ ئەم خەڵکە ئەوەیە کەهاوکاری دینەکەی خوا دەکەن.

هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) دواتر هەواڵی ئەم پیاوەیان بیست.

عەلا لەنامەیەك بۆ ئەبوبەکری نووسی:

((خواوەند لەدەهنا کانییەکی پێ بەخشین، کەنارەکانی نەدەبینران و دوای خەم و ڕەنج، وانە و مۆجیزەیەکی نیشاندەین تا سپاسی بکەین و بەردەوام ناوی لەسەر زمانمان بێت، لەخوا بپاڕێرەوە و بۆ سوپا و شەڕکەرانی دین داوای هاوکاری بکە.))

ئەبوبەکر لەخوا پاڕایەوە و وتی: عەرەبەکان کاتێك باسی سەرزەمینی خۆیان دەکرد دەیاونت کە لەلوقمان سەبارەت بەدۆڵی دەهنا پرسیاریان کرد ئایا لەوێ چاڵ هەڵکەنن یا نە.؟ لوقمان رێگەی لێگرتبوون و وتبووی: تەناف سەتڵ لەوێ کاریگەری نابێت و کانییەکان دەرناکەوێت. بەسەرهاتی ئەم کانییە لەمۆجیزە گەورەکانە و هاوشێوەی ئەمەم لەناو ئۆمەتەکانی دیکە نەبیستووە. خواوەندا شوێنەواری محەممەد لەناو ئێمەدا بەزیندووی بهێڵەرەوە.

عەلا شەڕی خەندەك و شکستی ناباوەڕان و کوژرانی حەتەم بەدەستی زەید و

موسەممەعی بۆ ئەبوبەکر نووسی:

((خواوەند ئاوزی دوژمنانی ئێمەی بەهۆی شەرابەوە لەناو برد وریژ و هێزی ئەوانی شکاند. هێرشمان کردە سەرخەندەکەکەیان و بینیمان هەموویان سەرخۆشن، ئەوانمان کوشت. جگە لەدەستەیەکەی کەم کەرزگاریان بوو حەتەم کوژرا.

ئەبوبەکر لەوەڵامدا نووسی:

ئەگەر لەمناڵەکانی شەیبان کوڕی سەعلەبە شتێك بیست کەوتەی پڕوپاگەندە چییەکانی پشتڕاست کردەوە، سوپایەك بۆ لەناو بردنی ئەوان ڕەوانە بکە تا بلاوەی لێبکەن و هیچ کات کۆنەبنەوە و پڕوپاگەندە دروست نەبێت.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکانی عەممان و مەهرە و یەمەن

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەمێژووی شەڕی ئەوان لەگەڵ موسوڵمانەکان گێڕانەوەکان جیاوازە. لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی ئیسحاق هاتووە: گرتنی یەمامە و بەحرەین و ڕەوانە کردنی سوپا بۆ شام لە ساڵی دوانزەیەمی کۆچ روویدا.

بەلام لەگێڕانەوەی باوکی حەسەنی مەداینی لەشارەزایانی مێژووی شام و عێراق هاتووە: هەموو سەرکەوتن و شەڕەکان دژی هەڵگەڕاوەکان لەسەر دەستی خالید کوڕی وەلید وکەسانی دیکە لەساڵی یانزەیەم روویاندا جگە لەرووداوی رەبیعە کوڕی بوجەیر کە لەساڵی سیانزەیەم کۆچ روویدا.

داستانی رەبیعە کوڕی بوجەیری تەغلەبی بەمشێوەیە: کاتێك خالید کوڕی وەلید لەمەسیخ وحەسید بوو، رەبیعە لەگەڵ دەستەیەك لەهەڵگەڕاوەکان شۆڕشی کرد. خالید شەڕ و ئەسیر و تالانی زۆری دەستکەوت. کچەکانی رەبیعە لەناو ئەسیرەکاندا بوون. هەموویانی بۆ لای ئەبوبەکر نارد. کچی رەبیعە بوو بەهاوسەری عەلی کوڕی ئەبی تالیب.

بەسەرهاتی عەممان بەوشێوەیە لەگێڕانەوەی کوڕی موحەیریز باسی کراوە: لەقیت کوڕی مالکی ئەزدی ناسراو بەزو ئەلتاج لەعەممان پێگەی بەدەست هێنابوو. لەرۆژگاری جاهلییەت بەجولەندی ناویان دەبرد. بانگەشەی ئەو هاوشێوەی بانگەشەی پێغەمبەران و دوای مەرگی پێغەمبەر(د.خ)، هەڵگەڕایەوە و دەستی بەسەر عەمماندا گرت. جەیفر و عوبادی بۆ کێو و دەریاکان دوورخستەوە. جەیفر کەسی بۆ لای ئەبوبەکر نارد و

لەرووداوەكان ئاگاداری كردەوەو داوای هاوكاری و پشتیوانی كرد.

ئەبوبەكر، حوزەیفە كوڕی موحسینی غەلفانی لەهۆزی حەمیر لەگەڵ عەرەفجەی بارقی ئەزدی بۆ هاوكاری ئەو ڕەوانە كرد. حوزەیفە لێپرسراوی عەممان و عەرەفجە لێپرسراوی مەهرە بوو. بڕیاریاندا كاتێك پێكەوە، بەهاوكاری یەك دژی دوژمنەكەیان بجەنگن و سەرەتا لەعەممانەوە دەستپێبكەن. حوزەیفە لەسنورەكەی خۆی سەركردە و عەرەفجە فەرمانەكانی ئەنجام بدات و عەرەفجە لەسنوری خۆی سەركردە و حوزەیفە فەرمانەكانی ئەنجام بدات. پێكەوە ڕۆشتن و بڕیاریاندا بەخێرایی ڕێگەی عەممان بگرنەبەر. كاتێك نزیك كەوتنەوە نامەیان بە جەیفر و عوباد نووسی.

ئەبوبەكر عێكرەمە كوڕی ئەبی جەهلی بۆ شەڕ لەگەڵ موسەیلەمە بۆ یەمامە نارد و شەرەحبیل كوڕی حەسەنەی بەدوای ئەودا ڕەوانە كرد و فەرمانی هاوشێوەی عەرەفجە و حوزەیفەی بەواندا. بەڵام عێكرەمە بەخێرایی ڕۆشت و دەیویست ناوبانگی ئەم سەركەوتنە تەنیا بۆ خۆی بێت، ڕووبەڕووی موسەیلەمە بوویەوە و شكستی خوارد و ڕووداوەكەی بۆ ئەبوبەكر نووسی. كاتێك شورەحبیل ئاگادار بوویەوە، لەشوێنەكەی خۆی مایەوە. ئەبوبەكر فەرمانی پێدا لەنزیك یەمامە بمێنێتەوە تا فەرمانەكانی دەگات. ئەو بەرەو یەمامە بەرێكەوت و نامەی بۆ عێكرەمە نووسی و سەركۆنەی كرد، وتی: نەتبینم و هیچ هەواڵێكت لێ نەبیستم تا ئەو كاتەی كارێكی پێویست و شیاو لەرێگەی خوادا ئەنجام دەدەیت. بەرەو عەممان برۆ و شەڕ لەگەڵ خەڵكانی ئەو سەرزەمینە بكە و هاوكاری حوزەیفە و عەرەفجە بكە كەهەركامیان سەركردەی سوپاكەی خۆیەتی. لەسنووری حوزەیفە، ئەو سالارە و كاتێك لەوێ رزگارتان بوو، بەرەو مەهرە برۆ. دوای ئەوە رووبكەرە یەمەن و لەیەمەن و حەزەرمەوت موهاجیر كوڕی ئومەییە ببینە و هێرش بكسەر هەڵگەڕاوەكانی نێوان عەممان و یەمەن. دەمەوێت هەواڵی دڵخۆشكەر لەتۆ ببیستم.

عێكرەمە كاتێك نامەكەی ئەبوبەكری بەدەست گەیشت، لەگەڵ سوپاكەی خۆی بەدوای عەرەفجە و حوزەیفە بەرێكەوت و پێش ئەوەی بگەنە عەممان، پەیوەستیان بوو. ئەبوبەكر فەرمانی بەعەرەفجە و حوزەیفەدا بوو كاتێك كاروبارەكانی عەممان سامان دەدەن سەبارەت بەمانەوە یا ڕۆشتن بۆ یەمەن، گوێ لەفەرمانەكانی عێكرەمە بگرن.

لەنزیك عەممان لەشوێنێك بەناوی رەجام پەیوەستێ یەك بوون و نامەیان بۆ جەیفر وعوباد نووسی. لەقیت لەهاتنی سوپای موسوڵمانان ئاگادار بوویەوە وخەڵكانی خۆی

کۆکردەوە و لەدەبا ئوردوی لێدا. جەیفر و عوبادیش لەشوێنکەی خۆیان بەرێکەوتن و لەسەحار ئوردویان لێدا. کەسیان بۆ لای عەرەفجە و حوزەیفە نارد تا پەیوەستیان بن. ئەوان هەردووکیان بەرێکەوتن و شەڕیان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی سەرزەمینەکانی نزیك سنووری خۆیان کرد و ئەوانیان لەناوبرد.

دواتر نامەکەیان بۆ ئوردوی لەقیت نارد و لەسەرکردەی مناڵەکانی جەدید دەستیان پێکرد. نامەیان گۆڕییەوە و لەلەقیت جیابوونەوە. دواتر بەرەو ئوردووگای لەقیت بەرێکەوتن و شەڕ دەستپێکرد.

لەقیت ژن و مناڵەکانی لەپێشەوەی سوپاکە دانابوو بۆ ئەوەی شەرکەران بوێرانە شەڕ و پارێزگاری لەژن و مناڵەکانی خۆیان بکەن. دەبا شارێکی گەورە و گەورەی شارەکانی ئەو ناوچە بوو. شەڕێکی قورس روویدا و زۆری نەمابوو لەقیت سەرکەوتن بەدەست بێنێت. لەو کاتەی شکست لەناو موسوڵمانەکان و ناباوەڕان لەسەرکەوتن نزیك ببوونەوە، پشتیوانی فراوان بۆ موسوڵمانان گەیشت. مناڵەکانی ناجییە بەسەرکردایەتی خەریت کوڕی راشد و خەڵکای عەبدقەیس بەسەرکردایەتی سەوحان لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی عەممان لەخزمەکانی مناڵەکانی ناجییە و عەبدقەیس، پەیوەستی موسوڵمانان بوون. خواوەند بەهۆی ئەوانە هێزی بەموسوڵمانان بەخشی و ناباوەڕانی لەناوبرد. موسوڵمانان لەگۆڕەپانی شەڕ دەهەزار کەس لەوانیان کوشت و شوێن هەڵاتووان کەوتن و کەسانێکی زۆریان کوشت و ژن و مناڵەکانیان ئەسیر کرد. سەرکردەکان تالأنییەکانیان بەسەر موسوڵمانان دابەش و پێنج یەکیان بۆ مەدینە نارد.

بەبۆچوونی عێکرەمە حوزەیفە دەبوایە لە عەممان بمێنێتەوە تا کاروبارەکان بەتەواوەتی سامان دەدرێن و خەڵکان ئارام ببنەوە. پێنج یەکی تالأنییەکان هەشسەد وشتر و هەموو بازارەکەیان تالأن کرد. عەرەفجە پێنج یەکی تالأنییەکانی بۆ مەدینە برد و حوزەیفە مایەوە تا خەڵکان هێور بکاتەوە و هۆزەکانی دەورووبەری عەممان ناچار بکات، کێشە بۆ فەرمانڕەوای موسوڵمانان و خەڵکی عەممان دروست نەکات.

## گێڕانەوەکانی تایبەت بەمەهرە لەنەجد

کاتێك عێکرەمە و حوزەیفە و عەرەفجە شەڕی هەڵگەڕاوەکانیان لەعەممان کۆتایی پێهێنا، عێکرەمە لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو مەهرە بەرێکەوت و داوای هاوکاری

لەخەڵکانی عەممان و دەوروبەری کرد. بەرێکەوت تا گەیشتە مەهرە و لەخەڵکی ناجییە و ئەزد و عەبدقەیس و راسب و سەعد و منداڵەکانی تەمیم کەسانێك بۆ هاوکاری کردنی پەیوەستی سوپاکەی بوون. هێرشی کردە سەر دیاری مەهرە کەدوو دەستەی لێ بوو: دەستەیەك لەدەشتی جیروت و نەزدون و یەکێك لەمنداڵەکانی شەخرات بەناوی شەخریت سەرکردەیان بوو. دەستەیەکی دیکە لەنەجد و هەموو خەڵکانی مەهرە جگە لەدەستەکەی شەخریت شوێنکەوتەی سەرکردەی ئەم دەستە یانی مەسحەبی موحاربی بوون. ئەم دوو سەرکردەیە دژایەتی یەکیان دەکرد و هەرکام دەیویست ئەوی دیکەیان شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بێت و دوو دەستەکەییش هەرکام هەوڵیان بۆ سەرکەوتنی سەرکردەکانی خۆیان دەدا. ئەمە هاوکارییەك بوو خواوەند بەموسوڵمانانی بەخشی چوونکە دووبەرەکی نێوان دوژمنان هۆکارێك بوو بۆ بەهێزی موسوڵمانان.

کاتێك عێکرەمە بینی دەستەی شەخریت ژمارەیان کەمترە، پێشنیاری ئیسلامی پێکرد. ئەو، سەرەتا بەپێشنیارەکەی عێکرەمە رازی و بەمشێوەیە هێزی مەسبەحی لاواز کرد. دواتر عێکرەمە کەسی بۆ لای مەسبەح نارد و پێشنیاری ئیسلام و هەڵگەڕانەوە لەکوفری پێکرد. بەلاّم ئەو بەهۆی زۆری ژمارەی شەڕکەرانی بەپێشنیارەکەی عێکرەمە رازی نەبوو و لەشوێنەکەی شەخریت دوورکەوتەوە. عێکرەمە لەگەڵ شەخریت شوێنی کەوتن و لەنەجد رووبەرووی مەسبەح بوویەوە. شەڕێك قورستر لەشەڕی دەبا دەستپێکرد. خواوەند سوپای ناباوەڕانی شکستدا و سەرکردەکەیان کوژرا. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆریان لەکوشت و ژمارەیەك ئەسیریان گرت. نزیکەی دوو هەزار ئەسپیان وەك تالاّنی بۆ مایەوە.

عێکرەمە تالاّنییەکانی دابەش کرد و یەك پێنجی بەشەخریتدا بۆ ئەبوبەکر و چوار لەسەر پێنجەکەی دیکەی لەناو موسوڵماناندا دابەش کرد. سوپاکەی بەچوارپێ و سیلاح بەهێز و عێکرەمە لەوێ مایەوە تا کاروبارەکانی خەڵکان سامان بدات. خەڵکانی نەجدی کۆکردەوە و بەیعەتی لێوەرگرتن. رووداوەکەی لەنامەیەکدا نووسی و بەسائب عابدی مەخزومی بۆ ئەبوبەکر نارد. شەخریت پێش سائب تالاّنییەکانی گەیاندە مەدینە.

## هەڵگەڕاوەکانی یەمەن

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد، عەتاب کوڕی ئەسید و تاهیر کوڕی ئەبی عەبدوللە لێپرسراوانی مەککە ودەوروبەری بوون. عەتاب لێپرسراوی مناڵەکانی کەنانە و تاهیر، لێپرسراوی عەك بوو. چوونکە پێغەمبەر(د.خ) فەرمانیدابوو کاروبارەکانی عەك بەکەسێك لەخۆیان، مناڵەکای مەعد کوڕی عەدنان، بسپێرن. لێپرسراوانی تاییف و دەوروبەری عوسمان کوڕی ئەبی عاس و مالك کوڕی عەوف ئەنساری بوون. عوسمان لێپرسراوی حەزەرییەکان و مالك لێپرسراوی بەدەوییەکان و شوێنکەوتەکانی هۆزی هەوازین بوو. لێپرسراوانی نەجران و دەوروبەری عەمرۆ کوڕی حەزم و ئەبوسوفیان کوڕی حەرب بوون. عەمرۆ کوڕی حەزم پێشنوێژ و ئەبوسوفیان لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکات بوو. خالید کوڕی سەعید کوڕی عاسم لێپرسراوی ناوچەی نێوان رەمع و زوبەید تا سنورەکانی نەجران بوو. لێپرسراوی هەمەدان عامر کوڕی شەهر، لێپرسراوی سەنعا، فیروزی دەیلەمی و دازویە و قەیس کوڕی مەکشوح هاوکارەکانی بوون. لێپرسراوی جوند، یەعلی کوڕی ئومەییە، لێپرسراوی مارب ئەبوموسا ئەشعەری، تاهیر کوڕی ئەبی عەبدوللە لێپرسراوی عەك و ئەشعەرییەکان بوو. مەعاز کوڕی جەبەل مامۆستای قورئان و لەسنووری هەموو لێپرسراوەکان هاتوچۆی دەکرد.

دەڵێت: ئەسوەد لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەر(د.خ) هێرشی کردە سەریەمەن. پێغەمبەر(د.خ) بەهۆی ئەو نامانەی بۆخەڵکانی نارد، شەڕی لەگەڵ کرد تا ئەوەی خواوەند شکستی پێهێنا و کوشتی. کاروباری پێغەمبەر(د.خ) لەیەمەن ودەوروبەری، رۆژێك پێش مردنی پێغەمبەر(د.خ) بۆ دۆخی جارانی خۆی گەڕایەوە. بەڵام خەڵکان بۆ فیتنە و ئاژاوە ئامادە و کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەریان بیست، یەمەن و دەوروبەری شڵەژا. سوارەکانی عەنسی لەنەجران تا سەنعا هاتوچۆیان دەکرد بەڵام کەس کاری بەکەس نەبوو. عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەبەرابەر کوڕی فەروە کوڕی مەسیك و معاویە کوڕی ئەنس لەگەڵ پاشماوەی کەسەکانی عەنسی هاتوچۆی دەکرد.

دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ)،جگە لەعەمرۆ کوڕی حەزم و خالید کوڕی سەعد نەڕۆشتنە ئەو سەرزەمینە و لێپرسراوەکانی دیکە پەنایان بۆ موسوڵمانان برد. عەمرۆ

کوڕی مەعدیکەرب ڕێگەی خالید کوڕی سەعیدی بەست و شمشێری سەمسامەی لێسەند. یەکێك لەنێردراوەکانی پێغەمبەر(د.خ) جەریر کوڕی عەبدوللە و ئەقرەع کوڕی عەبدوللە و وەبر کوڕی یەحنس لەگەڵ هەواڵەکان گەڕانەوە بۆ مەدینە.

ئەبوبەکر شەڕی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان دەست پێکرد بەهۆی ئەو نامانەی بۆ موسوڵمانانی نووسی هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) . سەرەتا ئوسامە کوڕی زەید لەشام گەڕایەوە و ئەمە سێ مانگی خایاند. تەنیا لەڕووداوی زی حەسی و زوئەلقسە ئەبوبەکر خۆی بەشداری کرد.

کاتێك ئوسامە گەڕایەوە، ئەبوبەکر بۆ شەڕ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان ڕووی لەئەبرەق کرد. کاتێك لەگەڵ خەڵککەی ڕووبەڕوو بوویەوە، داوای هاوکاری لەموسوڵمانەکان کرد و لەگەڵ دەستەیەك لەموهاجیر و ئەنسارەکان و موسوڵمانەکان شەڕی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی نزیك مەدینە کرد. داوای هاوکاری لەهەڵگەڕاوەکان نەکرد تا ئەوەی توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێت.

یەکەم کەس ئەبوبەکر نامەی بۆ نووسی عەتاب کوڕی ئەسید بوو. نووسی: لەگەڵ موسوڵمانەکانی سنووری خۆت هێرش بکەرە سەر هەڵگەڕاوەکان. فەرمانێکی لەم چەشنەی بۆ عوسمان کوڕی ئەبی عاس نووسی.

عەتاب، خالید کوڕی ئەسیدی بۆ شەڕ لەگەڵ خەڵکی تەهامە نارد. لەوێ دەستەیەك لەخەڵکی تایەفەی مودەلەج و دەستەیەك لەخەڵکی خوزاعە و لات و سەرسەرییەکانی کەنانە بەسەرکردایەتی جوندەب کوڕی سولەمی لەتایەفەی مناڵەکانی شەنوقی مودەلەج کۆبوونەوە. لەسنوری عەتاب جگە لەو دەستەیە هیچ دەستەیەکی دیکە کۆنەبوویەوە. خالید لەگەڵ شەڕکەرەکانی لەئاباریق ڕووبەڕوویان بوویەوە وبڵاوەی پێکردن. ژمارەیەکی زۆر لەمناڵەکانی شەنوقی کوشت کەتا ئێستا ژمارەی ئەو تایەفە کەمە و زیادی نەکردووە. سنوری عەتاب پاکسازی تیا کرا و جوندەب گیانی دەرباز کرد. سەبارەت بەکارەکەی خۆی هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((پەشیمان بوومەوە
زانیم کارێك کرد
تەنیا نەنگ و شەرمی لێ دەمێنێتەوە
شایەتی دەدەم خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە
ئەی مناڵەکانی مودەلەج، خواوەند، پەروەردگار و پشتیوانی منە.))

عوسمان کوڕی ئەبی عاس دەستەیەکی بەسەرکردایەتی عوسمان کوڕی رەبیعە بۆ شەنوە ڕەوانە کرد. دەستەیەك لەتایەفەی ئەزد و بوجەیلە و خەسعەم بەسەرکردایەتی حومەیزە کوڕی نەعمان لەوێ کۆببوونەوە. هەردوو دەستە لەشەنوە رووبەروو یەکبوونەوە و ناباوەڕان شکستیان خوارد و لەدەوری حومەیزە بڵاوەیان لێکرد. حومەیزە هەڵات.

## ناباوەڕانی هۆزی عەك

ئەبوجەعفەر دەڵێت: یەکەم هۆزی تەهامە کەدوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەدین هەڵگەڕایەوە، عەك و ئەشعەرییەکان بوون. کاتێك خەڵکانی عەك لەمردنی پێغەمبەر(د.خ) ئاگادار بوونەوە، دەستەیەك لەوان کۆبوونەوە و دەستەیەك لەئەشعەرییەکان و خەزم پەیوەستیان بوون. لەئەعلاب لەسەر کەنارەکان جێگیر و دەستەیەکی دیکە لەخەڵکان لەدەرویان کۆبوونەوە بێ ئەوەی سەرکردەیان هەبێت.

تاهیر کوڕی ئەبی هالە، ئەبوبەکری لەم رووداوە ئاگادار کردەوە و بۆ هێرش کردنە سەر ئەوان بەرێکەوت. ئەبوبەکری لەڕۆشتنی خۆی ئاگادار کرد. مەسروقی عەکی لەگەڵدا بوو و لەئەعلاب رووبەرووی ئەو دەستەیە بوویەوە و شەڕ دەستپێکرد. خواوەند شکستی بەهەڵگەڕاوەکان بەخشی و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. رێگاکان لەکوژراوەکان بۆگەنیان گرت و ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ موسوڵمانان بوو.

ئەبوبەکر پێش ئەوەی نامەی تاهیر و هەواڵی سەرکەوتنی بەدەست بگات، نووسی: نامەکەی تۆمان بەدەست گەیشت و لەڕۆشتنی تۆ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان و بۆگەنەکانی ئەعلاب ئاگادار بووینەوە، کارێکی چاکت کرد. پەلە بکەن و دەرفەتیان پێمەدەن. لەئەعلاب بمێننەوە تا رێگاکان ئەمن و نامەی منتان بەدەست بگات.

ئەم دەستەیە بەهۆی وتارەکەی ئەبوبەکر بەبۆگەنەکان ناویان دەرکرد و دواتر رێگەکەیان بەرێگەی بۆگەنەکان ناوبرد.

تاهیر دوای تەواو بوون و سەرکەوتن، لەگەڵ مەسروق و خەڵکانی عەکی هاورێی لەرێگەی بۆگەنەکان مایەوە تا فەرمانەکانی ئەبوبەکری بەدەست گەیشت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکی نەجران گەیشت، خەڵکەکەی کەژمارەیان چل هەزار پیاوی شەڕکەر لەمناڵەکانی ئەفعی و پێش مناڵەکانی

حارس لەو سەرزەمینە نیشتەجیّ بوون، دەستەیەکیان بۆ لای ئەبوبەکر نارد تا پەیمانەکەی خۆیان تازە بکەنەوە. کاتێك نێردراوەکان گەیشتن، ئەبوبەکر نامەیەکی بۆ نووسین بەم ناوەرۆکە:

((ئەمە نامەی بەندەی خوا ئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەرە(د.خ) بۆ خەڵکانی نەجران کەئەوان لەسوپاکەی خۆیان و لەخۆیان دەترسێنێت و بەڵێن و پەیمانەکانی محەممەد تازە دەکاتەوە جگە لەوەی محەممەدی پێغەمبەر(د.خ) بەفەرمانی خواوەند سەبارەت بەسەرزەمینی ئەوان و سەرزەمینی عەرەبەکان کەفەرموویەتی: دوو دین لەم سەرزەمینە جێگەی نابێتەوە.

ئەوان سەبارەت بەگیان و دین و سامان و کەسەکانیان (ئەوانەی ئامادەن و ئەوانەی غایبن) ئەسقۆف و قەشە و کەنیسەکانیان لەهەر شوێنێك بن و پاشاکانیان، کەم بن یا زۆر، ئەمانیان پێدەبەخشێت، سەرانەی پاشاکانیان وەك خۆیانە و ئەگەر بیدەن، نابنە شەرکەر و بەشداری شەڕەکان ناکەن و قەشە و ئەسقۆفەکانیان ناگۆڕدرێن و ئەوەی پێغەمبەر(د.خ) بەڵێنی پێداون و لەم نامەدا ئاماژەی پێدراوە، لەلایەن موسوڵمانانەوە رێزی لێدەگیرێت و سەباەرت بەماف ئەوان چاکەخوازی و دوورئەندێشی لەبەر چاو دەگیرێت. مسوەر کوڕی عومەر و عومەر و کۆیلەکەی ئەبوبەکر شایەتی ئەم نامەیەن.))

ئەبوبەکر جەریر کوڕی عەبدوڵلەی بۆ سنووری ئەو نارد و وتی لەخەڵکەکەی خۆی ئەوانەی باوەڕیان بەدین ماوە و لەسەر موسوڵمانی پێداگرن هاوکاری وەربگرێت و شەڕی هەڵگەڕاوەکانی پێبکات. هێرش بکاتە سەر هۆزی خەسعەم و لەگەڵ ئەوان کە بۆ پشتیوانی لەزوئەلخەلسە شۆڕشیان دەستپێکردووە و دەیانەوێت پەیمانەکەیان تازە بکەنەوە، بجەنگێت و کوشتاریان بکات. دواتر بڕواتە نەجران و لەویّ بمێنێتەوە تا نامەی ئەبوبەکری بەدەست دەگات.

جەریر ڕۆشت و فەرمانەکانی ئەبوبەکری ئەنجامدا. کەس بەرگری نەکرد جگە لەدەستەیەکی کەم. ئەوانی کوشت و لەناوی بردن. دواتر ڕۆشتە نەجران و چاوەڕوانی فەرمانەکانی ئەبوبەکری دەکرد.

ئەبوبەکر نامەی بۆ عوسمان کوڕی عاس نووسی تا لەخەڵکانی تاییف لەهەر بەشێك دەستەیەك دیاری بکات و کەسێکی بڕواپێکراوی خۆی بکاتە سەرکردەیان. ئەو، لەهەر بەشێکی تاییف بیست کەسی هەڵبژارد و سەرکردایەتی ئەوانی بەبراکەی خۆی سپارد.

ئەبوبەکر نامەی بۆ عەتاب کوڕی ئەسید نووسی: پێنسەد پیاوی بەهێز لەخەڵکانی

کوفە دەستنیشان و کەسێکی بڕواپێکراوی خۆی بکاتە سەرکردەیان. عەتاب دەستەیەکی هەڵبژارد و خالید کوڕی ئەسیدی برای کردە سەرکردەیان.

کاتێك سەرکردەی دەستەکان دیاریکران، چاوەڕوانی هاتنی فەرمانەکانی ئەبوبەکر و موهاجیران دەکرد.

هەڵگەڕانەوەی دووبارەی

خەڵکانی یەمەن

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەو کەسانەی بۆ دووەم جار لەدین هەڵگەڕانەوە، قەیس کوڕی عەبد یەغوس کوڕی مەکشوح بوو. داستانی هەڵگەڕانەوەی ئەوان لەگێڕانەوەی شەعبی باسی لیوەکراوە: کاتێك هەواڵی مردنی پێغەمبەر(د.خ) بەخەڵکانی یەمەن گەیشت، قەیس لەدین هەڵگەڕایەوە و بۆ کوشتنی فیروز و دازویە و جەشیش هەوڵیدا. ئەبوبەکر نامەی بۆ عومەیر زی موڕان و سەعد زی زود و سەمیفع زو ئەلکەلاع و حوەشب زو ئەلزەڵیم و شەهر زویەناف نووسی و فەرمانی پێدان خۆڕاگری بکەن و لەرێگەی خوا بجەنگن. بەڵێنی ناردنی سوپای پێدان. نامەکەی ئەبوبەکر بەمشێوە بوو:

لەئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)

بۆ عومەیر کوڕی ئەفلەح زو ئەلموڕان

و سەعد کوڕی عاقب زو زود

و و سەمیفع کوڕی ناکور زو ئەلکەلاع

و حوەشب زو ئەلزەڵیم

و شەهر زویەناف

ئەمیرەکان لەبەرابەر دوژمن هاوکاری بکەن و پارێزەری ئەوان بن. گوێ لەفەرمانەکانی فیروز بگرن چوونکە ئەوم وەك سەرکردە هەڵبژاردووە.

عوروە کوڕی غەزیەی دوسەینی دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خەلافەتی گرتەدەست، فیروزی کردە سەرکردە وپێشتر ئەو و دازویە و جەشیش و قەیس هاودڵ و هاوپەیمان بوون. نامەی بۆ سەرانی یەمەن نووسی.

دەڵێت: کاتێك قەیس لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە کەسی بۆ لای زو ئەلکەلاع و هاوەڵانی نارد و وتی: شازادەکان لەسەرزەمینی ئێوە بێگان و بوونەتە ئەرك بۆ ئێوە. ئەگەر ڕێگەیان بدەن، بۆ هەمیشە لەناو ئێمەدا دەمێننەوە. بۆچوونی من ئەویە

سەرکردەکانیان بکوژین و لەم دیارە دەریان بکەین.

بەلاّم زونەلکەلاع و هاوەلاّنی بێزاری خۆیان لەم کارە دەربڕی و هاوکاری ئەویان نەکرد. هاوکاری شازادەکانیشیان نەکرد و بێ لایەن مانەوە، وتیان: کارمان بەم پێشهاتانە نییە، تۆ هاورێی ئەوان بوویت و ئەوان هاورێی تۆن.

قەیس دەیویست سەرکردەی ئەبنا بکوژێت و کەسانی دیکە لەیەمەن دەربکات و بۆ ئەو دەستە سەرگەردانەی خەلّکانی لەحج کە لەیەمەن بەم لاولادا دەڕۆشتن و شەڕیان لەگەلّ هەموو نەیارەکاندا دەکرد، بەشێوەیەکی نهێنی نامەی نووسی و داوای کرد بەپەلە پەیوەستی بن و پەیمانی لەگەلّ ببەستن بۆ ئەوەی شازادەکان لەسەرزەمینی یەمەن دەرپەڕێنن.

لەحەجییەکان رازی بوون و ئاگاداریان کردەوە لەزووترین کاتدا پەیوەستی دەبن. لەناکاو خەلّکانی سەنعا لەنزیك بوونەوەی ئەوان ئاگادار بوونەوە و قەیس ڕۆشتە لای فیروز و وای نیشاندا لەم هەواڵە دەترسێت. دازویە هات و راوێژی لەگەلّ ئەوان کرد تا راستییەکان دابپۆشێت و گومانی خراپیان بەرابەر بەو نەبێت. ئەوان هەڵسەنگاندنیان بۆ وتەکانی کرد و لێی دلّنیا بوون.

رۆژی دواتر قەیس ئەوانی بۆ نان خواردن بانگێشت کرد. بەشێوەیەك بەرنامەی دانا سەرەتا دازویە و دواتر فیروز و دوای ئەوان جەشیش بگات.

لەرۆژی دیاریکراو دازویە ڕۆشت و گەیشتە مالّی قەیس. قەیس ئەوی کوشت و فیروز لەرێگەدابوو. کاتێك لەمالّی قەیس نزیك کەوتەوە، دووژنی بینی لەسەر بانێکەوە قسەیان لەگەلّ یەك دەکرد و وتیان: ئەویش وەك داوزیە دەکوژرێت. فیروز گەڕایەوە. کاتێك قەیس و هاوەلاّنی لەگەڕانەوەی ئەو ئاگادار بوونەوە، شوێنی کەوتن. فیروز هەلاّت و لەرێگە جەشیشی بینی. لەگەلّ ئەو بەرەو کوێستانی خەولان و شوێنی خالّۆکانی فیروز بەرێکەوتن. هەردووکیان بەکێوەکدا سەرکەوتن ولەبەر ئەوەی پێپۆشێکی سووکیان لەپێدابوو، کاتێك گەیشتنە شوێنی مەبەستن قاچیان بریندار و خوێناوی ببوو. سەرئەنجام گەیشتنە خەولان و فیروز پەنای بۆ خالّۆکانی خۆی برد و سوێندی خوارد چیتر پێپۆشی تەنك لەپێ نەکات. سوارەکانی قەیس گەڕانەوە. ئەو لەسەنعا ئالاّی شۆڕشی بەرز کردەوە و دەستی بەسەر شارەکەدا گرت و لەناوچەکانی دەوروبەر خەراجی وەرگرت. بەلاّم هێشتا دوودلّ بوو. لەم کاتەدا سوارەکانی ئەسوەد گەیشتنە لای.

کاتێك فیروز پەنای بۆ خاڵۆکانی خۆی برد، پەنایاندا و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە. ئەو روداوەکانی بۆ ئەبوبەکر نووسی.

قەیس وتی: خەولان و فیروز چین و پەناگەکەیان چ گرنگییەکی هەیە. خەڵکی ئەو هۆزانەی ئەبوبەکر نامەی بۆ نووسیبوون لەدەروی قەیس کۆبوونەوە و سەرکردەکەیان بێ لایەنی خۆیان پاراست. قەیس هێرشی کردە سەر شازادەکان و ئەوانی کردە سێ دەستە. ئەوانەی مابوونەوە لەگەڵ ژن و کەسەکانیان رایگرتن و ئەوانەی بۆ لای فیروز هەڵاتبوون، بۆ دوو دەستە دابەشی کردن، دەستەیەکی بۆ عەدەن نارد تا لەرێگەی دەریاوە بڕۆن و دەستەیەکی لەرێگەی وشکانییەوە نارد و بەهەمووانی وت: بۆ دیاری خۆتان بگەڕێنەوە. کەسی لەگەڵ ئەوان نارد تا رێگەیان نیشان بدات.

ژن و مناڵەکانی دەیلەمی لەرێگەی وشکانییەوە بەرێکران و ژن و مناڵی دازویە لەرێگەی دەریاوە.

کاتێك فیروز بینی خەڵکانی یەمەن لەدەروی قەیس کۆبوونەتەوە و ژن و مناڵەکەی بەرێکەوتوون و تالآن کراون و نەیدەتوانی بۆ رزگار کردنی ئەوان هیچ کارێك بکات و قسەکانی قەیسی بۆ ریسوا کردنی خاڵەکانی بیست، هۆنراوەیەکی بۆ شانازی کردن بەرەچەڵەك و تایەفەکەی خۆی نووسی. ناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

(( رێبوارانی ریخەڵآن و دارخورماکان بانگ بکەن
پێیان بڵێن سەرکۆنە نەکەن
وتاری دوژمنان هەرچەند زۆر دەڵێن
زیانیان لێ نادات
چوونکە دەگەڕێنەوە بۆ لای خەڵکەکەی خۆیان
لەقسەی رێبوارانی رێگە لەریخەڵآن
چاوبپۆشە
هەرچەند ماڵمان لەسەنعایە
بەڵام لەنەژادی گەورەکانین
دەیلەمییەکی دلێر دوای باسل
بەریسوایی رازی نەبوو و گەرمای سوتێنەری لەجیاتی سێبەر هەڵبژارد
کاتێك کەسرا پاشایەتی دەکرد

کێڵگە گەورەکانی عێراق تایبەت بەخەڵکەکەی من بوو
کاتێك باسی ڕەچەڵەکی خۆم بکەم
بەهەمان شێوە کەهەر دارێك بەڕەگی خۆی دەگات
ئەوان منیان پەروەردە کردووە
منیان بەوتاری چاك و ڕەچەڵەکی لەپێش ڕازاندۆتەوە
هێزی ئێمە لەکەمتەرخەمیمان سەبارەت بەدوژمن نییە
چوونکە خواوەند هێز بەکەمتەرخەمەکان نابەخشێت
لەئیسلام دوای بنەماڵەی ئەحمەد کەوتین
لەئیسلام ریسوا نەبووین
ئەگەر سەتڵێك ئاوی خەڵکەکەم منی تەڕ کرد
هیوادرام سەتڵێك ئاوی من ئەوان بخنکێنێت.))

فیروز خۆی بۆ شەڕ ئامادە وکەسی بۆ لای منالەکانی عەقیل کوڕی ڕەبیعە نارد و سەبارەت بەوان دژی ئەوکەسانەی کاروانی خەڵکانیان دەبرد، داوای هاوکاری کرد. خەڵکانی عەقیل بەسەرکردایەتی پیاوێك بەناوی معاویە ڕێگەیان لەپیاوەکانی قەیس بەست و هاوەڵانی کاروانیان کوشت و ژن و منالْ و خەڵکی فیروزیان ڕزگار کرد. ئەوانیان لەگوندێك جێگە کردەوە تا ئەوکاتەی فیروز گەڕایەوە بۆ سەنعا.

خەڵکانی عەقیل و عەك کەسانێکیان بۆ هاوکاری فیروز نارد. ئەو لەگەڵ ئەم دەستە کەمەو ئەوکەسانەی پێشتر لەدەروی کۆببوونەوە، بۆ شەڕی قەیس بەڕێکەوت و لەنزیك سەنعا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. شەڕیان کرد و خواوەند سوپاکەی قەیسی تێکشکاند و خۆی و هاوەڵانی ڕایانکرد. ڕوویان کردە ئەو شوێنەی دوای کوژرانی عەنسی لەوێ بوون. پاشماوەکانی عەنسی هاورێ لەگەڵ قەیس لەنێوان سەنعا و نەجران هاتوچۆیان دەکرد. عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب بۆ پشتڕاستکردنەوەی عەنسییەکان، لەبەرابەر فەروە کوڕی مەسیك ریزی بەستبوو.

عەمرۆ کوڕی سەلمە دەڵێت: داستانی فەروە کوڕی مەسیك بەمشێوەیە: ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و باوەڕی بەئیسلام هێنا. پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: ئەی فەروە، لەو ڕووداوەی لەڕۆژی یوم الزرع بەسەر خەڵکەکەت هات، خەمبار بوویت یا خۆشحاڵ؟

فەروە وتی: هەر کەس ڕووداوێکی هاوشێوەی یوم الزرع بەسەر خەڵکەکەی بێت، بەناچاری دەبێت خەمبار بێت.

یوم الزرع لەنێوان خەڵکی فەروە و هەمەدان سەبارەت بەبتی یەغوس روویدا کەماوەیەك لای خەڵکی فەروە دەمایەوە و ماوەیەك لای خەڵکی هەمەدان. خەڵکی موراد دەیانویست لەکاتی سەرەی هەمەدانییەکان یەغوس بگرن. خەڵکی هەمەدان بەسەرکردایەتی ئەجدەع کوڕی ئەبو مەسروق شەڕیان لەگەڵ کردن.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: بەڵام ئەم رووداوە بووە خۆی خێر بۆ ئەوان.

فەروە وتی: ئەگەر بەو شێوەیە، کەواتە هۆکارێکە بۆ خۆشحاڵی من.

پێغەمبەر(د.خ) ئەوی کردە لێپرسراوی زەکاتی هۆزی موراد و نێشتەجێ بووەکانی سەرزەمینی ئەوان.

عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەگەڵ منالەکانی زوبەید و حەلیفان لەخەڵکی خۆیان سەعد ئەلعەشیرە دابڕان و پەیوەستی خەڵکی موراد بوون. لەگەڵ ئەوان باوەڕی بەئیسلام هێنا و کاتێك ئەسوەد عەنسی لەدین هەڵگەڕایەوە، عەمرۆ لەگەڵ کەسەکانی خۆی پەشیمان بوویەوە و ئەسوەد ئەوی لەبەرابەر فەروە جێگیر کرد. چاودێری کارەکانی یەکتر و سەبارەت بەیەك هۆنراوەیان دەهۆنییەوە. عەمرۆ سەبارەت بەسەرکردایەتی فەروە و ریسوا کردنی هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((پاشایەتی فەروەم بەپاشایەتییەکەی خراپ بینی

کەرێکە و بەقەپۆزی خۆی بۆنی پیسایی دەکات

وکاتێك سەیری باوکی عومەیر بکەیت

لەبۆگەن و جەنایەت هاوشێوەی پیرێژنێکە))

فەروە بەم هۆنراوەیە وەڵامی دایەوە:

((لەباوکی مانگا قسەیەکەم بیست

ئەو پێشتر لەناو ئێسترەکاندا بوو

خواوەند ئەوی کردە دوژمن

لەبەر ئەوەی زۆر گلاو و پیس بوو))

ئەم دوودەستە بەمشێوەیە لەبەرابەر یەك ریزیان بەستبوو تا ئەو کاتەی عێکرەمە و سوپاکەی هاتن.

کوڕی موحەیریز دەڵێت: عێکرەمە لەمەهرەوە بەرەو یەمەن بەرێکەوت و گەیشتە ئەبین. ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی مەهرە و سەعد کوڕی زەید و لەدوو ناجییە و

عەبدقەیس ودەستەیەك لەمناڵەكانی مالك كوڕی كەنانە و عەمرۆ كوڕی جوندەبی لەگەڵدا بوو. دوای ئەوەی دەستەیەك لەهەڵگەڕاوەكانی نەخەعی كوشت، خەڵكی هۆزەكەی خۆی كۆكردەوە و وتی: لەموسوڵمانیدا چۆن بوون؟

وتیان: لەڕۆژگاری جاهلییەت دینی خۆمان بوو و هاوشێوەی عەرەبەكان نەبووین چ بكات بەوەی ئێستا باوەڕمان بەدینێك هێناوە و چاكی و لەپێشییەكانی دەزانین.

كاتێك سەبارەت بەوان پرسیاری كرد، بۆی دەركەوت راستگۆ بوون. خەڵكەكە هەمووی لەسەر دینی ئیسلام مابوونەوە و هەڵگەڕاوەكان هەڵاتبوون.

عێكرەمە كاروبارەكانی خەڵكی نەخەع و حەمیری سامانداـ

قەیس كوڕی عەبد یەغوس بەهۆی هاتنی عێكرەمە پەیوەستی عەمرۆ كوڕی مەعدیكەرب بوو. بەڵام دوای پەیوەست بوون دووبەرەكی لەناویاندا كەوتەوە و سەركۆنەی یەكیان كرد. عەمرۆ كوڕی مەعدیكەرب بۆ كوشتنی شازادەكان و كوشتنی داوزیە و هەڵاتنی لەبەرابەر فیروز، رەخنەی لەقەیس دەگرت.

## داستانی تاهیر كە هاوكاری فیروزی كرد

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: ئەبوبەكر نامەی بۆ تاهیر كوڕی ئەبی هالە نووسی و فەرمانی پێدا بەرەو سەنعا بڕوات و هاوكاری شازادەكان بكات. نامەی بۆ مەسروق نووسی و هەردووكیان بەرێكەوتن و روویان لەسەنعا كرد. نامەی بۆ عەبدوللە كوڕی سور كوڕی ئەسفەر نووسی تا هۆزەكانی عەرەب و خەڵكی تەهامە كۆبكاتەوە و لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە تا فەرمانەكانی پێدەگات.

دەڵێت: سەرەتای هەڵگەڕانەوەی عەمرۆ كوڕی مەعدیكەرب لێرەوە سەرچاوە دەگرێت: ئەو لەگەڵ خالید كوڕی سەعید و دژایەتی ئەوی كرد و شوێن ئەسوەدی عەنسی كەوت. خالید كوڕی سەعید رووبەرووی بوویەوە و چەن جارێك لەسەر خۆ شەڕیان تاقیكردەوە. خالید زەربەیەكی لەبازووی ئەودا و بەندی شمشێرەكەی قرتاند و بریندار بوو. عەمرۆ زەربەیەكی لەخالید بەڵام بێ ئەوەی كاریگەری هەبێت. كاتێك خالید ویستی جارێكی دیكە لێی بدات، عەمرۆ لەچوارپێكەی دابەزی و رووی لەكێوەكە كرد. خالید ئەسپ و شمشێرەكەی ئەو بەناوی سەمسامەی گرت.

عەمرۆ لەگەڵ كەسانی دیكە دووبارە باوەڕی بەئیسلام هێنایەوە. میراتی بنەماڵەی

سەعید کوڕی عاس بەسەعید کوڕی عاس گەیشت و کاتێك بوو بەلێپرسراوی کوفە، عەمرۆ دەیویست کچەکەی خۆی بکاتە هاوسەری ئەو بەلام رازی نەبوو. رۆژێك سەعید رۆشتە مالی عەمرۆ و چەند شمشێرێك کەخالید لەیەمەن دەستی کەوتبوو، لەگەلْ خۆی بردی، وتی: کوا سەمسامە؟

سەعید سەمسامەی نیشاندا و وتی: بیگرە، بۆ خۆت.

عەمرۆ وەریگرت. کۆپانی خستە سەر ئێسترەکەی خۆی و بەشمشێر لێیدا. پالأنەکەی بڕی و لەئێسترەکە چەقی. دواتر شمشێرەکەی دا بەسەعید و وتی: ئەگەر دەهاتیتە مالەکەی من و سەمسامەی هی من دەبوو، دەمبەخشی بەتۆ، ئێستا کەهی تۆیە، وەریناگرمەوە.

باوکی زەرعەی شەیبانی دەلێت: کاتێك موهاجیر کوڕی ئومەییە لەمەدینەوە بەرێکەوت، دوایین کەس بوو. رێگەی مەککەی گرتەبەر و لەویْ تێپەڕی و خالید کوڕی ئەسید پەیوەستی بوو. لەتاییف تێپەڕی و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی عاس پەیوەستی بوو.

ملی رێگەی گرتەبەر تا گەیشتە لای جەریر کوڕی عەبدوللە. جەریر پەیوەستی بوو، کاتێك گەیشتە لای عەبدوللە کوڕی سور، عەبدوللەیش پەیوەستی بوو. گەیشتە لای خەلکی نەجران و فەروە کوڕی مەسیك، پەیوەستی بوو. عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەقەیس جیابوویەوە و بیْ ئەوەی ئەمان وەربگرێت، رۆشتە لای موهاجیر. موهاجیر ئەوی بەستەوە. قەیسی گرت وئەویشی بەستەوە. رووداوەکانی بۆ ئەبوبەکر نووسی.

کاتێك موهاجیر لەنەجران رۆشت و لەلەحجییان نزیك کەوتەوە، سوپاکەی گەمارۆی خستە سەر ئەو دەستە، داوای ئەمانیان کرد و موهاجیر پێی بەخشین. ئەوان بوون بەدوو دەستە و موهاجیر لەرێگەی عەجیب رووبەرووی یەکێك لەو دەستانە بوویەوە و لەناوی بردن. سوارەکانی مەدینە لەریگەی بۆگەنەکان رووبەرووی دەستەکەی دیکە بوونەوە و ئەوانیان کوشتار کرد. عەبدوللە سەرکردەی سوارەکان و لەهەموو شوێنێك شوێن هەلأتووان دەکەوت و دەیکوشتن.

کاتێك قەیس کوڕی عەمرۆیان بردە لای ئەبوبەکر، بەقەیسی وت: هێرشت کردە سەربەندەکانی خوا و ئەوانت کوشت و هاورێیەتیت لەگەلْ هەلگەڕاوەکان و ناباوەڕاندا بەست؟ دەیویست ئەگەر بەلگەیەکی ئاشکرای دەستبکەوێت، بیکوژێت. بەلام قەیس

حاشای لەکوشتنی دازویە کرد. چوونکە کوشتنی ئەو بەنهێنی ئەنجام و هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نەبوو. لەبەر ئەمە ئەبوبەکر لەکوشتنی ئەوچاوی پۆشی.

ئەبوبەکر بەعەمرۆ کوڕی مەعدیکەربی وت: شەرم ناکەیت هەموو جارێك شکست و ئەسیر دەکرێیت، ئەگەر هاوکاری ئەم دینەت دەکرد، خواوەند پێگەیەکی بەرزی پێدەبەخشیت.

عەمرۆ وتی: چیتر دووبارەی ناکەمەوە.

ئەبوبەکر، عەمرۆ و قەیسی بۆ لای خەڵکەکانیان گەڕاندەوە.

موستەنیر دەڵێت: موهاجیر لەعەجیبەوە بەرێکەوت و لەسەنعا نیشتەجێ بوو. فەرمانیدا شوێن هەڵگەڕاوە هەڵاتووەکان بکەون. لەهەر شوێنێك ئەوانیان گرت، کوشتیانن. یاخییەکانی نەبەخشی و بەتۆبەی ئەو کەسانەی یاخی نەبوون و پەشیمانی خۆیان دەربڕی، رازی بوو.

موهاجیر رۆشتنی خۆی بۆ سەنعا و پاشماوەی رووداوەکانی ئەو سەرزەمینەی بۆ ئەبوبەکر نووسی.

## هەڵگەڕانەوەی خەڵکانی حەزەرمەوت

کەسیر کوڕی سەڵت دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد، لێپرسراوی ئەو لەحەزەرمەوت زیاد کوڕی لوبەیدی بەیازی و لێپرسراوی سەکاسەك و سەکوون، عوکاشە کوڕی موحسن و لێپرسراوی کێندە موهاجیربوو. موهاجیر لەمەدینە و تاکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) نەڕۆشتە شوێنی کارەکەی. ئەبوبەکر ئەوی نارد تا شەڕ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی یەمەن بکات و دوای ئەوە، بۆ سنووری کارەکەی خۆی بەرێکەوێت.

عەتا کوڕی فلانی مەخزومی دەڵێت: موهاجیر کوڕی ئومەییە لەسەفەری تەبووك بەجێمابوو. پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی گەڕانەوە لەتەبووك لێی دڵگران و رۆژێك کەدایکی سەلمە سەری پێغەمبەری(د.خ) دەشۆرد، پێی وت: کاتێك تۆ لەبراکەم دڵگیریت، هیچ شتێك کەڵکی بۆ من نییە. پێغەمبەر(د.خ) بەزەیی پیاییدا هاتەوە و فەرمانی بەکۆیلەکەی خۆیدا موهاجیر بانگ بکات. موهاجیر بەرادەیەك پاساوی هێنایەوە تا پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بەخشی و سالاری خەڵکانی کێندەی بەو سپارد.

بەڵام موهاجیر نەخۆش و نەیتوانی بڕواتە شوێنی کارەکەی. نامەی بۆ زیاد نووسی

تاکارەکانی بۆ ئەنجام بدات. دوای چاکبوونەوە، ئەبوبەکر دووبارە ئەوی کردە سەرکردە تا لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانی نەجران و ناوچەکانی یەمەن شەڕ بکات. زیاد و عوکاشە چوونکە چاوەڕوانی ئەو بوون، شەڕیان لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان نەکرد.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: هەڵگەڕانەوەی خەڵکی کێندە لەوێوە سەرچاوەی گرت کە بەبانگەوازەکەی ئەسوەدی عەنسی رازی بوون. خواوەند چوارپاشایەتییەکەی ئەوانی بەنەحلەت کرد. کاتێك خەڵکانی کێندە باوەڕیان بەئیسلام هێنا و خەڵکانی حەزەرمەوتیش بەهەمان شێوە، پێغەمبەر(د.خ) سەبارەت بەو بەشە لەزەکات کەدەبێت لەو ناوچەیە خەرج بکرێت، فەرمانیدا بوو بەشێك لەزەکاتی حەزەرمەوت لەناوچەی کێندە خەرج بکەن و زەکاتی کێندە لەناوچەی حەزەرمەوت و بەشێك لەزەکاتی حەزەرمەوت لەناوچەی سەکوون و بەشێك لەزەکاتی سەکوون لەناوچەی حەزەرمەوت. یەکێك لەمناڵەکانی وەلیعە وتی: ئەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێمە وشترمان نییە، ئەگەر دەتوانیت فەرمان بدە بەشە زەکاتی ئێمە ببەن.

پێغەمبەر(د.خ) بەلێپرسراوانی زەکاتی فەرموو: ئەگەر دەخوازن ئەو کارەیان بۆ بکەن.

وتیان: ئەگەر دڵنیا بووین هۆکاری گواستنەوەیان نییە، ئەوکارەیان بۆ دەکەین.

کاتێك پێغەمبەر(د.خ) مرد و کاتی خەرج کردنی زەکاتەکان گەیشت، زیاد کەسانی بانگێشت کرد. کۆبوونەوە و خەڵکانی مناڵەکانی وەلیعە وتیان، بەهەمان شێوە کەبەڵێنیتان بە پێغەمبەر(د.خ) داوە، بەشە زەکاتی ئێمە بدەن.

وتیان: ئێوە چوارپێتان هەیە و دەبێت خۆتان بیگوازنەوە. بەشێوەیەکی توند لەگەڵیان ئاخاوتن و ئەوانیش پەچەکرداریان لەخۆیان نیشاندا، وتیان: تۆ هاودەستی ئەوان و دژی ئێمەیت.

خەڵکانی حەزەرمەوت زەکاتیان نەدا و کێندییەکان بۆ نەدانی زەکات پێداگری وبۆ سەرزەمینی خۆیان گەڕانەوە و بەدوولێیەوە رۆژگاریان بەسەر دەبرد. زیاد ئەوانی پشتگوێ خست چوونکە چاوەڕوانی موهاجیری دەکرد.

کاتێك موهاجیر رووی کردە سەنعا، سەبارەت بەوەی ئەنجامیدا بوو، نامەی بۆ ئەبوبەکر نووسی و مایەوە تا وەڵامی نامەکەی دەستکەوتەوە. نووسرابوو: رووبکەرە حەزەرمەوت و زیاد لەسەر کارەکەی بهێڵەرەوە و مۆڵەتی گەڕانەوە بەخەڵکان لەهۆزەکانی مەککە و خوارەوەی یەمەن بدە مەگەر ئەوەی خۆیان خوازیاری جیهاد بن.

عوبەید کوڕی عوبەیدەی بۆ هاوکاری کردنی ئەو نارد. نامەی بۆ عیکرەمە نووسی و فەرمانی پێدا بەرەو حەزەرمەوت بڕوات.

کاتێك نامەکەی ئەبوبەکر گەیشت، موهاجیر لەسەنعاوە بەمەبەستی حەزەرمەوت بەڕێکەوت. عیکرەمە لەئەبیەنەوە ڕێگەی حەزەرمەوتی گرتەبەر و لەمارب بەیەك گەیشتن و لەبیابانی سەهید تێپەڕین و ڕۆشتنە ناو حەزەرمەوت. یەکیان لەبەرابەر ئەسوەد سەنگەری گرت و ئەوی دیکەیان سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ هۆزی وائل بوو.

کەسیر کوڕی سەڵت دەڵێت: کاتێك خەڵکانی کێندە گەڕانەوە و زەکاتیان نەدا و خەڵکان حەزەرمەوتیش بەهەمان شێوە، زیاد کوڕی لوبەید بۆ وەرگرتنی زەکاتی منداڵەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە بەڕێکەوت. ئەوان نیشتەجێی ریاز بوون. یەکەم کەس لەو خەڵکە کەزیادی بینی، گەنجێك بەناوی شەیتان کوڕی حوجر بوو. زیاد وشترێکی گەنجی لەناو وشترەکانی زەکات بینی و پەسەندی کرد. ئاگر کردەوە وداغی زەکاتی لێدا. وشترەکە هی عەدا کوڕی حوجر برای شەیتان و لەناو وشترەکانی زەکاتدا نەبوو. شەیتان بەهەڵە ئەوی خستە ناو ریزی وشترەکانی زەکات.

عەدا وتی: ئەم وشترە ناوی شەزرەیە.

شەیتان وتی: براکەم راست دەکات، کاتێك بژاردم گومانم کرد وشترێکی دیکەیە، شەزرە بگەڕێنەرە و وشترێکی دیکە وەربگرە چوونکە ئەوە نادات.

زیاد گومانی کرد لەدانی زەکات، کەمتەرخەمی لەخۆیان نیشان دەدەن. ئەوی بەکافر و ناموسوڵمان لەقەڵەمدا کەبەدوای شەڕ دەگەڕێت. بەتوندی لەگەڵیان پەیڤی و ئەوانیش بەتوندی وەڵامیان دایەوە.

زیاد وتی: سەرنەکەویت و وشترەکەت دەستناکەوێتەوە چوونکە داغی زەکاتی بەرکەوتووە و تایبەتە بەخوا و هیچ ڕێگەیەك بۆ گەڕاندنەوەی بۆ تۆ نییە.

عەدا کاتێك ئەم قسانەی بیست، هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی عەمرۆ، لەریاز ستەمم لێبکرێت و زۆردارەکان زۆرم لێبکەن، ئەو کەسەی لەناو ماڵەکەی خۆی بەستەم رازی ببێت، ریسوایە. هاواری کرد: ئەی باوکی سەمیت، باوکی سەمیت. حارسە کوڕی سوراقە کوڕی مەعدیکەرب هاتە لای زیاد، وتی: وشتری ئەو گەنجە بدەرەوە و وشترێکی دیکە وەربگرە.

زیاد وتی: نابێت.

باوکی سەمیت هاواری کرد: کەواتە تۆ جوولەکەیت. ڕۆشتە لای وشترەکە و ئەژنۆ

بەندی وشترەکەی کردەوە، نەقیزەیەکی لێدا و وشترەکە هەستا.

زیاد فەرمانی بەگەنجەکانی حەزەرمەوت و سەکووندا لێی بدەن. دەستیان بەستەوە و هاورێکانی ئەویان قۆڵبەست کرد. وشترەکەیان وەرگرتەوە و دووبارە ئەژنۆبەندەکەیان بەست.

هاواری خەڵکانی ریاز بەرز بوویەوە و مناڵەکانی معاویە پشتیوانیان لەحارسە و خەڵکی سەکوون و حەزرەمەوت لەزیاد. دوو ئوردووی گەورە لەهەردوولا سازدرا بەلاّم مناڵەکانی معاویە لەبەر ئەسیرەکانی خۆیان هیچ کارێکیان نەکرد و هاوەلاّنی زیاد دژی ئەوان هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو.

زیاد کەسی بۆ لای مناڵەکانی معاویە نارد و وتی: یا سیلاح دابنێن یا بۆ شەڕ ئامادە بن.

وتیان: هەرگیز سیلاح ناخەینە سەر زەوی تا ئەو کاتەی هاورێکانمان رزگار دەکەن.

زیاد وتی: تا بەریسوایی بلاّوەی لێنەکەن، ئازادیان ناکەین. ئەی خەڵکی بۆگەن، مەگەر ئێوە لەحەزەرمەوت نیشتەجێ و دراوسێکانی هۆزی سەکوون نین، ئێوە لەدیاری حەزەرمەوت و دراوسێیەتی ئەوکەسانەی بەسەر ئێوەدا زاڵن، دەتوانن چی بکەن.

خەڵکانی سەکوون وتیان: هێرشیان بکەسەر چوونکە تەنیا لەئەگەری شەڕ دەست لەداواکانی خۆیان هەڵدەگرن. زیاد لەشەودا هێرشی کردە سەریان و کەسانێکی لێ کوشتن و زۆربەیان هەلاّتن.

کاتێ: هەلاّتن، زیاد سێ ئەسیرەکەی ئازاد کرد و سەرکەوتوو بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. کاتێک ئەسیرەکان گەڕانەوە بۆ لای کەسەکانی خۆیان، ئەوانیان سەرکۆنەو خەڵکان بەگەشتی سەرقاڵی سەرکۆنە کردنی یەکتر بوون، وتیان: لەم سەرزەمینە یا جێگەی ئێمە یا جێگەی ئەوان، دەبێت یەکێکمان بروات. کۆبوونەوە و لەشوێنێک ئوردوویان لێدا و بریاریاندا زەکات نەدەن. زیاد پشتگوێی خستن و هێرشی نەکردە سەریان. زیاد کوڕی حوسن کوڕی نەمیری بۆ لای ئەوان نارد و ئەو بەردەوام لەنێوان خەڵکی حەزەرمەوت و سەکەوون هاتوچۆی دەکرد تا پەیمانی ئاشتی لەنێواندا بەسترا. ئەمە شۆڕشی دووەمی خەڵکانی حەزەرمەوت و دوای ماوەیەکی کەم گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

مناڵەکانی معاویە کوڕی عەمرۆ روویان لەسار کرد و سووچێکیان تایبەت کرد

بەخۆیان. بەردچنی بوو و بەموحەجەر ناوی دەرکرد.جەمدو مەخوس و موشرەح و ئەزەعە و خوشکەکەیان عەمردە هەرکام لەموحەجەرێك نیشتەجێ و منالەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە لەدەوری ئەم سەرکردانە کۆبیوونەوە. منالەکانی حارس کوڕی معاویە لەموحەجەرەکانی خۆیان نیشتەجێ بوون، ئەشعەس کوڕی قەیس لەموحەجەرێك و سەمت کوڕی ئەسوەد لەموحەجەرێکی دیکەدا بوو. هەموو منالەکانی معاویە لەسەر نەدانی زەکات رێککەوتن و ئارەزووی هەلگەڕانەوەیان لەسەردا پەروەراند جگە لەشورەحبیل کوڕی سەمت و کوڕەکەی کەدەیانوت: بۆ خەلکانی ئازادە، هەر رۆژە لەسەر دینێك، کارێکی شەرمێنەرە و بۆ چاکەکاران رەوا نییە لەترسی شەرم خۆیان لەچاکییەکان دووربخەنەوە چ بگات بەوەی لەچاکتر و رێگەی راست رووبکەنە گومڕایی، خواوەندا ئێمە لەم کارە هاوکار وهاودەنگی خەلکەکەی خۆمان نین و لەهاوئاهەنگی لەگەلْ ئەوان پەشیمانین. مەبەستیان رووداوی وشترە داغکراوەکە و شۆڕشی دووەم بوو.

شورەحبیل کوڕی سەمت و کوڕەکەی پەیوەستی زیاد کوڕی لوبەید بوون. کوڕی سالح و ئەمرۆ ئەلقەیس کوڕی عابس پەیوەستی زیاد بوون و وتیان: دەستەیەك لەخەلکانی سەکاسەك پەیوەستی ئەم کەسانە بوون و کەسانێك لەخەلکانی حەزەرمەوت و سەکوون لەگەلْ ئەوانن. شەوانە و بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکە سەریان مەگەر ئەوەی لەنێوان ئێمەدا دوژمنی بکەوێتەوە و لەیەك دابڕێین، ئەگەر هێرش نەکەیت دەترسین، خەلکان لەدەوری ئێمە بلاوەی لێبکەن و پەیوەستی ئەوان بن. ئەم خەلکە لەپەیوەست بوونی کەسانی دیکە لەخۆبایی و هیوادارن کەسانی دیکەیش پەیوەستیان بن.

زیاد وتی: بەو شێوەی دەتانەوێت. ئەوانی کۆکردەوە و بەشێوەیەکی لەناکاو لەشەودا هێرشی کردە سەر موحەجەرەکانی ئەوان. ئەوان لەدەروی ئاگرەکانی خۆیان دانیشتبوون و هێرشبەران توانییان کەسانی مەبەستی خۆیان بناسنەوە و سەرقالی شەڕ لەگەلْ منالەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە بوون چوونکە چوارێ و شەڕکەران لەوان بوون. لەپێنج دەستەدا هێرشیان کردە سەر ئەوان. ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا و ئەوەی توانی هەلات منالەکانی عەمرۆ کوڕی معاویە ریسوا بوون و دوای ئەوە دەسەلاتیان بۆ هیچ کارێك نەما

زیاد لەگەلْ ئەسیر و تالانییەکان گەڕایەوە. لای ئوردوگای ئەشعەس و منالەکانی

حارس کوڕی معاویە تێپەڕی. ژنەکانی منداڵەکانی معاویە پاڕانەوە و هاواریان کرد: ئەی ئەشعەس، ئەی ئەشعەس، پوورەکانت دەبەن، پوورەکانت دەبەن. گرژی لەناو منداڵەکانی حارس دروست بوو و ژنەکانیان رزگار کرد.

ئەشعەس دەیزانی کاتێك زیاد و سوپاکەی لەرووداوەکە ئاگادار ببنەوە، لەخۆی و منداڵەکانی حارس کوڕی معاویە دەست هەڵناگرن، منداڵەکانی حارس و منداڵەکانی عەمرۆ و ئەو دەستە لەخەڵکانی سەکاسەك و هۆزەکانی شوێنکەوتەی دەوروبەری خۆی کۆکردەوە.

لەم کاتەدا بارودۆخی هۆزەکانی حەزەرمەوت دیاریکرا: هاوەڵانی زیاد ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون و خەڵکانی کێندە باوەشیان بۆ کوفر کردەوە، کاتێك ریز و باوەڕی هۆزەکان دەرکەوت، زیاد نامەی بۆ موهاجیر نووسی. کەسانی دیکەیش نامەیان نووسی. ئەو عێکرەمەی کردە جێگری خۆی و لەگەڵ سوارەکانی سوپا، سەهید، سارای نێوان مارب و حەزەرمەوتی بەخێرایی بڕی و گەیشتە لای زیاد و روویان لەکێندە کرد. سەرکردەکەیان ئەشعەس و لەموحەجەری زەرقان رووبەروو بوونەوە روویدا و شەڕیان دەستپێکرد. خەڵکانی کێندە شکستیان خوارد و ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا پاشماوەکەیان هەڵاتن و روویان لەنەجیر کرد. ئەو ناوچەیان بەهێز و تۆکمە کردبوو.

موهاجیر لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەموحەجەری زەرقانەوە رووی لەنەجیر کرد. خەڵکانی کێندەی لەگەڵدا بوو. لەوێ گەمارۆیان خرایەسەر. لەخەڵکی سەکاسەك و سەرسەرییەکانی سەکوون و حەزەرمەوت و نەجیر و ئەو کەسانەی فریوی ئەوانیان خواردبوو، لەگەڵ ئەوان بوون. سێ رێگە دەگاتە ئەو شوێنە. زیاد لەسەر یەکێك لەرێگەکان دابەزی و موهاجیر رێگەیەکی دیکەی بەست. رێگەی سێیەم کراوە بوو تا ئەوەی عێکرەمە لەگەڵ سوپاکەی هات و لەو رێگەیە دابەزی و رێگەی گواستنەوە و بردنی خواردەمەنی لێگرتن. عێکرەمە سوارەکانی بۆ هێرش کردنە سەر خەڵکانی کێندە ڕەوانە کرد. یەکێك لەنێردراوەکان یەزید کوڕی قەنان لەمنداڵەکانی مالیك بوو کەخەڵکانی گوندەکانی منداڵەکانی هیندی تا بەرەهوت کوشتار کرد. خالید کوڕی فلانی مەخزومی و رەبیعەی حەزرەمی بەرەو کەنارەکان نارد و خەڵکی مەخا و تایەفەکانی دیکەیان کوشت و کێندیەکان لەبازنەی گەمارۆکە، لەو بەڵایەی بەسەر خەڵکەکەیان

هات، ئاگادار بوونەوە و وتیان: مەرگ باشتر لەم بارودۆخەیە، ناوچاوانی خۆتان بتاشن وەك بلێی خۆتان بۆ ڕێگەی خوا تەرخان کردووە و ئەو نیعمەتی پێبەخشیون و نزیك لەون، ئەگەری هەیە بەسەر ئەم ستەمکارانە، سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت. ناوچاوی خۆیان تاشی و بەڵێنیاندا پشت نەکەنە گۆڕەپانی شەڕ و ڕانەکەن. یەکیان لەکاتی شەو لەسەر دیواری شارەکە هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((بۆمناڵەکانی قەتیرە و ئەمیری مناڵەکانی موغەیرە

بەرەبەیانێکی شوومە)).

شاعیری موسوڵمانان وەڵامی دەدایەوە.

بۆ بەیانی هاتنەدەر و لەدەوروبەری نەجیر شەڕێکی دژوار دەستپێکرد. کەسانێکی زۆر لەسەر ڕێگەکانی نەجیر کوژران و خەڵکانی کێندە شکستیان خوارد.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: دوای ئەوەی موهاجیر شکستی بەخەڵکانی کێندە هێنا، عێکرەمە گەیشت و زیاد و موهاجیرە بەسوپاکەی خۆیان وت: براکانی ئێوە بۆ هاوکاری ئێوە هاتوون و ئێوە پێش ئەوان سەرکەوتنتان بەدەست هێنا، بەڵام لەتالآنییەکان ئەوان بکەنە شەریك. ئەو کارەیان کرد و سوپاکەی عێکرەمەیان لەتالآنییەکان کردە شەریك. پێنج یەکیان لەگەڵ ئەسیرەکان بۆ مەدینە نارد. مژدەدەر پێش ئەوان ڕۆشت و هۆنراوەی سەرکەوتنی بۆ ئەوان خوێندەوە.

سەری دەڵێت: ئەبوبەکر، بەموغەیرە کوڕی شوعبە نامەیەکی بۆ موهاجیر نووسی بەم ناوەرۆکە: کاتێك ئەم نامە بەدەستی ئێوە بگات و ئەگەر هێشتا سەرکەوتنتان بەدەست نەهێناوە، ئەگەر شەڕتان کرد و سەرکەوتنتان بەدەست هێنا، شەڕکەران بکوژن و ژن و مناڵەکان ئەسیر بکەن یا بەفەرمانی من خۆیان بدەن بەدەستەوە و ئەگەر پێش گەیشتنی نامەکەی من پەیمانی ئاشتیتان بەستووە، دەبێت سەرزەمینەکەی خۆیان بەجێ بهێڵن چوونکە پەسەندی ناکەم ئەو کەسانەی ئەو کردەوانەیان ئەنجامداوە، لەشوێنی خۆیان بهێڵمەوە، دەبێت بزانن خراپەیان کردووە و سزای کردەوەکانی خۆیان بچێژن.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێ دانیشتووانی نەجیر بینیان بەردەوام هێزی پشتیوانی موسوڵمانان دەگەن و دڵنیا بوون دەستیان لێ هەڵناگرن، ترسان وسەرکردەکانی خەڵك، مەترسی گیانی خۆیان لا دروست بوو. ئەگەر چاوەڕوان دەبوون تا موغەیرە بگات دەیانواتی لەسەر بنەمای بەجێهێشتنی سەرزەمینەکەی خۆیان، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ موسوڵمانان واژۆ بکەن، بەڵام ئەشعەس پەلەی کرد و ئەمانی لەعێکرەمە وەرگرت و

ڕۆشتە لای چونكە تەنیا بڕوای بەو بوو لەبەر ئەوەی عێكرەمە ئەسما كچی نەعمان كوڕی حوزنی وەك هاوسەر هەڵبژاردبوو. ئەم هاوسەرگیرییە لەكاتێكدا بەسترا كە لەجوند چاوەڕوانی موهاجیری دەكرد. نەعمان پێش ئەوەی شەڕ دەستپێبكات كچەكەی خۆی كردە هاوسەری ئەو. عێكرەمە ئەشعەسی بۆ لای موهاجیر نارد و داوای ئەمانی بۆ خۆی و نۆ كەس لەهاوەڵانی كرد كەخۆیان و كەسەكانیان لەئەماندا بن بەو مەرجەی دەرگاكان بكەنەوە. موهاجیر ڕازی بوو وپێی وت: پەیمان نامەكە بنووسە و بیهێنە تا واژۆی بكەم.

سەعید كوڕی ئەبی بەردە دەڵێت: ئەشعەس ڕۆشتە لای موهاجیر و بۆ ماڵ منداڵی خۆی و نۆ لەهاوەڵانی داوای ئەمانی كرد بەو مەرجەی دەرگاكان بكەنەوە و باوەڕ بەئیسلام بێنن. موهاجیر وتی: بۆ ئەوەی دەخوازیت بینووسە و پەلە بكە. ئەو پەیمان نامەكەی نووسی و ناوی برا و ئامۆزاكانی خۆی برد بەڵام لەتاو پەلەپەل ناوی خۆی لەبیر كرد. نووسراوەكەی هێنا و موهاجیر واژۆی كرد. گەڕایەوە و ئەو كەسانەی ناویان لەپەیمان نامەكەدا بوو، ئەمانیان پێ بەخشرا.

موجالید دەڵێت: كاتێك ئەشعەس دەیوست ناوی خۆی بنووسێت، مەجدەم كێرد بەدەست لەسەر سەری ئامادە بوو، وتی: ئەگەر ناوی من نەنووسیت، دەتكوژم. ئەو ناوی مەجدەمی نووسی و خۆی لەبیر كرد.

باوكی ئیسحاق دەڵێت: كاتێك دەرگا كرایەوە و موسوڵمانان هێرشیان برد، هەموو پیاوە شەڕكەرەكانیان كوشت، دەستی هەموویانیان بەستەوە و سەریان پەڕاندن. لەنەجیر و خەندەق هەزار ژنیان ئەسیر كرد. بۆ تاڵانی و ئەسیرەكان پاسەوانیان دانا. كەسیر كوڕی سەڵت یەكێك بوو لەوان.

كەسیر دەڵێت: كاتێك دەرگاكان كرانەوە و ڕۆژگاری خەڵكانی نەجیر كۆتایی هات و تاڵانییەكان حسێب كران، ئەشعەس ئەوكەسانەی كۆكردەوە كەئەمانیان پێبەخشرابوو. هەركەس ناوی لەپەیمان نامەكەدا بوو، گیانی پارێزراو بوو بەڵام ناوی ئەشعەسیان نەبینی. موهاجیر وتی: سپاس بۆ خوا نەیهێشت بەمەبەستەكەت بگەیت، ئەی دوژمنی خوا، ئارەزووی ڕیسوایی تۆم دەكرد. ئەوی بەستەوە و ویستی بیكوژێت، بەڵام عێكرەمە وتی: مەیكوژە و ڕەوانەی ئەبوبەكری بكە چوونكە باشتر دەزانێت لەمبارەو فەرمان بدات. ئەگەر كەسێك لەبیری كردووە ناوی خۆی بنووسێت بەڵام نێوەنجیگەری

ئەم کارە بووە و لەبیر چوونەوە، کارەکەی ئەو هەڵناوەشێنێتەوە.

موهاجیر وتی: بابەتەکە ئاشکرایە، بەڵام راوێژ کردنم پێ باشترە. ئەشعەسی لەگەڵ ئەسیرەکان بۆ مەدینە نارد. موسوڵمانان بەنەحلەتیان دەکرد و ئەسیرەکانی دیکەیان بەمەلعون دەزانی. ژنان ئەویان بەعەوف ئەلنار ناوبرد کە لەزمانی خەڵکانی یەمەن بەمانای خیانەتکارە.

موغەیرە لەشەودا رێگەی ون کرد تا خواوەند مەبەستەکەی خۆی بێنێتەدی. کاتێك گەیشتە لای موهاجیر، خەڵکان لەخوێنی خۆیان گەوزابوون. ئەسیرەکانیان ئامادە و بەرێکەوتن.

کاتێك هەواڵی سەرکەوتن گەیشتنە لای ئەبوبەکر، ئەشعەسی بانگ کرد و وتی: مناڵەکانی وەلیعە تۆیان گومڕا کرد و تۆ ئەوانت گومڕا نەکرد چوونکە شیاوی ئەم کارە نەبوویت، ئەوان لەناوچوون، تۆیشیان لەناو برد، ناترسیت نفرینی پێغەمبەر(د.خ) تۆی گرتبێتەوە، گومان دەکەیت چیت لێ دەکەم؟

وتی: من سەبارەت بەخوێنی دەکەس وتووێژم کرد و خوێنی من حەڵاڵ نییە.

ئەبوبەکر وتی: ئایا رازی بوون؟

وتی: بەڵێ.

وتی: نووسراوەکەت بۆ بردن و واژۆیان کرد؟

ئەشعەس وتی: بەڵێ.

وتی: پەیمان نامەکە دوای مۆر کردن تەنیا سەبارەت بەو کەسانە جێبەجێ دەکرێت کەناویان ئاماژەی پێدرابێت و تۆ تەنیا لایەنێکی وتووێژەکە بوویت.

کاتێك ئەشعەس بۆ گیانی خۆی ترسا، وتی: چاکەم لەگەڵ بکە و بمبەخشە، لەگوناحەکەم خۆش و بەئیسلامەکەم رازی ببە، هاوشێوەی کەسانی دیکە هەڵسوکەوتم لەگەڵ بکە و ژنەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە.

ئەم قسەی لەبەر ئەوە وت چوونکە ئەو کاتەی لەمەدینە ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ)، دایکی فەروە کچی باوکی قوحافەی خوازبێنی کرد. ئەویان کردە هاوسەری. ئەوی لەمەدینە دانا تا جارێکی دیکە بگەڕێتەوە. پێغەمبەر(د.خ) مرد و ئەشعەس لەدین هەڵگەڕایەوە.

دەترسا لەوەی ئەبوبەکر وەڵامی نەداتەوە، وتی: دڵنیا بە بۆ دینی خوا باشتر لەهەموو خەڵکان دەبم.

ئەبوبەکر لەخوێنی ئەو چاوی پۆشی و کەسەکانی بۆ گەڕاندەوە و وتی: بڕۆ، هیوادارم هەواڵی دڵخۆشکەر لەتۆ ببیستم. ئەوانی ئازاد کردو ڕۆشتن. پێنج یەکی تالانییەکانی لەناو خەڵکان و چوار لەسەر پێنجی لەسەر سوپاییەکان دابەش کرد.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەلام لەگێڕانەوەی عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکردا هاتووە: کاتێك لەمەدینە ئەشعەسیان بردە لای ئەبوبەکر، وتی: خۆت دەزانی چیت کردووە، گومان دەکەیت چی لەتۆ دەکەم.

وتی: منەتم دەخەیتە سەرو رزگارم دەکەیت و خوشکەکەت دەکەیتە هاوسەری من چوونکە پەشیمان بوومەوە و ئێستا موسوڵمانم.

ئەبوبەکر وتی: ئەو کارە دەکەم. دایکی فەروە خوشکەکەی خۆی کردە هاوسەری ئەشعەس. ئەشعەس لەمەدینە مایەوە تا ئەو کاتەی عێراق دەستی بەسەردا گیرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتەدەست، وتی: خواوەند سنوورەکانی ئێوەی فراوان و ولاتی عەجەمەکان دەستی بەسەردا گیراوە، کارێکی قێزەونە عەرەبەکان خاوەنی یەکتر بن. سەبارەت بەبەهای ئازادی ئەسیرەکان عەرەب کە لەرۆژگاری جاهلییەت و ئیسلام ئەسیر کرابوون، راوێژی کرد جگە لەو ژنانەی بۆ خاوەنەکانی خۆیان منالیان هێنابوویە دنیا. بەهای ئازادی ئەوانی بەحەوت یا شەش وشتر خەملاند. سەبارەت بەخەڵکانی حەنیفە و کێندە و دەبا کەپیاوەکانیان کوژرا بوو و هەروەها ئەوکەسانەی بێ سەرپەرەست بوون، بەهاکەیان دابەزاند. خەڵکان بۆ دۆزینەوەی هاوسەرەکانی خۆیان روویان لەهەموو سووچ و قوژبنەکان کرد. ئەشعەس لەناو منالەکانی نەهد و غەتیف دوو لەژنەکانی خۆی دۆزییەوە. ئەو، لەناو ئەم دوو تایەفەی قسە و سەبارەت بەغەراب و هەڵۆ پرسیاری کرد.

وتیان: مەبەستت چییە؟

وتی: لەشەڕی نەجیر هەڵۆکان و گورگەکان وسەگەکان و کەمتیارەکان ژنەکانی ئێمەیان ڕفاند.

خەڵکانی غەتیف وتیان: غەراب لای ئێمەیە.

وتی: بارودۆخی ئەو لای ئێوە چۆنە؟

وتیان: پارێزراو و ڕێزدار.

وتی: زۆر باشە. لەوێ ڕۆشت.

عومەر بڕیاریدا هیچ عەرەبێك بەندە نەبێت. موسوڵمانان لەسەر ئەمە ڕێككەوتن. موهاجیر لەكاری كچی نەعمان كوڕی حەزن وردبوویەوە، ئەو كچەكەی خۆی پێشكەشی پێغەمبەر(د.خ) كردبوو، وتبوویان، هەرگیز نەخۆش نەكەتووە، پێغەمبەر(د.خ) دوای ئەوەی ڕووبەڕووی دانیشت، فەرمووی: پێویستم پێی نییە، ئەگەر خێری دەبوو، نەخۆش دەكەوت.

موهاجیر سەبارەت بەم ژنە لەعێكرەمە پرسیاری كرد: كەی ئەوت كردە هاوسەری خۆت؟

وتی: ئەو كاتەی لەعەدەن بووم، لەجوند ئەویان هێنایە لای من، ناردم بۆ مارب و دواتر هێنامە ئوردووگاكەی خۆم.

دەستەیەك وتیان: تەلاقی بە چوونكە شیاو نییە.

دەستەیەكی دیكە وتیان: تەلاقی مەدە.

موهاجیر سەبارەت بەو ژنە نامەی بۆ ئەبوبەكر نووسی و پرسیاری لێكرد.

ئەبوبەكر وەڵامی دایەوە: باوكی ئەو نەعمان كوڕی حەزن هاتە لای پێغەمبەر(د.خ) وەسفی كچەكەی خۆی كرد و پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی، بیهێنێت. كاتێك هێنای وتی: ئەمەیش بڵێم هیچ كات نەخۆش نەكەوتووە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ئەگەر خێری دەبوو، نەخۆش دەكەوت. چاوی لێ پۆشی و كەس نەیویست بیكاتە هاوسەری خۆی.

دوای ئەوەی عومەر وتی: بەهای ئازادی دیلە عەرەبەكان بدەن، چەند كەسێكیان لای قوڕەیشییەكان مانەوە. یەك لەوان بوشرا كچی قەیس كوڕی ئەبی ئەلكەسیم و لای سەعد كوڕی مالیك بوو. عومەر لەو ژنە چاوی بەدنیا هەڵهێنا. زەرعە كچی موشەرەح لای عەبدوللە كوڕی عەباس و عەلی هێنایە دنیا.

ئەبوبەكر نامەی بۆ موهاجیر نووسی و ئەوی لەنێوان لێپرسراویەتی یەمەن یا حەزرەمەوت سەرپشك كرد. موهاجیر یەمەنی هەڵبژارد. یەمەن دوو سەركردەی بوو: فیروز و موهاجیر. حەزرەمەوتیش دوو سەركردە: عوبەیدە كوڕی سەعد سالاری كێندە و سەكاسەك و زیاد كوڕی لوبەید سەركردەی حەزەرمەوت.

ئەبوبەكر بۆ لێپرسراوی ئەو شوێنانەی خەڵكەكەیان لەدین هەڵگەڕابوونەوە، نامەی نووسی: حەز دەكەم كاروبارەكان بەكەسانێك بسپێرن كە لەدین هەڵنەگەڕابێتنەوە. كارەكان بەوان بسپێرن و هەركەس نەخوازێت، كارتان پێی نەبێت و بۆ جیهاد لەرێگەی

خوا هاوکاری لەهەڵگەڕاوەکان وەرمەگرن.

زوحاک کوڕی خەلیفە دەڵێت: دوو ژنی گۆرانیبێژ کەوتنە دەستی موهاجیر. یەکیان لەگۆرانییەکانی خۆی جوێنی بە پێغەمبەر(د.خ) دەدا و دەستی ئەوی بڕی و دوودانی پێشەوەی هەڵکەند.

ئەبوبەکر لەمبارەوە نامەی بۆ نووسی: لەکردەوەی تۆ سەبارەت بەو ژنەی جوێنی بە پێغەمبەر(د.خ) دەدا، ئاگادار بوومەوە، ئەگەر ئەو کارەت نەدەکرد، فەرمانی کوشتنی ئەوم دەدا چوونکە سنووری ئیهانە کردن بەپێغەمبەران وەك سنووری کەسانی دیکە نییە و هەر موسوڵمانێك ئەو کارە بکات، یەکێکە لەهەڵگەڕاوەکان و ئەگەر هاوپەیمانی موسوڵمانەکان بێت، شەڕئەنگێزە و پەیمان شکێن.

هەروەها ئەبوبەکر سەبارەت بەو ژنەی لەگۆرانییەکانی خۆی جوێنی بەموسوڵمانان دەدا، بۆ موهاجیری نووسی: بیستوومە دەستی ژنێکت بڕیوەتەوە کە لەگۆرانییەکانی خۆی جوێن بەموسوڵمانان دەدات و دانەکانی پێشەوەی ئەوت هەڵکەندووە، ئەگەر خۆی بەموسوڵمان دەزانی، دەبوا تەمێی بکەیت و پێویستی بەدەست بڕینەوە و هەڵکێشانی دان نەدەکرد، ئەگەر کافرە، چاوپۆشین لەگوناحەکەی ئەو ڕەوا نەبوو، ئەگەر لێکۆڵینەوەم لەم کارەی تۆ دەکرد، بارودۆخت ناسازگار دەبوو، بەسەرکۆنەکەی من ڕازیبە و هەرگیز ئەندامی کەسێك مەبڕەوە مەگەر بەمەبەستی قیساس بێت، چوونکە گوناحە و هۆکاری بێزاری.

لەم ساڵەدا، یانی ساڵی یانزەیەمی کۆچ، مەعاز کوڕی جەبەل لەیەمەن گەڕایەوە و ئەبوبەکر عومەری وەك سەرپەرەستی کاروباری داوەری دەستنیشان کرد. لەهەموو ڕۆژگاری خەلافەتی ئەبوبەکر، عومەر بەرپرسیاری داوەری بوو.

لەم ساڵەدا ئەبوبەکر، عەتاب کوڕی ئەسیدی کردە سەرپەرەستی حەج و حاجییەکان. ئەم حەدیسەیان لەعەلی کوڕی محەممەد گێڕاوەتەوە. دەستەیەکی دیکە وتوویانە: لەساڵی یانزەیەم، عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف ڕێ و ڕەسمەکانی حەجی لەگەڵ خەڵکان ئەنجامدا. ئەبوبەکر ئەم کارەی پێسپارد.

## ساڵی دوانزەیەمی کۆچ

ئەبوجەعفەر دەڵێت: کاتێك خالید لەکاروباری یەمامە تەواو بوو، ئەبوبەکری راستگۆ نامەی بۆ نووسی تا بەرەو عێراق بڕوات. فەرمانی پێدا سەرەتا لەدەروازەی ئۆبلەوە دەستپێبکات و لەگەڵ پارسەکان و کەسانی سنووری پاشایەتی ئەوان بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوت بکات.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر خالیدی بۆ شاری کوفە نارد کە موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی لەوێ بوو. خالید لەموحەرەم ساڵی دوانزەی کۆچ بەرەو ئەو شوێنە بەرێکەوت و لەبەسرە تێپەڕی کەقوتبە کوڕی قتادەی سەدووسی لەوێ بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەڵام بەپێی وتەی واقدی سەبارەت بەکارەکانی خالید جیاوازی هەیە. دەستەیەك وتوویانە لەیەمامە یەکسەر بەرەو عێراق ڕۆشت و لەچەند گوندێك بەناوی بانقیا و باروسما و ئەلیس دابەزی و خەڵکانی ئەو ناوچانە بەشێوەیەکی ئاشتیانە پێشوازیان لێکرد. لایەنی ئاشتی سوڵح کوڕی ئەبی سەڵوبا بوو. ئەم پێشهاتە لەساڵی دوانزەیەمی کۆچ روویدا. خالید جەزیەی لێوەرگرت و پەیمانێکی بۆ نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بسم الرحمان الرحیم. لەخالید کوڕی وەلید بۆ کوڕی سەلوبای سەوادی کە لەکەناری فورات نیشتەجێیە. تۆیەی ئەمانی خواوەند کەخوێنی ئەو بەدانی جەزیە پارێزراوە و تۆ بۆ خۆت و کەسەکان و خەڵکەکەت لەدوو گوندی بانقیا و باروسما، هەزار دەرەمت داوە و من رازی بووم و ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵ منن، ڕەزامەندن و لەبەرابەردا تۆ لەپەنای خوا و لەپەنای موسوڵماناندایت و هوشام کوڕی وەلید شایەتی ئەم پەیمانەیە.))

خالید و سوپاکەی بەرێکەوتن و گەیشتە حیرەو سەرکردەکانی ئەو سەرزەمینە لەگەڵ قەبیسە کوڕی ئەیاس کوڕی حەیەی تایی هاتنە لای. قەبیسە دوای نەعمان کوڕی مونزەر لەلایەن کەسراوە پاشایەتی حیرەی پێبڕابوو. خالید بەو وهاوەڵانی وت: پێشنیاری خواپەرەستی و ئیسلامتان پێدەکەم، ئەگەر رازی بن و باوەڕ بێن ئەرك و مافەکانی ئێوە هاوشێوەی موسوڵمانان دەبێت و ئەگەر رازی نەبن، دەبێت جەزیە بدەن، کەسانێکم لەگەڵدایە مەرگیان زیاتر لەوە خۆش دەوێت کەئێوە ژیانتان خۆش دەوێت، لەگەڵ ئێوە دەجەنگین تا ئەو کاتەی خواوەند لەنێوان ئێمەدا داوەری دەکات.

قەبیسە کوڕی ئەیاس پێی وت: ئێمە پێویستمان بەشەڕ لەگەڵ تۆ نییە، لەسەر دینەکەی خۆمان دەمێنینەوە و جەزیە دەدەین. خالید لەسەر وەرگرتنی نەوەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. ئەمە یەکەم جەزیە بوو موسوڵمانان لەعێراق دەستیان کەوت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەڵام بەوتەی هوشامی کەلبی، کاتێك ئەبوبەکر فەرمانی بۆ خالید کوڕی وەلید نووسی تا بەرەو شام بڕوات، فەرمانی پێدا لەعێراقەوە دەست پێبکات و لەوێ تێپەڕێت. خالید بەرێکەوت و لەنەباح دابەزی.

هوشام دەڵێت: موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی لەعێراقەوە ڕۆشتە مەدینە بۆ لای ئەبوبەکر و وتی: من بکە سەرکردەی خەڵکەکەی خۆم تا لەگەڵ فارسەکانی سنووری خۆم، بجەنگم و کاروباری ناوچەکەم سامان بدەم. ئەبوبەکر ئەوی کردە سەرکردە. ئەو ڕۆشت و خەڵکەکەی خۆی کۆکردەوە و هێرش و پەلامارەکانی دەستپێکرد. جارێك هێرشی دەکردە سەر ناوچەی کەسکەر و جارێك هێرشی دەکردە سەر خوارەوەی فورات.

کاتێك خالید کوڕی وەلید گەیشتە نەباح، موسەنا کوڕی حارسە لەخەفان ئوردووی لێدابوو. خالید نامەی بۆ نارد و فەرمانی پێدا پەیوەستی ببێت. نامەی ئەبوبەکریشی بۆ نارد کەفەرمانی پێدەدا ملکەچی فەرمانەکانی خالید کوڕی وەلید بێت. موسەنا بەخێرایی پەیوەستی بوو. بەگومانی خەڵکانی عیجل یەکێك لەوان بەناوی مەزعور کوڕی عودەی هاوڕێ لەگەڵ موسەنا ڕۆشتبووە مەدینە و لەگەڵ ئەو کێشەی بۆ دروست بوو. نامەیان بۆ ئەبوبەکر نووسی و ئەو نامەی بۆ پیاوی عێجلی نووسی و فەرمانی پێدا هاوڕێ لەگەڵ خالید بەرەو شام بڕوات. موسەنای لەوێ هێشتەوە و پیاوی عیجلی تا میسر ڕۆشت و پێگەی بەرز بوویەوە و ئێستاماڵەکەی لەمیسر بەناوبانگە.

خالید لەعێراق پێشڕەوی کرد و جابان سەرکردەی گوندی ئەلیس ڕێگەی ئەوی بست. خالید موسەنا کوڕی حارسەی بۆ شەڕی ئەو نارد. لەکەنار ڕووبارێك لەوێ ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەبەر ئەمە بەڕووداوی ڕووباری خوێن ناوی دەرکرد. زۆربەی هاوەڵانی کوژران و لەگەڵ خەڵکانی ئەلیس پەیمانی ئاشتی بەست و پێشڕەوی کرد تا گەیشتە حیرە. سوارە ئازادەکان بەسەرکردایەتی سوپاکەی کەسرا کە لەئوردووگاکانی بەرابەر عەرەبەکان بوون، هاتن و لەشوێنی ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕووداوەکان لەگەڵ

سوپاکەی خالید شەڕیان کرد. موسەنا کوڕی حارسەی بۆ هاوکاری ئەو نارد و شکستیان خوارد.

کاتێك خەڵکانی حیرە ئەمەیان بینی، بۆ پێشوازی کردن لەخالید بەرێکەوتن. عەبدولمەسیح کوڕی عەمرۆ کوڕی بەقیلە و هانی کوڕی قەبیسە لەناویاندا دەبینران.

خالید بەعەبدولمەسیحی وت: لەکوێوە هاتوویت؟

وتی: لەپشتی باوکم.

خالید وتی: یانی لەکوێوە هاتوویتەدەر؟

وتی: لەسکی دایکم؟

خالید وتی: لەسەر چیت؟

وتی: لەسەر زەوی.

خالید وتی: یانی لەناو چیت؟

وتی: جلەکانم.

خالید وتی: ئاوزت هەیە؟

وتی: بەڵێ، بەندیشم هەیە..

خالید وتی: پرسیارم لێکردیت.

وتی: منیش وەڵامم دایتەوە.

خالید وتی: بەئاشتی یا بەجەنگ؟

وتی: ئاشتی.

خالید وتی: ئەی ئەم قەڵایانە چییە.

وتی: ئەم قەڵایانەمان دروست کرد تا ڕێگە لەنەزان بگرێت و ئاوزدار بێت و لەبەر دەرگا بیگرێت.

خالید بەخەڵکانی حیرەی وت: پێشنیاری خواپەرەستی و ئیسلامتان پێدەکەم، ئەگەر ڕازی بن ئەرك و مافی ئێوە هاوشێوەی ئێمەیە و ئەگەر ڕازی نەبن دەبێت باج و جەزیە بدەن. ئەگەر بەمەیش ڕازی نەبن هاوڕێ لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەی خوازیاری مەرگن، لەگەڵتان دەجەنگم.

وتیان: پێویستمان بەشەڕ کردن لەگەڵ تۆ نییە.

خالید لەسەر بنەمای وەرگرتنی سەد و نەوەد هەزار درەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. ئەمە یەکەم جەزیە بوو لەعێراقەوە ڕەوانەی مەدینە کرا.

خالید لەبانقیا دابەزی و لەگەڵ بەسبەهری کوڕی سەلوبا لەسەر وەرگرتنی هەزار درەم و یەك عابا پەیمانی ئاشتی بەست و پەیمان نامەیەکی بۆ خەڵکی ئەو ناوچەیە نووسی. ئاشتی خالید لەگەڵ خەڵکانی حیرە بەم مەرجە بوو هاوشێوەی سیخوڕەکان لەدەنگ و باسەکان ئاگاداری بکەنەوە و ئەوان رازی بوون.

شەعبی دەڵێت: منداڵەکانی بەقیلە پەیمانەکەی خالید کوڕی وەلید کەبۆ خەڵکانی مەداینی نووسی بوو، بۆ منیان هێنا. خوێندمەوە و نووسرا بوو:

لەخالید کوڕی وەلید بۆ سنوورداره پارسییەکان. سڵاو لەو کەسەی خوازیاری رزگاری بێت. سپاسی خوا دەکەم کەخزمەتەکارانی ئێوەی بڵاوە پێکرد و پاشایەتی لێ سەندنەوە و رێز و گەورەیی ئێوەی لەناو برد. هەرکەس هاوشێوەی ئێمە نوێژ بکات و روو بکاتە قیبلە و قوربانی ئێمە بخوات، ئەرك و مافەکانی هاوشێوەی ئێمەیە.

کاتێك ئەم نامەی من بەدەستی ئێوە دەگات، چەندین کەس وەك بارمتە بۆ لای من بنێرن و خۆتان بەدەستەوە بدەن و گەرنە سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، کەسانێك بۆ لای ئێوە ڕەوانە دەکەم بەو ئەندازەیە مەرگیان خۆش دەوێت کەئێوە ژیانتان خۆش دەوێت))

کاتێك خەڵکی مەداین نامەکەی خالیدیان خوێندەوە، سەریانسوڕما. ئەمە لەساڵی دوانزەیەم بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەڵام گێڕانەوەی شەعبی سەبارەت بەخالید و ڕۆشتنی ئەو بۆ عێراق بەمشێوەیە: کاتێك لەیەمامە تەواو بوو، ئەبوبەکر نامەی بۆ نووسی: ئێستا کەخواوەند سەرکەوتنی پێبەخشیت، بەرە عێراق بڕۆ تا پەیوەستی عەیاز ببیت و نامەی بۆ عەیاز کوڕی غەنەم نووسی کە لەنێوان نەباج و حیجاز بوو تا بەرەو مەسیخ بڕوات و لەسەرەوەی عێراق بڕواتە ناو ئەو سەرزەمینە و پێشڕەوی بکە تا پەیوەستی خالید دەبیت. هەر کەس دەخوازێت بگەڕێتەوە، مۆڵەتی پێبدەن و کەس بەنابەدڵ لەگەڵ خۆتان مەبەن.

دەڵێت: کاتێك نامەکانی ئەبوبەکر بەخالید و عەیاز گەیشت وبەفەرمانی ئەبوبەکر مۆڵەتی گەڕانەوەیان بەخەڵکاندا، هەموو خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری گەڕانەوە و دەوریان چۆڵ بوو. داوای هاوکارییان لەئەبوبەکر کرد وئەو، قەعقاع کوڕی عەمرۆ تەمیمی بۆ هاوکاری خالید ڕەوانە کرد. پێیان وت: بۆ هاوکاری کەسێك دەڕۆیت

سوپاکەی لەدەوری بلاّو بوونەتەوە.

قەعقاع وتی: سوپایەك کەسێکی وەك خالید سەرکردەی بێت، هیچ کات شکست ناخوات.

هەروەها ئەبوبەکر عەبدوللە کوڕی عەوف حەمیری بۆ هاوکاری عەیاز نارد.

ئەبوبەکر نامەی بۆ خالید و عەیاز نووسی تا ئەو کەسانەی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان شەڕیان کردووە و دوای پێغەمبەر(د.خ)، لەسەر باوەڕ و موسوڵمانی پێداگر بوون، لەگەڵ خۆتان ببەن و هەرکەس لەموسوڵمانەکان کەدوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەدین هەڵگەڕاوەتەوە، پەیوەستی خۆتانی مەکەن تا بۆچوونی خۆم لەوبارەوە بۆ ئێوە بنووسم. لەبەر ئەمە لەم شەڕانە کەس لەهەڵگەڕاوەکان بەشداری نەکرد.

کاتێك نامەی سەرکرایەتی عێراق بەدەستی خالید گەیشت، نامەی بۆ حەرملە و سەلما و موسەنا و مەزعور نووسی تا پەیوەستی بن. ڕۆژێکی دیاری کرد تا لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەئوبلە کۆببنەوە چوونکە ئەبوبەکر فەرمانی بە خالید دابوو کاتێك دەڕواتە ناو عێراق لەدەروازەی سیند و هنیدەوە دەست پێبکات و لەو کاتەدا بەئۆبلە ناویان دەبرد. ئەو هۆزانەی لەنێوان ئەو و عێراقدا بوون، کۆی کردنەوە، هەشت هەزار کەس لەخەڵکانی موزێر و ڕەبیعە کۆبوونەوە و دوو هەزار شەڕکەر لەناو سوپاکەی خۆی دەبینرا. لەگەڵ ئەم دەهەزار شەڕکەرە و هەشت هەزار شەڕکەری چوار سوپاکەی دیکە یانی موسەنا و حەرملە و مەزعور و سەلما، هەژدە هەزارکەس، ڕووبەڕووی هورموز بوویەوە.

موغەیرە کوڕی عوقبە دەڵێت: ئەبوبەکر سەرکردایەتی جەنگی عێراقی بەخالید کوڕی وەلید سپارد و فەرمانی پێدا لەخوارەوەی عێراقەوە بڕواتە ناو ئەو سەرزەمینە. هەروەها عەیازیشی کردە سەرکردەی جەنگی عێراق و فەرمانی پێدا لەسەرەوەی عێراقەوە بڕواتە ناو ئەو سەرزەمینە. دواتر بەرەو حیرە بڕۆن و هەرکەس زووتر بگات، سەرکردە بێت و ئەوی دیکە شوێنکەوتەی فەرمانەکانی بێت. نووسیبووی: کاتێك لەحیرە کۆبوونەوە و بلاّوەتان بەسوپای پارسەکان کرد و مەترسی هێرش کردنە سەر موسوڵمانەکانتان نەبوو، یەکێکتان لەحیرە بمێنێتەوە و پشتیوانی دواوەی سوپای موسوڵمان و هاوڕێکەی خۆی بێت و ئەوی دیکە هێرش بکاتە سەر سەرزەمینی پارسەکان و شوێنی هێز و دەسەلاّتی ئەوان یانی مەداین.

شەعبی دەڵێت: خالید پێش بەڕێکەوتن هاوڕێ لەگەڵ ئازازەبە باوکی زەبازەبەی

(؟) یەمامە، نامەی بۆ هورموز نووسی کەلەو کاتەدا سنووردار بوو:

باوەڕ بێنە تا تەندروست بمێنیتەوە یا تەسلیم و جەزیە بدە، جگە لەخۆت سەرکۆنەی کەسێك مەکە چوونکە لەگەڵ خەڵکانێك هێرش دەکەمە سەر تۆ کەزیاتر خوازیاری مەرگن تا ژیان.

موغەیرە کوڕی عوتەبە داوەری خەڵکانی دەڵێت: کاتێك خالید لەیەمامەوە بەرێکەوت، سوپاکەی بۆ سێ دەستە دابەش کرد و ئەوانی لەیەك ڕێگەوە نەنارد. موسەنای دوو ڕۆژ پێش بەرێکەوتنی خۆی ڕەوانە کرد و زەفەری کردە ڕێنیشاندەری ئەو. عودەی کوڕی حاتەم و عاسم کوڕی عەمرۆی نارد و هەر کام یەك ڕۆژ دوای ئەوەی دیکە بەرێکەوتن. ڕێنیشاندەری ئەوان مالك کوڕی عوباد و سالم کوڕی نەزر بوون.

دەڵێت: دوای ئەوان خالید خۆی بەرێکەوت و ڕێنیشاندەری ئەو رافیع بوو. بڕیاریاندا لەگەڵ هەر سێ دەستەکە لەحەفیر کۆببنەوە و شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن. ئەوێ دەروازەی هێند وناودارترین و بەهێزترین سنووری فارسەکان بوو. سنووردارەکەی لەوشکانی لەگەڵ عەرەبەکان و لەدەریا لەگەڵ هیندییەکان شەڕی دەکرد.

دەڵێت: موهەلیب کوڕی عوقفەبە و عەبدولرەحمان کوڕی سیای ئەحمەری کەحەمرای سیا ناوەکەی خۆی لەو وەرگرتووە، لەگەڵ خالیدا بوون. کاتێك نامەکەی خالید بەدەستی هورموز گەیشت، هەواڵەکەی بۆ شیری کوڕی کەسرا و ئەردەشێر کوڕی شیری نووسی و سوپاکەی خۆی کۆکردەوە و لەگەڵ سوارچاکەکانی سوپاکەی بەرەو کوازیم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ خالید ئەسپی غاردا. پێشەنگەکانی نارد بەڵام لەڕێگە ڕووبەڕووی خالید نەبوونەوە و ئاگادار بوویەوە عەرەبەکان بڕیاریانداوە لەحەفیر کۆببنەوە. گەڕایەوە بۆئەوەی زووتر لەوان لەو ناوچەیە دابەزێت. لەوێ دابەزی و سوپای ڕازاندەوە و دوو براکەی بەناوی قوباد و ئەنوشگان کەرەچەڵەکیان لەگەڵ ئەردەشێری گەورە و ئەردەشێر و شیری یەکی دەگرتەوە، وەك فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەی دانا. خەڵکان بەزنجیر پەیوەستی یەك ببوون. ئەوانەی خۆیان بەزنجیر نەبەستبوویەوە بەوانەی دیکەیان وت: خۆتان بۆ دوژمن بەستۆتەوە، ئەو کارە مەکەن چوونکە خراپ بەسەرماندا دەشکێتەوە.

وەڵامیان دایەوە: ئێوە مەبەستی هەڵاتنتان هەیە.

کاتێك خالید لەبوونی هورموز لەحەفیر ئاگادار بوویەوە، بەرەو کازمە ڕۆشت و

ماندوو و شەکەت گەیشتە ئەو سەرزەمینە. هورموز لەهەموو سەرکردەکان بۆ عەرەبەکان خراپتر بوو. هەموو عەرەبەکان لێی تورە و بۆ گلاوی ئەویان وەك نموونە دەهێنایەوە و دەیانوت: گلاوتر لەهورموز و کافرتر لەهورموز.

لەکازمە سوپای هورموز و عەرەبەکان ریزیان بەست. بەزنجیرەکان پەیوەستی یەك بوون. ئاو لەژێر دەستی ئەواندا بوو. خالید لەشوێنێك دابەزی ئاوی لێنەبوو و کاتێك لەم بابەتە ئاگادار بوویەوە، فەرمانی دابەزینی دا و باریان کردەوە و بۆ دەست گرتن بەسەر ئاوەکە شەڕی لەگەڵ دوژمن کرد چوونکە ئاو دەبێت لەژێر دەستی ئەو سوپایەدا بێت کەبەهێزتر و خۆڕاگرترە.

باریان خست وسوارەکان وەستابوون. پیادەکان پێشڕەوی و شەڕیان دەستپێکرد. خواوەند هەورێکی نارد و دواوەی موسوڵمانان ئاویان دەستکەوت. بەمشێوەیە هێزی پێبەخشین و هێشتا هەتاو هەڵنەهاتبوو، لەدوژمن کەس لەگۆڕەپانی شەڕ نەدەبینرا.

کوڕی هەیسەمی بوکایی گێرانەوەیەکی بەم ناوەڕۆکە هەیە جگە لەوەی دەڵێت: هورموز سوپاکەی خۆی نارد تا بەشێوەیەکی لەناکاو خالید بکوژن. کاتێك بڕیاری ئەو کارەیاندا، هورموز هاتەدەر و وتی: پیاوێك لەبەرابەر پیاوێك، خالید لەکوێیە؟ فەرمانی بەسوارەکانی خۆیدا بوو. کاتێك خالید دابەزی، هورموزیش دابەزی و داوای شەڕی دەستەویەخەی لێکرد. کاتێك رووبەرووی یەکبوونەوە، چەند جارێك بەشمشێر لەیەکیاندا و خالید بەسەریدا زاڵ بوو. پشتیوانەکانی هورموز هێرشیان کردەسەر و گەمارۆیاندا بەڵام هەوڵەکانی ئەوان رێگر نەبوو لەکوشتنی هورموز بەدەستی خالید. قەعقاع کوڕی عەمرۆ هێرشی برد و بڵاوەی بەپشتیوانەکانی هورموز هێنا. خالید شمشێری سووڕاندو پارسەکان شکستیان خوارد. موسوڵمانان تا شەو شوێنیان کەوتن. خالید تالانی خەڵکانی کۆکردەوە. زنجیرەکانیش لەناو تالانییەکان دەبینران، هەرکامیان باری یەك وشتر و هەزار ڕەتڵ کێشی بوو. ئەم شەڕەیان بەزات ئەلسەلاسل ناوبرد. قوباد و ئەنوشگان رزگاریان بوو.

شەعبی دەڵێت: کلاوی پارسەکان بەهۆی پێگە و رێزیان لەناو خەڵکەکەی خۆیان، گرانبایی بوو. هەرکەس پێگەیەکی بەرزی پێدەبڕا، کلاوەکەی سەد هەزار دەرم دەژیا و هورموز یەکێك بوو لەوان. بەهای کلاوەکەی سەد هەزار درەم و لەزیوی جەواهیر نیشان دروست کرابوو. ئەبوبەکر کلاوەکەی دا بەخالید. گەورەترین پێگەی پیاوەکانی پارس ئەوە بوو منالی یەکێك لەحەوت بنەماڵە بەرێزەکەی ئەوان بێت.

حەنزەلە کوڕی زیاد دەڵێت: کاتێك ئەو ڕۆژە موسوڵمانەکان گەڕانەوە، جارچی خالید جاڕی بەڕێکەوتنی دا و لەگەڵ شەڕکەران ملی ڕێگەی گرتەبەر. بارەکان لەدواوە بوو تا گەشتنە ئەو شوێنەی ئەمڕۆ پردی گەورەی بەسرەیە. لەوێ دابەزین. قوباد و ئەنوشگان رزگاریان ببوو و خالید هەواڵی سەرکەوتنی خۆی لەگەڵ پێنج یەکی تاڵانییەکان و فیلەکەی بۆ مەدینە نارد. نامەی سەرکەوتن لەمەدینە بۆ خەڵکان خوێندرایەوە.

کاتێك زەڕ کوڕی کەلیب پێنج یەك و فیلەکەی بردە مەدینە، بەناو مەدینەدا سووڕاندیان تا خەڵکان هەموو بیبینن. ژنان دەیانوت: بەراستی ئەوەی دەیبینین، ئافرێنراوی دەستی خوایە. گومانیان کرد فیل دەسکردی مرۆڤە. ئەبوبەکر فیلەکەی گەڕاندەوە.

دەڵێت: خالید لەشوێنی پردی گەورەی بەسرە دابەزی. موسنا کوڕی حارسی بەدوای هەڵاتوواندا نارد و مەعقەل کوڕی موقرینی موزنی بەرەو ئوبلە ڕەوانە کرد تا ماڵ و ئەسیرەکان لەوێ کۆبکاتەوە. مەعقەل ڕۆشتە ئوبلە و فەرمانەکانی ئەنجامدا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەم داستانە سەبارەت بەسەرکەوتنی ئوبلە بەپێچەوانەی زانستەکانی شارەزایانی حەدیسی راستە چوونکە گرتنی ئوبلە لەرۆژگاری عومەر و لەساڵی چواردەیەمی کۆچ و لەسەر دەستەی عوتبە کوڕی غەزوان ڕوویدا. لەکاتی خۆیدا باسی دەکەین بەخواستی خوا.

حەنزەلە کوڕی زیاد دەڵێت: موسەنا ڕۆشت تا گەیشت ڕووباری زەن((ژن)). ڕووی کردە ئەو قەڵای ژن لەوێ نیشتەجێ بوو. مەعنی کوڕی حارسەی لەوێ دانا و گەمارۆی خستە سەر کۆشکی ژنەکە و بەتەسلیم بوون ناچاری کرد. هەموویانی کوشت و سامانی ئەوانی تاڵان کرد و کاتێك ژنەکە لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ موسەنا بەست و باوەڕی هێنا. مەعنی ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

خالید و سەرکردەکانی سوپا شوێنکۆڕکێیان بەوەرزێرەکان نەکرد چوونکە فەرمانی ئەبوبەکر بەو شێوە بوو بەڵام منداڵی ئەو شەڕکەرانەی خزمەتی عەجەمەکانیان دەکرد، ئەسیر کران و ئەو وەرزێرانەی بەشداری شەڕەکانیان نەکرد، پشتگوێ خران و موسوڵمانان پەنایان پێ بەخشین. لەشەڕی زات ئەسلاسل و شەڕی دواتر، هەر سوارەیەك دوو هەزار درەمی پێبڕا بەشی پیادە یەك لەسەر سێی ئەو بڕە بوو.

## شەڕی مەزار

دەڵێت: شەڕی مەزار لەمانگی سەفەری ساڵی دوانزەیەم کۆچ روویدا و ئەو رۆژە خەڵکان وتیان: صفر الاصفارە کەتیاییدا هەموو ستەمکاران لەشوێنی بەریەك کەوتنی رووبارەکان دەکوژرێن.

سوفیانی ئەحمەری دەڵێت: کاتێك خالید نامەی بۆ هورموز نووسی کە لەیەمامە هێرش دەکاتە سەری، هورموز هەواڵەکەی بۆ ئەردەشێر و شیری نووسی و ئەوان قارن کوڕی قریانسیان بۆ هاوکاری ئەو نارد. قارن لەمەداینەوە بەمەبەستی هاوکاری کردنی هورموز بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە مەزار لەشکستی سوپای پارسەکان ئاگادار بوویەوە. پاشماوەی هەڵاتووان پەیوەستی بوون و سەرکۆنەی یەکیان کرد. هەڵاتووانی ئەهواز و فارس بەهەڵاتووانی سواد و کێوەکانیان دەوت ئەگەر جیاببینەوە هیچ کات یەکناگرنەوە و بڕیاریاندا بگەڕێنەوە. وتیان: ئەوە هاوکاری پاشاو ئەوە قارن. ئەگەری هەیە خواوەند دەرفەتێکمان پێببەخشێت بۆ ئەوەی بتوانین تۆڵە لەدوژمن بستێنینەوە و ئەوەی لەدەستمان داوە، وەریبگرینەوە. گەڕانەوە و لەمەزار ئوردوویان لێدا. قارن، قوباد و ئەنوشگانی وەك فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەی دانا و موسەنا و مەعنی کوڕی حارسە خالیدیان ئاگادار کردەوە و کاتێك ئەو لەهاتنی قارن ئاگادار بوویەوە، تاڵانییەکانی دابەش کرد و پێنج یەکی بەوەلید کوڕی عوقبەبە بۆ ئەبوبەکر نارد و لەکۆبوونەوەی خەڵکان لەسەر لێواری رووبار ئاگاداری کردەوە.

خالید بەرێکەوت تا لەمەزار لەنزیك قارون دابەزی و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. قارن هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ و داوای شەڕکەری کرد. خالید لەگەڵ مەعقەل کوڕی ئەعشی کەئەبیەز باوکی کەبان نازناوەکەی بوو، رووبەرووی بوونەوە و مەعقەل زووتر لەخالید دەستی پێی گەیشت و خوێنی ڕشت. عاسم ئەنوشگانی کوشت و عودی قوباد.

قارن بڕواپێکراوترین سەرکردەی پارسەکان و دوای ئەو موسوڵمانان رووبەرووی سەرکردەیەکی بەناوبانگی وەك ئەو نەبوونەوە. ژمارەیەکی زۆر لەفارسەکان کوژران و هەڵاتووان سوار کەشتی بوون و دەریا رێگەی نەدا موسوڵمانان شوێنیان بکەون. خالید لەمەزار مایەوە و هەرکەس تاڵانییەکی دەستکەوتبوو، بەخۆی بەخشی و تاڵانییەکانی دیکەی دابەش کرد. لەپێنج یەك بەشی شەڕکەرە ئازاکانیدا و پاشماوەی تاڵانییەکانی

لەگەڵ سەعید کوڕی نەعمانی کەعبی بۆ مەدینە نارد.

ئەبی عوسمان دەڵێت: لەشەڕی مەزار سی هەزار کەس لەفارسەکان کوژران جگە لەوانەی لەئاودا خنکان. ئەگەر ئاو ڕێگر نەدەبوو هەموو شتێك وهەموویان لەناو دەچوون. ئەوانەی گیانیان بەدەربرد رووت یا نیوە رووت بوون.

شەعبی دەڵێت: کاتێك خالید کوڕی وەلید گەیشتە عێراق، لەکەوازیم رووبەرووی هورموز بوویەوە. دوای ئەوەی لەناوچەی فورات لەکەناری دیجلە دابەزی و رووبەرووی دوژمن بوویەوە و لەکەنار دیجلە و رووبارێکی دیکە بۆ ماوەیەکی زۆر مایەوە. دوای رووبەروو بوونەوە لەگەڵ هورموز هەموو شەڕەکانی دواتر دژوارتر و خوێناویتر بوون تا ئەو کاتەی ڕۆشتە دومەئەلجەندەل. لەشەڕی رووبار بەشی سوارەکان زیاتر بوو لەشەڕی زات ئەلسەلاسل.

دوای جەنگی رووبار، خالید ژن و منداڵی شەڕکەران و ئەو کەسانەی هاوکاری ئەوانیان کردبوو، ئەسیرکرد و وەرزێران کەبەڵێنیان دابوو خەراج بدەن، لەشوێنی خۆیان هێشتەوە.

هەموو سەرزەمینەکە بەشەڕ دەستی بەسەردا گیرا بەڵام ئەو کەسانەی خەراجیان دەدا، کەوتە ژێر چەتری پەنای موسوڵمانان و زوییەکانیان لەدەستی خۆیاندا مایەوە. ئەمە سەبارەت بەو زەوییانەی دابەش نەکرابوون و ئەوەی دابەش کرابوو، وەك خۆی مایەوە.

حەبیب باوکی حەسەن یانی باوکی حەسەنی بەسری کە مەسیحی بوو و مافنە ئازاد کراوی عوسمان و باوکی زیاد ئازاد کراوی موغەیرە کوڕی شوعبە لەناو ئەسیرەکاندا دەبینران. خالید سەعید کوڕی نەعمانی وەك سەرکردەی سوپاکەی دەستنیشان و سوەید کوڕی موقرینی وەك لێپرسراوی زەکات دیاریکرد و پێی وت لەحەفیر نیشتەجێ و کارگوزارانی خۆی ڕەوانە بکات و کاروباری وەرگرتن لەدەستی خۆیدا بهێڵێتەوە.

خالید چاودێری هەواڵ و دەنگ و باسەکانی دوژمن بوو.

## دوای ئەوە لەسەفەری سالی دوانزەیەمی کۆچی شەڕی وەلجە روویدا وەلجە ناوچەیەك لەنزیك كەسكەرە.

شەعبی دەڵێت: کاتێك خالید لەشەڕی رووبار ئاسوودە و ئەردەشێر لەکوژرانی قارن ئاگادار بوویەوە، ئەندەرزغوری ڕەوانە کرد. ئەو پارسی و زادەی سوادو لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوو. بەلام لەوێ گەورە و پەروەردە نەکرابوو. بەهمەن جادویەی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە و فەرمانی پێدا بەرێگەکەی ئەندەرزغوردا بڕوات.

دەڵێت: ئەندەرزغور پێشتر سنووردارى خوراسان بوو. لەمەداینەوە بەرێکەوت تا گەیشتە كەسكەر و لەوێوە رووی کردە وەلجە. بەهمەن جاودویەیش بەدوای ئەودا ڕۆشت بەلام رێگەیەکی دیکەی گرتەبەر و لەدڵی سوادەوە گوزەری کرد و لەدێهاتەکانی نێوان حیرە و كەسكەر، عەرەبەکان و وەرزێرەکانی بۆ پەیوەست بوون بەئەندەرزغور ڕەوانە کرد و لەوەلجە لەنزیك ئوردووی ئەو، ئوردوویان لێدا. کاتێك سوپا و شەڕکەران کۆبوونەوە، شانازی بەخۆیەوە کرد و خوازیاری هێرش کردنە سەر خالید بوو.

دەڵێت: خالید لای رووبارە لەئوردوو لێدانی ئەندەرزغور ئاگادار بوویەوە و فەرمانی بەرێکەوتنی دا. سوەید کوڕی موقرینی وەك جێگر ی خۆی دانا و فەرمانی پێدا لەحەفیر بمێنێتەوە. رووی کردە ئەو سوپایەی لەخوارەوەی دیجلە بەجێهێشتبوو و فەرمانی پێدان ئاگادار و وشیار بن. دواتر لەگەڵ سوپاکەی خۆی رێگەی وەلجەی گرتەبەر و لەگەڵ سوپاکەی ئەندەرزغور رووبەڕوو بوویەوە. شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد و هەردوولا بێزار و شەکەت بوون. خالید چاوەڕوانی هاوکاری دەکرد کە بۆ دوژمن لەدوو ناوچە بۆسەیان نابوویەوە. سەرکردەکانیان بیشر کوڕی ئەبی روهم و سەعید کوڕی مورەی عیجلی بوون. ئەوان هاتن و ریزی عەجەمەکان شکستی خوارد. خالید لەپێشەوە و ئەوان لەدواوەی سوپای فارسەکان هێرشیان کرد. کەس لەوان نەیتوانی شوێنی کوژرانی هاورێکەی خۆی ببینێت و ئەندرەزرغور لەتینوویەتی گیانی سپارد.

خالید لەناو سوپاکەی خۆی وتارێکی خوێندەوە و بۆ هاندانی ئەوان وتی: مەگەر نابینن خۆراك هاوشێوەی خۆڵ فراوانە، سوێند بەخوا ئەگەر جیهاد لەرێگەی خوا و پێشنیاری خواپەرەستی و جگە لەبژێوی مەبەستی دیکەمان نەدەبوو، بۆچوونی پەسند ئەوەیە لەسەر ئەم ناوچەیە بجەنگین و برسییەتی و نەداری لەسەر شانی ئەو کەسانەی

نەیانتوانیوە لەرێگەی خوادا جیهاد بکەن، هەڵبگرین.

خالید دوای ئەم شەڕە، وەك پێشوو هەڵسکەوتی لەگەڵ وەرزێران کرد. ئەوانی نەکوشت. ژن و منداڵی شەڕکەرانی ئەسیر و بەخاوەن زەوییەکانی وت خەراج بدەن و لەپەنای موسوڵماناندا بن. ئەوان رازی بوون.

شەعبی دەڵێت: خالید لەشەڕی وەلجە رووبەرووی یەکێك لەپارسەکان بوویەوە کەدەیتوانی لەگەڵ هەزار پیاو بەرابەری بکات. خالید ئەوی کوشت و کاتێك کوشتی، لەسەر پشتی دانیشت و فەرمانیدا خواردنەکەی بۆ ببەن.

دەڵێت: کوڕێکی جابر کوڕی بوجەیر و کوڕێکی عەبدلئەسوەد لەناو کوژراوەکانی منداڵەکانی بەکر دەبینران.

## ئەلیس لەقوولای فورات

موغەیرە کوڕی عوتەبە دەڵێت: کاتێك لەشەڕی وەلجە دەستەیەك لەنەسرانییەکانی بەکر کوڕی وائل کەهاوکاری پارسەکانیان دەکرد، کوژران، نەسرانییەکانی دیکە لەکوژرانی ئەوان تورە و نامەیان بۆ عەجەمەکان نووسی و لەئەلیس کۆبوونەوە. عەبدلئەسوەدی عیجلی سەرکردەیان بوو. لەموسوڵمانانی منداڵەکانی عێجل عوتەیبە کوڕی نەهاس و سەعید کوڕی مورە و فورات کوڕی حەییان و موسەنا کوڕی لاحیق و مەعور کوڕی عودەی، ڕق و کینەی نەسرانییەکانیان لەدڵدا بوو.

ئەردەشێر کەسی بۆ لای بەهمەن جادوویە نارد کە لەقسیاسا بوو. ئەو لەیەکێك لەرۆژەکان رابطی (لەدەقەکەدا رافد) شابوو. فارسەکان هەموو مانگەکانیان بەسی رۆژ دەژمارد و هەر رۆژ رابطیك بوو کەلای شا رابطی خەڵك و بەهمەن رابطی بەهمەن رۆژ بوو.

ئەردەشێر پەیامی بۆ بەهمەن نارد: لەگەڵ سوپاکەی خۆت بەرەو ئەلیس بەرێکەوە و پەیوەستی فارسەکان و عەرەبە مەسیحییەکان ببە کەلەوێ کۆبوونەتەوە. بەهمەن جاپانی نارد و وتی پەلە بکات بەڵام شەڕ لەگەڵ دوژمن نەکات تا خۆی دەگات مەگەر ئەوەی دوژمن هێرش بکاتە سەریان.

بەهمەن گەڕایەوە بۆ لای ئەردەشێر تا بیبینێت و سەبارەت بەباس وکارەکان فەرمانی لێوەربگرێت. ئەردەشێر نەخۆش بوو. بەهمەن جاپان تا ئەلیس ڕۆشت و لەمانگی

سەفەر لەوێ دابەزی. ئەو سوارانەی لەبەرابەر عەرەبەکان بوون لەگەڵ عەبدئەلئەسوەد و مەسیحییەکانی مناڵەکانی عیجل و تیم اللات و زەبیعە و عەرەبەکانی گوندەکانی حیرە لەدەوری کۆبوونەوە. جابر کوڕی بوجەیری مەسیحی بۆ هاوکاری عەبدئەلئەسوەد هات.

خالید لەکۆبوونەوەی عەبدئەلئەسوەد و جابر و زوهەیر و کەسانی دیکە ئاگادار بوویەوە و بەرێکەوت بەلام لەنزیك بوونەوەی جابان بێ ئاگا بوو. تەنیا بیری لەعەرەبەکان و مەسیحییەکانی گوندەکان دەکردەوە. لەئەلیس ڕووبەڕوی جابان بوویەوە. عەجەمەکان بەجاپانیان وت: ئایا شەڕ دەستپێبکەین یا خواردن بەخەڵك بدەین و بەشێوەیەك خۆمان نیشانی دوژمن بدەین کەگرنگییان پێنادەین و دوای تەواو بوونی لەخواردن، بجەنگین؟

جاپان وتی: ئەگەر لەبەرابەر گوێ پێنەدانی ئێوە، دەستیان لێ هەڵگرتن، گرنگی پێمەدەن بەلام گومان دەکەم هێرش دەکەنە سەرتان و ڕێگەی نان خواردنتان لێ دەگرن.

بەلام خەڵکان گوێیان لەقسەکانی نەگرت و سفرەکانیان ڕاخست. خواردنیان هێنا و لەسەر سفرەکان دانیشتن. کاتێك خالید لێیان نزیك کەوتەوە، وەستا و فەرمانیدا بارەکانیان کردەوە. پاسەوانی بۆ خۆی دانا تا لەپشتەسەرەوە پارێزگاری لێبکات. دواتر هێرشی دەستپێکرد و خۆی هاتە ریزی پێشەوە و هاواری کرد ئەبجەر لەکوێیە، عەبدئەلئەسوەد لەکوێیە، مالك کوڕی قەیس لەکوێیە؟

کەس وەلامی نەدایەوە. مالك یەکێك لەخەڵکانی جەزرە بوو، ڕۆشتە پێش و خالید پێی وت: ئەی گلاو زادە لەناو ئەوان تۆی نەشیاو بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی من هاتوویت؟

ئەمەی وت و بەشمشێر لێیدا و کوشتی و عەجەمەکان دەستیان لەخواردن هەڵگرت.

جاپان وتی: مەگەر نەموت، سوێند بەخوا تا ئێستا لەهیچ سەرکردەیەك نەترسابووم.

کاتێك عەجەمەکان نەیانتوانی نان بخۆن، ورەیان دابەخۆیان و وتیان: خواردنەکە دادەنێین تا ئەو کاتەی دوژمن لەناو دەبەین. دواتر دەگەڕێینەوە و دەیخۆین.

جاپان وتی: لەنائاگایی خۆتان سفرەتان ڕاخست، ئێستا گوێ لەفەرمانەکانی من بگرن و خواردنەکە ژەهراوی بکەن چوونکە ئەگەر شەڕەکە لەبەرژەوەندی ئێوە کۆتایی هات، زیانێکی کەمتان لێدەکەوێت و ئەگەر شکست بخۆن، دەتوانن ئەوان لەناو ببەن.

بەلام عەجەمەکان بەوتەکانی ڕازی نەبوون.

جاپان عەبدئەلئەسوەد و ئەبجەری برد و فەرماندەیی دوو باڵی سوپاکەی بەوان سپارد. خالید هاوشێوەی شەڕەکانی پێشوو سوپاکەی ڕازاندەوە. شەڕێکی قورس

دەسپێپێکرد. ناباوەڕان چوونکە چاوەڕوانی بەهمەن جادویەیان دەکرد، سەرسەختانە پێداگری و بەرگرییان دەکرد. موسوڵمانانیش خۆڕاگرییان دەکرد، خالید وتی: نەزر دەکەم ئەگەر بەسەر ئەواندا سەرکەوتم دەبێت ئەوەندەیان لێبکوژم خوێنیان لەرووبارەکەدا ڕەوانە ببێت.

خواوەند شکستی بەناباوەڕان هێنا و خالید وتی جارچییەکەی لەناو خەڵکان جاربدات: ئەسیر بگرن، ئەسیر بگرن، کەس مەکوژن، کەس مەکوژن جگە لەو کەسانەی خۆڕاگری دەکەن. سوارەکان پۆل پۆل ئەسیرەکانیان لای خالید کۆدەکردەوە و خالید چەند کەسێکی دیاریکردبوو تا سەریان بپەڕێنێت. شەو ڕۆژێك ئەو کارەی کرد و بۆ بەیانی و ڕۆژی دواتر شوێن هەڵاتووان کەوتن تا گەیشتنە نەهرەین. ژمارەیەکی زۆر لەئەلیسەوە روویان لەو ناوچەیە کرد و هەموویانیان کوشت.

بەڵام قەعقاع و کەسانی هاوشێوەی ئەو وتیان: ئەگەر خەڵکانی سەر زەوی هەمووی بکوژیت خوێنیان ڕەوان نابێت چوونکە لەو کاتەوەی ڕێگەیان لەلافاوی خوێن گرتووە و زەوی خوێنەکان ناباتەوە بۆ خۆی، خوێن لەجێگەی خۆی دەمێنێتەوە، ئاوی بەسەردا بکە تا سوێندەکەی خۆت هێنابێتەدی. ئاوی تێکەڵ بەخوێنی کوژراوەکان کرد و خوێن لەناو رووبارەکە ڕەوانە بوو. لەبەر ئەمە تا ئێستا بەرووباری خوێن ناوی دەبەن.

بەشر کوڕی خەسایسە دەڵێت: بیستوومە کاتێك زەوی خوێنی ئادەمی بۆ خۆی گەڕاندەوە، ئەو کارە یاساغ کرا و خوێنەکان چیتر ڕەوان نابن مەگەر تا ئەو سنوورەی فێنك دەبێتەوە.

کاتێك عەجەمەکان شکستیان خوارد و ئوردووگاکەی خۆیان بەجێهێشت، موسوڵمانان دوای شوێنکەوتنی ئەوان گەڕانەوە بۆ ئوردووگاکە. خالید لەسەر سفرەی ئەوان وەستا و وتی: ئەمەم بەئێوە بەخشی و تایبەتە بەئێوە. موسوڵمانەکان لەسەر سفرەکە دانیشتن. ئەوانەی دێهات و نانی ناسکیان نەبینیبوو، دەیانوت: ئەم وەرەقە ناسکانە چییە؟ ئەوانەی لەو شێوە نانەیان بینیبوو، وتیان: عەیشی ڕەقیق کەدەڵێن ئەمەیە، لەبەر ئەمە نانی ناسك بەرەقاق ناوی دەکرد و پێشتر پێیان دەوت قوڕی.

لەخالید دەگێڕنەوە: دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) لەغەزای خەیبەر نان و خواردن و ئەو شتانەی دەیانخوارد، بەشەڕکەرانی بەخشی بەو مەرجەی لەگەڵ خۆیان نەیبەن.

موغەیرە دەڵێت: چەندین ئاش بۆ ماوەی سێ ڕۆژی بەردەوام بەئاوی خوێناوی

بژێوی سوپاکەیان دەکرد ئارد کەژمارەیان زیاتر لەهەژدە هەزار کەس بوو.

خالید یەکێك لەمناڵەکانی عێجل بەناوی جوندەل کەرێنیشاندەرێکی تێکۆشەر بوو، هەواڵەکەی بۆ مەدینە نارد. ئەو هەواڵی سەرکەوتن و بڕی تالآنییەکان و ژمارەی ئەسیرەکان و پێنج یەك و ناوی ئەو کەسانەی لەشەڕدا بوێرییان لەخۆیان نیشاندابوو، بەئەبوبەکر راگەیاند. کاتێك ئەبوبەکر تێکۆشان و وردبینی ئەوی بینی، پرسیاری ناوەکەی کرد و کاتێك زانی ناوی جوندەلە، هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((گیانی عسام، گەورەیی پێبەخشیوە

و پێشەنگی و پێشڕەوی کردۆتە عادەتی ئەو))

فەرمانیدا کەنیزێکی ئەسیری پێببەخشن. جوندەل چەند مناڵێکی لەو کەنیزە هێنایە دنیا.

دەڵێت: ژمارەی کوژراوای سوپای فارسەکان لەئەلیس حەفتا هەزار کەس و زۆربەیان لەئەمغیشیا بوون.

عوبەیداللە کوڕی سەعد لەمامی خۆی دەگێڕێتەوە: لەحیرە سەبارەت بەئەمغیشیا پرسیارم کرد، وتیان: مەنیشیایە، ئەمەم بەسەیف وت، وتی: ئەم دوو ناوە جیاوازن.

## گرتنی ئەمغیشیا لەمانگی سەفەر و خواوەند شەڕی لەبەرژەوەندی موسوڵمانان

کۆتایی پێهێنا

موغەیرە دەڵێت: دوای تەواو بوونی شەڕی ئەلیس، خالید بەرەو ئەمغیشیا بەرێکەوت کەخەڵکەکەی ڕۆشتبوون و لەسوادی عێراق بڵاوەیان لێکردبوو. لەو کاتەوە بەکرێگیراوان لەعێراق دەرکەوتن و خالید فەرمانی وێران کردنی ئەمغیشیا و هەموو ناوچەکانی دەوروبەری دەرکرد. ئەمغیشیا شارێکی هاوشێوەی حیرە و فورات و بادەقلی بەوێ دەگات. ئەلیس یەکێك لەناوچەکانی ئەو سەرزەمینە بوو. تالآنییەکی زۆریان لەوێ دەستکەوت و هاوشێوەی نەبینراوە.

فوراتی عیجلی دەڵێت: موسوڵمانان لەشەڕی زات ئەلسلاسل تا گرتنی ئەمغیشیا بەرادەیەك تالآنییان دەستکەوت پێشتر لەخەویشدا نەیاندەبینی. بەشی سوار هەزار و پێنسەد درهەم بوو جگە لەوەی بەسوارکارە ئازاکانیان بەخشی. کاتێك ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە، ئەم بابەتەی لای خەڵکانی مەدینە باس کرد و زیادی کرد: ئەی قورەیشییەکان شێرەکەی ئێوە پەلاماری شێریدا و بەسەریدا سەرکەوت، ژنان چیتر ناتوانن کەسێکی وەك خالید بێننە دنیا.

## شەڕی مقەر و لێواری فوراتی بادەقلی

موغەیرە دەڵێت: ئازادبە لەڕۆژگاری کەسرا تا ئەو کاتە سنوورداری حیرە بوو. سەرکردەکانی ئەوان بێ مۆڵەتی پاشا هاوکاری یەکیان نەدەکرد و ئەو لەنیوەی سنورێکی گەورە و بەهای کلآوەکەی پەنجا هەزار بوو. کاتێك خالید ئەمغیشیای وێران کرد و خەڵککەی بوونە بەکرێگیراوی دانیشتووانی گوندەکان، ئازادبە زانی دەستبەرداری ئەویش نابێت. لەبەر ئەمە هەوڵەکانی دەستپێکرد و بۆ شەڕ لەگەڵ خالید ئامادە بوو. کوڕەکەی خۆی وەك پێشەنگ نارد وخۆی دوای ئەو ملی ڕێگەی گرتەبەر. لەدەرەوەی حیرە ئوردووی لێدا و فەرمانی بەکوڕەکەیدا فورات ببەستێت.

کاتێك خالید لەئەمغیشیاوە بەرێکەوت و پیادەکان و تالآنییەکانی لەکەشتییەکان بارد کرد، لەناکاوبینیان کەشتییەکان لەقوڕ چەقین. ترسان. کەشتیوانەکان وتیان:

پارسەکان رووبارەکانیان کردۆتەوە و ئاو بەرێگەیەکی دیکەدا دەڕوات وتا رووبارەکان نەبەستن ئاو، لێرە نابینین. خالید بەپەلە لەگەڵ دەستەیەك بەرەو ئازادبە بەرێکەوت ولەسەر لێواری عەتیق رووبەرووی دەستەیەك لەسوارەکانی ئەو بوویەوە و ناکاوگیری کردن. لەو کاتەدا بیریان لەوە نەدەکردەوە خالید هێرشیان بکاتە سەر. خالید لەمقەڕ ئەوانی کوشتار کرد. دواتر بەخێرایی ملی رێگەی گرتەبەر و پێش ئەوەی کوڕەی ئازادبە ئاگادار بێتەوە، لەسەر لێواری فوراتی بادقلی رووبەرووی خۆی و سوپاکەی بوویەوە و هەموویانی کوشت. رێڕەوی ئاوەکەی کردەوە و رووبارەکانی بەست و ئاو بەرێگەی هەمیشەیی خۆیدا دەڕۆشت.

موغەیرە دەڵێت: کاتێك خالید کوڕی ئازادبەی لەلێواری فوراتی بادەقلی کوشت، مەبەستی حیرەی کرد و فەرمانیدا سوپاکەی لەدوای ئەو بێن. دەیویست لەنێوان خوەرنەق و دیجلە دابەزێت و کاتێك گەیشتە خوەرنەق، ئاگادار بوویەوە ئازادبە رێڕەوی ئاوەکەی گۆڕیوە و هەڵاتووە. هۆکاری هەڵاتنی ئەوە بوو لەمەرگی ئەردەشێر و کوژرانی کوڕەکەی خۆی ئاگادار ببوویەوە. سوپاکەی ئەو لەنێوان غەریین وکۆشکی ئەبیەز بوو. کاتێك هاوەڵانی خالید لەخوەرنەق پەیوەستی بوون، بەرێکەوت تا لەئوردووگای ئازادبە لەنێوان غەریین و کۆشکی ئەبیەز ئوردووی لێدا. کاتێك خەڵکانی حیرە لەپشت دیواری شارەکەوە خۆیان داشارد، خالید سوارەکانی خۆی بۆ حیرە نارد و هەر کام لەسەرکردەکانی سوپای کردە لێپرسراوی گەمارۆ خستنە سەر یەکێك لەقەڵاکان و گەمارۆ و شەڕ لەگەڵ خەڵکەکەی. زەرار کوڕی ئەزوەر گەمارۆی خستە سەر کۆشکی عەدەسین کەعودەی کوڕی عودەی کوژراو لەوێ بوو، زەرار کوڕی موقرینی ئەزدی گەمارۆی خستە سەر کۆشکی منالەکانی مازن کەئاکال لەوێ دەژیا. زەرار، خاوەنی نۆ برا بوو.، موسەنا کۆشکی بەقیلەی گەمارۆدا و عومەر کوڕی عەبدولمەسیح لەوێ ژیانی بەسەر دەبرد. پێشنیاری باوەڕهێنانیان بەگەمارۆدراوەکان کرد و یەك رۆژ مۆڵەتیان پێدان. بەڵام خەڵکانی حیرە لەهەڵوێستی خۆیان پێداگر و بیانووی شەڕیان بەموسوڵمانان‌دا.

غەسن کوڕی قاسم دەڵێت: خالید بەسەرکردەکانی خۆی وت سەرەتا پێشنیاری ئیسلامیان پێبکەن، ئەگەر رازی بوون، رازی بن و جیاواز لەو شێوە بۆ ماوەی یەك رۆژ مۆڵەتیان پێبدەن. فەرمانی پێدان، گوێ لەوتەی دوژمن مەگرن تا فریوتان نەدەن، بجەنگن و دوودڵی و گومان سەبارەت بەشەڕ کردن لای موسوڵمانان دروست مەکەن.

زەرار کوڕی ئەزوەر وەك یەکەم سەرکردەی سوپای موسوڵمانان دوای یەك ڕۆژ مۆڵەت، شەڕی دەسپێکرد. ئەو، لێپرسراوی شەڕ لەگەڵ خەڵکانی کۆشکی ئەبیەز بوو. بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر لەبەرزاییەکانەوە دەرکەوتن، پێشنیاری سێ کاریان پێکردن: باوەڕ بێنن، جەزیە بدەن، بجەنگن. ئەوان شەڕیان هەڵبژارد و هاواریان کرد تا بەردهاوێژەکان بێنن. زەرار وتی: دوورکەونەوە تا ئەوەی دەیهاوێژن بەر ئێوە نەکەوێت، بزانم چییە.

زۆری نەخایاند سەرەوەی کۆشکەکەی پڕ بوو لەو پیاوانەی توورکەیان بەخۆیانەوە هەڵواسی بوو و گووڵەی سواڵەتیان بۆ موسوڵمانان دەهاویشت.

زەرار فەرمانی تیرهاویشتنی دەرکرد. موسوڵمانان نزیك بوونەوە و دەستیان بەتیر هاویشتن کرد. سەرەوەی دیوارەکان چۆڵ بوو. لەشوێنەکانی دەوروبەر هێرش دەستپێکرد و هەرکام لەسەرکردەکان لەگەڵ شەڕکەرانی خۆیان زاری شەڕیان هەڵدا و بەزۆر دەستیان بەسەر ماڵ و کەنیسە و خانەقاکاندا گرت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکانیان کوشت. قەشە و ڕاهیبەکان هاواریان بەرز کردەوە: ئەی خەڵکی ناو کۆشکەکان ئێوە هۆکاری کوژرانی ئێمەن. خەڵکانی ناو کۆشکەکان هاواریان کرد: ئەی عەرەبەکان، بەیەکێك لەسێ مەرجەکەی ئێوە ڕازی بووین، وازمان لێ بێنن تا دەڕۆنە لای خالید.

ئەیاس کوڕی قەبیسەی تایی و براکەی هاتنە لای زەرار کوڕی ئەزوەر و عودەی کوڕی عودەی و زەید کوڕی عودەی ڕۆشتنە لای زەرار کوڕی خەتاب. عودەی هەمان عودەی واستە و لەشەڕی زی قار کوژرا و دایکی هۆنراوەیەکی لەپرسەی ئەودا هۆنییەوە. عەمرۆ کوڕی عەبدولمەسیح و کوڕی ئەکال یەکیان هاتە لای زەرار کوڕی موقرین و ئەوی دیکەیان ڕۆشتە لای موسەنا کوڕی حارسە. ئەوانیان بۆ لای خالید ڕەوانە کرد.

موغەیرە دەڵێت: یەکەم کەس داوای ئاشتی کرد، عەمرۆ کوڕی عەبدولمەسیح بوو. کەسانی دیکەیش هاتن و سەرکردەکان ئەوانیان بۆ لای خالید نارد. هەرکام کەسێکی بڕواپێکراوی لەگەڵدا بوو تا بەنوێنەرایەتی خەڵکانی ناو کۆشك، پەیمانی ئاشتی ببەستن. خالید بەتەنیا لەگەڵ نوێنەری هەرکام لەکۆشکەکان دانیشت و وتی: ئێوە چین، ئەگەر عەرەبن، بۆ دوژمنایەتی عەرەبەکان دەکەن و ئەگەر عەجەمن بۆ لەگەڵ ویژدان و

دادپەروەی دەجەنگن؟

عودەی وتی: ئێمە عەرەبین، دەستەیەکمان عەرەبی عارەبە و دەستەیەک عەرەبی موستەعریبە.

خالید وتی: ئەگەر بەمشێوە دەبوون، ڕووبەڕووی ئێمە نەدەبوونەوە و لەکارەکانی ئێمە بێزار نەدەبوون.

عودەی وتی: بەڵگەی وتاری ئێمە زمانەکەمانە کەعەرەبییە.

خالید وتی: وتەکانت ڕاستە.

وتی: یەکێك لەم سێ شتە هەڵبژێرن: یا باوەڕ بەدینەکەی ئێمە بێنن و لەماف و لێپرسراویەتی موسوڵمانان کەڵك وەربگرن، بەدڵخواز لێرە بڕۆن یا بمێننەوە، یا جەزیە بدەن یا شەڕ دەسپێدەکەین. من لەگەڵ خەڵکانێك بۆ شەڕی ئێوە هاتووم زیاتر لەوەی ئێوە خوازیاری ژیانن، تامەزرۆی مەرگن.

وتیان: جەزیە دەدەین.

خالید وتی: هاوار لەئێوە، کوفر بیابانی گومڕاکەرە و لەهەموو عەرەبەکان نەزانتر ئەو کەسەیە لەم بیابانەدا بڕوات و دوو نیشاندەر ببینن، یەکیان عەرەب و ئەوی دیکەیان عەجەم، عەرەبەکە پشتگوێ بخەن و بەرێگەی عەجەمەکەدا بڕۆن.

دواتر لەسەر وەرگرتنی سەد و نەوەد هەزار پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و چەندین خەڵاتییان پێشکەش کرد. هەواڵی سەرکەوتن و دیارییەکانی بەهورمزەیل کامیلی بۆ ئەبوبەکر نارد. ئەبوبەکر دیارییەکانی خستە سەر جەزیە و نامەی بۆ خالید نووسی ئەگەر دیارییەکان لەناو جەزیەکەدا نییە، وەك ئەوان لەقەڵەمی بدە و پاشماوەکەی هەڵگرە وهێز بەهاوەڵان و شەڕکەرانی خۆت ببەخشە.

یوسف کوڕی ئەبی ئیسحاق دەڵێت: کەسانێك لەخەڵکانی حیرە ڕۆشتنە لای خالید و لەکارەکانی خۆیان عەمرۆ کوڕی عەبدولمەسیحیان پێشدەخست. خالید پرسی: چەند ساڵتە؟

وتی: دووسەد ساڵ.

خالید وتی: سەرسوڕهێنەرترین شت یا ڕووداو کەتا ئێستا بیستووتە چییە؟

وتی: گوندەکانم بینی لەحیرەوە پەیوەستی دیمەشق بوو. ژن لەحیرە دەڕۆشتەدەر و جگە لەنان توێشووی دیکەی هەڵنەدەگرت.

خالید کاتێك ئەم قسەی بیست، پێکەنی و وتی: ئەی عەمرۆ، ئاوزی تۆ لەپیریدا

خڵەفاوە. بەخەڵکانی حیرەی وت: بیستوومە خەڵکانێکی زیرەك و فێڵبازن بۆ لەکارەکانی خۆتان کەسێك دەخەنەپێش کەنازانێت لەکوێوە هاتووە؟

عەمرۆ گرنگی بەم وتەیە نەدا و مەبەستی ئەوەی کرد قسە بکات تا خالید ئاوز و راستی وتەکانی ئەوی بۆ دەرکەوێت، وتی: سوێند بەماڤ تۆ ئەی ئەمیر، دەزانم لەکوێوە هاتووم؟

خالید وتی: لەکوێوە هاتوویت؟

وتی: شوێنی دوور یا نزیك؟

خالید وتی: هەرکامیان دەخوازیت.

وتی: لەسکی دایکم.

خالید وتی: مەبەستت چییە؟

وتی: بڕۆینە پێش.

خالید وتی: کوێیە؟

وتی: ئاخیرەت، (رۆژی پەسلان)

خالید: شوێنە دوورەکە کوێیە؟

وتی: پشتی باوکم؟

خالید وتی: لەچیدایت؟

وتی: جلەکانم.

خالید وتی: ئاوزت هەیە.

وتی: بەندیش دەبەستم.

خالید هەستی بەزمان پاراوی ئەو کرد و وتی: خەڵکان، خەڵکەکەی خۆیان باشتر دەناسن.

عەمرۆ وتی: ئەی ئەمیر: مێروو باشتر لەوشتر دەزانیت، چی لەماڵی مێروودایە؟

زوهری دەڵێت: درێژەی گێرانەوەکەی لەحەدیسێکی دیکەدایە، دەڵێت: عەمرۆ خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو کەکیسەیەکی بەکەمەرییەوە هەڵواسیبوو، خالید کیسەکەی لێسەند و ئەوەی لەناو کیسەکەدا بوو، خستیە بەردەستی و وتی: ئەی عەمرۆ ئەمە چییە؟

وتی: ژەهری یەك کاژێرە.

خالید وتی: بۆ ژەهرت لەگەڵ خۆت هێناوە؟

وتی: دەترسام پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی من مامڵەم لەگەڵ بکەیت، تەمەنی خۆم کردووە و مەرگ خراپتر لەوەیە بەهەواڵێکی ناخۆش بۆ لای خەڵکەکەم بگەڕێمەوە.

خالید وتی: کەس تا ئەجەلەکەی کۆتایی نەییێت، نامرێت.

عەمرۆ وتی: بسم الله خیر الاسماء و رب الارض و رب السماء الذی لیس یضر مع اسمە داء الرحمان الرحیم.

کەسانێك ویستیان ژەهرەکەی لێ بستێنن بۆ ئەوەی نەیخوات بەلاَم ئەو دەستی خۆی پێش خست و ژەهرەکەی قووتدا، وتی: سوێند بەخوا ئەی عەرەبەکان تا کەسێك لەئێوە مابێتەوە و بخوازن، پاشایەتی تایبەت دەبێت بەئێوە. دواتر رووی کردە خەڵکانی حیرە و وتی: ئەی خەڵکینە، هیچ کارێك بەئەندازەی کارەکەی ئەمرۆ، داهاتووەکەی رووناك نەبووە.

خالید بەو مەرجە بەپەیمانی ئاشتی رازی بوو کەکەرامە کچی عەبدولمەسیح بکەنە هاوسەری شەویل. ئەم کارە بۆ ئەوان دژوار بوو. کەرامە وتی: گرنگی پێمەدەن چوونکە لەجیاتی من بەهای ئازادی من وەردەگرن. ئەو کارەیان کرد و خالید لەنێوان خۆیان و ئەوان پەیمان نامەیەکەیان نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە پەیمانێکە لەنێوان خالید کوڕی وەلید لەگەڵ عودەی و عومەر کوڕەکانی عودەی و عەمرۆ کوڕی عەبدولمەسیح و ئەیاس کوڕی قەبیسە و حەیری کوڕی ئەکال (بەوتەیەك جەیری) نوێنەرانی خەڵکی حیرە کەهەموو خەڵکانی حیرە پێی رازین.

پەیمانیان بەست ساڵانە یەکسەد و نەوەد هەزار درەم جەزیە بدەن، لەسەرقاڵانی دنیا و قەشەکان جگە لەو کەسانەی پشتیان کردۆتە دنیا، لەپێناو بەرگری کردنی ئەوان ئەگەر نەیکات، هیچ نەدەن.

ئەگەر رێز لەکردار یا پەیمانەکەی خۆیان نەگرن، لەپەنای موسوڵمانان‌دا نین.

ئەم پەیمان نامەیە لەمانگی رەبیع الاولی ساڵی دوانزەیەم نووسرا.))

پەیمانەکەی تەسلیم بەخەڵکانی حیرە کرد.

کاتێك دوای مەرگی ئەبوبەکر خەڵکانی سواد کافر بوون، گرنگییان بەپەیمان نامەکە نەدا و لەناویان برد و دووبارە ئامێزیان بۆ کوفر کردەوە و فارسەکان بەسەریاندا زاڵ

بوون. کاتێك موسەنا بۆ جاری دووەم دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرت، ویستیان پشت بەپەیمانەکە ببەستن بەڵام موسەنا گرنگی پێنەدا و بڕیارێکی دیکەیدا. کاتێك موسەنا لەسواد شکستی خوارد، دووباره کافر بوونەوە و هاوکاری ناباوەڕانیان کرد و گرنگییان بەپەیمانەکە نەدا و لەناویان برد.

کاتێك سەعد دەستی بەسەر سوادا گرت، پەیمانەکەیان هێنایە کایەوە. سەعد وتی: یەکێك لەم دوو پەیمانە بێنن و کاتێك نەیانهێنا، سەبارەت بەکارەکانی ئەوان لێکۆڵینەوەی کرد و چوارسەد هەزاری وەك جەزیە بەسەردا سەپاندن جگە لەو کەسانەی بەخشرا بوون.

یونس کوڕی ئەبی ئیسحاق دەڵێت: جەریر کوڕی عەبدوللە یەکێك بوو لەو کەسانەی هاوڕێ لەگەڵ سەعید کوڕی عاس بەرەو شام ڕۆشت. داوای لەخالید کرد مۆڵەتی پێبدات بۆ ئەوەی بڕواتە لای ئەبوبەکر و سەبارەت بەخەڵکەکەی قسەی لەگەڵ بکات و بتوانێت ئەوان کۆبکاتەوە کە لەناو هۆزە عەرەبەکاندا بڵاو ببوونەوە. خالید مۆڵەتی پێدا و ئەو ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و بەڵێنەکەی پێغەمبەری لەمبارەوە وەبیرهێنایەوە و چەند شایەتێکی بۆ پشتڕاست کردنەوەی قسەکانی بردە لای ئەبوبەکر و داوای لێ کرد ئەو بەڵێنە بباتە سەر. ئەبوبەکر تووڕە بوو، وتی: دەبینیت سەرقاڵی چیت و دەبێت موسوڵمانەکان لەبەرابەر دوو شێری پارس وڕۆم هاوکاری بکەم، بەڵام ئێستا دەتەوێت سەرقاڵی کارێك بم کەهیچ کاریگەرییەك لەسەر ئەم کارانەی ئێستامان دانانێت، بگەڕێرەوە بۆ لای خالید کوڕی وەلید تا بزانین فەرمانەکانی خواوەند سەبارەت بەم دوو ناوچەیە چین.

جەریر گەڕایەوە و لەحیرە گەیشتە لای خالید. لەشەڕی حیرە و شەڕەکانی پێشووتر کەدوای ئەوە لەعێراق روویدا، هەروەها شەڕی خالید لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان بەشدار نەبوو.

## ڕووداوەکانی دوای حیرە

جەمیلی تایی لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك کەرامە کچی عەبدولمەسیحیان کردە هاسەری شەویل، بەعودەی کوڕی حاتەمم وت: سەرتسوڕنەماوە شەویل کچەکەی عەبدولمەسیحی دەوێت لەکاتێکدا پیر بووە؟ وتی: هەموو تەمەنی حەزی لەو دەکرد و دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) باسی ئەو شارانەی دەکرد موسوڵمانان دەستی بەسەردا دەگرن و ناوی حیرەی برد و فەرمووی: دەڵێی ستوونی کۆشکەکانی هاوشێوەی کەڵبەی سەگ بوو. زانیم ئەو شوێنەیان نیشانی پێغەمبەر(د.خ) داوە و دەستی بەسەردا دەگیرێت و لەبەر ئەمە داوای کەرامەم لە پێغەمبەر(د.خ) کرد.

شەعبی دەڵێت: کاتێك شەویل ڕۆشتە لای خالید، وتی: کاتێك بیستم پێغەمبەر(د.خ) باسی گرتنی حیرەی دەکرد، داوام لێکرد کەرامە بکاتە هاوسەری من و فەرمووی: کاتێك حیرە بەشەڕ دەستی بەسەردا گیرا، کەرامە هاوسەری تۆ بێت. چەند کەسێك بۆ ئەم داستانە شایەتییاندا و خالید بەو مەرجە لەگەڵ خەڵکانی حیرە پەیمانی ئاشتی بەست تا کەرامە بکەنە هاوسەری شەویل. ئەم بابەتە بۆ بنەماڵە و خەڵکی حیرە دژوار و قورس بوو.

بەڵام کەرامە وتی: نیگەران مەبن، سەبارەت بەژنێك کەتەمەنی گەشتۆتە هەشتا ساڵ، خەم مەخۆن، پیاوێکی نەزانە لەکاتی گەنجیدا منی بینیوە و گومان دەکات گەنجی و جوانی لەناو ناچێت.

کەرامەیان تەسلیم بەخالید و خالید ئەوی بەشەویل سپارد.

کەرامە بەشەویلی وت: تۆ چ نیازێکت بەپیرێژنێکی وەك من هەیە، لەجیاتی من بەهای ئازادی من وەربگرە.

وتی: رازی نابم مەگەر ئەوەی خۆم بڕەکەی دیاری بکەم.

وتی: خۆت دیاری بکە.

شەویل وتی: دایکم لەش فرۆش بێت ئەگەر کەمتر لەهەزار درەم وەربگرم.

کەرامە بڕەکەی بەزۆر زانی بۆ ئەوەی فریوی بدات. دواتر بەهای ئازادی خۆیدا و گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکەکەی.

کاتێك خەڵك لەم کارە ئاگادار بوونەوە، شەویلیان سەرکۆنە و وتیان: نەتدەزانی

لەسەرووی هەزاریش، ژمارەی دیکە هەیە.

خالید وتی: تۆ شتێك دەخواست و خواوەند شتێكی دیكە. كارمان بەناخ و مەبەستەکەی تۆ نییە.

هەروەها شەعبی دەڵێت: کاتێك خالید دەستی بەسەر حیرەدا گرت، نوێژی سەرکەوتنی بۆ هەشت رەکعەت زیاد کرد و تیایدا سلاوی نوێژی نەدایەوە، دواتر ئاوڕی دایەوە و وتی: لەشەڕی موتە نۆ شمشێر بەدەستی منەوە شکا بەلام هیچ خەڵکێکم وەك فارسەکان و لەناو فارسەکانیش خەڵکانی وەك ئەلیسم نەبینیوە.

قەیس کوڕی ئەبی حازم لەگەڵ جەریر ڕۆشتبووە لای خالید، دەیوت: کاتێك لەحیرە گەشتینە لای خالید، جلەکانی خۆی لەملییەوە ئاڵاندبوو و بەتەنیا نوێژی دەخوێند. ئاوڕی دایەوە و وتی: لەشەڕی موتە نۆ شمشێر بەدەستمەوە شکا و تەنیا یەك شمشێری یەمانی لەدەستمدا مایەوە و هەنووکە ئەو شمشێرەم پێیە.

ماهان دەڵێت: کاتێك خەڵکانی حیرە پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ خالید بەست، سەلوبا کوڕی نەستونا سەرکردەی قس الناتف هاتە ئوردووگاکەی خالید و سەبارەت بەبانقیا و بەسما پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەست و هەرچی تایبەت بەدووگوندەکە بوو پەیمانی بەست و بەڵێنیدا و لەبەرابەر ئەوە بۆ خۆی و خەڵکەکەی ئەمانی وەرگرت و لەبەرابەر دەهەزار دینار جگە لەوەی تایبەت بوو بەکەسرا. جەزیەی هەر کەسێك چوار درەم خەمڵێنرا و خالید پەیمان نامەیەکی بۆ ئەوان نووسی و جێبەجێ کرا. ئەوان لەکاتی زاڵبوونی پارسەکان پەیمان نامەکەیان نەشکاند.

موجالید بەمشێوەیە ئاماژەی بەناوەڕۆکەی پەیمان نامەکەداوە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە نامەی خالید کوڕی وەلیدە بۆ سەلوبا کوڕی نەستونا و خەڵکەکەی، من لەگەڵ ئێوە سەبارەت بەسەرانە و پارێزگاری، پەیمان دەبەستم کە لەسەر هەر کەسێکی کارکەر لەبانقیا پێویستە، لەسەر دە هەزار دینار، جگە لەماڵە تایبەتەکان و کەسی بەتوانا بەئەندازەی توانای خۆی و کەسی نەدار بەئەندازەی توانای خۆی بیدەن.

تۆ نوێنەری خەڵکەکەی خۆتیت و بەنوێنەرایەتی تۆ رازی بوون، من و موسوڵمانەکانی هاوڕێی من رازی بووین و خەڵکەکەی تۆیش رازین، پشتیوانی و پارێزگاری ئێوە لەسەر شانی ئێمەیە، ئەگەر ئێوەمان پاراست، سەرانە ماڧ خۆمانە و

گەرنە پارێزگاریتان لێ ناکەین. هوشام کوڕی وەلید و قەعقاع کوڕی عەمرۆ و جەریر کوڕی عەبدوللەی حەمیری و حەنزەلە کوڕی رەبیع شایەتی ئەم نامەن و لەساڵی دوانزەیەم لەمانگی سەفەر نووسرا.))

موغەیرە دەڵێت: وەرزێرەکان چاودێری بارودۆخیان دەکرد و چاوەڕوان بوون بزانن خالید لەگەڵ خەڵکانی حیرە چی دەکات. کاتێك کاروباری نێوان خەڵکانی حیرە و خالید سامانی گرت، وەرزێرەکانی مەڵتاتین روویان لەخالید کرد و زادبۆن بەهیش وەرزێری فوراتی سریا و سەلوبا کوڕی نەستونا کوڕی بەسبێهری ( و بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە سەلوبا کوڕی بەسبێهری و بەستونا) هاتن و سەبارەت بەناوچەی نێوان فەلالیج تا هورموزگێرد لەسەر هەزار هەزار ( و بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە هەزار هەزار سەقیل(مسقاڵ) پەیمانی ئاشتییان بەست تا زەوییەکانی تایبەت بەکەسرا و ئەوەی لەگەڵ ئەوان بڕوات و لەماڵەکەی خۆی نەمێنێتەوە و پەیمانی ئاشتی نەیگرێتەوە، تایبەت بەموسوڵمانان بێت. خالید لەناو ئوردووگاکەی خێوەتێکی هەڵدا و نامەیەکی بۆ ئەوان نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە نامەی خالید کوڕی وەلیدە بۆ زاد کوڕی بەهیش و سەلوبا کوڕی نەستونا، ئێمە پشتیوانی لەئێوە دەکەین و ئێوەیش دەبێت سەرانە بدەن. دەستەبەری خەڵکەکەی خۆتان لەبێهقوبادی سەرو و خوارون و لەبەرابەر هەزار مسقاڵ کە ساڵانە دەدرێت و لەهەر کەسێکی کارکەر و ئەمە جگە لەپەیمانی بانقیا و بسمایە و ئێوە من و موسوڵمانەکانتان رازی کردووە و ئێمە ئێوە و خەڵکانی بێهقوبادی سەرو و خواروو و هاوپەیمانانی ئێوە لەبێهقوبادی ناوەڕاست، لەگەڵ سامانی خۆتان بەجێدێڵین جگە لەو سامان و مڵك و ماڵەی تایبەتە بەکەسرا و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوان دەڕۆن.

هوشام کوڕی وەلیید و قەعقاع کوڕی عەمرۆ و جەریر کوڕی عەبدوللەی حەمیری و بەشیر کوڕی عوبەیدالله کوڕی خەسایسە و حەنزەلە کوڕی رەبیع شایەتی ئەم نامەن کە لەساڵی دوانزەیەم لەمانگی سەفەر نووسراوە.))

خالید کوڕی وەلید لێپرسراو و کارگوزارانی خۆی بۆ ئەو شوێنانە نارد. یەکێك لەکارگوزارەکانی ئەو عەبدولله کوڕی وەسیمەی بەسری بوو کە لەفەلالیج بۆ پاراستن و وەرگرتنی جەزیە، نیشتەجێ بوو.

جەریر کوڕی عەبدولله وەك لێپرسراوی بانقیا و بەسما دەستنیشان کرا.

بەشیر کوڕی خەسایسە وەك كارگوزاری نەهرەین و لەبانبورا كەسەر بەكوفەیە، نیشتەجێ بوو.

سوەید کوڕی موقرین وەك لێپرسراوی تەستەر و لەعەقەر نێشتەجێ بوو. تا ئێستا ئەو شوێنە بەعەقەری سوەید ناو دەبەن و ناوەكەی بۆ سوەیدی مینقەری ناگەڕێتەوە.

وات کوڕی ئەبی ئەت بوو بەلێپرسراوی رووباری مەستان و لەكەنار رووبار نیشتەجێ بوو. ئەو رووبارە بەناوی ئەو ناوی دەبرێت و تا ئێستا پێی دەڵێن رووباری ئەت. ئەو لەهۆزی مناڵەكانی سەعد کوڕی زەید کوڕی مەناتە.

ئەمانە لەرۆژگاری خالید لێپرسراوانی خەراج بوون.

سنوورەكان لەرۆژگاری خالید لەسیب (كەنار دەریا) بوون و زەرار کوڕی ئەزوەر و زەرار کوڕی خەتاب و موسەنا کوڕی حارسە و زەرار کوڕی موقرین و قەقعاق کوڕی عەمرۆ و بەسرە کوڕی ئەبی روهم و عوتەیبە کوڕی نەهاسی نارد كە لەژێر ناوچەی ژێر دەسەلاتی ئەو لەسیب دابەزین. ئەوان سەركردە و سنووردارەكان بوون. خالید فەرمانی هێرشی پێدان و لەناو تێپەڕین و تا كەنارەكانی دیجلە پێشڕەوییان كرد.

دەڵێت: كاتێك خالید بەسەر بەشێكی سواد زاڵبوو، یەكێك لەدانیشتووانی حیرەی بانگ كر وبەودا نامەیەكی بۆ پارسییەكانی مەداین نووسی كە بەهۆی مەرگی ئەردەشێرەوە گرفتاری دووبەرەكی و ئاژاوە ببوون. ئەوان بەهمەن جادویەیان لەبێهرسیر وەك پێشەنگ و پێشەكی سوپاكەیان دانابوو. ئازادبە و كەسانی وەك ئەو لەناو سوپاكەی بەهمەندا دەبینران. سەلوبایش كەسێكی بانگ كرد و خالید بەواندا دوو نامەی ڕەوانە كرد. یەكیان بۆ گەورەكانی خەڵك و ئەوی دیكەیان بۆ خەڵكان بەگشتی. یەكێك لەنێردراوەكان خەڵكی حیرە و ئەوی دیكەیان نبتی بوو. كاتێك خالید لەپیاوی حیرەی پرسی ناوت چییە؟ وتی: موڕەت. خالید وتی: نامەكە هەڵگرە و ببیە بۆ پارسەكان ئەگەری هەیە خواوەند بەزەیی بەژیانی ئەواندا بێتەوە و تەسلیم بن یا باوەڕ بەئیسلام بێنن. لەنێردراوی سەلوبای پرسی ناوت چییە؟ وتی: هێزقیل. خالید وتی: نامەكە بگرە و وتی: خواوەندا گیانیان بستێنە.

دەقی نامەكانی خالید بەمشێوە بوو:

((بسم الله الرحمان الرحیم. لەخالید كوڕی وەلید بۆ پاشاكانی پارس، سپاس بۆ خواوەند كە پاشایەتی ئێوەی لەناو برد و بیر و هزری ئێوەی پەرێشان كرد و

دووبەرەکی خستە ناو ئێوە، ئەگەر ئەو کارەتان نەدەکرد بۆ ئێوە خراپتر دەبوو، باوەڕ بەدینەکەی ئێمە بێنن بۆ ئەوەی هێرش نەکەینە سەر سەرزەمینەکەتان و روو لەدیارەکانی دیکە بکەین و گەرنە رووبەرووی مەرگ دەبنەوە لەسەر دەستی کەسانێك کە بەو ئەندازەی ئێوە ژیانتان خۆش دەوێت، ئەوان لێی بێزارن.))

((بسم الله الرحمان الرحیم. لەخالید کوڕی وەلید بۆ سنووردارەکانی پارس. باوەڕ بەئیسلام بێنن بۆ ئەوەی ژیانتان بەردەوام بێت، یا پەیمان ببەستن و جەزیە ڕەوانە بکەن و گەرنە لەگەڵ خەڵکان هێرش دەکەمە سەرتان کە بەو ئەندازەی ئێوەژیانتان خۆش دەوێت، ئەوان بەدوای مەرگدا دەگەڕێن.))

ماهان دەڵێت: خەراجیان لەماوەی پەنجا رۆژدا بۆ خالید کوڕی وەلید نارد، بەڵێندەران و نوێنەری خەڵکان وەك بارمتە لای ئەو بوون. هەموو خەراجی بەموسوڵماندا و بەمشێوەیە هێز و دەسەڵاتیان زیادی کرد.

دەڵێت: پارسەکان بەهۆی مەرگی ئەردەشێر لەسەر پاشایەتی و جێگرتنەوەی ئەو گرفتاری دووبەرەکی و ئاژاوە بوون بەڵام بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خالید کوڕی وەلید یەکیانگرت. یەکساڵ بەمشێوەیە تێپەڕی و موسوڵمانان ئەمبەری دیجلەیان داگیر کردبوو. پارسییەکان لەحیرەوە تا دیجلە بێ دەسەڵات و کەس لەوان پەیمانی نەبوو مەگەر ئەوانەی نامەیان نووسی و ئەمانیان وەرگرت. خەڵکانی سەواد یا ڕۆشتبوون یا لەناو قەڵاکانی خۆیان سەنگەریان گرتبوو و شەڕیان دەکرد.

دەڵێت: لێپرسراوانی خەراج بۆ خەراجدەران (بەرائەت) وەرەقەیەکیان ئامادە کرد کەدەقەکەی بەمشێوە بوو:

((بسم الله الرحمان الرحیم. بەرائەت بۆ ئەوکەسەی لەفلانە و فیسارە شوێن لەو جەزیەی ئەمیر، خالید کوڕی وەلید، پەیمانی ئاشتی لەسەر بەستووە کەوەرم گرت و لەبەر ئەوەی جەزیە دەدەن لەئەماندان و خالید و موسوڵمانان دژی ئەوکەسانەی پەیمانی ئاشتی بشکێنن هاودەستی ئێوەن و ئەمانی ئێوە ئەمانی ئاشتییە و ئێمە بۆ پەیمانەکەی ئێوە ئەمەکدارین.))

ئەو دەستە لەموسوڵمانان خالید ئەوانی کردە شایەت، شایەتی ئەم وەرەقەیش بوون وەك هوشام و قەعقاع و جابر کوڕی تاریق و جەریر و بەشیر و حەنزەلە و ئەزداز و حەجاج کوڕی زی عەنق و مالك کوڕی زەید.

سەیف کوڕی عەتییە دەڵێت: خالید لەعێراقەوە ڕۆشت و دانیشتووانی حیرە نووسراوێکیان لەلایەن ئەوەوە نووسی بەم ناوەرۆکە: ئێمە ئەو جەزیەیەماندا خالید بەندەی خوا و موسوڵمانان خواوەند لەگەڵ ئێمە پەیمانیان کردبوو و ئەوان لەجیاتی ئەوە ئێمە لەدەستدرێژەی موسوڵمانان و کەسانی دیکە دەپارێزن.

کوڕی هوزەیلی کامیلی دەڵێت: خالید بەدوو نێردراوەکەی وت هەواڵەکانی بۆ بێننەوە و پێش ئەوەی بەرەو شام بەرێکەوێت، یەکساڵ لەشوێنی خۆی مایەوە و شوێنی نیشتەجێ بوونی حیرە بوو. بۆ هەر شوێنێك دەڕۆشت و دەگەڕایەوە، فارسەکان پاشایەکیان لەسەر کار لادەبرد و یەکی دیکەیان دادەنا و جگە لەبەرگری لەبێهرسیر هیچ کارێکی دیکە نەدەکرا. شیری کوڕی کەسرا هەموو خزمەکانی خۆی کە بەرەچەڵەك بەکەسرا کوڕی قوباد دەگەیشتنەوە، کوشتبوو و دوای ئەردەشێر و کوڕی، فارسەکان هێرشیان کردە سەر هەموو ئەو کەسانەی ڕەچەڵەکیان بۆ بەهرامی گوور دەگەڕایەوە و ئەوانیان کوشت. بەمشێوەیە کەسیان دەستنەدەکەوت ئەو وەك پاشا هەڵبژێرن و بڕیاری لەسەر بدەن.

شەعبی دەڵێت: خالید کوڕی وەلید دوای گرتنی حیرە تا ئەو کاتەی ڕۆشتە شام، زیاتر لەیەك ساڵ بەکاری عەیاز سەرقاڵ بوو و بەموسوڵمانانی وت ئەگەر فەرمانی خەلیفە نەدەبوو، بۆ هاوکاری کردنی عەیاز کە لەدوومە گرفتار ببوو، نەدەڕۆشتم چوونکە هیچ لەمپەرێك بۆ گرتنی سەرزەمینی فارسەکان نەبوو. ساڵێك تێپەڕی کە لەساڵی ژنان دەچوو.

خەلیفە فەرمانی بەخالید دابوو: نیزامێك لەفارسەکان لەپشت سەری ئەودایە و لەدیاری ئەوان پێشڕەوی نەکات. سوپایەکی فارسی لەعەین بوو و سوپایەکی دیکە لەئەنبار و سوپایەکی دیکە لەفەراز.

کاتێك نامەکانی خالید بەدانیشتووانی مەداین گەیشت، ژنانی بنەماڵەی کەسرا قسەیان کرد و فەروخزاد کوڕی بەندوان سەرکردایەتی خەڵکانی گرتەدەست تا ئەو کاتەی بنەماڵەی کەسرا کەسێك دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی وەك پاشا هەڵیبژێرن.

ماهان دەڵێت: ئەبوبەکر فەرمانی بەخالید دابوو: لەخوارەوەیعێراقەوە بڕوات و فەرمانی بەعەیازدابوو لەسەرەوەی عێراق بڕوات و هەرکامیان زووتر گەیشتە حیرە، ئەمارەت بۆ ئەو بێت. پێی وتن ئەگەر بەخواستی خواوەند لەحیرە کۆبوونەوە و

ئوردووگاکانی نێوان عەرەبەکان و فارسەکانتان لەناو برد و مەترسی هێرش کردنە سەر موسوڵمانان لەدواوە نەما، کەسێکتان لەحیرە بمێنێتەوە و ئەوی دیکەتان هێرش بکاتە سەر دیاری فارسەکان و شەڕیان لەگەڵ بکات. داوای هاوکاری لەخوا بکەن و لەو بترسن. کارەکانی ئەو دنیا پێش ئەم دنیا بخەن، لەوەی خواوەند یاساغی کردووە، خۆتان بەدوور بگرن، لەگوناح بەدوور بن و گوناحکار بەخێرایی تۆبە بکات، لەسەر گوناحەکان پێداگری مەکەن و تۆبە بۆ ڕۆژەکانی دواتر دوامەخەن.

دەڵێت: خالید فەرمانەکانی ئەبوبەکری ئەنجامدا و لەحیرە نیشتەجێ بوو. ناوچەی نێوان فەلالیج و خوارەوەی سوادی گرت و کارەکانی سوادیی حیرەی بەسەر جەریر کوڕی عەبدوڵلەی حەمیری و بەشیر کوڕی خەسایسە و خالید کوڕی واشمە و کوڕی زی عەنق و ئەت و سوەید و زەرار دابەش کرد. کاروبارەکانی سوادی ئوبلەی بەسەر سوەید کوڕی موقرین و حەسەکەی حبتی و حەسین کوڕی ئەبی حوڕ و ڕەبیعە کوڕی عەسەل سپارد و سوپاکانی لەسەر سنورەکان جێگیر کرد. قەعقاع کوڕی عەمرۆی کردە جێگری خۆی لەحیرە.

خالید بەرەو سنووری ژێر دەسەڵاتی عەیاز بەرێکەوت تا ناوچەکەی ئەو پاک بکاتەوە و هاوکاری بکات. لەفەلووجەوە بەرێکەوت و لەکەربەلا دابەزی کەعاسم کوڕی عەمرۆ سالاری پادگانەکەی ئەوێ بوو. ئەقرەع کوڕی حابس پێشەنگی سوپاکەی خالید و موسەنا لەسەر یەکێك لەسنوورەکانی ئێران بوو. پێش ئەوەی خالید لەحیرەوە بەرێکەوێت و دوای ئەوەی هاوکاری عەیازی کرد، عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر پارسەکان و تا کەنارەکانی دیجلە پێشڕەوییان دەکرد.

ئەبی ڕەوق دەڵێت: خالید چەند ڕۆژێك لەکەربەلا مایەوە و عەبدوڵلە کوڕی وەسیمە لەزۆری مێش و مێشوولە سکاڵای کرد. خالید پێی وت: چاوەڕێ بە دەمەوێت ئەو ئوردووگایانەی عەیاز بۆ لەناو بردنی ئەوان راسپێردراوە، لەسەر ڕێگە پاك بکەمەوە و لەجێگەی ئەوان عەرەبەکان نیشتەجێ بکەم و چیتر مەترسی هێرش لەدواوە هەڕەشە لەموسوڵمانان نەکات و عەرەبەکان بەبێ کێشە بتوانن پەیوەستی ئێمە بن چوونکە فەرمانی خەلیفە بەمشێوەیە و ئەم کارە دژوارییەکان لەسەر شانمان هەڵدەگرێت.

یەکێك لەخەڵکانی ئەشجەع سەبارەت بەمێش و مێشوولەکان کەکوڕی وەسیمە سکالاّی دەکرد، هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((چوارپێکەی خۆم هەم لەکەربەلا و هەم لەیەمەن

ئەوەندە ڕاگرت تا لاواز بوو
لەهەر شوێنی وەستانێکەوە بڕوات، دەگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی
بەراستی ریسوای دەکەم
و مێشە چاوشینەکان ڕێگەی شوێنی
ئاوخواردنەوەی لێدەگرن.))

## داستانی ئەنبار و زات ئەلعیون و گێرانەوەی تایبەت لەکلوازی

تەلحە دەڵێت: کاتێك خالید لەحیرە بەڕێکەوت، ئەقرەع کوڕی حابس فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی بوو. کاتێك ئەقرەع لەیەك مەنزڵی پێش ئەنبار دابەزی. دەستەیەك لەموسوڵمانان وشترەکانیان بێچووی هێنایە دنیا بەڵام نەیاندەتوانی بێستن و ناچاربوون لەگەڵ ئەو بێچووە وشترە شیرخۆرانەدا درێژە بەڕێگە بدەن. کاتێك فەرمانی بەڕێکەوتنیاندا، گووانی وشترەکانیان بەست و بێچووە وشترەکانیان خستە سەر پشتی وشترەکان و تا ئەنبار پێشڕەوییان کرد. خەڵك لەوێ سەنگەر و خەندەکیان لێدابوو. لەسەرەوەی دیواری قەڵاکانەوە عەرەبەکانیان بینی. شێرزاد فەرمانڕەوای سابات، سەرکردەی سوپاکەی ئەنبار بوو. بیرمەندترین پیاوی عەجەم و لەنێوان عەرەبەکان و عەجەمەکانی ئەو سەرزەمینە، کەس بڕواپێکراوتر و ڕێزدارتر لەو نەبوو.

کاتێك سوپاکەی خالید نزیك بوویەوە، عەرەبەکانی ئەنبار لەسەرەوەی دیواری شارەکە هاواریان کرد: ئەنبار کەوتە مەترسییەوە، وشتر بێچووە وشتر دەبات.

شێرزاد کاتێك دەنگی ئەوانی بیست، وتی: چی دەڵێن؟

کاتێك بابەتەکەیان بۆ ڕوون کردەوە، وتی: ئەم خەڵکە فاڵی خراپ بۆ خۆیان دەگرنەوە و هەرکەس فاڵی خراپ بۆ خۆی لێبدات، گیرۆدەی دەبێت، سوێند بەخوا ئەگەر خالید شەڕ دەستپێنەکات، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دەبەستم.

لەم کاتەدا خالید لەگەڵ پێشەنگی سوپاکەی هات و بەدەوری خەندەکەکەدا سووڕایەوە و شەڕی دەستپێکرد. لەکاتی شەڕ لەهێرش کردن نەدەترسا و بەتیرهاوێژەکانی خۆی وت: کەسانێك دەبینم شارەزای شەڕ کردن نین، چاویان بکەنە نیشانە و جگە لەمە هیچ کارێك نەکەن.

تیرهاوێژەکان بەردەوام تیریان دەهاویشت و ئەو ڕۆژە نزیکەی هەزار چاو کوێر بوو. ئەم شەڕەیان بەزات ئەلعیون ناوبرد.

هاوار بەرز بوویەوە: چاوی خەڵکانی ئەنبار لەدەست چوو. شێرزاد پرسی: چی دەڵێن؟ کاتێك بۆیان روون کردەوە، وتی: (اباذ، اباذ) بۆبەستنی پەیمانی ئاشتی کەسانێکی بۆ لای خالید نارد بەڵام خالید بەمەرجەکانی ئاشتی رازی نەبوو و نێردراوەکانی گەڕاندەوە. دواتر وشترە پەککەوتەکانی بۆ تەستکترین و تەنگترین شوێنی خەندەکەکە برد و ئەوانی خستە ناو خەندەکە و پڕی کردەوە. لەوێوە هێرشی برد و موسوڵمان و ناباوەڕ لەدەوری خەندەکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. خەڵکی ئەنبار پەنایان بۆ قەڵاکانی خۆیان برد و شێرزاد دووبارە کەسی بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی بۆ لای خالید نارد و بەمەرجەکانی رازی بوو. بڕیاریدا خۆی و سوارەکانی بگەیێنیتە شوێنی پێویست و ماڵ و کاڵاکان لەگەڵ خۆیان نەبن.

کاتێك شێرزاد گەیشتە لای بەهمەن جادوویە وبەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، بەهمەن سەرکۆنەی کرد وشێرزاد وتی: لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێك بووم ئاوزیان لەسەردا نەبوو، بەڕەچەڵەك عەرەب و کاتێك دوژمن هێرشی کردە سەرمان، فاڵی خراپیان بۆ خۆیان گرت و کەمتر ڕوویداوە ئەوکەسانەی فاڵی خراپ بۆ خۆیان دەگرنەوە، گرفتاری نەبن. کاتێك دوژمن بۆ شەڕ لێیان نزیك کەوتەوە، هەزار چاوی لەوان کوێر کرد و زانیم بەستنی پەیمانی ئاشتی زۆر باشترە.

کاتێك خالید و موسوڵمانان لەئەنبار جێگیر و خەڵکانی ئەنبار ئاسوودە بوون و دەرکەوتن، خالید بینی بەعەرەبی دەنووسن و زانست فێر دەبن. لەوانی پرسی: ئێوە لەکام خەڵکەن؟

وتیان: لەعەرەبەکان، پێش ئێمە عەرەبەکان لێرە نیشتەجێ بوون و ئەژدادی ئەوان لەڕۆژگاری بەخت نەسر کەهێرشی کردبووە سەر عەرەبەکان، هاتنە ئێرە و مانەوە.

وتی: نووسین لەکێوە فێر بوون؟

وتیان: نووسین لەئەیاد فێر بووین و هۆنراوەی شاعیرێکیان بۆ خوێندەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

((خەڵکی من ئەیادە چ بخوازێت بڕوات

چ بخوازێت بمێنێتەوە و وشترەکان لەڕ بێن

کاتێك بڕۆن هەموو گۆڕەپانی عێراق لەژێر دەستی ئەواندایە

هەروەها خەت و پێنووس))

خالید لەگەڵ خەڵکانی دەوروبەری ئەنبار پەیمانی ئاشتی بەست و لەخەڵکانی بوازیحەوە دەستی پێکرد. خەڵکی کەلوازی کەسیان نارد تا پەیمانیان بۆ ببەستێت. ئەو پەیمانێکی نووسی و لەولای دیجلە بوونە کەسانی بڕواپێکراوی خالید. دوای ئەوە خەڵکانی ئەنبار لەنێوان بگرە و بێنەی نێوان موسوڵمانان و ناباوەڕان پەیمانی خۆیان شکاند جگە لەخەڵکانی بوازیح کەهاوشێوەی خەڵکانی بانقیا ڕێزیان لەپەیمانەکەی خۆیان گرت.

حەبیب کوڕی ئەبی سابت دەڵێت: لەگەڵ هیچ کەسێك لەخەڵکانی سواد پێش ئەوەی شەڕ ڕووبدات، پەیمان نەهاتە ئاراوە مەگەر منداڵەکانی سەلوبا کەخەڵکانی حیرە بون وکەلوازی و دەستەیەك لەگوندەکانی فورات و ئەوان پەیمانی خۆیان شکاند و دووبارە پشتیوانییان لەموسوڵمانان کرد.

محەممەد کوڕی قەیس دەڵێت: لەشەعبیم پرسی: سەرزەمینی سواد بەشەڕ دەستی بەسەردا گیرا؟

وتی: بەڵێ، هەموو زەوی بەمشێوە بوو جگە لەدەستەیەك لەقەڵاکان کەخەڵکەکەی پەیمانی ئاشتییان بەست و دەستەیەکیان بەزۆر تەسلیم بوون.

وتم: ئایا خەڵکانی سواد پێش شەڕ پشتیوانی موسوڵمانانیان دەکرد؟

وتی: نە، بەڵام کاتێك پێشنیاری ئیسلامیان پێکرا و ڕازی بوون بەوەی خەراج بدەن، خەراجیان لێ وەرگیرا و پشتیوانی موسوڵمانانیان کرد.

## داستانی عەین ئەلتەمر

موهەلیب دەڵێت: کاتێك خالید لەئەنبار ئاسوودە بوو، زەبەرقان کوڕی بەدری لەئەنبار وەك جێگری خۆی دانا و مەبەستی ڕۆشتن بۆ عەین ئەلتەمری کرد کەمێهران کوڕی بەهرامی چووبین لەگەڵ دەستەیەکی زۆر لەعەجەمەکان و عوقفە کوڕی ئەبی عوقفە لەگەڵ دەستەیەکی زۆر لەعەرەبەکانی نەمر و تەغلەب و ئەیاد و هاوپەیمانەکانیان لەوێ بوون و کاتێك لەهاتنی خالید ئاگادار بوونەوە، عوقفە بەمێهرانی وت: عەرەبەکان باشتر دەزانن چۆن شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان بکەن، ئێمە بەخالید بسپێرە.

مێهران وتی: بۆچوونەکەت راستە و ئێوە شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان باشتر دەزانن و لەکاروباری شەڕ لەگەڵ عەجەمەکان هاوشێوەی ئێمەن. ئەو فریودا و پێشتر ئەوی نارد، وتی: شەڕیان لەگەڵ بکەن و ئەگەر پێویستتان بەئێمە بوو هاوکاریتان دەکەین.

کاتێك عوققە رووبەرووی خالید بوویەوە، عەجەمەکان بەمێهرانیان وت: بۆ لەگەڵ ئەم سەگە بەمشێوەیە قسەت کرد؟

وتی: هەرچیم وت لەبەرژەوەندی ئێوە و زیانی ئەوان بوو. عەرەبەکان هاتوون کەسوپاکەی ئێوەیان کوشتار کردووە و هێزی ئێوەیان تێکشاندووە، عوققەم بۆ شەڕ لەگەڵ ئەوان نارد، ئەگەر شەڕ لەبەرژەوەندی یا زیانی خالید بێت، سوودی ئێوەی تیایە و ئەگەر پێچەوانەکەی رووبدات و عوققە شکست بدەن، هێزیان لاواز و ئێمە بەهەموو هێزی خۆمان، شەڕیان لەگەڵ دەکەین.

عەجەمەکان وتیان بۆچوونەکەت پەسەندە.

مێهران لەعەین مایەوە و عوققە لەسەر رێگەی خالید دابەزی. بوجەیر کوڕی فلان لەتایەفەی منالەکانی عوبەید کوڕی سەعد کوڕی زوهەیر فەرماندەی باڵی راستی سوپا و هوزەیل کوڕی عیمران فەرماندەی باڵی چەپ بوو. دووری نێوان عوققە و مێهران نیوە رۆژێك رێگە بوو. مێهران لەگەڵ سوپای پارسەکان لەقەڵاکەدا مایەوە و عوققە لەرێگەی کەرخ وەك پێشەنگی سوپای پارسەکان رێگەی لەخالید گرت.

کاتێك خالید هات، عوققە سوپاکەی ئامادە کردبوو. خالیدیش سوپای رازاندەوە و بەفەرماندەی دووباڵی سوپاکەی وت ئاگاتان لەئێمە بێت. من هێرش دەبەم و چەندین کەسی بۆ پاسەوانی کردنی خۆی دانا و هێرشی دەستپێکرد. عوققە سەرقاڵی ئامادە کردنی سوپاکەی خۆی بوو کەخالیدگەمارۆی خستە سەر و ئەسیری کرد. شەڕکەرانی ئەو بێ جەنگ شکستیان خوارد. ژمارەیەکی زوریان ئەسیر و بوجەیر و هوزەیل هەڵاتن. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن.

کاتێك مێهران لەرووداوەکە ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ سوپاکەی خۆی هەڵات و قەڵاکانیان چۆڵ کرد. کاتێك پاشماوەی سوپاکەی عوققە لەعەرەب و عەجەم گەشتنە قەڵاکان، سەنگەریان گرت. خالید لەگەڵ سوپاکەی خۆی هات و لەدەرەوەی قەڵاکە دابەزی. عوققە و عەمرۆ کوڕی سەعق بەئەسیری لەگەڵیدا بوون. عوققە و عەمرۆ هیوادار بوون خالید وەك تاڵانچییە عەرەبەکان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکات. کاتێك لەمەبەستەکەی ئاگادار بوونەوە، داوای ئەمانیان کرد بەڵام خالید رازی نەبوو مەگەر

ئەوەی ملکەچی فەرمانەکان و خۆیان بەدەستەوە بدەن. کاتێك قەڵاکان دەستیان بەسەردا گیرا، تەسلیمی موسوڵمانانی کرد. خالید فەرمانی کوشتنی سەرکردەی خەڵکان یانی عوقەی دەرکرد تا ئەسیرەکانی دیکە لەژیان بێ هیوا بن. کاتێك ئەسیرەکان کوژراوی ئەویان بینی، لەژیان بێ هیوا بوون. دوای ئەوە عەمرۆ کوڕی سەعقیان کوشت و هەموو خەڵکانی ناو قەڵاکەیشی کوشتار کرد. هەرچی ژن و ماڵ و سامان لەناو قەڵاکەدا بوو وەك تالآنی بۆ موسوڵمانەکان مایەوە. لەکەنیسەکەی ئەوێ چل کوڕیان ئەسیر کرد کەسەرقاڵی فێربوونی ئینجیل بوون. دەرگاکەیان لەسەر ئەوان داخستبوو. دەرگاکەی شکاند و پرسی: ئێوە کێن؟

وتیان: بارمتەین.

خالید ئەوانی بەناو پیاوە تێکۆشەرەکانی سوپاکەیدا دابەش کرد کەباوکی زیاد مواتلی سەقیف و نەسیر باوکی موسا کوڕی نەسیر و باوکی عەمرە باوەگەورێی عەبدوللە کوڕی عەبدولعەلی شاعیر و سیرین باوکی محەممەد کوڕی سیرین و حورەیس و عەلاسە لەناویاندا دەبینران. باوکی عەمرە بەشورەحبیل کوڕی حەسەنە برا و حورەیس بەیەکێك لەمناڵەکانی عوبادە و عەلاس بەمەعنی و حەمران بەعوسمان.

عومەیر و باوکی قەیس لەناو ئەواندا بوون.

لەم دەستەیە ئەوانەی ئازادبووەکانی شامییەکان بوون، ڕەچەڵەکی خۆیان پاراست. نەسیر ڕەچەڵەکی بۆ مناڵەکانی یەشکور دەگەڕاندەوە و باوکی عەمرە بۆ مناڵەکانی مورە. هەروەها کوری ئوخت ئەلنەمر یەکێك بوو لەوان.

موهەلیب کوڕی عوقبە دەڵێت: کاتێك وەلید کوڕی عوقبە بەنوێنەرایەتی خالید هاتە لای ئەبوبەکر و پێنج یەکی تالآنییەکانی هێنا، ئەبوبەکر ئەوی بۆ هاوکاری عەیاز ڕەوانە کرد و کاتێك وەلید گەیشتە لای عەیاز، عەیاز گەمارۆی خستبوە سەر دوژمن. ئەوانیش بەهەمان شێوە عەیازیان گەمارۆ و ڕێگەکانیان لێ بەستبوو.

وەلید بەعەیازی وت: لەهەندێ دۆخدا بۆچوونێکی پەسەند باشترە لەسوپایەکی فراوان، کەس بۆ لای خالید بنێرە و داوای هاوکاری بکە. عەیاز ئەو کارەی کرد و نێردراوەکەی ئەو دوای شەڕی عەین ئەلتەمەر گەیشتە لای خالید. خالید نامەی بۆ عەیاز نووسی: بۆ هاوکاری تۆ بەرێدەکەوم و هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((ماوەیەك چاوەڕێ بە تا وشترەکان بێنە لای تۆ

چوونکە شێرە شمشێرە بەدەستەکانیان پێیە
بەدەستەکان کەلەدوای دەستەکانەوە دێن.

## داستانی دومەت ئەلجەندەل

دەڵێت: کاتێك خالید لەعەین ئەلتەمەر ئاسوودە بوو، عوەیم کوڕی کاهیلی ئەسلەمی وەك جێگری خۆی دانا و لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەهەمان شێوە کەرۆشتبووە ناو عەین ئەلتەمر، ئەو ناوچەی بەجێهێشت.

کاتێك خەڵکانی دومە لەمەبەست و بەرێکەوتنی خالید ئاگادار بوونەوە، کەسیان بۆ لای هاوپەیمانەکانی خۆیان لەتایەفەی بەهرا و کەلب و غەسان و تنوخ و زەجاعیم نارد. پێشتر وەدیعە لەگەڵ خەڵکانی کەلب و بەهرا هاتبوو. کوڕی وەبرە کوڕی رۆمانس هاورێیەتی دەکرد، کوڕی حەدرەجان لەگەڵ خەڵکانی زەجاعیم و کوڕی ئەیهەم لەگەڵ دەستەیەك لەغەسان و تنوخ هاتن و بارودۆخیان لەعەیاز دژوار کرد. کاتێك لەنزیك بوونەوەی خالید ئاگادار بوونەوە، دوو سەرکردەیان بوو یەکیان ئەکیدەر کوڕی عەبدولمەلیك و ئەوی دیکەیان جوودەی کوڕی رەبیعە. کێشە لەناو سەرکردەکان دروست بوو ئەکیدەر وتی: من خالید باشتر لەهەموان دەناسم، کەس بەختەوەرتر لەو نییە و لەشەڕدا کەس وەك ئەو توندوتیژ و سەختگیر نییە، هەر خەڵکێك رووبەرووی خالید ببنەوە، چ کەم چ زۆر، شکست دەخۆن، گوێ لەوتەکانم بگرن و پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەم خەڵکە ببەستن.

بەلاّم بەوتەکانی رازی نەبوون. وتی: من بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خالید هاوڕای ئێوە نیم، چیتان پێخۆشە ئەنجامی بدەن. ئەمەی وت و لەوناوچەیە ڕۆشت. خالید لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە و عاسم کوڕی عەمرۆی نارد و ڕێگەی ئەوی بەست. ئەکیدەری گرت و وتی: هاتنی من بەمەبەستی بینینی خالید کوڕی وەلید بووە. کاتێك ئەویان بردە لای خالید فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد و هەموو سامانەکەیان تالاّن کرد.

خالید بەرەو خەڵکانی دومە بەرێکەوت کەجودی کوڕی رەبیعە و وەدیعەی کەلبی و کوڕی رۆمانس کەلبی و کوڕی ئەیهەم و کوڕی حەدرەجان سەرکردەیان بوون. خالید لەنێوان دومە و ئۆردووگاکەی عەیاز، ئۆردووی لێدا.

عەرەبە مەسیحییەکان بۆ هاوکاری خەڵکانی دومە هاتبوون و لەدەورووبەری قەلاّکانی

دومە ئوردوویان لێدا بوو. لەناو قەڵاکەدا شوێنی چۆڵ نەدەبینرا. کاتێک خالید دابەزی، جودی و رەبیعە هێرشیان کردەسەر و کوڕی حەدرەجان و کوڕی ئەیهەم هێرشیان کردنە سەر عەیاز. خواوەند جودی و وەدیعەی لەسەر دەستی خالید شکستدا و عەیازیش دوژمنەکانی خۆی لەناوبرد. موسوڵمانان سەرکەوتن. خالید جودی گرت و ئەقرەع کوڕی حابس وەدیعەی ئەسیر کرد. پاشماوەی شەڕکەران روویان لەقەڵاکە کرد. جێگەی هەموویان نەدەبوویەوە و کاتێک قەڵاکە پڕ بوو، دەرگایان بەسەر هاوەڵانی خۆیاندا بەست. عازم کوڕی عەمرۆ وتی: ئەی منداڵەکانی تەمیم، کەلبییەکان هاوپەیمانی ئێوەن، پەناپان پێبدەن. منداڵەکانی تەمیم ئەوکارەیان کرد و ئەم پێشنیارەی عاسم بووە هۆی رزگاری ئەوان.

خالید هێرشی کردە سەر کەسانی دەوروبەری قەڵاکە و بەرادەیەک لەوانی کوشت کەدەرگای قەڵاکە لەجەستەی کوژراوەکان بەسترا. جودی بانگ کرد و ملی پەڕاند. یەک یەک ئەسیرەکانیان کوشت جگە لەئەسیرەکانی کەلب کەعاسم و ئەقرەع و خەڵکانی کەلب وتیان: ئەمانمان پێبەخشیون. خالید ئەوانی بەرەڵا کرد و وتی: هاوشێوەی رۆژگاری جاهلییەت هەڵس و کەوت دەکەن و ئیسلامتان پشتگوێ خستووە.

عاسم پێی وت: لەرزگار بوونی ئەوان دڵگران مەبە چوونکە شەیتان دەستی بەوان ناگات.

خالید هێرشی کردە سەر دەرگای قەڵاکە و بەرادەیەک هەوڵیدا تا لەشوێنی خۆی هەڵیکەند. موسوڵمانان هێرشیان کردە ناوقەڵاکە و شەڕکەرانیان کوشت و تازەپێگەیشتووانیان ئەسیر و دواتر وەک حەڕاجی ئەوانیان فرۆشت. خالید کچەکەی جودی کڕییەوە.

خالید لەدومە مایەوە و ئەقرەعی بۆ ئەنبار رەوانە کرد.

کاتێک خالید بۆ حیرە گەڕایەوە و لەو شارە نزیک کەوتەوە، قەعقاع خەڵکانی حیرە بۆ دەف ژەنین ناچار کرد، ئەوان بەدەم دەف لێدانەوە پێشوازییان لەخالید کرد. بەخۆیان دەوت: بڕۆین چوونکە ئەم کارە رێگە لەخراپە دەگرێت.

موهەلیب دەڵێت: کاتێک خالید لەدومە بوو، عەجەمەکان چاوی تەماحیان تێبڕی و عەرەبەکانی جەزیرە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوققە نامەیان بۆنووسی و زەرمێهر هاورێ لەگەڵ روزبە لەبەغدادەوە بەرەو ئەنبار بەرێکەوت. ئەوان لەحەسید و خەنافس

بڕیاریاندا بوو لەگەڵ عەرەبەکان کۆببنەوە.

زەبەرقان لەئەنبارەوە نامەی بۆ قەعقاع کوڕی عەمرۆ جێگری خالید لەحیرە نووسی و قەعقاع ئەعبود کوڕی فەدەکی سەعدی بۆ حەسید نارد و عوروە جوعدی بارقی بۆ خەنافس و فەرمانی پێدان: ئەگەر هێرشیان کردنەسەر، بجەنگن.

ئەعبود و عوروە ڕۆشتن و لەنێوان عەجەمەکان و گوندەکان بوونە لەمپەر و ڕێگەیان لەجموجۆڵی ئەوان گرت. روزبە و زەرمهێر لەچاوەڕوانی خەڵکانی رەبیعە کەنامەیان بۆ نووسیبوون، لەبەرابەر موسوڵمانەکان مانەوە.

کاتێك خالید لەدومەوە بۆ حیرە گەڕایەوە و لەڕووداوەکە ئاگادار بوویەوە، نارەزوومەندی شەڕ لەگەڵ خەڵکانی مەداین بوو بەڵام نەیدەویست سەرپێچی فەرمانەکانی ئەبوبەکر بکات و لەلایەن خەلیفەوە سەرکۆنە بکرێت. قەعقاع کوڕی عەمرۆ و باوکی لەیلی فەدەکی بەپەلە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی زەرمێهر و روزبە بەڕێکەوتن و زووتر لەخالید گەیشتنە عەین ئەلتەمر.

لەم کاتەدا نامەی ئەمرۆ ئەلقەیس کەلبی بەدەستی خالید گەیشت کەهوزەیل کوڕی عیمران لەمەسیخ ئوردووی لێداوە و رەبیعە کوڕی بوجەیر لەگەڵ سوپایەك لەسەنی و بشر دابەزیوە و دەیانەوێت تۆڵەی عوققە بستێننەوە و پەیوەستی زەرمێهر و روزبە بن.

خالید فەرمانی ڕۆشتنیدا، ئەقرەع کوڕی حابس فەرماندەی پێشەنگەکانی سوپاکەی و عەیاز کوڕی غەنەمی وەك جێگری خۆی لەحیرە بەجێهێشت و لەهەمان ڕێگەی قەعقاع و باوکی لەیلی بەرەو خەنافس بەڕێکەوت. لەعەین ئەلتەمر ئەوانی گرتەوە و قەعقاعی بۆ سەرەوەی حەسید نارد و کردی بەسەرکردەی شەڕکەران و باوکی لەیلی بۆ خەنافس نارد و وتی: ڕێگە مەدەن ئەم دوو دەستەیە پەیوەستی یەك بن و شەڕیان لەگەڵ بکەن. بەڵام دوژمن هیچ جموجۆڵێکی نەکرد.

## شەڕی حەسید

کاتێك قەعقاع بینی روزبە و زەرمێهر هیچ جووڵەیەك لەخۆیان نیشان نادەن، بەرەو حەسید بەڕێکەوت کەروزبە لەگەڵ دەستەیەك لەعەرەب و عەجەمەکان لەوێ بوو. کاتێك روزبە لەهاتنی قەعقاع ئاگادار بوویەوە، داوای هاوکاری لەزەرمهێر کرد و ئەویش هات و مەهبوزانی وەك سەرکردەی سوپاکەی خۆی بەجێهێشت. لەحەسید ڕووبەڕووی

یەکبوونەوە و شەڕی دەستپێکرد. ژمارەیەکی زۆر لەعەجەمەکان کوژرا و قەعقاع زەرمیهری کوشت و روزبە لەسەر دەستی عیسمە کوڕی عەبدوللەی حارسی کوژرا.

لەشەڕی حەسید موسوڵمانەکان تالآنی زۆریان دەستکەوت و پاشماوەی سوپاکەی دوژمن بەرەو خەنافس ڕۆشتن و لەوێ کۆبوونەوە.

## شەڕی خەنافس

باوکی لەیلی فەدەکی لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی و ئەو کەسانەی پەیوەستی ببوون، بەرەو خەنافس بەرێکەوت. هەڵاتووانی جەنگی حەسید پەیوەستی مەهبوزان بوون. کاتێك مەهبوزان لەهاتنی باوکی لەیلی ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ سوپاکەی هەڵات و روویان لەمەسیخ کرد کەهوزەیل کوڕی عیمران لەوێ بوو. لەخەنافس شەڕ روویندا و خالیدیان لەرووداوەکان ئاگادار کردەوە.

## شەڕی مەسیخ

کاتێك هەواڵی کوشتاری حەسید و هەڵاتنی سوپاکەی خەنافس بەخالید گەیشت، نامەی نووسی و لەگەڵ قەعقاع کوڕی عەمرۆ و باوکی لەیلی فەدەکی و عوروە شەو و کاژێرێکی دیاریکراویان دانا تا لەمەسیخ لەنێوان حوران و قوڵت کۆببنەوە.

خالید لەعەین ئەلتەمر بەرەو مەسیخ کەوتەرێ. سوار وشتر و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا.، لەجوناب و بوردان و حەنی تێپەڕی و لەشەو و کاژێری دیاریکراو هەموویان گەیشتنە مەسیخ و لەسێ قۆڵەوە هێرشیان کردە سەر هوزەیل و سوپاکەی کەخەوتبوون. ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت و هوزەیل و چەند کەسێك ررزگاریان بوو. گۆڕەپان پڕ بوو لەجەستەی کوژراوان کەهاوشێوەی مەڕ سەریان بڕابوو.

حێرقوس کوڕی نەعمان، ئامۆژگاری هوزەیل و کەسەکانی کرد بەڵام وتەکانی ئەو دەوری نەبوو. حێرقوس هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و سەرەتاکەی بەمشێوەیە:

((پێش ئەوەی ئەبوبەکر بێت

شەرابم پێبدەن))

ئەو، لەو رۆژگارەدا ژنێکی لەمناڵەکانی هیلال بەناوی دایکی تەغلەب وەك هاوسەر هەڵبژارد و لەو شەوەدا ژنەکەی ئەو لەگەڵ عوبادە و ئەمرۆ ئەلەقیس وقەیس، هەموویان

کوڕی بەشیری هیلالی، کوژران.

لەشەڕی مەسیخ جەریر کوڕی عەبدولله، عەبدولعوزا کوڕی ئەبی روهمی نەمری کوشت و ئەو و لوبەید کوڕی جەریر نامەیەکی ئەبوبەکریان وەك بەڵگەی موسوڵمانی خۆیان پێبوو. کاتێك ئاگادار بوویەوە کەعەبدولعوزا لەشەوی هێرشەکە وتبووی: پیرۆزە پەروەردگاری محەممەد، خوێنبایی ئەو و لوبەیدی دا و وتی: نەدەبوا خوێنبای ئەوان بدەم چوونکە لەگەڵ نەیارەکان بوون. سەبارەت بەمناڵەکانی پێشنیاری کرد چاکەیان لەگەڵ بکەن.

عومەر لەخالید بۆ کوشتنی ئەم دوو کەس و مالك کوڕی نەویرە رەخنەی دەگرت و ئەبوبەکر دەیوت: هەرکەس لەدیاری ناباوەڕان نیشتەجێ بێت، ئەمە ئاکامەکەیەتی.

عودەی کوڕی حاتەم دەڵێت: کاتێك هێرشمان کردە سەر سوپاکەی مەسیخ، یەکێك لەخەڵکانی نەمر بەناوی حێرقوس کوڕی نەعمان لەگەڵ ژن و مناڵەکەی خۆی دانیشتبوو، قاپێك شەرابیان دانابوو و دەیانوت: بەم شەوە درەنگە کەی کاتی شەراب خواردنەوەیە؟

حێرقوس وتی: بخۆنەوە چوونکە دوایین شەرابە و دڵنیام چیتر شەراب ناخۆنەوە لەبەر ئەوەی خالید لەعەینە و سوپاکەی لەحەسیدە و لەکۆبوونەوەی ئێمە ئاگادارە و دەستمان لێهەڵناگرێت.

لەم کاتەدا یەکێك لەسوارەکان ڕۆشتەپێش و بەشمشێر لێیدا و سەری کەوتە ناو قاپە شەرابەکە. کچ و کوڕەکانی ئەومان ئەسیر کرد.

## داستانی سەنی و زەمیل

رەبیعە کوڕی بوجەیری تەغلەبی بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی عوقەه لەسەنی و بشر دابەزی و پەیمانی لەگەڵ روزبە و زەرمهێر بەستبوو. کاتێك خالید سوپاکەی مەسیخی لەناو برد، بەقەعقاع و باوکی لەیلی وت پێشتر بەرێکەون و بەهەمان شێوەی مەسیخ کاتیان دیاری کرد بۆ ئەوەی لەسێ قۆلەوە هێرش بکەنە سەر رەبیعە.

خالید مەسیخی بەجێهێشت و لەحوران و رەنق و حوماه تێپەڕی کەئێستا سەرزەمینی مناڵەکانی جونادە کوڕی زوهەیر تیرەیەك لەکەلبە. هەروەها لەزەمیل تێپەڕی کەهەمان بشرە و سەنی لێوەی نزیکە. هەردووکیان لەرۆژهەڵاتی روسافەیە.

لەسەنی دەستپێیکرد و لەگەڵ هاوەڵانی خۆی کۆبوونەوە و شەوانە لەسێ قۆڵەوە هێرشیان کردەسەر و شمشێریان خستە ناو ناباوەڕان. کەس لەو خەڵکە رزگاری نەبوو. تازەپێگەیشتووانیان ئەسیر و پێنج یەکی تالاّنییەکانی بەنەعمان کوڕی عەوف شەیبانی بۆ ئەبوبەکر نارد و تالاّنی ئەسیرەکانی دابەش کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کچی رەبیعە کوڕی بوجەیری تەغلەبی کڕی و بردییەوە بۆ ماڵ و عەمرۆ و روقیە لەو ژنە چاویان بەدنیا هەڵهێنا.

کاتێك هوزەیل لەگۆڕەپانی شەڕ رزگاری بوو، رووی کردە زەمیل و پەنای بۆ عەتاب کوڕی فلاّن برد. عەتاب لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەبشر بوو و خالید لەسێ قۆڵەوە هێرشی کردە سەر ئەوان بەهەمان شێوە کەهێرشی کردە سەر رەبیعە. کوشتارێکی گەورەی لەناوئەواندا بەرێخست کەهاوشێوەی نەبینراوە. تا دڵیان ویستی، خەڵکیان کوشت.

خالید سوێندی خواردبوو تەغلەبییەکان لەسەرزەمینەکەی خۆیان ناکاوگیر بکات.

خالید تالاّنی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد و پێنج یەکی تالاّنییەکانی بە سەباح کوڕی فلاّنی موزنی بۆ ئەبوبەکر نارد کەکچی موزەنی نەمری و لەیلی کچی خالید و رێحانە کچی هوزەیل کوڕی هوبەیرە لەناو پێنج یەکی تالاّنییە نێردراوەکان بۆ مەدینە دەبینران.

خالید لەبشرەوە بەرەو رەزاب بەرێکەوت کەهیلال کوڕی عوققە لەوێ بوو. کاتێك هاوەڵانی لەنزیك کەوتنەوەی خالید ئاگادار بوونەوە، بلاّوەیان لێکرد. هیلالیش ڕۆشت و لەو ناوچەیە شەڕ روویەنەدا.

## شەڕی فوراز

خالید دوای ناکاوگیر کردنی تەغلەب و دوای رەزاب بەرەو فوراز بەرێکەوت کەسنووری شام و عێراق و جەزیرەیە. دوای ئەم سەفەرە دوورودرێژە کە بەردەوام لەشەڕدابوو، جەژنی رەمەزانی لەوێ کرد.

موهەلیب کوڕی عوققەبە دەڵێت: کاتێك موسوڵمانەکان لەفوراز کۆبوونەوە، ڕۆمییەکان تووڕە بوون و لەپادگانە پارسییەکانی نزیك خۆیان و لەهۆزەکانی تەغلەب و ئەیاد ونەمر داوای هاوکارییان کرد و دەستەیەکی فراوان لەدەوریان کۆبوونەوە و بۆ

رووبەروو بوونەوەی خالید بەرێکەوتن و کاتێك گەیشتنە کەنارەکانی فورات، وتیان: یا ئێوە وەرنە ئەمبەر یا ئێمە دەپەڕینەوە.

خالید وتی: ئێوە بپەڕنەوە.

وتیان: کەواتە لەکەنارەکان دووربکەونەوە تا ئێمە بپەڕینەوە.

خالید وتی: ئێمە دوور ناکەوینەوە، لەشوێنێکی خوارتر لەشوێنی نیشتەجێ بوونی ئێمە بپەڕنەوە.

ئەم رووداوە لەنیوەی مانگی زیقەعدەی ساڵی دوانزەیەم روویدا و رۆمییەکان و پارسەکان بەیەکیان وت: ئەندێشە لەکاروبارەکانی خۆتان بکەن، ئەم پیاوە لەرێگەی دینی خوادا دەجەنگێت و ئاوز و دوورئەندێشی هەیە، سوێند بەخوا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت و ئێمە شکست دەخۆین.

بەڵام ئەم گفتوگۆیە سوودی پێنەبەخشین و لەخوار شوێنی نیشتەجێ بوونی خالید لەفورات پەڕینەوە و کاتێك کۆبوونەوە، وتیان: جیا ببنەوە بۆ ئەوەی بوێری هەردەستەیەکمان بۆ دەرکەوێت. ئەوکارەیان کرد و شەڕێکی دژوار و دوورودرێژ دەستپێکرد. خواوەند ناباوەڕانی شکستدا و خالید وتی: شوێنیان کەون و ئەمانیان پێمەدەن. سوارەکان دەستە دەستە ئەوانیان کۆدەکردەوە و دەیانکوشتن. لشەڕی فوراز و لەگۆڕەپانی شەر و شوێنکەوتنی ئەسیرەکان نزیکەی سەد هەزار کەس کوژرا.

کاتێك شەرەکە کۆتایی پێهات، خالید بۆ ماوەی دەرۆژ لەفوراز مایەوە و پێنج رۆژ بۆ کۆتایی زیقەعدە فەرمانی بەرێکەوتن بۆ حیرەی دەرکرد. بەعاسم کوڕی عەمرۆی وت سوپاکە لەگەڵ خۆی ببات و شەجرە کوڕی ئەعێزی لەدواوەی سوپاکەی دانا. خۆی واینیشاندا لەگەڵ سوپاکەی دەڕوات.

## حەج کردنی خالید

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێنج رۆژ بۆ کۆتایی زیقەعدە، خالید بەمەبەستی حەج کردن لەفورازەوە بەرێکەوت بەڵام ئەم کارەی لەخەڵکان شاردەوە. لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی ملی رێگەیان گرتەبەر و لەلارێکانەوە گەیشتنە مەککە. هیچ رێنیشاندەرێك نەیدەتوانی لەو رێگایانەوە بڕوات. بەیەکێك لەرێگەکانی جەزیرەدا پۆشت کەدوژارتر و هەڵدێرتر لەو رێگەیان نەبینیوە. ماوەی دووربوونی ئەو لەسوپاکەی کەم بوو. کاتێك

کۆتایی سوپاکەی گەیشتە حیرە، خالیدیش گەیشتە حیرە. خۆی و هاوەڵانی سەریان تاشیبوو و جگە لەژمارەیەکی کەم لەسوپاکەی کەس لەحەج کردنی ئەو ئاگادار نەبوویەوە. ئەبوبەکر دواتر لەم کارەی ئاگادار بوویەو و سەکۆنەی کرد و بۆ سزادانی، ئەوی بۆ شام نارد.

خاید لەفورازە بەلارێدا ڕۆشت و لەچاڵی عەنبەری و مێنەقب تێپەڕی تا گەیشتە زات عەرەق و لەوێوە ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی گرتەبەر تا گەیشتە عەرەفات. ئەم ڕێگەیان بەسەد ناو ناودەبرد و کاتێك لەحەج گەڕایەوە، لەحیرە نامەی ئەبوبەکری بەدەست گەیشت کەهەڕەشە و سەرکۆنە کردن بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: نامەی ئەبوبەکر لەکاتی گەڕانەوەی خالید لەحەج، لەحیرە بەدەستی گەیشت: نووسرا بوو: بڕۆ تا پەیوەستی موسوڵمانان لەیەرموك ببیت چوونکە کەوتوونەتە گێژاوەوە و ئەو کارەی ئەنجامداتدا، هیچ کات دووبارەی مەکەرەوە، بەهاوکاری خواوەند، ڕۆشتنی تۆ نابێتە هۆکاری ڕەنجی دەستەکان و ڕەنج لەسەر شانی ئەوان هەڵناگرێت، باوکی سلێمان! نیعمەت و سەرکەوتنەکانی خوایی بۆ تۆ بێت، کارەکانی خۆت تەواو بکە تا خواوەند نیعمەتەکانی بەتەواوی بەتۆ ببەخشێت و لەخۆبایی مەبە چوونکە ڕووبەڕووی زیانەکان دەبیتەوە، شانازی بەکارەکانی خۆتەوە مەکە چوونکە شانازی کردن تایبەتە بەخوا و خاوەنیش هەرخوایە.

هەیسەمی بوکایی دەڵێت: کەسانێك لەخەڵکانی کوفە کەبەشداری ئەم شەڕانەیان کردبوو، لەکاتی وتووێژ لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان هەڕەشەیان لەمعاویە دەکرد و دەیانوت: معاویە چی پێخۆشە با بیڵێت، ئێمە شەڕکەرانی زات ئەلسلاسلین و باسی شەڕەکانی نێوان زات ئەلسلاسل و فورازیان دەکرد. بەڵام شەڕەکانی دواتریان نەدەهێنایە سەرزمان.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: خالید کوڕی وەلید ڕوویکردە ئەنبار و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەست تا لەوێ بڕۆن. دواتر بەمەرجەکانی خالید ڕازی بوون و خالید ئەوانی بەخشی و لەشوێنی خۆیان ئەوانی هێشتەوە. دواتر هێرشی کردە سەر بازاری بەغداد کەیەکێك لەگوندەکانی عال بوو. موسەنای ڕەوانە کرد و هێرشی کردە سەر بازارێك کەدەستەیەك لەخەڵکانی قوزاعە و بەکر لەوێ بوون. ئەوەی لەبازارەکە دابوو تالانی کرد. دوای ئەوە ڕووی کردە عەین ئەلتەمر و بەشەر دەستی بەسەردا گرت.

خەڵکانێکی زۆری کوشت و ئەسیری گرت و ئەسیرەکانی بۆ مەدینە نارد. ئەمە یەکەم دەستەی ئەسیرەکان بوو لەدیاری عەجەمەوە دەگەیشتە مەدینە. دواتر بەرەو دومەت ئەلدجوندەل بەرێکەوت وئەکیدەری کوشت و کچی جودی ئەسیر و گەڕایەوە و لەحیرە نیشتەجێ بوو. ئەمانە لەساڵی دوانزەیەم روویاندا.

هەروەها لەم ساڵەدا عومە کوڕی خەتاب عاتیکە کچی زەیدی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

لەم ساڵەدا باوکی مورسەدی غەنەوی مرد.

لەم ساڵەدا باوکی عاس کوڕی رەبیع لەمانگی زیحەججە مرد و لای زوبەیر وەسیەتی کرد. عەلی کوڕی ئەبی تالیب کچی ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

لەم ساڵەدا عومەر ئەسلەمی کۆیلەی خۆی کڕییەوە.

سەبارەت بەسەرپەرەستی حەج بۆچوونەکان جیاوازن. دەستەیەك وتوویانە ئەبوبەکر لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد.

ئەبی ماجیدەی سەهمی دەڵێت: ئەبوبەکر لەدەورانی خەلافەتی خۆی لەساڵی دوانزەیەم بەمەبەستی حەج روویکردە مەککە. من لەگەڵ کوڕی یەکێك لەکەسەکانم شەڕم کرد و ئەو قەپاڵی لەگوێچکەم گرت و بەشێکی قرتاند، یا وتی من قەپم لەگوێچکەی گرت و بەشێکیم قرتاند. ئەم رووداوەیان بۆ ئەبوبەکر باس کرد و وتی: ئەوان ببەنە لای عومەر بزانن ئەگەر برینەکەی قورسە، قیساسی لێ وەربگرێت. کاتێك ئێمەیان بردە لای عومەر، وتی: بەڵێ برینەکەی قورسە، تیمارکەرێك بێنن. کاتێك باسی تیمارکەری کرد، وتی: لەپێغەمبەرەم بیست فەرمووی، کۆیلەیەکەم بەپووری خۆمدا و هیوادارم خێر و خۆشی بۆ ئەو بەدواوە بێت و وتم ئەو تیمارکەر یا قەساب یا ئاسنگەر نەکات. ئەو کەسەی بریندار ببوو، قیساسی وەرگرت.

بەپێی گێڕانەوەی واقدی ئەبوبەکر لەساڵی دوانزەیەم حەجی کرد و عوسمان کوڕی عەفانی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: عومەر کوڕی خەتاب لەساڵی دوانزەیەم حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دەستەیەك وتوویانە ئەبوبەکر لەرۆژگاری خەلافەتی خۆی حەجی نەکرد و لەساڵی دوانزەیەم عومەر کوڕی خەتاب یا عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وەك سەرپەرەستی حاجییەکان دەستنیشان کرد.

ساڵی سیانزەیەم کۆچ دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی سیانزەیەمی کۆچ

لەم ساڵەدا کاتێك ئەبوبەکر لەمەککە بۆ مەدینە دەگەڕایەوە، سوپایەکی بۆ شام نارد.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر لەساڵی دوانزەیەم لەحەج گەڕایەوە، سوپایەکی بۆ شام نارد، عەمرۆ کوڕی عاسی بۆ فەلەستین نارد. ئەو لەڕێگەی مەعریقەو و ئەیلەوە ڕۆشت و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان و باوکی عوبەیدەی جەراح و شورەحبیل کوڕی حەسەنەی نارد و فەرمانی پێدان لەڕێگەی تەبووکییەوە ڕوویکەنە بەلقای شام.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر لەسەرەتای ساڵی سیانزەیەم سوپایەکی بۆ شام نارد و یەکەم ئاڵای بۆ خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس بەست بەڵام پێش بەرێکەوتن ئەوی لەسەر کار لابرد و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی وەك سەرکردەی سوپاکە دەستنیشان کرد. ئەو یەکەم سەرکردە بوو ڕووی کردە شام و حەوت هەزار کەسی لەگەڵدا بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆکاری لابردنی خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس وەك لەگێڕانەوەی عەبدوللە کوڕی ئەبی بەکر باسی کراوە، ئەمەیە: ئەو دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) لەیەمەن گەڕایەوە و بۆ ماوەی دوو مانگ بەیعەتی نەکرد. دەیوت: پێغەمبەر(د.خ) سەرکردایەتی پێ بەخشیوم و تا ئەو کاتەی لەم جیهانە کۆچی کرد، منی لەسەر کارەکەم لانەبرد. ئەو، هەروەها عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عوسمان کوڕی عەفانی بینیبوو و پێی وتبوون: ئەی کوڕەکانی عەبدمەناف بۆ ڕێگەتاندا کەسێکی دیکە جڵەوی کاروبارەکان بگرێتەدەست؟

دەڵێت: ئەبوبەکر گرنگی بەوتەکانی نەدەدا بەڵام عومەر ڕقی ئەوی لەدڵ گرت و کاتێك ئەبوبەکر سوپای بۆ شام دەنارد، خالید کوڕی سەعید یەکەم کەس بوو بۆ سەرکردایەتی یەکێك لەو چوار سوپایە دەستنیشان کرا، عومەر قسەی دەکرد و دەیوت: ئەو دەکەیتە سەرکردە لەکاتێکدا فڵانە قسە و فیسارە کاری ئەنجامداوە؟ ئەوەندە پێداگری کرد تا ئەبوبەکر ئەوی لەسەر کار لابرد و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی وەك سەرکردە سوپا دانا.

موبەشیر کوڕی فەزڵ دەڵێت: خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس لەڕۆژگاری

پێغەمبەر(د.خ) لەیەمەن و لەکاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ)، لەیەمەن بوو. مانگێك دوای مردنی پێغەمبەر(د.خ) گەڕایەوە. جلوبەرگێکی جوانی لەبەردابوو. چاوی بەعومەر کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبی تالیب کەوت. عومەر بەچەند کەسێکی وت جلوبەرگەکانی بدڕێنن، حەریری پۆشیوە و لەشەڕ خۆی بەدوور گرتووە. چەند کەسێك جلەکانی ئەویان دڕاند و وتی: ئەی باوکی حەسەن، ئەی کوڕەکانی عەبدمەناف، بەسەر ئێوەدا زاڵبوون؟

عەلی وتی: بەبۆچوونی تۆ ئەمە زاڵبوونە یا خەلافەت؟

خالید وتی: ئەی کوڕەکانی عەبدمەناف کەس لەئێوە زیاتر بۆ خەلافەت شیاو نەبوو.

عومەر وتی: خوا دەمت بشکێنێت، سوێند بەخوا بەردەوام درۆزنێکی وەك تۆ قسە دەکات بەڵام تەنیا زیان لەخۆی دەدات.

عومەر ئەبوبەکری لەوتەکانی خالید ئاگادار کردەوە و کاتێك ئەبوبەکر بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکان ئاڵای بۆ سەرکردەکان دەبەست، ئاڵایەکی بۆ خالید بەست و عومەر ڕێگەی ئەم کارەی لێگرت و وتی: ڕیسوا و چارەسەری لانییە، درۆیەکی هێناوەتە سەرزمان و بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە، ئەو بۆ شەڕ مەنێرە. ئەبوبەکر ئەوی لەناو سوپاکەدا هێشتەوە بەڵام سەرکردایەتی لێ سەندەوە. بەشێك لەبۆچوونەکەی عومەری پەسند کرد و بەشێکی دیکەی نا.

باوکی عوسمان دەڵێت: ئەبوبەکر فەرمانی بەخالیددا لەتیما نیشتەجێ ببێت. ئەو، بەرەو ئەو ناوچەیە بەرێکەوت. ئەبوبەکر فەرمانی پێدابوو لەوێ نەڕوات و پێشنیاری پەرەستینی خواوەند بەخەڵکان بکات تا پەیوەستی ببن و تەنیا ئەو کەسانە لەناو سوپاکەی خۆی جێگە بکاتەوە کەلەدین هەڵنەگەڕابێتنەوە و تەنیا شەڕ لەگەڵ ئەوکەسانە بکات کەهێرشی دەکەنەسەر تا ئەو کاتەی فەرمانەکانی بەدەست دەگات.

دەڵێت: خالید لەتیما مایەوە و دەستەیەکی فراوان لەدەروی کۆبوونەوە. ڕۆمییەکان لەگەورەیی سوپاکەی ئەو ئاگادار بوونەوە و لەعەرەبەکانی دەوروبەر سوپایەکیان ئامادە کرد. خالید نامەی بۆ ئەبوبەکر نووسی کەدەستەیەك لەهۆزەکانی بەهرا و کەلب و سەلیح و تنوخ و لەخم و جوزام و غەسان لەسەر پێشنیاری ڕۆمییەکان لەسێ مەنزڵی زیزا ئوردوویان لێداوە.

دەڵێت: ئەبوبەکر نامەی بۆ خالید نووسی پێشڕەوی بکات و نەگەڕێتەوە و داوای هاوکاری لەخوا بکە. خالید بەرێکەوت و کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە، بڵاوەیان لێکرد و

ئوردووگاکەیان چۆڵ کرد. هەموو ئەو کەسانەی کۆببوونەوە باوەڕیان بەئیسلام هێنا.

خالید ڕووداوەکەی بۆ ئەبوبەکر نووسی و وڵامی بۆ هاتەوە: پێشڕەوی بکە بەڵام نە بەو ئەندازەی لەپشتەوە هێرشت بکەنەسەر. خالید لەگەڵ ئەو شەڕکەرانەی لەتیماوە لەگەڵی هاتبوون و لەگەڵ ئەوانەی دواتر پەیوەستی بوون، لەکەنار ڕێخەڵانەکەوە پێشڕەوی کرد تا لەنێوان ئۆبەل و زیزا و قستەل دابەزی. یەکێك لەبەتریقەکانی ڕۆم بەناوی باهان ڕووبەڕووی بوویەوە. خالید شکستی پێهێنا و سوپاکەی کوشتار کرد. ڕووداوەکەی بۆ ئەبوبەکر نووسی و داوای هاوکاری کرد.

لەم کاتەدا یەکەم دەستەی یەمەنییەکان و خەڵکانی نێوان مەککە و یەمەن ڕۆشتنە لای ئەبوبەکر. زوئەلکەلاعیش لەگەڵ ئەوان هاتبوو. عێکرەمەیش لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەشەڕی تەهامە و عەممان و بەحرەین گەڕایەوە مەدینە. ئەبوبەکر بۆ لێپرسراوانی زەکاتی نووسی هەکەرس دەخوازێت چوارپێ؟ بیگۆڕنەوە و هەمووان خوزایاری گۆڕان بوون و ئەم سوپایان بەتبدیل(گۆڕان) ناوبرد. ئەوان بۆ پەیوەست بوون بەخالید کوڕی سەعید بەرێکەوتن. لێرە بەدواوە ئەبوبەکر بەحەز و ئارەزوومەندییەوە سەرقاڵی کاروبارەکانی شام و گرنگیی تایبەتی پێدا.

دەڵێت: ئەبوبەکر عەمرۆ کوڕی عاس کە پێغەمبەر(د.خ) وەك لێپرسراوی زەکاتی سەعد هوزەیم و عوزرە و جزام و عەدەس دەستینشانی کردبوو، بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە. ئەمە پێش ئەوە بوو بەرەو عەممان بەرێکەوێت و بەڵێنیدا لەکاتی گەڕانەوە ببێتە لێپرسراوی زەکات.

کاتێك ئەبوبەکر گرنگی تایبەتی بەشامدا، نامەی بۆ عەمرۆ نووسی: لەکاتی ڕۆشتن بۆ عەممان وبۆ ئەنجامدانی بەڵێنەکانی پێغەمبەر(د.خ)، جارێکی دیکە تۆم وەك لێپرسراوی زەکاتی هۆزە دیاریکراوەکان هەڵبژارد بەڵام ئەی باوکی عەبدوڵڵە، دەمەوێت کارێکت پێ بسپێرم کە بۆ ژیان و کۆتایی تۆ باشترە مەگەر ئەوەی زیاتر خوازیاری کارەکەی ئێستات بیت.

عەمرۆ نووسی: من یەکێك لەتیرەکانی ئیسلامم و دوای خواوەند، تۆی کەتیر دەهاوێژی و تیرەکان کۆدەکەیتەوە، بزانە کام تیرە بەهێزتر و باشتر و کاریگەرترە و کاتێك ڕووداوێك لەسووچێکەوە ڕوویدا، بیهاوێژە.

ئەبوبەکر بۆ وەلید کوڕی عوقبەبە نامەی نووسی وەڵامی بۆ هاتەوە: زیاتر تامەزرۆی

جیهادە.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر بۆ عەمرۆ کوڕی عاس و وەلید کوڕی عوقڤەبە، لێپرسراوانی زەکات لەخەڵکانی قوزاعە نامەی نووسی. کاتێك ئەوانی وەك لێپرسراوی زەکات ڕەوانە دەکرد، پێشنیاری بەهەرکامیان کرد و وتی: بەنهێنی و ئاشکرا لەخوا بترسە : ((من یتق الله یجعل له مخرجا و یرزقه من حیث لا یحتسب و من یتق الله یکفر عنه سیأته و یعظم له اجرا.

واتاکەی: هەرکەس لەخوا بترسێت، ڕێگە چارەیەکی بۆ دادەنێت و لەو شوێنەوەی گرنگی پێنادات، ڕۆژی پێدەبەخشێن. هەرکەس لەخوا بترسێت گوناحەکانی دەسرێتەوە و پاداشتێکی گەورەی پێدەدات.))

ئێستا تۆ بەیەکێك لەڕێگەکانی خوادا دەڕۆیت و نابێت لەکاروبارەکانی دین کەمتەرخەمی لەخۆت نیشان بدەیت و لەسستی و سەختگیری بەدوور بیت.

دوای ئەوە نامەی بۆ نووسین: کەسێك وەك جێگری خۆتان دیاریبکەن و خەڵکانی دەوروبەر کۆبکەنەوە، عەمرۆ، عەمرۆ کوڕی فلانی عوزری وەك جێگری خۆی لەبەرزاییەکانی قوزاعە و وەلیدیش، ئەمرۆ ئەلقەیسی وەك جێگری خۆی لەسەر بەشێك لەقوزاعە دەستنیشان کرد کەنزیك لەدومەیە. خەڵکانی زۆر لەدەوریان کۆبوونەوە و چاوەڕوانی فەرمانەکانی ئەبوبەکریان دەکرد.

ئەبوبەکر قسەی بۆ خەڵکان کرد. سپاسی خوای بەجێهێنا و وتی: لەهەرکارێك قۆناغێکی گەشە کردن هەیە و هەرکەس پێی بگات، بەسیەتی، هەرکەس بۆ خوا و لەڕێگەی خوا هەوڵ بدات، خواوەندی بەسە، هەوڵبدەن و تێبکۆشن چوونکە کارێکی ڕەوایە، هەرکەس باوەڕی نەبێت، دینی نییە و هەرکەس بێ ریا کردەوەکانی ئەنجام نەدات، پاداشتی دەستناکەوێت و هەرکەس نییەتی باشی نەبێت، کردەوەکانی فیڕۆیە.لەکتێبی خوا بەرادەیەك پاداشت بۆ جیهاد لەبەر چاو گیراوە کەموسوڵمان دەبێت خوازیاری ئەو کارە بێت. ئەمە مامڵەیەکە خواوەند بەڵگەی بۆ هێناوەتەوە و بەهۆیەوە کەسان لەم دنیا و لەو دنیا لەریسوایی رزگار دەکات و ڕێزیان پێدەبەخشێت.

دەستەیەکی پەیوەستی دەستەکەی عەمرۆ کرد و ئەوی کردە ئەمیری فەلەستین و فەرمانی پێدا لەو ڕێگەی دیاری کردووە، بەرێکەوێت. نامەی بۆ وەلید نووسی و ئەوی وەك ئەمیری ئەردەن دەستنیشان کرد. یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی بانگ کرد و سوپایەکی گەورەی خستە بەردەست. سوهەیل کوڕی عەمرۆ و دەستەیەك لەخەڵکانی

مەككەی هاوشێوەی ئەو لەناو ئەم سوپایەدا دەبینران. بەپێی پیادە ئەوی ڕەوانە کرد. باوکی عوبەیدەی جەراحی وەك سەرکردەی سوپایەك دەستنیشان و ئەمارەتی حمسی پێ سپارد. ئەوی ڕەوانە کرد. هەردووکیان پیادە ڕێگەیان دەبڕی. خەڵکان و شەڕکەران لەپشت سەری ئەوانەوە بوون.

عوبادە دەڵێت: کاتێك وەلید گەیشتە لای خالید کوڕی سەعید، هاوکاری کرد و کاتێك سوپای موسوڵمانان کەئەبوبەکر بۆ پشتیوانی ئەوان ڕەوانەی کردبوو، هاتن و ئەو سوپایان بەتبدیل ناوبرد. کاتێك لەبەرێکەوتنی ئەمیرەکان ئاگادار بوویەوە، بەمەبەستی بەدەست هێنانی ڕێز و گەورەیی هێرشی کردە سەر ڕۆمییەکان و پشت سەری خۆی چۆڵ کرد. پێش گەیشتنی ئەمیرەکان شەڕی دەسپێکرد و باهان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو بەسوپاکەی خۆی هاتە دیمەشق. خالید بەهاوڕێیەتی زو ئەلکەلاع و عێکرەمە و وەلید لەگەڵ سوپاکەی تا مەرج ئەلسەفەر لەنێوان واقوسە و دیمەشق پێشڕەوی کرد و کەوتە ناو بازنەی گەمارۆی سوپاکەی باهان. ڕێگەکانیان لێ بەست و ئەو بێ ئاگا بوو. باهان هێرشی کردەسەر و ڕووبەڕووی سەعید کوڕی خالید بوویەوە کە لەگەڵ دەستەیەك بەدوای ئاودا دەگەڕان. ئەوانیان کوشت. کاتێك خالید ئاگادار بوویەوە، لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکانی هەڵات و لەهاوەڵانی ئەو هەر کەسێك توانی سوار لەسەر وشتر یا ئەسپەکەی خۆی گیانی بەدەربرد و لەئوردووگاکە جیابوویەوە و هەڵاتن تا گەیشتنە زونەلمورە. عێکرەمە لەگەڵ سوپا مایەوە و بەرگری لەدواوەی سوپاکە دەکرد. ڕێگەی نەدا باهان و سوپاکەی شوێنیان بکەون و لەسنورەکانی شام مایەوە.

شورەحبیل کوڕی حەسەنە لای خالید کوڕی وەلید لەگەڵ ژمارەیەك لەشەڕکەران گەڕابوویەوە. ئەبوبەکر کارەکەی وەلیدی بەو سپارد و لەگەڵ ئەو بەرێکەوت و پێشنیاری پێکرد کاتێك شورەحبیل کوڕی حەسەنە بگاتە لای خالید کوڕی سەعید، بەشی زۆری شەڕکەرانی لەگەڵ خۆی ببات. لەم کاتەدا دەستەیەك لای ئەبوبەکر کۆببوونەوە و ئەو، معاویەی کردە سەرکردەی ئەوان و وتی: پەیوەستی یەزید ببن. معاویە پەیوەستی سوپاکەی یەزید بوو و کاتێك لەڕێگە چاوی بەپاشماوەی هاوەڵانی خالید کەوت، ئەوانی لەگەڵ خۆی برد.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب سەبارەت بەخالید کوڕی وەلید و خالید کوڕی سەعید قسەی زۆری لەگەڵ ئەبوبەکر کرد بەڵام سەبارەت بەخالید کوڕی

وەلید، ئەبوبەکر گرنگی بەوتەکانی نەدا و وتی: ئەو شمشێرەی خواوەند بۆ ناباوەڕان دەرکێشاوە، نایخەمە ناو کالآن. بەلآم سەبارەت بەخالید کوڕی وەلید دوای ئەو رووداوە، گرنگی بەوتەکانی عومەردا.

عەمرۆ کوڕی عاس لەرێگەی مەعریقەوە ڕۆشت و باوکی عوبەیدە بەرێگەی خۆیدا و یەزید لەرێگەی تەبووکییە و شورەحبیل کوڕی حەسەنە بەرێگەی خۆیدا. ئەبوبەکر ئەوانی بۆ گرتنی ویلایەتەکانی شام دەستنیشان کردبوو. دەیزانی رۆمییەکان رووبەرووی ئەوان دەبنەوە و دەیویست هەرکام سەرنج بەناوچەکانی دیکەیش بدات و لاواز نەبن.

شەعبی دەڵێت: کاتێك خالید کوڕی سەعید گەیشتە زوئەلمورە و ئەبوبەکر ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ نووسی: لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە کەپێشڕەوی و پاشەکشێ دەکەیت و لەگۆڕەپان هەڵدێیت و بەشێوەی پێویست رووبەروی دوژمن نابیتەوە و خۆڕاگری ناکەیت. دوای ماوەیەك مۆڵەتی پێدا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە و خالید پێی وت: لەمن خۆشەبە.

وتی: مەگەر هەڵەیەك بچووکە لەکاتی شەڕ ترسەنۆك بیت.

کاتێك خالید ڕۆشت، ئەبوبەکر وتی: عەمرۆ و عەلی خالیدیان باشتر دەناسی ئەگەر گوێم لەوتەکانی ئەوان دەگرت، بڕوام بەخالید نەدەکرد.

باوکی حارسە دەڵێت: سەرکردەکانی سوپا لەگەڵ شەڕکەران روویان لەشام کرد. عێکرەمە پشتیوانی خەڵکان بوو. کاتێك رۆمییەکان ئاگادار بوونەوە نامەیان بۆ هێرقل نووسی. هێرقل بەرێکەوت و لەحیمس ئوردووی لێدا و دەستەی شەڕکەرانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە و سوپاکانی رازاندەوە. دەیویست دەستە شەڕکەرەکان سەرقاڵ بکات چوونکە سوپاکەی فراوان و پیاوە شەڕکەرەکانی نائارام بوون. تەزاروق زڕ براکەی خۆی لەگەڵ نەوەد هەزار کەس بۆ رووبەروو بوونەوەی عەمرۆ نارد وکەسێکی وەك پشتیوانی ئەوان ڕەوانە کرد کە لەفەلەستینی سەروو لەسەر بەرزاییەکانی جەلق جێگیر بوو. جەرجە کوڕی توزرای بۆ رووبەروو بوونەوەی یەزید کوڕی ئەبی سوفیان نارد و لەبەرابەر ئەو ئوردووی لێدا و دراقسی بۆ رووبەروو بوونەوەی شورەحبیل کوڕی حەسەنە ڕەوانە کرد و فیقار کوڕی نەستووسی لەگەڵ شەست هەزار شەڕکەر بۆ شەڕ لەگەڵ باوکی عوبەیدەی جەڕاج ڕەوانە کرد. موسوڵمانەکان ترسان چوونکە هەموو ژمارەی موسوڵمانە شەڕکەرەکان بیست و یەك هەزارکەس بوو جگە لەسوپاکەی

عێکرەمە کەئەویش شەش هەزار شەڕکەری لەخۆ دەگرت. هەموویان نامەیان بۆ عەمرۆ نووسی بۆ ئەوەی بزانن چی بکەن؟

عەمرۆ لەوەڵامدا، نامە و پەیکی ڕەوانە کرد: دەبێت کۆببنەوە و کەسانێك وەك ئێمە لەکاتی کۆبوونەوە لەبەر کەمی ژمارەی شەڕکەران شکست ناخۆن و ئەگەر بڵاوەی لێبکەین، پیاوەکانی ئێمە لەدوژمن بەهێزترن.

موسوڵمانان یەرموکیان وەك شوێنی کۆبوونەوە دیاری کرد. هاوشێوە عەمرۆ نامەیان بۆ ئەبوبەکریش نووسی: وەڵامی ئەبوبەکر هاوشێوەی عەمرۆ بوو: کۆببنەوە و ببنە یەك سوپا و لەگەڵ موسوڵمانان ڕووبەڕووی سوپای ناباوەڕان ببنەوە چوونکە ئێوە شەڕکەرانی خواوەند و خواوەند هاوکاری کەسەکانی خۆی دەکات و کافران ڕیسوا و شکست دەدات. ئێوە لەبەر کەمی ژمارە شکست ناخۆن، سوپای لەدەهەزار زیاتر وەك دواوەی سوپاکەی حسێبی بۆ دەکرێت، ئاگاتان لەکەنارەکان بێت و لەیەرموك کۆببنەوە.

کاتێك هێرقل لەمەبەستی موسوڵمانان ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ بەتریقەکانی خۆی نووسی: ئێوەیش هاوشێوەی ئەوان کۆببنەوە و لەیەك شوێنی ئوردوو لێبدەن کە گۆڕەپانەکەی بەربڵاو و ڕێڕەوەکەی تەنگ و تەسك بێت، تەزاروق سەرکردە و جەرجە فەرماندەی پێشەنگەکان و باهان و دراقس فەرماندەی دوو باڵی سوپاکە بن. فیقار کاروبارەکانی جەنگ لەئەستۆ بگرێت، دڵخۆشن بن چوونکە باهان بۆ هاوکاری کردنی ئێوە بەڕێوەیە.

ڕۆمییەکان فەرمانەکەی هێرقلیان ئەنجامدا و لەواقوسە دابەزین کە لەسەر کەنارەکانی یەرمووکە. دۆڵەکە بۆ ئەوان بوو بەخەندەکێك و تێپەڕین لێی ئەگەری نەبوو. باهان لەوێ ئوردووی لێدا چوونکە دەیویست ڕۆمییەکان ئارام ببنە و موسوڵمانان ببینن و ئەندێشەی خراپ لەمێشکیاندا دروست نەبێت.

موسوڵمانان ڕویان لەیەرموك کرد و لەبەرابەر ڕۆمییەکان و لەسەر ڕێگەی ئەوان ئوردوویان لێدا. ڕۆمییەکان جگە لەتەنیشت ئوردووگای موسوڵمانان ڕێگەی گوزەر کردنیان نەبوو، عەمرۆ کوڕی عاس وتی: ئەی خەڵکینە، دڵخۆش بن، سوێند بەخوا ڕۆمییەکان گەمارۆ دراون و هیچ کات خەڵکی گەمارۆدراو ڕزگاریان نابێت.

موسوڵمانان کۆتاییەکانی سەفەری ساڵی سیانزەیەم و دوو مانگی ڕەبیعیان لەبەرابەر ڕۆمییەکان و لەسەر ڕێگەی ئەوان بەسەر برد بەڵام دەستیان بەوان نەدەگەیشت چوونکە

دۆڵی واقوسە لەپشت سەریان بوو و بەردەمیان خەندەکێك و پەڕینەوە لێی ئەگەری نەبوو. کاتێك دەستەیەك لەرۆمییەکان دەهاتنەدەر، موسوڵمانەکان هێرشیان دەکردنەسەر تا ئەوەی مانگی رەبیع الاوەل کۆتایی پێهات. لەمانگی سەفەر ئەبوبەکریان لەبارودۆخی خۆیان ئاگادار کردەوە و داوای هاوکاریان لێکرد. ئەبوبەکر نامەی بۆ خالید نووسی و فەرمانی پێدا پەیوەستی ئەوان بێت و موسەنا بکاتە جێگری خۆی لەعێراق. خالید لەمانگی رەبیع خۆی بەوان گەیاند.

موهەلیب دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان لەیەرموك دابەزین و داوای هاوکارییان لەئەبوبەکر کرد، وتی: ئەم کارە، کاری خالیدە. ئەو لەعێراق بوو. کەسی ڕەوانە کرد و هانیدا بەپەلە بەرێکەوێت. خالید ڕۆشت و کاتێك گەیشت کەباهان پەیوەستی سوپای رۆمییەکان ببوو. شەماسان و قەشەکان پێش ئەو هاتبوون و رۆمییەکانیان بۆ شەڕ هاندەدا.

باهان بۆ نیشاندانی هێزی رۆمییەکان هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ. خالید رووبەرووی بوویەوە. سەرکردەی موسوڵمانەکان هەرکام لەگەڵ بەرابەرەکەی خۆی شەڕی کرد. باهان شکستی خوارد و شکست لەناو رۆمییەکاندا بڵاو بوویەوە و پەنایان بۆ خەندەکەکەی خۆیان برد.

باهانیان بەپیرۆز دەزانی و موسوڵمانان لەهاتنی خالید کوڕی وەلید دڵخۆش بوون. موسوڵمانان خۆڕاگریان کرد و رۆمییەکان لەناوچوون. ژمارەی ناباوەڕان دووسەد و چل هەزار کەس و هەشتا هەزارکەسیان خۆیان بەیەکەوە بەستبوویەوە، چل هەزار کەسیان بەزنجیر بەستبوو بۆ ئەوەی تا دوایین دڵۆپ بجەنگن، چل هەزار کەسیان بەعەمامەکان بەستبوویەوە، هەشتا هەزار ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو و هەشتا هەزار پیادە. موسوڵمانان بیست و حەوت هەزار کەس بوون. خالید لەگەڵ نۆ هەزار کەس هات و ژمارەیان گەیشتە سی و شەش هەزار کەس.

ئەبوبەکر لەجومادی الاوەل نەخۆش کەوت و لەنیوەی جومادی الاخر دە رۆژ پێش سەرکەوتنی یەرموك، چاوی لەجیهان بەست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەبوبەکر هەرکام لەسەرکردەکانی وەك ئەمیری ویلایەتێکی شام دەستنیشان کردبوو. باوکی عوبەیدەی جەراح لێپرسراوی حیمس، یەزید کوڕی ئەبی سوفیان لێپرسراوی دیمەشق، شورەحبیل کوڕی حەسەنە لێپرسراوی ئەردەن، عەمرۆ

کوڕی عاس و عەلقەمە کوڕی موحریزە لێپرسراوی فەلەستین. عەلقەمە کاتێك کۆتایی بەشەڕی یەرموك هات، بەرەو میسر بەڕێکەوت.

کاتێك سەرکردەکان گەیشتنە شام، لەدەروی هەرکام لەوان دەستەیەکی فراوان کۆبوویەوە. دواتر ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی لەیەك شوێن کۆببنەوە و پێکەوە ڕووبەڕووی خەڵکانی ڕۆم ببنەوە.

کاتێك خالید بینی موسوڵمانانی هەر دەستەیەك بەجیا شەڕ دەکەن، وتی: ئەی سەرکردەکان دەتانەوێت کارێك بکەن دینی خواوەند بەهێز بێت و نەبێتە هۆی کەمبوونەوە و دابەزینی شان و شکۆی ئێوە؟

عوبادە دەڵێت: چوار سوپا لەگەڵ چوار سەرکردە گەیشتە شام. ژمارەیان بیست و حەوت هەزار کەس بوو، سێ هەزار کەسی لەسوپا پرژ وبلاوەکەی خالید کوڕی سەعید پەیوەستیان بوو کە ئەبوبەکر سەرکردایەتی ئەوانی بەمعاویە و شورەحبیل سپارد. دەهەزار کەس لەهێزە پشتیوانەکان لەگەڵ خالید کوڕی وەلید لەعێراقەوە هاتن. ئەمە جگە لەو شەش هەزار کەسەی لەگەڵ عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل پشتیوانی موسوڵمانانیان دەکرد. هەموویان چل وشەش هەزار کەس و سەرکردەی هەر سوپایەك بەجیا شەڕی لەگەڵ سوپای ڕۆمییەکان دەکرد تا ئەوکاتەی خالید لەعێراقەوە هات. ئوردووی باوکی عوبەیدە لەیەرموك لەتەنیشت ئوردووی عەمرۆ کوڕی عاس و ئوردووی شورەحبیل لەتەنیشت ئوردووی یەزید کوڕی ئەبی سوفیان بوو. چەندین جار باوکی عوبەیدە لەگەڵ عەمرۆ و شومرحبیل لەگەڵ یەزید نوێژیان خوێند بەلآم عەمرۆ و یەزید لەگەڵ شورەحبیل و باوکی عوبەیدە نوێژیان نەدەکرد.

دەڵێت: کاتێك خالید هات موسوڵمانەکان بەمشێوەیە بوون. ئەویش بەجیا ئوردووی لێدا و لەگەڵ خەڵکانی عێراق نوێژی خوێند. دواتر خالید هەستی بەوە کرد موسوڵمانان لەوەی باهان بۆ هاوکاری سوپای ڕۆمییەکان هاتووە نیگەران و بەپێچەوانەوە ڕۆمییەکان شادمانن. کاتێك دوو سوپا ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، خواوەند ڕۆمییەکانی شکستدا و لەگەڵ پشتیوانەکانی خۆیان پەنایان بۆ خەندەکەکان برد کە لایەکی واقوسە بوو. یەك مانگی تەواو لەناو خەندەکەکەدا مانەوە و قەشە و شەماساکان بۆ شەڕ هانیان دەدان و دەیانوت: مەترسی لەسەر مەسیحییەت هەیە. ورەیان بەرز بوویەوە و لەمانگی جومادی الاخر بۆ شەڕێك کەهیچ کات هاوشێوەی نەبینراوە،

خەندەكانیان بەجێهێشت.

دەڵێت: كاتێك موسوڵمانان جموجۆڵی ڕۆمییەكانیان بینی، ویستیان هەر سوپا بەجیا شەڕیان لەگەڵ بكات. خالید كوڕی وەلید ڕۆشتە لایان و سپاسی خوای كرد و وتی: لەم ڕۆژێكی ئاوادا سەركێشی و شانازی كردن بەخۆ ڕەوا نییە، لەجیهاد بێ ریا بن و لەكردەوەكانی خۆتان تەنیا خواتان لەبیر بێت چوونكە ئەم ڕۆژە ڕۆژەكانی تری بەدواوە دێت، لەگەڵ سوپایەك كەبەو شێوەیە دەجەنگن، جیاجیا و پەرژ و بڵاو شەڕ مەكەن، نەڕەوایە و نەشیاو و ئەوەی لەئێوە دوورە ئەگەر ئەوەی ئێوە دەیزانن بیزانێت، ڕێگر دەبێت لەم كارەی ئێوە، لەم بابەتە كەهیچ فەرمانێك بەئێوە نەدراوە، بەبۆچوونێكی پەسند و كەسێك كەدەتوانێت ئەم كارە مەترسیدارە لەئەستۆ بگرێت، بەسەندە بكەن.

وتیان: بۆچوونی راست چییە؟

وتی: كاتێك ئەبوبەكر ئێمەی نارد، گومانی دەكرد هەركام بەرەو ناوچەیەك بەرێدەكەوین و ئەگەر دەیزانی چی ڕوودەدات ئێمەی كۆدەكردەوە، ئەو كارەی ئێوە دەكەین زۆر خراپترە لەنیگەرانی موسوڵمانان و بۆ ناباوەڕان و دوژمنەكانتان سوودمەندترە، دەزانم خوازیار بوونی ئێوە بۆژیان بڵاوەی پێكردوون، ئەی خوایە، ئەی خوایە، هەركام لەئێوەیان وەك ئەمیری سەرزەمینێك دیاریكردووە و ئەگەر ببێتە گوێرایەڵی یەكێك لەسەركردەكانی دیكە لای خەلیفە نابێتە هۆی سەرشۆڕبوون و لەدەستدانی پێگەكەی. دوژمن ئامادەیە، شەڕی ئەمڕۆ ئەنجامی گرنگی دەبێت، ئەگەر ئەمڕۆ بتوانین بۆ ناو خەندەكەكان پاشەكشێیان پێبكەین بەردەوام دەتوانین پاشەكشێیان پێبكەین، بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ شكستمان بدەن، هیچ كات سەركەوتن بەدەست ناهێنین. باسەركردایەتی بگۆڕینەوە، ئەمڕۆ كەسێك سەركردە بێت و بەیانی كەسێكی دیكە تا هەمووان سەركردایەتی لەئەستۆ بگرن، ئەمڕۆ من بكەنە سەركردە.

دەڵێت: هەمووان بەسەركردایەتی ئەو ڕازی بوون و گومانیان كرد ئەو ڕۆژەیش شەڕ هاوشێوەی ڕۆژەكانی پێشوو درێژە دەكێشێت.

ڕۆمییەكان بەرازاندنەوەیەكی تایبەت كەكەس هاوشێوەی نەبینیوە، پێشڕەوییان كرد. خالید سوپاكەی ڕازاندەوە و عەرەبەكان پێشتر ئەوكارەیان نەكردبوو. لەگەڵ سی و شەش یا چل دەستە پێشڕەوی كرد، وتی: ژمارەی دوژمن فراوانە. چۆنییەتی ڕازاندەوە و ئامادە كردنی دەستەكان بەشێوەیەكە بەچاو فراوان دێتە بەرچاو. چەند دەستەی لەناوەڕاست جێگیر كرد و باوكی عوبەیدەی كردە فەرماندەیان. چەند دەستەی

لەباڵی ڕاست دانا و عەمرۆ کوڕی عاسی کردە سەرکردەیان. شورەحبیل کوڕی حەسەنە لەگەڵ ئەودا بوو. چەند دەستەی لەباڵی چەپ دانا و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی کردە سەرکردەیان. قەعقاع کوڕی عەمرۆی کردە فەرماندەی یەکێك لەدەستەکانی عێراق و مەزعور کوڕی عودەی فەرماندەی دەستەیەکی دیکە بوو. عەیاز کوڕی غەنەم فەرماندەی دەستەیەك، هاشم کوڕی عوتەبە فەرماندەی دەستەیەك، زیاد کوڕی حەنزەلە فەرماندەی دەستەیەك، خالید فەرماندەی دەستەیەك لەگەڵ سوپا پرژوبڵاوەکەی خالید کوڕی سەعید. دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی فەرماندەی دەستەیەك، ئەمرۆ ئەلقەیس فەرماندەی دەستەیەك، یەزید کوڕی یەحنس فەرماندەی دەستەیەك، باوکی عوبەیدە فەرماندەی دەستەیەك، عێکرەمە فەرماندەی دەستەیەك، سوهەیل فەرماندەی دەستەیەك، عەبدولرەحمان کوڕی خالید فەرماندەی دەستەیەك، عەبدولرەحمان لەم کاتەدا تەمەنی هەژدە ساڵ بوو. حەبیب کوڕی موسلیمە فەرماندەی دەستەیەك، سەفوان کوڕی ئومەییە فەرماندەی دەستەیەك، سەعید کوڕی خالید فەرماندەی دەستەیەك، باوکی ئەعوەر کوڕی ئەبوسوفیان فەرماندەی دەستەیەك، کوڕی زو ئەلخومار فەرماندەی دەستەیەك،، عومارە کوڕی مەخشی کوڕی خوەیلد فەرماندەی دەستەیەك، باڵی ڕاستی سوپاکە و دەستەی شورەحبیل کوڕی حەسەنە و دەستەی خالید کوڕی سەعید لەوێ بوو، سەمت کوڕی ئەسوەد فەرماندەی دەستەیەك، زو ئەلکەلاع فەرماندەی دەستەیەك، معاویە کوڕی خودەیج فەرماندەی دەستەیەك، جوندەب کوڕی عەمرۆ فەرماندەی دەستەیەك، عەمرۆ کوڕی فلاّن فەرماندەی دەستەیەك، لەقیت کوڕی عەبدقەیس کوڕی بوجرەی فەزاری فەرماندەی دەستەیەك. دەستەی یەزید کوڕی ئەبی سوفیان لەباڵی چەپی سوپاکەدا بوو، زوبەیر فەرماندەی دەستەیەك، حوەشب زوئەلزەلیم فەرماندەی دەستەیەك، قەیس کوڕی عەمرۆ کوڕی زەید کوڕی عەوف هەوازینی فەرماندەی دەستەیەك، عیسمە کوڕی عەبدوللە ئەسەدی فەرماندەی دەستەیەك، زەرار کوڕی ئەزوەر فەرماندەی دەستەیەك، مەسروق کوڕی فلاّن فەرماندەی دەستەیەك، عوتەبە کوڕی ڕەبیعە کوڕی بەهز هاوپەیمانی منالەکانی عیسمە فەرماندەی دەستەیەك، جاریە کوڕی عەبدوللە ئەشجەعی فەرماندەی دەستەیەك، قوباس فەرماندەی دەستەیەك، باوکی دەردە داوەری خەڵکان بوو، ئوبوسوفیان هۆنراوەی بۆ دەخوێندنەوە، قوباس کوڕی ئەشیم سەردەستەی پێشەنگەکان و عەبدوللە کوڕی مەسعود لێپرسراوی ڕاگرتنی نەزم بوو.

لەگێڕانەوەی تەڵحە و محەممەد بەمشێوەیە باسی کراوە بەم زیادەیە: قورئان خوێنی سوپاکە میقداد بوو. ئەم سونەتە پێغەمبەر(د.خ) دوای شەڕی بەدر لەناو موسوڵمانان بەجێهێشت تا لەکاتی رووبەروو بوونەوە لەگەڵ دوژمن سورەی جیهاد کەهەمان سورەی ئەنفالە، بخوێنن. دوای ئەو، خەڵکان هەمیشە ئەو کارەیان دەکرد.

لەگێڕانەوەی عوباد و خالیددا هاتووە: لەشەڕی یەیرموك زیاتر لەیەك هەزار کەس لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بەشدار بوون و سەد کەس لەشەڕکەرانی بەدر لەناو ئەواندا دەبینرا.

دەڵێت: ئەبوسوفیان بەرێگەدا دەڕۆشت، لای دەستەکان دەوەستا و دەیوت: ئەی خوایە، ئەی خوایە، ئێوە بەرگریکارانی عەرەب و موسوڵمانان و ئەوان بەرگری کاری رۆم و ناباوەڕان، خواوەندا ئەمە یەکێك لەرۆژەکانی تۆیە، خواوەندا، سەرکەوتن بەموسوڵمانان ببەخشە.

دەڵێت: کەسێك بەخالیدی وت: رۆمییەکان فراوان و موسوڵمانان کەمن.

خالید وتی: رۆمییەکان کەمن و موسوڵمانان فراوان، سوپا بەسەرکەوتن فراوانە و بەشکست کەم، نەك بەژمارەی شەڕکەران، سوێند بەخوا ئارەزووم دەکرد ئەسپەکەی خۆم زیندوو دەبوو و ژمارەی رۆمییەکان دوو بەرابەر. ئەسپەکەی لەرێگەدا شەل ببوو.

دەڵێن: خالید بەعێکرەمەو قەعقاعی وت کەفەرماندەی دوو باڵی ناوەڕاستی سوپاکە بوون، شەڕ دەستپێبکەن. هەردوولا رووبەروو یەکبوونەوە و ئەسپەکانیان غارپێدا. لەم کاتەدا نێردراوی مەدینە گەیشت، سوارەکان رێگەیان لێگرت و وتیان: چ هەواڵێکت پێیە؟ وەلامی دایەوە، هەواڵی خۆش و هێزی پشتیوان لەرێدایە، بەلاّم لەراستیدا هەواڵی مردنی ئەبوبەکر و سەرکردایەتی باوکی عوبەیدەی جەراحی هێنابوو.

کاتێك نێردراوەکەیان بردە لای خالید، بەشێوەیەکی نهێنی لەمەرگی ئەبوبەکر ئاگاداری کردەوە و پێی وت چی وەلاّمی سوارەکان داوەتەوە. خالید وتی: کارێکی باشت کرد، لێرە بمێنەرەوە. نامەکەی وەرگرت و لەناو تیردانەکەی خۆی شاردییەوە چوونکە دەترسا ئەگەر هەواڵەکە لەناو موسوڵمانان بلاّو ببێتەوە، بلاّوەی لێبکەن. مەحمییە کوڕی زونەیم نێردراو بوو و لای خالید مایەوە.

جەرجە هاتە پێش و لەناو دوو ریزدا وەستا و داوای خالیدی کرد. خالید باوکی عوبەیدەی لەجێگەی خۆی دانا و بەرێکەوت. لەنێوان دوو ریزی رووبەرووی بوویەوە بەشێوەیەك گەردنی ئەسپەکانیان لەیەك گیری کرد.

جەرجە وتی: ئەی خالید، ڕاستم پێ بڵێ و درۆ مەکە چوونکە پیاوەی ئازادە درۆ ناکات و پیاوی ڕێزدار پیاوی خواناس فریو نادات، ئایا خواوەند شمشێری بەپێغەمبەری ئێوەداوە و ئەویش بەتۆ و تۆیش هێرش بکەیتە سەر هەر خەڵکێك، شکستیان پێدێنیت؟

وتی: نە.

وتی: کەواتە بۆ تۆ بەشمشێری خوا ناو دەبەن؟

خالید وتی: خواوەند پێغەمبەری بۆ ئێمە نارد، ئێمە هەمووان خۆمان لەو بەدوور گرت وبێزاری خۆمان دەربڕی. دواتر دەستەیەك لەئێمە باوەڕیان بەوتەکانی کرد و شوێنی کەوتن. من لەوکەسانە بووم ئەوم بەدرۆزن ناو دەبرد و بەردەوام دژایەتی و شەڕم لەگەڵ دەکرد. دوای ئەوەی خواوەند دڵی ئێمەی ڕووناك وبۆ ڕێگەی ڕاست ڕێوێنی کردین شوێن پێغەمبەر(د.خ) کەوتین و بەمنی فەرموو: تۆ یەکێکی لەشمشێرەکانی خوا کە بۆ ناباوەڕان لەکالآن دەرهاتووە، دۆعای سەرکەوتنی بۆ کردم و لەبەر ئەمە بەشمشێری خوا ناوم دەبەن و بۆ ناباوەڕان لەهەمووان سەختگیرتر و توندوتیژترم.

جەرجە وتی: قسەکەت ڕاستە.

وتی: ئەی خالید پێشنیاری چی بەمن دەکەیت؟

وتی: بەوەی شایەتوومان بێنیتە سەرزمان و بڵێ خوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە و باوەڕ بەئیسلام بێنیت.

جەرجە وتی: هەرکەس بەوە ڕازی نەبێت چی؟

وتی: جەزیە بدات وئێمە پشتیوانی لێدەکەین.

وتی: ئەگەر نەیدات.

خالید وتی: شەڕ دەستپێدەکەین.

وتی: پێگەی ئەو کەسەی باوەڕ بەدینەکەی ئێوە دێنێت، چییە؟

وتی: پێگەی هەموومان لەشەریف و ناشەریف و لەسەرەتا و کۆتایی سەبارەت بەو کارانەی خواوەند فەرزی کردووە، وەك یەکە.

جەرجە وتی: هەرکەس باوەڕ بەدینەکەی ئێوە بێنێت، لەپاداشت و ئەرکەکانی هاوشێوەی ئێوەیە.

خالید وتی: بەڵێ و باشتریشە.

وتی: چۆن وەك ئێوەیە لەکاتێکدا ئێوە پێش ئەو بوون؟

وتی: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) لەناوماندا بوو، وەحی بۆ دەهات و لەقورئان بۆی باس دەکردین و مۆجیزەکانی نیشان داین وباوەڕمان بەم دینە هێنا و بەیعەتمان بەست هەرکەس ئەوەی بینیومانە و بیستوومانە، بیبینێت و بیبیستێت، دەبێت ببێتە موسوڵمان و بەیعەت ببەستێت بەڵام ئێوە چوونکە ئەوەی ئێمە بینیوومانە و بیستوومانە، نەتانبینیوە و نەتانبیستووە، باوەڕ هێنانی ئێوە باشترە.

جەرجە وتی: سوێند بەخوا راستییەکانت هێنایە سەرزمان بێ ئەوەی فرت و فێڵ بکەیت.

وتی: سوێند بەخوا راستیم بەتۆ وت چوونکە پێویستم بەتۆ و بەکەس نییە و خواوەند شایەتی پرسیارەکانی تۆیە.

جەرجە وتی: راست دەکەیت، ئاوڕی دایەوەو هاتە لای خالید و وتی: ئیسلام فێری من بکە.

خالید ئەوی بردە خێوەتەکەی خۆی. دەفرێك ئاوی کرد بەخۆیدا و دوو رەکعەت نوێژی خوێند. کاتێك جەرجە هاتە لای خالید، رۆمییەکان گومانیان کرد هێرشی بردووە ئەوانیش هێرشیان برد و پاشەکشێیان بەموسوڵمانان کرد جگە لەو دەستانەی عێکرەمە و حارس کوڕی هوشام سەرکردەیان بوون.

خالید لەگەڵ جەرجە سوار بوو، رۆمییەکان لەناو سوپای موسوڵماناندا بوون. موسوڵمانان هاواریان بەرز بوویەوە و پاشەکشێیان کرد. دووبارە گەڕانەوە و ئەمجارە رۆمییەکان پاشەکشێیان کرد. خالید فەرمانی هێرش کردنی دەرکرد و شمشێرەکان کەوتنە گیانی یەك. خالید و جەرجە لەکاتی هەڵاتنی خۆر تا ئاوا بوونی جەنگان.

جەرجە کوژرا و جگە لەو دوو رەکعەت نوێژەی لەکاتی موسوڵمان بوون خوێندبووی، نوێژی دیکەی نەکرد. موسوڵمانان نوێژی عەسر و ئێوارێیان بەئیشارە کرد و رۆمییەکان شوێنەکانی خۆیان چۆڵ و خالید هێرشی کردە سەر دڵی سوپای رۆم بۆ ناو پیادە و سوارەکان. ئوردووگاکەیان گۆڕەپانێکی بەربڵاو بەڵام ڕێگەی ڕۆشتنیان تەنگ و تەسك. سوارەکان پیادەکانیان بەجێهێشت و لەرێگەکە خۆیان دەرباز و روویان لەسارا کرد.

کاتێك موسوڵمانان بینیان سوارە رۆمییەکان هەڵاتن ڕێگەیان بۆ کردنەوە و ڕێگەیان

لێنەگرتن. هەموویان ڕۆشتن و بڵاوەیان لێکرد. خالید و موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر پیادەکان و ئەوانیان لەناوبرد وەك بڵێی دیوارێکیان بەسەردا داڕمابێت. ڕۆمییەکان پەنایان بۆ خەندەکەکە برد. خالید هێرشی کردە سەر خەندەکەکە. ڕۆمییەکان بەرەو واقوسە هەڵاتن و بەستراو و نەبەستراوەکان کەوتنە ناوی. هەرکەس لەبەستراوەکان کە لەشەڕەکە خۆڕاگری دەکرد، لەکاتی ڕاکێشانی هەڵاتووان دەکوژرا و یەك کەس دەکەسی لەناو دەبرد چوونکە توانای خۆڕاگری نەبوو و کاتێك دوو کەس دەکەوت، ئەوانی دیکە نەیاندەتوانی خۆیانە بگرن. سەد و بیست هەزار کەس کەوتنە ناو واقوسە، هەشتا هەزار کەسیان بەستراوە بوون و چل هەزار کەسیان نەبەستراوە. جگە لەو سوار و پیادانەی لەگۆڕەپانی شەڕدا کوژران. هەر سوارێك لەتالآنییەکان هەزار و پێنسەدی بەرکەوت.

کاتی شکست، فیقار و دەستەیەك لەگەورەکانی ڕۆم پارچەیەکیان کێشا بەسەر سەر و ڕوخساری خۆیاندا و دانیشتن، وتیان: ئێستا کەنەمانتوانی ڕۆژێکی خۆش ببینین نامانەوێت بینەری ڕۆژێکی تاڵ بین چوونکە نەمانتوانی بەرگری لەمەسیحییەت بکەین. لەو حاڵەدا کوژران.

عوبادە دەڵێت: خالید ئەو شەوەی لەخێوەتەکەی تەزاروق بەسەر برد چوونکە کاتێك ڕۆشتە ناو خەندەکەکە و لەوێ دابەزی، سوارەکان دەوری ئەویان گرت و موسوڵمانان تا بەرەبەیان شەڕیان کرد.

کوڕی عوسمانی غەسانی دەڵێت: عێکرەمە کوڕی ئەبی جەهل ئەو ڕۆژە وتی: من لەهەموو شەڕەکانی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) شەڕم کرد و ئێستا لەدەست ئێوە هەڵبێم؟ هاواری کرد: کێ بۆ مردن پەیمانم لەگەڵ دەبەستێت؟

حارس کوڕی هوشام وزەرار کوڕی ئەسوەد و چوارسەد کەس لەسەران و سوارەکان بۆ مەردن پەیمانیان لەگەڵ بەست. لەبەردەم خێوەتەکەی خالید ئەوەندە شەڕیان کرد کەژمارەیەکیان کوژران و بریندار بوون و دواتر مردن جگە لەو کەسانەی برینەکانیان چاکبوویەوە. زەرار کوڕی ئەزوەر یەکێك بوو لەوان.

دەڵێت: لەکاتی بەرەبەیانیدا عێکرەمەی برینداریان بردە لای خالید. ئەو سەری خستە سەر ڕانی خۆی، عەمرۆ کوڕی عێکرەمەیشیان هێنا، ئەویش سەری خستە سەر ڕانی خۆی و ڕوخساری پاك دەکردەوە، ئاویان دەکردە دەمی و دەیوت: کوڕی حەنتەمە

گومانی دەکرد ئێمە شەهید نابین.

لەئەبی ئەمامە دەگێڕنەوە: لەو ڕۆژەدا ژنانیش بەشداری شەڕەکەیان کرد، جویریە کچی ئەبوسوفیان هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ و هاورێیەتی هاوسەرەکەی خۆی دەکرد. هەمان ڕۆژ ئەبوسوفیان تیر بەرچاوی کەوت و کوڕی حەسمە تیرەکەی لەچاوی دەرهێنا.

ئەرتات کوڕی جوهەیش دەڵێت: ئەشتەر لەشەڕی یەرموک بەشداری کرد بەڵام لەقادسیە ئامادە نەبوو. لەو ڕۆژەدا کەسێك لەسوپای ڕۆم هاتە پێش و داوای شەڕکەری کرد، ئەشتەر ڕووبەڕووی بوویەوە و چەند جارێك بەشمشێر لەیەکیاندا، ئەشتەر زەربەیەکی لەڕۆمییەکەدا و وتی: بیگرە من کوڕی ئەیادم.

وتی: خواوەند هاوشێوەی تۆ لەناو خەڵکەکەی من زیادە بکات، ئەگەر لەخەڵکی من نەدەبوویت، هاوکاری ڕۆمییەکانم دەکرد، بەڵام ئێستا هاوکارییان ناکەم.

باوکی عوسمان دەڵێت: لەو سێ هەزار کەسەی لەشەڕی یەرموك کوژران، عێکرەمە و عەمرۆ کوڕی عێکرەمە و سەلمە کوڕی هوشام و عەمرۆ کوڕی سەعید و ئەبان کوڕی سەعید، لەناویاندا بوون. خالید کوڕی سەعید بریندار بوو، کەس نەیزانی لەکوێ مرد. جوندەب کوڕی عەمرۆ دوسی و توفەیل کوڕی عەمرۆ کوژران. زەرار کوڕی ئەزەر بریندار کرا بەڵام زیندوو مایەوە، تولەیب کوڕی عومەیر و وەهب کوڕی وەهبار کوڕی سوفیان و هوشام کوڕی عاسی کوژران.

عەمرۆ کوڕی مەیمون دەڵێت: کاتێك خالید بۆ هاوکاری شەڕکەرانی یەرموك هات، کەسێك لەعەرەبەکانی ڕۆمی پێی وت: ئەی خالید، ڕۆمییەکان ژمارەیان فراوانە، دووسەد هەزار یا زیاتر، ئەگەر دەخوازیت بۆ شوێنەکەی خۆت بگەڕێرەوە.

خالید وتی: من لەڕۆمییەکان دەترسێنیت، سوێند بەخوا حەز دەکەم ئەسپەکەم چاك ببێتەوە و ڕۆمییەکان دوو بەرابەر بن.

خواوەند ڕۆمییەکانی لەسەر دەستی ئەو شکستدا.

ئەرتات کوڕی جوهەیش دەڵێت: لەڕۆژی شەڕی یەرموك خالید وتی: سپاس بۆ خواوەند کەمەرگی ئەبوبەکر کەزیاتر لەعومەرم خۆش دەویست، لەسەر دەستی ئەو بوو و عومەر کەبەدوژمنم دەزانی وەك خەلیفە هەڵبژارد و چیتر ملکەچی فەرمانەکانی ئەوم.

عەمرۆ کوڕی مەیمون دەڵێت: هێرقل پێش شکستەکەی خالید کوڕی سەعید بۆ زیارەت ڕووی لەبیت المقدس کرد. کاتێك لەوێ بوو ئاگاداریان کردەوە کەسوپای عەرەبەکان نزیك دەبنەوە. ڕۆمییەکانی کۆکردەوە و وتی: بۆچوونی پەسەند ئەوەیە شەڕ

لەگەڵ ئەم خەڵکە نەکەن و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەستن، سوێند بەخوا ئەگەر نیوەی داهاتی شامیان پێبدەن و نیوەکەی دیکەی بۆ خۆتان بێت و بەرزاییەکانی رۆم لەدەستی ئێوەدا بێت باشترە لەوەی دەست بەسەر شامدا بگرن و لەبەرازاییەکانی رۆم ببنە شەریکتان. بەڵام براکەی و زاواکەی تورە بوون و خەڵکان لەدەروی بلاوەیان لێکرد. کاتێك بینی بەفەرمانەکانی رازی نابن، براکەی خۆی نارد و سەرکردەکانی دەستنیشان کرد. لەبەرابەر هەر سوپایەکی موسوڵمانان سوپایەکی رەوانە کرد و کاتێك موسوڵمانان کۆبوونەوە، فەرمانی بەسوپاکەیدا لەشوێنێکی بەربلاو و پان و بەرین ئوردوو لێبدەن و ئەوان لەواقوسە دابەزین. هێرقل رۆشت و لەحیمس نیشتەجێ بوو. کاتێك ئاگادار بوویەوە خالید بەمەبەستی شەر کردن لەگەڵ ئەو بەرێکەوتووە و خەڵکانی کوشتار و سامانی ئەوانی تالان و بەفیرۆداوە و دواتر رووی کردۆتە بەسرا و ئەو ناوچەیشی گرتووە و غەزرایشی تالان کردووە، بەکەسانی نزیکی خۆی وت: مەگەر پێم نەوتن لەگەڵ ئەم خەڵکە شەر مەکەن چوونکە ناتوانن لەبەرابەر ئەوان خۆراگری بکەن لەبەر ئەوەی دینەکەیان تازەیە و هێزیان پێدەبەخشێت و کەس ناتوانێت لەبەرابەر ئەوان خۆراگری بکات تا ئەو کاتەی ماوەیەکی زەمەنی بەسەر دینەکەیان تێدەپەرێت.

وتیان: بۆ بەرگری کردن لەدینەکەی خۆت بجەنگە و خەڵکان مەترسێنە و ئەرك و لێپرسراویەتی سەرشانت ئەنجام بدە .

وتی: تەنیا ئارەزووم بلاوبوونەوەی دینەکەی ئێوەیە.

کاتێك سوپای موسوڵمانان لەیەرموك دابەزی، کەسیان بۆ لای رۆمییەکان نارد کەدەمانەوێت سەرکردەکەتان ببینین و گفتوگۆی لەگەڵ بکەین. رێگە بدەن برۆینە لای. رۆمییەکان سەرکردەی خۆیان ئاگادار کردەوە و مۆڵەتی پێدان. باوکی عوبەیدە و یەزید کوری ئەبی سوفیان، وەك نێردراو لەگەڵ حارس کوری هوشام و زەرار کوری ئەزوەر و باوکی جوندەل کوری سوهەیل رۆشتن.

لەو کاتەدا برای پاشای رۆم لەئوردووگاکەی خۆی سێ خێوەتی لەدیبا هەڵدا بوو. کاتێك نێردراوانی عەرەب هاتن، لەرۆشتن بۆ ناو خێوەتەکان و بینینی ئەو خۆیان بەدوور گرت. وتیان: ئێمە حەریر بەرەوا نازانین. ئەو بۆ بینینی نێردراوەکان لەسەر فەرش دانیشت.

کاتێك هێرقل لەم بابەتە ئاگادار بوویەوە، وتی: مەگەر پێم نەوتن، ئەمە سەرەتایی

ریسواییە، شام لەدەستچوو، هاوار لەزادەی شووم.

ئاشتی لەنێوان رۆمییەکان و موسوڵمانان سەقامگیر نەکرا و باوکی عوبەیدە و هاوەڵانی گەڕانەوە. کاتیان دیاری و شەڕ دەستی پێکرد و موسوڵمانان سەرکەوتن.

باوکی ئەمامە دەڵێت: ئەو رۆژەی خالید سەرکردایەتی شەڕکەرانی یەرموکی گرتەدەست، خواوەند شەوەکەی رۆمییەکانی شکستدا و موسوڵمانان بەسەر عوققەبەدا سەرکەوتن و ئوردووگاکەیان تالآن کرد. خواوەند سەرکردە و گەورەکانی خەڵکی رۆمی کوشت و براکەی هێرقل کوژرا و تەزاروق ئەسیر کرا.

دەڵێت: کاتێك هێرقل لەشکستی سوپاکەی ئاگادار بوویەوە، لەملای حیمس بوو، بەرێکەوت و حیمسی لەنێوان خۆی و موسوڵمانان بەجێهێشت. کەسێکی وەك سەرکردە و جێگری خۆی لەوێ دانا بەهەمان شێوە کە لەدیمەشق ئەو کارەی کردبوو.

دەڵێت: کاتێك شکست لەناو رۆمییەکان بلآوبوویەوە، سوارەکانی موسوڵمان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی بەرچاویان لەوان کوشت. کاتێك باوکی عوبەیدە سەرکردایەتی گرتەدەست، فەرمانی بەرێکەوتنیدا و موسوڵمانان بەرێکەوتن و لەمەرج ئەلسەفرار ئوردوویان لێدا.

دەڵێت: لەمەرج ئەلسەفرار منیان پێشخست. دوو سواری دیکەم لەگەڵدا بوو، بەرێکەوتین و بەناو ماڵ و دارەکاندا گەڕاین. یەکێك لەدوو هاورێکەم وتی: گەشتیتە ئەو شوێنەی فەرمانیان پێدابوویت، بگەڕێرەوە و مەترسی بۆ من و هاورێکەم دروست مەکە.

وتم: لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە تا بەیانی دادێت، یا من بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە. ڕۆشتم تا گەیشتمە دەروازەی شارەکە، کەسی لێنەبوو، جڵەوی ئەسپەکەی خۆم دەرهێنا و تورکەمی ئاڵفم پێوەبەست. ڕمەکەم لەزەوی چەقاند. سەرم خستە سەرزەوی و لەدەنگی کلیلەکان بەئاگا هاتمەوە. دەروازەکەیان دەکردەوە. هەستام و نوێژی بەیانیم خوێند. سوار ئەسپەکەم بووم و هێرشم کردە سەر پاسەوانی دەروازەکە و کوشتم. رێگەی گەڕانەوەم گرتەبەر. کەسانێك شوێنم کەوتن بەڵام لێم نزیك نەدەکەوتنەوە چوونکە دەترسان بۆسەمان دانابێت. گەیشتمە لای هاورێکەم کەپێم وتبوو لەشوێنەکەی خۆی بمێنێتەوە. کاتێك ئەویان بینی، وتیان: ئەمە بۆسە بوو، گەیشتە لای بۆسەکەی خۆی.

دەڵێت: من و هاورێکەم رۆشتین تا گەیشتینە هاورێکەی ترمان و بەرێکەوتین و پەیوەستی سوپای موسوڵمانان بووینەوە. باوکی عوبەیدە سوور بوو لەسەر ئەوەی

شوێنەکەی بەجێنەهێڵێت تا فەرمانەکانی عومەر کوڕی خەتابی پێدەگات. کاتێك فەرمانی پێگەیشت بەرێکەوتن و لەنزیك دیمەشق دابەزین و بەشیر کوڕی کەعب کوڕی ئەبی حەمیریان لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکان لەیەرموك بەجێهێشت.

قوباس دەڵێت: یەکێك بووم لەشەڕکەرانی یەرموك، ماڵ و تالآنی زۆرمان دەستکەوت و رێنیشاندەر، ئێمە بردە لای چاڵی پیاوێك کە لەرۆژگاری جاهلییەت کاتێك گەیشتمە تەمەنی بلۆق ئارەزووم دەکرد زانست و ئەزمون لەو بەدەست بێنم و ببمە یەکێك لەشوێنکەوتەکانی. کاتێك بۆ لای ئەو رێنوێنییان کردم، ئەوم بینی، لەمەبەستەکەی خۆم ئاگادارم کردەوە و وتی: کارێکی چاکت کرد.

دەڵێت: یەکێك بوو لەشێرەکانی عەرەب و لەرۆژدا لایەکی وشتری دەخوارد و لەلاکەی دیکە ئەوەندەی دەمایەوە بەشی من بکات. کاتێك هێرشی دەکردە سەر تایەفەیەك، منی لەنزیك ئەویٚ دادەنا و دەیوت: کاتێك فلآنە هۆنراوە و فیسارە هۆنراوەت بیست، بزانە ئەوە منم، ئەوسا بۆ لای من وەرە. ماوەیەك لەگەڵ ئەودا بووم، دواتر برێك سامانی پێدام و گەڕامەوە بۆ لای کەسەکانم. ئەوە یەکەم تالآنی بووم دەستمکەوت.

دەڵێت: دوای ئەوە بوومە سەروەری خەڵکەکەی خۆم و ڕۆشتمە ناو ریزی عەرەبەکان. کاتێك لای ئەو چاڵە گوزەرمان کرد، ناسیمەوە و پرسیاری ماڵی ئەو پیاوەم کرد. نەیاندەناسی، بەلآم وتیان: زیندووە، منیان بردە لای کوڕەکانی، بەسەرهاتەکەی خۆم بۆ باس کردن، وتیان: بەیانی وەرە چوونکە باشترین کات بۆ بینینی ئەو بەیانییە.

دەڵێت: بەیانی ڕۆشتم، منیان بردە لای ئەو، ئەویان لەخێوەتەکەی هێنایەدەر و لای من دایانیشاند. بەردەوام شتەکانم بیردەخستەوە بەڵکو بیری بکەوێتەوە، وتەکانی بیستم و لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکان دڵشاد و دەیویست بەردەوام بم. گفتوگۆکەمان درێژەی کێشا و منداڵەکان بێزار بوون. پیرەکەیان لەشتی مەترسیدار ترساند تا بگەڕێتەوە بۆ خێوەتەکەی خۆی. وتی: بوونی منیان بەناخۆش زانی.

وتم بەڵیٚ. شتێکم بەخۆی و بەخششەم بەکەسانیدا و لەویٚ ڕۆشتم.

باوکی سەعیدی مەقبەری دەڵێت: مەروان کوڕی حەکەم بەقوباسی وت: تۆ گەورەتری یا پێغەمبەر(د.خ)؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ) لەمن گەورەتر بوو بەلآم بەتەمەن من گەورەتر بووم.

مەروان وتی: کۆنترین بیرەوەریت لەگەڵ ئەو چییە؟

وتی: پیسایی یەك ساڵەی فیل.

مەروان وتی: سەرسوڕهێنەرترین بیرەوەریت لەگەڵ ئەو؟

وتی: یەكێك لەمناڵەكانی قوزاعە بووم، كاتێك گەیشتمە تەمەنی بلۆق، بەدوای كەسێكدا دەگەڕام تا لەگەڵیدابم و زانستی لێوە فێربیم، ئەویان بەمن ناساند و ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە.

ساڵح كوڕی كەیسان دەڵێت: كاتێك سەركردەكان بەرێكەوتن، ئەبوبەكر لەگەڵ یەزید كوڕی ئەبی سوفیان ڕۆشتەدەر تا فەرمانەكانی خۆی پێبدات، ئەبوبەكر پیادە و یەزید سوارە بوو. كاتێك فەرمانەكانی خۆی كۆتایی پێهێنا، وتی: ماڵئاواییت لێدەكەم وبەخوات دەسپێرم. ئەبوبەكر گەڕایەوە و یەزید بەرێگەی تەبووكییەدا ڕۆشت. شورەحبیل كوڕی حەسەنە بەدوای ئەو ڕۆشت و دوای ئەو باوكی عوبەیدەی جەڕاح بەرێكەوت تا پشتیوانی ئەوان بێت. یەك چوارەمی سوپاكە لەگەڵ ئەودا بوو. هەموویان لەرێگەی تەبووكییەوە ڕۆشتن.

عەمرۆ كوڕی عاس تا غەمرونەلعەرەبات پێشڕەوی كرد و ڕۆمییەكان لەگەڵ حەفتا هەزار كەس بەسەركردایەتی تەزاروق زڕبرای هێرقل لەسەر تەپۆڵكەی حەلق لەفەلەستینی سەروو دابەزین. عەمرۆ كوڕی عاس نامەی بۆ ئەبوبەكر نووسی و لەهێرشی ڕۆمییەكان ئاگاداری كردەوە و داوای هاوكاری كرد.

خالید كوڕی سەعید كوڕی عاس لەمەرج ئەلسەفەری شام بوو. ڕۆژێك بۆ گەڕان بەدوای ئاو هاتەدەر و بەدەستی ڕۆمییەكان كوژرا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: عەلی كوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەكر چەند ڕۆژ دوای ئەوەی یەزید كوڕی ئەبی سوفیان بەرێكەوت، شەرەحبیل كوڕی حەسەنەی ڕەوانە كرد.

دەڵێت: شورەحبیل كوڕی عەبدوللە كوڕی مەتاع كوڕی عەمرۆ لەهۆزی كێندە بوو و بەوتەیەك لەهۆزی ئەزد. لەگەڵ حەوت هەزار شەڕكەر بەرێكەوت. دوای ئەو باوكی عوبەیدەی جەڕاح لەگەڵ حەوت هەزار كەس بەدوای ئەواندا ڕۆشت. یەزید لەبەلقا دابەزی و شورەحبیل لەئەردەن و بەوتەیەك لەبوسرا نیشتەجێ بوو. باوكی عوبەیدە لەجابییە ئوردووی لێدا.

ئەبوبەكر عەمرۆ كوڕی عاسی بۆ هاوكاری ئەوان ناردو لەغەمر ئەلعەرەبات دابەزی. خەڵكانی بۆ جیهاد هاندەدا كەروویان لەمەدینە و ئەبوبەكر ئەوانی بۆ شام دەنارد. دەستەیەكیان پەیوەستی باوكی عوبەیدە و دەستەیەكی دیكەیان پەیوەستی یەزید

کوڕی ئەبی سوفیان بوون.

دەڵێت: یەکەم ئاشتی لەشام ئاشتی مأب بوو، مأب خێوەتەگەیێکە، شار نییە و بەشێکە لەبەلقا، باوکی عوبەیدە لەسەر رێگەی خۆی لای خەڵکانی ئەو ناوچە گوزەری کرد کەرووبەرووی بوونەوە و دواتر داوای ئاشتیان کرد و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ مۆر کرا.

دەستەیەك لەرۆمییەکان لەعەرەبەی فەلەستین کۆبوونەوە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان باوکی ئەمامەی باهلی بۆ شەڕی ئەوان نارد کەبلاوەی بەکۆبوونەوەکەیان کرد.

دەڵێن: یەکەم شەڕ دوای شەڕی ئوسامە لەشام شەڕ لەعەرەبە بوو. دوای ئەوە رۆمییەکان بەرەو داسن و بەوتەیەك داسنە ڕۆشتن. باوکی ئەمامەی باهلی شکستی پێهێنان و یەکێك لەبەتریقەکانی ئەوانی کوشت. دوای ئەوە شەری مەرج ئەلسەفەری روویدا و خالید کوڕی سەعید کوڕی عاس کوژرا. ئەزرەنجا لەگەڵ چوار هەزارکەس لەرۆمییەکان هێرشی کردەسەر و ناکاوگیری کردن و خالید و دەستەیەك لەموسوڵمانەکان کوژران.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەیەك ئەو کەسەی لەو شەڕەدا کوژرا، کوڕەکەی خالید کوڕی سەعید بوو، کاتێك کوڕەکەی کوژرا، ئەو لەکاروباری سوپا خۆی بەدوور گرت و ئەبوبەکر، خالید کوڕی وەلیدی نارد و ئەوی کردە سەرکردەی سەرکردەکانی شام و هەموو سوپاکانی پەیوەستی سوپاکەی ئەو کرد.

دەڵێت: خالید لەرەبیع الاخری ساڵی سیانزەیەم لەگەڵ هەشسەد کەس و بەوتەیەك پێنسەد کەس لەحیرەوە بەرێکەوت و موسەنا کوڕی حارسەی لەجێگەی خۆی دانا. لەسەندوۆ رووبەرووی دەستەیەك لەدوژمنان بوویەوە و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و کوڕی ئیحرامی ئەنساری لەوێ دانا. لەمەسیخ و حەسید رووبەرووی دەستەیەکی دیکە لەدوژمنان بەسەرکردایەتی رەبیعە کوڕی بوجەیر بوویەوە و شکستی پێهێنان. ژمارەیەك ئەسیر و تالآنی دەستکەوت.

دوای ئەوە لەرێگەی بیابانەوە لەقەراقێر گەیشتە سووی و هێرشی کردە سەر خەڵکەکەی و سامانی ئەوانی گرت و حێرقوس کوڕی نەعمانی بێهرانی کوشت.

رووی کردە خەڵکانی ئەرك و خەڵکەکەی بەئاشتی رازی بوون.

روویکردە تەدمور و خەڵکەکەی سەرەتا سەنگەریان گرت بەلآم دواتر خوازیاری

ئاشتی بوون.

روویکردە فەریقین و لەگەڵ خەڵککەی شەڕی کرد و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و تالآنی زۆری دەستکەوت.،

روویکردە حەوارین و شەڕی کرد و شکستی پێهێنان و چەندین کەسی ئەسیر کرد.

روویکردە مەرج راهیت و هێرشی کردە سەر خەڵکان و کەسانێکی زۆری کوشت و ئەسیری زۆری گرت.

بوسر کوڕی ئەبی ئەرتات و حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ غوتە نارد کەروویان کردە کەنیسەیەك و پیاوان و ژنانی ئەسیر کرد و ژن و منداڵەکانیان بردە لای خالید.

دەڵێت: کاتێك خالید لەحەج بۆ حیرە گەڕابووییەوە، نامەی ئەبوبەکریان تەسلیم کرد کەفەرمانی دابوو بەرەو یەرموك بڕوات و هاوکاری موسوڵمانان بکات و چیتر بەو شێوەیە نەڕواتە مەککە بەمەبەستی زیارەت کردن.

عەبدولرەحمان کوڕی سیاهی ئەحمەری دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خالید کوڕی وەلیدی بۆ عێراق دەنارد، خالید کوڕی سەعیدی بۆ شام نارد و هەمان فەرمانی بەویشدا. خالید کوڕی سەعید بەرێکەوت تا گەیشتە شام و لەوێ مایەوە و خەڵکانی کۆکردەوە و هێزی فراوان بوو. رۆمییەکان لێی ترسان بەڵام گوێی لەفەرمانەکانی ئەبوبەکر نەگرت و رۆمییەکان شوێنی کەوتن و بۆمەرج ئەلسەفەر پاشەکشێیان پێکرد.

کاتێك ئارام و ترسی دوژمنی لەسەر نەما، هێرشیان کردەسەر و رووبەرووی کوڕەکەی سەعید کوڕی خالید بوونەوە. ئەو و هاوەڵانی ئەویان کوشت و ئەم هەواڵە بەخالید گەیشت و هەڵات تا لەسارا شوێنێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

دەڵێت: رۆمییەکان لەیەرموك کۆبوونەوە و لەوێ جێگەیان گرت و وتیان: سوێند بەخوا کارێك دەکەین ئەبوبەکر سەرقاڵی کاری خۆی بێت و سوپا بۆ سەرزەمینی ئێمە ڕەوانە نەکات. خالید کوڕی سەعید رووداوەکەی بۆ ئەبوبەکر نووسی و ئەبوبەکر بۆ عەمرۆ کوڕی عاس لەدیاری قوزاعە نامەی نووسی بەرەو یەرموك بڕوات. ئەو کارەی کرد و ئەبوبەکر باوکی عوبەیدەی جەڕاح و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی نارد و فەرمانی هێرشی پێدان بەڵام پێشڕەوی نەکەن مەگەر ئەوەی دوژمن لەپشت سەرتانەوە نەمابێت.

دەڵێت: شورەحبیل کوڕی حەسەنە لەگەڵ هەواڵی یەکێك لەسەرکەوتنەکانی خالید هاتە لای ئەبوبەکر. ئەبوبەکر ئەوی لەگەڵ سوپایەك بۆ شام نارد.

هەرکام لەسەرکردەکانی سوپای کردبووە لێپرسراوی یەکێك لەویلایەتەکانی شام.

هەموویان لەیەرموك کۆبوونەوە و کاتێك رۆمییەکان موسوڵمانەکانیان بینی، لەکاروکردەوەکانی خۆیان پەشیمان و لەبیریان کرد هەڕەشەیان لەئەبوبەکر دەکرد. هەموویان بیریان لەخریان دەکردەوە و لەواقوسە ئوردوویان لێدا.

ئەبوبەکر وتبووی: سوێند بەخوا بەهۆی خالید کوڕی وەلید بیرۆکە شەیتانییەکان لەبری رۆمییەکان دەبەمەوە. نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا موسەنا و نیوەی سوپاکەی لەعێراق بەجێبێڵێت و کاتێك خواوەند شامی بۆ موسوڵمانان ئاوەڵا کرد، بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

خالید پێنج یەکی تالآنییەکانی لەگەڵ هەواڵی بەرێکەوتنی خۆی بۆ شام بەعومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری بۆ مەدینە نارد.

خالید رێنیشاندەرەکانی رێگەی بانگکرد و لەحیرەوە بەرێکەوت. تا دومە ڕۆشتە پێش. دواتر لەرێگەی ساراوە گەیشتە قەراقێر. وتی: لەکام رێگەوە بڕۆین بۆ ئەوەی رووبەرووی دەستەی رۆمییەکان نەبینەوە چوونکە شەڕ لەگەڵ ئەوان رێگر دەبێت لەوەی بتوانم هاوکاری موسوڵمانان بکەم.

رێنیشاندەرەکان وتیان: رێگەیەك دەزانین بەڵام جگە لەسواری چالاك سوپا ناتوانێت لەو رێگەوە گوزەر بکات. مەترسی بۆ موسوڵمانان دروست مەکە.

خالید بڕیاریدا لەهەمان رێگەوە بڕوات و جگە لەرافیع کوڕی عومەیر ئەویش بەترس و نیگەرانی زۆر، کەس بەو کارە رازی نەبوو. خالید قسەی لەگەڵ کردن و وتی: پەرێشان مەبن و باوەڕتان سست نەبێت، بزانن کار بەئەندازەی نییەتە و پاداشت بەئەندازەی دڵپاکی، رەوا نییە موسوڵمان بەباوەڕ بەهاوکاری خواوەند لەهیچ رووداوێك بترسێت.

وتیان: تۆ پیاوێکیت خواوەند چاکییەکانی بەتۆ بەخشیوە، ئەمە تۆ و ئەوە رێگە. نییەتیان کرد و هاوشێوەی خالید بۆ رووبەروو بوونەوەی مەترسییەکان خۆیان ئامادە کرد. خالید فەرمانیدا بۆ ماوەی پێنج رۆژ بۆ ئەم سەفەرە پڕ مەترسییە، ئاو هەڵبگرن و سوارەکان ئەسپەکانیان تێراوبکەن. هەرکامیان وشترە بەهێزەکان بەتینوویەتی رابگرن و دواتر لەسەر خۆ و کەم کەم ئاویان پێبدەن. گوێچکە و دەمی وشترەکانیان بەستەوە تا ناوسکیان خاڵی بوویەوە و لەقەراقێر لەرێگەی سارا تا سوی کە لەنزیك سارای شام بوو، بەرێکەوتن. دوای یەك رۆژ رێگە، بۆ بەشێك لەئەسپەکان چەند وشترێکیان سەربڕی

و شلەمەنی ئاو سکی وشتریان تێکەڵ بەشیر کرد و دەرخواردی ئەسپەکانیاندا. شەڕکەران کەمێك ئاویان خواردەوە و بەمشێوەیە چوار ڕۆژ ڕێگەیان بڕی.

عوبەیدالله کوڕی مەحفەز دەڵێت: موحریز کوڕی حورەیشی مەحاربی بەخالیدی وت: بڕۆی ڕاستی خۆت لەڕێکی ئەستێرە بەرەبەیان دابنێ و بەرەو پێش بڕۆ دەگەیتە سووی. لەهەمووان زیاتر شارەزای ڕێگە بوو.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: کاتێك خالید لەسوی دابەزی، دەترسا گەرمای هەتاو، تەنگیان پێ هەڵچنێت و بەرافیعی وت: چیت پێیە؟ وتی: هەمووی چاکەیە، گەشتینە ئاو. دڵنەوایی دانەوە بەڵام سەریسوڕمابوو، چاوی ئێشا. وتی: ئەی خەڵکینە بەدوای دوو نیشانەدا بگەڕێن کەهاوشێوەی دوو مەمکە.

وتیان: ئەوە دوو نیشانەکە.

رافیع وەستا و وتی: بەچەپ و ڕاستدا و بڕۆن و بەدوای دارە دڕکاوییەکاندا بگەڕێن.

شوێنی دارەکانیان دۆزییەوە و وتیان: شوێنی دارەکان دەبینین بەڵام داری لێ نییە.

وتی: لەهەر شوێنێك پێتان خۆشە چاڵاوێك هەڵکەنن.

ئاویان لەژێر زەوی دەرهێنا و رافیع وتی: ئەی ئەمیری خوا، سی ساڵ پێش لەکاتی گەنجی، جارێك لەگەڵ باوکم هاتمە سەر ئەم ئاوە و دوای ئەوە چیتر نەهاتووم.

خۆیان ئامادە کرد و هێرشیان برد. کەس بڕوای نەدەکرد سوپایەك لێرەوە بڕواتە لایان.

زەفەر کوڕی دەهی دەڵێت: خالید لەسوی هێرشی کردە سەر مەسیخی بەهرا لەسەر چاڵی قەسوانی. مەسیخ و نەمر بێ ئاگا بوون و بەرەبەیان چەند کەسێك لەوان شەرابی دەخواردەوە. ساقی ئەوان هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((پێش ئەوەی سوپاکەی ئەبوبەکر بێت، پێکێکم بۆ تێکەن.)) سەریان بەشمشێر پەڕاند و خوێنی تێکەڵ بەشەراب بوو.

عەمرۆ کوڕی محەممەد دەڵێت: کاتێك خەڵکانی غەسان ئاگادار بوونەوە خالید لەسوی دەرکەوتووە و هێرشی کردۆتە سەر مەسیخی بەهرا و شکستی داون، لەمەرج راهیت کۆبوونەوە. خالید لەم کارەی ئەوان ئاگادارو ڕووبەڕوویان بوویەوە. خالید سنوور و سوپاکانی نزیك عێراقی لەپشت سەری خۆی بەجێهێشتبوو و لەنێوان ئەوان و یەرموکدا بوو. لەگەڵ ئەسیرەکانی بەهرا ڕۆشت و گەیشتە دورمانە کەدوو نیشانە لەسەر ڕێگەکە بوو. لەکەسب تێپەڕی و گەیشتە دیمەشق و لەوێوە گەیشتە مەرج

ئەلسەفەر و رووبەرووی غەسانییەکان بوویەوە کەسەرکردەکەیان حارس کوڕی ئەیهەم بوو. سوپا و سامانی ئەوانی تالآن کرد و چەند رۆژێك لەمەرج مایەوە. پێنج یەکی تالآنییەکانی بەبیلال کوڕی حارسی موزنی بۆ مەدینە نارد.

لەمەرجەوە بەرێکەوت و لەسەر ئاوەکانی بوسرا دابەزی. ئەمە یەکەم شاری شام بوو لەسەردەستی خالید و سوپاکەی هاورێی دەستی بەسەردا گیرا. لەوێ ڕۆشت و لەواقوسە هاورێ لەگەڵ نۆ هەزار شەرکەر پەیوەستی موسوڵمانان بوو.

موهەلیب دەڵێت: کاتێك خالید لەحەج گەڕایەوە و نامەی ئەبوبەکری پێگەیشت کەفەرمانی پێدەدا لەگەڵ نیوەی سوپاکەی بەرێکەوت و نیوەکەی تر بەموسەنا کوڕی حارسە بسپێرێت و نووسیبووی: لەهیچ شوێنێك تێمەپەرە مەگەر ئەوەی کەسێك لەوێ دابنێیت و کاتێك خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، لەگەڵ سوپاکەت بۆ عێراق بگەڕێرەوە. خالید هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە و ئەوانی بۆ هاورێیەتی خۆی هەڵبژارد. ئەو کەسانەی چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) نەکەوتبوو، لای موسەنا بەجێی هێشتن. دواتر سەیرێکی سوپاکەی کرد و ئەو کەسانەی توانیبوویان پێغەمبەر(د.خ) ببینن، هەڵیبژاردن و کەسانی دیکەی بۆ موسەنا دانا. بەمشێوەیە سوپاکەی کردە دوو بەش.

بەڵام موسەنا وتی: سوێند بەخوا دەبێت فەرمانەکەی ئەبوبەکر ئەنجام بدرێت و نیوەی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ من بمێننەوە چوونکە بێ بوونی ئەوان ناتوانم لەسەرکەوتن دڵنیا بم، بۆ من لەوان بێ بەش دەکەیت؟

کاتێك خالید ئەمەی بینی، دوای بگرە و بێنە، دەستەیەك لەوانی لای موسەنا بەجێهێشت کەفورات کوڕی حەییانی عێجلی و بەشیر کوڕی خەسایسە و حارس کوڕی حسان، هێردوانی زوهەلی، مەعبەد کوڕی دایکی مەعبەد ئەسلەمی و عەبدوللە کوڕی ئەبی ئەوفی ئەسلەمی و حارس کوڕی بیلالی موزنی و عاسم کوڕی عەمرۆ تەمیمی لەوان بوون.

کاتێك موسەنا رازی و بەمەبەستەکەی خۆی گەیشت، خالید بەرێکەوت و موسەنا تا قەراقێر لەگەڵی ڕۆشت. دواتر لەمانگی موحەرەم بۆ حیرە گەڕایەوە و سەرقاڵی بەرێوبردنی کاروبارەکانی سنوورەکەی خۆی بوو. براکەی خۆی وەك لێپرسراوی ئوردووگای سیب دانا. عوتبە کوڕی نەهاسی لەجێگەی زەرار کوڕی خەتاب و مەسعود

برای زەرار کوڕی ئەزوەری لەجێگەی زەڕار دانا. بەم شێوە شوێنی سەرکردەکانی بەکەسانی شیاو پڕ کردەوە. لێپرسراویەتی بەمەزعور کوڕی عودەی بەخشی.

ساڵێك دوای هاتنی خالید بۆ حیرە و کەمێك دوای ڕۆشتنی ئەو لەساڵی سیانزەیەم، پارسەکان، شەهربەراز کوڕی ئەردەشێر کوڕی شەهریاریان وەك پاشا هەڵبژارد کەرەچەڵەکی بۆ کەسرا و شاپوور دەگەڕایەوە. ئەو سوپایەکی گەورە پێکهاتوو لەدە هەزار کەس و یەك فیلی بەسەرکردایەتی هورموز کوڕی جادویە بۆ شەڕ لەگەڵ موسەنا ڕەوانە کرد و پادگانەکانی دەوروبەر موسەنایان لەهاتنی ئەو ئاگادار کردەوە. ئەو لەحیرەوە بەرێکەوت و پەیوەستی پادگانەکانی خۆی بوو. دوو باڵی سوپاکەی بەمەعنی و مەسعود کوڕەکانی حارسە سپارد و لەبابل چاوەڕوانی دوژمنی کرد.

هورموز جادویە هات و دوو باڵی سوپاکەی بەکەوکەبد و خوکەبز سپارد. نامەیەکی بۆ موسەنا نووسی بەم ناوەڕۆکە:

((لەشەهر بەراز بۆ موسەنا، من سوپایەکم لەسەرسەرییەکانی فارس بۆ شەڕی تۆ ناردووە کە شوانی مەل و بەرزان، تەنیا بەهۆی ئەوانەوە شەڕ لەگەڵ تۆ دەکەم.))

موسەنا لەوەڵامدا نووسی:

((لەموسەنا بۆ شەهر بەراز، تۆ یەکێك لەم دوو تایبەتمەندییەت هەیە، یا سەرکێشیت و ئەمە بۆ تۆ خراپە و بۆ ئێمە چاك، یا درۆزنیت و پاشای درۆزنەکان لای خوا و خەڵکان پاداشت و ریسواییان پێدەبڕێت، گومان دەکەم سەرسەرییەکانتان لەناچاریدا ڕەوانە کردووە، سپاس بۆ خوا ئێوەی ناچاری شوانی مەل و بەرازەکان کرد)).

پارسییەکان لەنامەکەی ئەو هاواریان بەرز بوویەوە و وتیان: زادە و سەرچاوەی شەهر بەراز بووە هۆی لەخۆبایی بوونی ئەو. بەشێك لەشارەکان دەبێتە هۆی ریسوایی خەڵکەکەی. بۆیە ئەم قسەیان کرد چوونکە ئەو دانیشتووی میشان بوو. بەشەهر بەرازیان وت: بەم نامەی بۆ دوژمنت نووسی، بوێری ئەوانت زیاد کرد، کاتێك دەتەوێت نامە بۆ کەسێك بنووسیت، راوێژ بکە.

دوو دەستەکە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و لەنزیك تەپۆڵکەی سیراتی نزیك لەسەر رێگەی یەکەم، شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. موسەنا و چەند کەسێك لەموسوڵمانەکان هێرشیان کردە سەر فیلەکە و کوشتیان. فارسەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان دەستیان بەکوشتار و شوێن کەوتنی دوژمن کرد. تا نزیك پادگانەکەی خۆیان پاشەکشێیان پێکردن و لەوێ جێگیر بوون. موسوڵمانان تا نزیك مەداین شوێن

هەڵاتووان کەوتن.

عەبدە کوڕی تەییبی سەعدی لەمبارەوە قەسیدەیەکی هەیە، ئەو لەبەر کۆچی ژنە خۆشەویستەکەی خۆی کۆچی کردبوو. لەشەڕی بابل ئامادە و کاتێك لەدۆزینەوەی ژنەکەی بێ هیوا بوو، بۆ بادیە گەڕایەوە. دەڵێت:

(( ئایا ڕشتەی خۆشەویستی خەولە دوای جیابوونەوە یەکدەگرێتەوە
یا ماڵەکەی تۆ لەو دوورە و گرفتاری خۆتیت
دۆستەکان ڕۆژەکانیان هەیە و بەردەوام لەبیریانە
و ڕووداوەکان پێش جیابوونەوە لێکدانەوەیان هەیە
خەویلە لەناو خەڵکانێك نیشتەجێ بووە کەدەیانناسم
لەنزیك مەداین جێگیرین و فیل و کەڵەشێری لێیە
سەری عەجەمەکان دەکوتن....
و سوارە بەتواناکانیان هەیە...
تا کۆتایی قەسیدەکە.))

فەرزدق سەبارەت بەئامۆژیارییەکانی بنەماڵەکانی بەکر کوڕی وائل و ناوهێنانی موسەنا و کوشتنی فیلەکە هۆنراوەیەکەی هەیە بەم ناوەڕۆکە:

((بنەماڵەی موسەنا کە لەبابل فیلەکەیان کوشت
ئەو کاتەی پاشایەتی بابل لەدەستی فارسەکاندا بوو))

دوای شکستی هورموز جادوویە، شەهربەراز گەڕایەوە و دووبەرەکەی لەناو فارسەکاندا دروست بوو. لەسەرزەمینی سواد ئەوەی لەپشت دیجلە و بورسدا بوو، لەدەستی موسەنا و موسوڵماناندا مایەوە.

فارسەکان دوای شەهر بەراز کچی ژنەکانی کەسرایان وەك پاشا هەڵبژارد بەڵام فەرمانەکانی کاری پێنەدەکرا و دواتر شاپوور کوڕی شەهربەرازیان وەك پاشا هەڵبژارد.

دەڵێت: شاپور کوڕی شەهربەراز پاشایەتی گرتەدەست، فەرخزاد کوڕی بەندوان کەلێپرسراوی کاروبارەکانی ئەو بوو، ئازەرمیدۆخت کچی کەسرای لەو خوزابێنی کرد. شاپور رازی بوو بەڵام ئازەرمیدۆخت توڕە بوو، وتی: کوڕە مام، چۆن من دەکەیتە ژنی بەندەکەی خۆم.

شاپور وتی: شەرم بکە و چیتر ئەم قسە مەهێنە سەر زمان چوونکە ئەو هاوسەری

تۆیە.

ئازەرمیدۆخت کەسی بۆ لای سیاوەخشی رازی نارد کەیەکێك بوو لەپیاوکوژەکانی عەجەم. نیگەرانییەکانی خۆی لەگەڵ ئەودا باس کرد.

سیاوەش وتی: ئەگەر حەز بەم هاوسەرگیرییە ناکەیت، قسە لەگەڵ شاپور مەکە و کەس بۆ لای فەروخزاد بنێرە تا بێتە لای تۆ.

ئازەرمیدۆخت ئەو کارەی کرد. شاپور فەرمانی ئەو کارەی دا. بۆ شەوی پەردە، فەروخزاد ڕۆشتە لای ئازەرمیدۆخت و سیاوەش پەلاماریدا و خۆی و هاوەڵانی کوشت. دواتر ئازەرمیدۆختی لەگەڵ خۆی بۆ لای شاپور برد. گەیشتنە لای پاشا و سیاوەخش و کەسەکانی هاتن و ئەویان کوشت و ئازەرمیدۆخت پاشایەتی گرتەدەست. عەجەمەکان سەرقاڵی ئەم کێشانە بوون.

ماوەیەك بوو هەواڵی موسوڵمانان بەئەبوبەکر نەگەیشتبوو، موسەنا، بیشر کوڕی خەسایسەی لەجێگەی خۆی دانا و لەجیاتی ئەو سەعید کوڕی مورەی عیجلی کردە فەرماندەی پادگانەکان و خۆی بەرەو مەدینە بەرێکەوت تا ئەبوبەکر لەهەواڵی ناباوەڕان و موسوڵمانان ئاگادار بکاتەوە و مۆڵەتی لێوەربگرێت لەو هەڵگەڕاوانەی تۆبەیان کردبوو و خوازیاری بەشداری لەشەڕەکان بوون، هاوکاری وەربگرێت و پێی بڵێت کەس وەك ئەوان بۆ شەڕ لەگەڵ پارسەکان و هاوکاری کردنی موهاجیرەکان تێکۆشەرتر و تامەزرۆتر نییە.

کاتێك موسەنا گەیشتە مەدینە، ئەبوبەکر نەخۆش بوو. دوای ئەوەی فەرمانی بەخالید کوڕی وەلیددا بەرەو شام بڕوات، نەخۆش کەوت و بەهەمان نەخۆشی مرد. کاتێك گەیشتنی موسەنا، ئەبوبەکر لەسەرەمەرگدا بوو. خەلافەتی بەعومەر سپارد و کاتێك لەهەواڵەکان ئاگاداری کردەوە، وتی: عومەر بێنن بۆ لای من.

کاتێك عومەر هات، وتی: ئەی عومەر گوێ لەوتەکانی من بگرە. گومان دەکەم ئەمڕۆ دەمرم، ڕۆژی دووشەممە بوو، ئەگەر مردم پێش ئەوەی شەو دابێت پێشنیاری ڕۆشتن لەگەڵ موسەنا بەخەڵکان بکە و ئەگەر لەشەودا مردم، پێش ئەوەی بەیانی دابێت، ئەو کارە بکە. هیچ بەڵایەك هەرچەندە گەورە نەبێتە ڕێگر لەئەنجامدانی ئەرکە دینییەکان، بینیت کاتی مردنی پێغەمبەر(د.خ) کەخەڵکان بەڵایەك لەوە گەورەتریان نەبینیوە، چۆن هەڵس و کەوتم کرد. ئەگەر لەفەرمانەکانی خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) سستیم لەخۆم نیشان دەدا، ڕیسوا دەبووین و دەرئەنجامەکانیمان دەبینی و مەدینە دەسووتێنرا،

ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی بەسەرکردەکانی شام بەخشی، سوپاکەی خالید بۆ عێراق بگەڕێنەرەوە چوونکە خەڵکی ئەو سەرزەمینە و لێپرسراوی کاروبارەکانی ئەو ناوچەن و بۆ ئەم کارە بوێری و توانایی پێویستیان هەیە.

ئەبوبەکر دەمەوئێواریێ مرد. عومەر شەو ئەوی لەمزگەوت بەخاك سپارد و دوای دفن کردنی ئەبوبەکر، پێشنیاری ڕۆشتن لەگەڵ موسەنای بەخەڵکان کرد و وتی: ئەبوبەکر دەیزانی حەز ناکەم خالید سەرکردەی سوپاکەی عێراق بێت بۆیە ناوی سوپاکەی ئەوی برد بێ ئەوەی باسی خۆی بکات.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەبوبەکر لەکاتی پاشایەتی ئازەرمیدۆخت مرد. لایەکی سواد لەسنوری دەسەلاتی ئەودابوو کاتێك مرد. فارسەکان گرفتاری سەرقاڵییەکانی خۆیان بوون. لەخەلافەتی ئەبوبەکر تا خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب و گەڕانەوەی موسەنا و باوکی عوبەیدە بۆ عێراق، فارسەکان بۆ دەرکردنی موسوڵمانەکان لەسواد هیچ کارێکیان نەکرد و بەشی زۆری سوپای عێراق لەحیرە بوو. پادگانەکان لەسیب و هێرشەکانی سوپا لەکەنارەکانی دیجلە تێنەدەپەڕی. دیجلە سنووری نێوان عەرەب و عەجەم بوو.

ئەمە بوو بەسەرهاتەکانی عێراق لەماوەی خەلافەتی ئەبوبەکر لەسەرەتاوە تا کۆتایی.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خالید لەحیرە، ئەبوبەکر نامەی بۆ نووسی تا لەگەڵ هەموو پیاوە بەهێزەکانی خۆی بەرەو شام بەرێکەوت و بۆ خەڵکە کەمهێزەکەی سوپاکەی خۆی، یەکێك لەخۆیان بکاتە فەرماندە. کاتێك نامەکەی ئەبوبەکر بەخالید گەیشت، وتی: ئەمە کاری چەپلەر یانی عومەرە، چوونکە ناخوازێت گرتنی عێراق لەسەر دەستی من بێت.

خالید لەگەڵ پیاوە بەهێزەکانی بەرێکەوت و پیاوە لاواز و ژنانی بۆ مەدینە گەڕاندەوە و عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری کردە سەرکردەی ئەوان. موسەنا کوڕی حارسەی وەك فەرماندەی سوپاکەی عێراق لەتایەفەی رەبیعە و کەسانی دیکەی دیاریکرد. دواتر روویکردە عەین ئەلتەمر و هێرشی کردە سەر خەڵکەکەی و کەسانێکی زۆری کوشت و گەمارۆی خستە سەر یەکێك لەقەلاکان کە لەسەردەمی کەسرا، شەڕکەران لەوێ بوون. دەستی بەسەر قەلاکەدا گرت و دانیشتووانی قەلاکەی کوشت. کەسانێکی زۆری لەوان و خەڵکانی عەین ئەلتەمر ئەسیر و رەوانەی مەدینەی کردن.

یەکێك لەئەسیرەکان باوکی عەمرە کۆیلە شەبان بوو کەباوکی عەبدولعەلی کوڕی

باوکی عەمرەیە.

هەروەها باوکی عوبەیدە کۆیلەی موعەلی ئەنساری زەریقی، باوکی عەبدوللە کۆیلەی زوهرە، خیرە کۆیلەی ئەبی داوودی ئەنساری مازنی، یەسار باوەگەورێی محەممەد کوڕی ئیسحاق کۆیلەی قەیس کوڕی موخریمە کوڕی موتەلیب کوڕی عەبدمەناف، ئەفلەح کۆیلەی باوکی ئەییووبی ئەنساری مالکی، حیمران کوڕی ئەبان کۆیلەی عوسمان کوڕی عەفان لەناویاندا دەبینران.

خالید کوڕی وەلید لەعەین ئەلتەمر، عوققە کوڕی بوشری نەمری کوشت و هەڵیواسی. دواتر لەقەراقێر یەکێك لەچاڵاوەکانی مناڵەکانی کەلب، لەرێگەی بیابانەوە بەرەو سوی بەرێکەوت کەچاڵاوی تایەفەی بەهرایە. پێنج رۆژ لەرێگەدا بوو، بەڵام چوونکە شارەزای رێگە نەبوو بەدوای رێنیشاندەرێك دەگەڕا، رافیع کوڕی عومەیری تاییان پێناساند و خالید وتی: رێگە نیشانی خەڵکان بدە.

رافیع وتی: بەسوپا و کەل و پەلەوە ناتوانیت لەم رێگەیە تێپەڕیت چوونکە سوار تەنیا لەڕۆشتن بەو رێگەیە دەترسێت و تەنیا کەسانی لەخۆبایی بەم رێگەیەدا دەڕۆن، پێنج رۆژی تەواو رێگەیە بەبێ ئاو و مەترسی رێگە ون کردن لەئارادایە.

خالید وتی: سوێند بەخوا هیچ رێگە چارەیەکمان نییە، فەرمانی خەلیفەیە، چی بکەین؟

وتی: تا دەتوانن ئاو هەڵگرن و هەمووان گوانی وشترەکانی خۆیان ببەستن چوونکە مەترسییەکانی رێگە فراوانە، مەگەر خواوەند هاوکاریمان بکات. بیست وشتری قەڵەو بۆ من بێنن.

خالید فەرمانیدا و وشترەکانیان هێنا. رافیع ئەوانی بەستەوە تا لەتینویەتی بێزار بوون. دواتر ئەوانی بردە سەر ئاوخۆرەکە، ئاویان خواردەوە تا تێراو بوون، دواتر لێوی ئەوانی بڕی و دەمی بەستن بۆ ئەوەی کاوێژ نەکەن و ناوسکیان خاڵی ببێتەوە. بەخالیدی وت: بەرێکەوە.

خالید لەگەڵ سوپاو کەل و پەلەکان بەرێکەوت. لەهەر شوێنێك مەنزڵی دەگرت، چوار وشتری سەر دەبڕی و ئاوی ناوسکی ئەوانیان دەردەهێنا و دەرخواردی ئەسپەکانیان دەدا. خەڵکان لەئاوەکەی خۆیان دەخواردەوە. دوایین رۆژی سەفەری سارا، خالید لەچارەنووسی هاوەڵانی خۆی دەترسا و بەرافیع کوڕی عومەیری وت: دەبێت چی بکەین؟

وتیان: بەخواستی خوا گەشتیتە ئاو. کاتێك لەدوو هێما نزیك کەوتەوە، بەکەسانی وت: بڕوانن بزانن داری بچوکی دڕکاوی دەبینن؟

وتیان: دار نابینین.

وتی: انا لله و انا الیه راجعون، سوێند بەخوا لەناچوون و منیش، بێ باوکینە، جوان بڕوانن.

کاتێك گەڕان، دارەکانیان بینی بەڵام بڕابوونەوە و هیچیان لێ نەمابوویەوە.

کاتێك موسوڵمانەکان ئەوەیان بینی، تەکبیریان وت. رافیع کوڕی عومەیر وتی: بن دارەکان هەڵکەنن. کاتێك هەڵیانکەند، سەرچاوەیەك هەڵقوڵی، ئاویان خواردەوە تا تێراو بوون. دوای ئەوە مەنزڵگەکان پەیوەستی یەك بوون.

رافیع بەخالیدی وت: سوێند بەخوا تەنیا یەکجار ئەو کاتەی تەمەنم نۆ ساڵ بوو، لەگەڵ باوکم هاتینە لای ئەم ئاوە.

یەکێك لەشاعیرە موسوڵمانەکان لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

(( چەندە کانییەکی دڵڕفێن بوو و رافیع چۆن ڕێگەی دۆزییەوە؟

لەڕێگەی بیابان لەقەراقێر تا سوی ڕۆشت

پێنج ڕۆژ کاتێك سوپا ڕێگەی دەبڕی، گریا

پێش ئەوە هیچ مرۆڤێك بەم ڕێگەدا نەڕۆشتبوو))

کاتێك خالید گەیشتە سوی، هێرشی کردە سەر خەڵکانی ئەوێ لەتایەفەی بەهرا. دەستەیەکیان سەرقاڵی شەراب خواردنەوە بوون و قاپی شەرابیان بەدەستەوە بوو. کۆببوونەوە و گۆرانیبێژەکەیان شێعرێکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( پێش ئەوەی سوپاکەی ئەبوبەکر بگات پێکێکم بۆ تێکەن

ئەگەری هەیە مەرگی ئێمە نزیك و نازانین

لەشووشە بۆم تێکەن

بەردەوام پیاڵەم بۆ پڕکەن

من لەو بادەی خەم دەڕەوێنێتەوە، تێراو بکەن

چوونکە گومان دەکەم بەرەبەیان سوپاکەی خالید بگات

بۆ پێش جەنگ لەگەڵ ئەوان و پێش ئەوەی ژنان لەپەردە بێنەدەر، بەرێناکەون.))

دەڵێت: لەکاتی هێرشەکە، گۆرانیبێژەکە کوژرا و خوێنی کەوتە ناو قاپە شەرابەکە. خالید پێشڕەوی کرد تا لەمەرج راهیت هێرشی کردە سەر غەسانییەکان. دوای ئەوە لەزیك بوسرا دابەزی کەباوکی عوبەیدەی جەراح و شەرەحبیل کوڕی حەسەنە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان لەوێ بوون. کۆبوونەوە و گەمارۆیان خستە سەر بوسرا تا دەستی بەسەردا گیرا و پەیمانیان ئاشتیان بەست بەو مەرجەی جەزیە بدەن. ئەمە یەکەم شاری شام بوو لەسەردەمی خەلافەتی ئەبوبەکر دەستی بەسەردا گیرا. دوای ئەوە هەمووان روویان لەفەلەستین کرد بۆ ئەوەی هاوکاری عەمرۆ کوڕی عاس بکەن کە لەعەرەبات نزیك چاڵەکەی فەلەستین ئوردوی لێدا بوو.

کاتێك رۆمییەکان لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوونەوە، لەجەڵقەوە روویان کردە ئەجنادین و تەزاروق زڕ برای هێرقل سەرکردەی ئەوان بوو. ئەجنادین لەسەرزەمینی فەلەستین لەنێوان رەملە و بەیت جەبرینە.

کاتێك عەمرۆ کوڕی عاس لەهاتنی باوکی عوبەیدە کوڕی جەڕاح و شورەحبیل کوڕی حەسەنە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان ئاگادار بوویەوە، بەرێکەوت و پەیوەستی ئەوان بوو. لەئەجنادین کۆبوونەوە و لەبەرابەر رۆمییەکان ئوردوویان لێدا.

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت: سالاری رۆمییەکان پیاوێك بەناوی قەبقەلار و هێرقل کاتێك بەرەو قوستەنتەنییە دەڕۆشت، ئەوی وەك جێگری خۆی کردە سەرکردەی ئەوان. تەزاروق لەگەڵ رۆمییەکانی هاورێی خۆی، پەیوەستی بوو. بەلام شارەزایانی شام گومان دەکەن سەرکردەی رۆمییەکان تەزاروقە و خواوەند زاناترە.

دەڵێت: کاتێك دوو سوپاکە لەیەك نزیك کەوتنەوە، قەبقەلار پیاوێکی عەرەبی بەناوی کوڕی هەزاروۆف لەخەڵکی قوزاعە لەتیرەی تەزید کوڕی حەیدان ڕەوانە کرد و پێی وت: بڕۆ ناو ئەو خەڵکە و بۆ ماوەی شەو ورۆژێك لەناو ئەواندا بمێنەرەوە و هەواڵەکانی ئەوان بۆ من بێنە.

دەڵێت: ئەو عەرەب بوو و دەیتوانی بڕواتە ناو ئوردووگای موسوڵمانان. ڕۆشت و بۆ ماوەی شەو ورۆژێك لەناو سوپای موسوڵمانان مایەوە. دواتر گەڕایەوە بۆ لای قەبقەلار. پرسی: چیت بینی؟

وتی: شەوانە راهیبن و رۆژانە سوارکار، ئەگەر کوڕی پاشاکەیان دزی بکات، دەستی دەبڕن و ئەگەر زینابکات، سەنگساری دەکەن تا دادپەروەرییان هێنابێتەدی.

قەبقەلاری وتی: ئەگەر راست بکەیت، باشترە بمرین لەوەی لەسەر ئەم زەوییە شەڕ

لەگەڵ ئەو خەڵکە بکەین. حەز دەکەم خواوەند کارێك بکات جیابوونەوە لەنێوان ئێمەدا دروست ببێت نە من بەسەر ئەواندا سەرکەوم نەئەوان بەسەر مندا.

دەڵێت: هێرشیان بردە و شەڕ دەستییێکرد. قەبقەلار کاتێك شەڕی موسوڵمانەکانی بینی، بەرۆمییەکانی وت: پەرۆیەك لەسەری من ببەستن.

وتیان: بۆچی؟

وتی: رۆژێکی خراپە و ناخوازم بیبینم. بەدرێژایی تەمەنم رۆژێکی سەختتر لەم رۆژەم نەبینیوە.

دەڵێت: موسوڵمانان سەری پێچراوی ئەویان بڕی.

شەڕی ئەجنادین لەساڵی سیانزەی کۆچ دوو رۆژ بۆ کۆتایی جومادی الاول روویدا. لەم شەڕەدا دەستەیەك لەموسوڵمانان وەك سەلمە کوڕی هوشام کوڕی موغەیرە، وهبار کوڕی ئەسوەد عەبدلئەسوەد، نەعیم کوڕی عەبدوللە نەحام، هوشام کوڕی عاس کوڕی وائل و چەند کەسێکی دیکە لەقورەیشییەکان کوژران. ناوی کوژراوەکانی ئەنساریان نەبردووە.

هەروەها لەساڵی سیانزەیەم هەشت یا حەوت رۆژ بۆ کۆتای جومادی الاخر ئەبوبەکر چاوی لەجیهان بەست.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: خالید هاتە دیمەشق و سەرکردەی بەسرە، سوپایەکی دژی ئەو رازاندەوە. خالید و باوکی عوبەیدە هێرشیان کردەسەر و لەئەدرەنجا رووبەرووی بوونەوە و بەسەر رۆمییەکاندا سەرکەوتن و شکستیان پێهێنان. رۆمییەکان پەنایان بۆ قەڵاکانی خۆیان برد و خوازیاری ئاشتی بوون. خالید پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەوان بەست بەو مەرجەی هەر کەس ساڵانە یەك دینار و یەك پێوانە گەنم وەك جەزیە بدات.

دوای ئەوە دوژمن مەبەستی شەڕ لەگەڵ موسوڵمانانی کرد. سوپای موسوڵمانان و رۆمییەکان لەئەجنادین رووبەرووی یەکبوونەوە و رۆژی دووشەممە دوو رۆژ بۆ کۆتایی جومادی الاولی ساڵی سیانزەی کۆچ، شەڕ روویدا. خواوەند شکستی بەناباوەڕان هێنا و جێگرەکەی هێرقل کوژرا و دەستەیەك لەسەرکردەی موسوڵمانەکان شەهید بوون.

هێرقل بۆ شەڕی موسوڵمانەکان گەڕایەوە و لەواقوسە رووبەرووی یەکبوونەوە. هەر دوو سوپا شەڕیان کرد و لەکاتی شەڕەکە، هەواڵی مەرگی ئەبوبەکر و سەرکردایەتی

باوکی عوبەیدەی جەڕاحیان پێگەیشت. ئەم شەڕە لەمانگی ڕەجەب ڕوویدا.

دەڵێت: ئەبوبەکر لەتەمەنی شەست و سێ ساڵی کۆچی دوایی کرد. مەرگی ئەو لەڕۆژی دووشەممە هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی جومادی الاخر بوو.

دەڵێت: هۆکاری مردنەکەی ئەوە بوو جوولەکەکان برنجی ژەهراوییان دەرخوارددا و حارس کوڕی کەلدە لەگەڵ ئەو لەو خواردنەی خوارد بەڵام دەستی لێهەڵگرت و وتی: خورادنێکی ژەهراویت خوارد و ژەهرێکی یەك ساڵەیە. دوای یەك ساڵ مرد.

نەخۆش ئەبوبەکر پانزە ڕۆژی خایاند.

پێیان وت: داوای پزیشك بکە.

وتی: پزیشك منی بینیوە.

وتیان: چی پێ وتیت؟

وتی: هەرچی بخوازم، ئەنجامی دەدەم.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەڕۆژی مردنی ئەبوبەکر، عەتاب کوڕی ئەسید لەمەککە چاوی لەجیهان بەست، پێکەوە ژەهر خوارد کرابوون، بەڵام عەتاب لەمەککە مرد.

سەبارەت بەنەخۆشی ئەبوبەکر، لەعایشە دەگێڕنەوە: نەخۆشی ئەبوبەکر لەوێوە دەستی پێکرد کە لەڕۆژی دووشەممە حەوت ڕۆژ بۆ کۆتایی جومادی الاخر، لەڕۆژێکی سارد، خۆی شۆرد. بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لەرز وتای بوو. بۆ نوێژ نەدەهاتەدەر و بەعومەر کوڕی خەتابی دەوت پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات. خەڵکان بۆ سەردان کردنی دەهاتنە ماڵەکەی و هەر ڕۆژ حاڵی لەڕۆژی پێشتر خراپتر دەبوو. لەو ماڵەدا دەژیا کەپێغەمبەر پێیدا بوو و ئێستاکە ڕووبەڕووی ماڵەکەی عوسمان کوڕی عەفانە. لەکاتی مەرگ، عوسمان زیاتر لەهەمووان لای دەمایەوە و لەشەوی سێ شەممە هەشت ڕۆژ بۆ کۆتایی جومادی الاخری ساڵی سیانزەیەمی کۆچ، چاوی لەجیهان بەست.

دەڵێت: باوکی مەعشەر دەیوت: خەلافەتی ئەبوبەکر دوو ساڵ و چوار مانگ چوار ڕۆژ کەم درێژەی کێشا و شەست و سێ ساڵی بوو کاتێك جیهانی بەجێهێشت.

لەمبارەوە گێڕانەوەکان جیاوزان. تەمەنی ئەو هاوئەندازەیە لەگەڵ تەمەنی پێغەمبەر(د.خ) و سێ ساڵ دوای ساڵی فیل چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: بەماوەی خەلافەتی ئەبوبەکر، تەمەنی بەئەندازەی تەمەنی پێغەمبەر(د.خ) بوو و لەکاتی مردن شەست و سێ ساڵ تەمەنی بوو.

جەریر دەڵێت: لای معاویە بووم، وتی: کاتێك پێغەمبەر(د.خ) کۆچی دوایی کرد،

تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو، کاتێك ئەبوبەکریش مرد، تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو، کاتێك عومەر کوژرا، تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: خەلافەتی ئەبوبەکر دوو ساڵ و سێ مانگ و بیست ڕۆژ و بەوتەیەك دە ڕۆژ بوو.

## ئەوکەسانەی ئەبوبەکریان شۆرد
**ئەو کاتەی نوێژیان لەسەر خوێند**
**ئەو کەسەی لەسەر مردووی ئەبوبەکر نوێژی خوێند و**
**کات و ساتی مەرگی ئەو**

عایشە دەڵێت: ئەبوبەکەر لەنێوان عەسر وئێواریێ مرد.

ئەسما کچی عەمیس دەڵێت: ئەبوبەکر پێی وتم: تۆمن بشۆ.

وتم: توانای ئەو کارەم نییە.

وتیك عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر هاوکاریت دەکات و ئاو دەکاتە بەدەستا.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکری راستگۆ وەسیەتی کرد ژنەکەی، ئەسما، بیشوات و ئەگەر تەنیا نەیتوانی ئەو کارە بکات، محەممەدی کوڕی یارمەتی بدات.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: ئەم حەدیسە راست نییە لەبەر ئەوەی محەممەد لەکاتی مردنی باوکی تەمەنی سێ ساڵ بوو.

عایشە دەڵێت: ئەبوبەکر لەمنی پرسی، پێغەمبەریان بەچەند پارچە کفن کرد؟

وتم: سێ.

وتی: ئەم دوو پارچەیە بشۆن و یەکی دیکە بکڕن.

وتم: باوکە گیان، ئێمە دەتوانین پارچەی تازەت بۆ بکڕین.

وتیك کچم، زیندوو زیاتر لەمردوو پێویستی بەپارچەی تازە هەیە، ئەم پارچانە بەخوێن و چڵك پیس دەبێت.

عەبدولرەحمان کوڕی قاسم دەڵێت: ئەبوبەکر شەو دوای ئاوا بوونی خۆر لەشەوی سێشەممە کۆچی دوایی کرد و هەمان شەو بەخاك سپێردرا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکریان خستە سەر تەختەکەی پێغەمبەر(د.خ). عومەر لەمزگەوت نوێژی لەسەر خوێند وعومەر و عوسمان و تەڵحە و عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەی. عەبدوللە دەیویست بڕواتە ناو گۆڕەکەی، بەلاّم عومەر وتی: بەسە.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر لای عایشە وەسیەتی کرد تا لەتەنیشت

پێغەمبەر(د.خ) بەخاکی بسپێرن و کاتێك مرد، گۆڕی ئەویان لای پێغەمبەر(د.خ) هەڵکەند و سەریان لای شانی پێغەمبەر(د.خ) دانا.

عەبدوللە کوڕی زوبەیر دەڵێت: سەری ئەبوبەکریان لای شانی پێغەمبەر(د.خ) دانا و سەری عومەر لەخوار کەلەکەی ئەبوبەکرەوە بوو.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای عایشە و وتم: دایە گیان، جێگەی پێغەمبەر(د.خ) و دوو هاوڕێکەییم نیشان بدە. ئەو سێ گۆڕی نیشاندام کە نەبەرز ببوونەوە نەچاڵ بوون. خۆڵی سووریان لەسەر بوو. گۆڕی پێغەمبەر(د.خ) لەپێشیانەوە بوو، گۆڕی ئەبوبەکر لای سەری پێغەمبەر(د.خ) و سەری عومەر لای قاچی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

موتەلیب کوڕی عەبدوللە کوڕی حەنتەب دەڵێت: گۆڕی ئەبوبەکریان هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) تەخت و ئاویان بەسەردا کرد. عایشە خەڵکانی بۆ گریان لەسەر گۆڕەکە دانیشاند.

سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکری ڕاستگۆ مرد، عایشە چەندین کەسی بۆ گریان لەسەر گۆڕەکەی ئەو دانیشاند. عومەر کوڕی خەتاب هات و وتی: بۆ ئەبوبەکر مەگرین. بەڵام ئەوان دەستیان هەڵنەگرت. عومەر بەهوشام کوڕی وەلیدی وت: بڕۆ ژوور و کچی ئەبوبەکر و خوشکی ئەبوبەکر بێنەرە لای من. کاتێك عایشە قسەی عومەری بیست، وتی: مەیێرە ناو ماڵەکەی من.

عومەر بەهوشامی وت: بڕۆ ژوور، من مۆڵەتت پێدەدەم.

هوشام ڕۆشتە ژوور و دایکی فەروە خوشکی ئەبوبەکری هێنایە لای عومەر. عومەر چەند قامچییەکی لێدا و کاتێك ژنان ئەمەیان بیست، بڵاوەیان لێکرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر لەسەرەمەگ هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

((هەرکەس وشتری هەیە بەجێی بێڵێت
هەرکەس سامانی هەیە لێی بستێنن
هەرکەسێك ئامادە نییە بێت
بەڵام ئەوەی مردووە، ناتوانێت بێت))

دوایین وتەی ئەمە بوو: خواوەندا وەك موسوڵمان بممرێنە و پەیوەستی خواپەرەست و خۆپارێزەکانم بکە.

## وەسفی جەستەی ئەبوبەکر

عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: عایشە یەکێك لەعەرەبەکانی بینی کە لەکەژاوەکەی خۆی دانیشتبوو، کاتێك لای عایشە تێپەڕی، وتی: کەس وەك ئەم پیاوە هاوشێوەی ئەبوبەکر نییە.

پێم وت: وەسفی خەلیفەم بۆ بکە.

وتی: پیاوێکی سپی پێست و لاغر بوو، کەمێك چەمابوویەوە و دۆخینەکەی لەسەر کەلەکەی نەدەبەسترا، روخساری ئێسقانی و چاوەکانی بەقوڵا چووبوو، ناوچاوی کورت و دەمارەکانی دەستی دیار بوو.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر سپی زەردباو بوو، باڵایەکی کەمێك چەماوە و ئەندامی ورد، روخساری جوان و لووتی هەڵۆیی، چاوەکانی بەقووڵا چووبوون. مەچەکی باریك و ڕانەکانی قەڵەو بوون. بەحەنا رەنگی دەکرد.

دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر مرد، باوکی زیندوو و لەمەککە دەژیا. کاتێك ئاگادار بوویەوە، وتی: بەڵایەکی گەورەیە.

## ڕەچەڵەکی ئەبوبەکر و ناو وناوبانگی ئەو

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: بۆچوونەکان وەك یەکە، ناوی ئەبوبەکر عەبدوللەیە و پێیان دەوت عەتیق چوونکە روخساری جوان بوو.

دەڵێت: دەستەیەك وتوویانە: بۆیە بەعەتیق ناویان دەبرد چوونکە پێغەمبەر(د.خ) پێی فەرموو: لەئاگر ئازادیت. ئازادیان بەعەتیق ناو دەبرد.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەعایشەیان پرسی: بۆ ئەبوبەکر بەعەتیق ناو دەبەن؟ لەوەڵامدا وتی: رۆژێك پێغەمبەر(د.خ) سەیری کرد و وتی: ئەمە ئازاد کراوی خواوەندە لەئاگر.

دەڵێت: ناوی باوکی ئەبوبەکر، عوسمانە و نازناوەکەی باوکی قوحافە، بەم پێیە، رەچەڵەکی بەمشێوەیە: ئەبوبەکر عەبدوللە کوڕی عوسمان کوڕی عامر کوڕی عەمرۆ کوڕی کەعب کوڕی سەعد کوڕی تیم کوڕی موڕە کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کوڕی غالب کوڕی فێهر کوڕی مالك.

دەڵێت: دایکی ئەبوبەکر دایکی خێر، کچی سەخر کوڕی عامر کوڕی کەعب کوڕی سەعد کوڕی تیم کوڕی موڕە بوو.

واقدی دەڵێت: ناوی ئەبوبەکر عەبدوللەیە کوڕی ئەبو قوحافە، باوکی قوحافە عوسمانە و کوڕی عامر. دایکی ئەبوبەکر ام الخیرە و ناوی سەلمیٰ کچی سەخر کوڕی عامر کوڕی کەعب کوڕی سەعد کوڕی تیم کوڕی موڕەیە.

بەلأم بەوتەی هوشام ناوی ئەبوبەکر عەتیقە، کوڕی عوسمان کوڕی عامر.

عومارە کوڕی غەزیيە دەڵێت: لەعەبدولرەحمان کوڕی قاسم ناوی ئەبوبەکری راستگۆم پرسی. وتی: ناوی عەتیقە. سیٰ برابوون. عەتیق، موعەتیق، وعۆتەیق.

## ژنەکانی ئەبوبەکر

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر لەرۆژگاری جاهلییەت فتیلەی کردە هاوسەری خۆی. واقدی و کەلبی وتەکەی پشتڕاست دەکەنەوە و وتوویانە: فتیلە کچی عوبدولعوزا کوڕی عەبد کوڕی ئەسعەد کوڕی جابر کوڕی مالك کوڕی حوسەل کوڕی عامر کوڕی لوئەی. عەبدوللە و ئەسما لەو ژنە چاویان بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەرۆژگاری جاهلییەت دایکی رۆمانی کردە هاوسەر کەکچی عامر کوڕی عومەیرە کوڕی زوهەل کوڕی رەهمان کوڕی حارس کوڕی غەنەم کوڕی مالك کوڕی کەنانە بوو. عەبدولرەحمان و عایشە لەو ژنە چاویان بەدنیا هەڵهێنا. ئەم چوار منالەی ئەبوبەکر لەو ژنانەن کە لەرۆژگاری جاهلیەت ئەوانی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

لەکاتی ئیسلامدا، ئەبوبەکر ئەسما کچی عەمیسی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد کەپێشتر ژنی جەعفەر کوڕی ئەبی تالیب بوو. ئەو کچی عەمیس کوڕی مەعد کوڕی تیم کوڕی حارس کوڕی کەعب کوڕی مالك کوڕی قوحافە کوڕی عامر کوڕی رەبیعە کوڕی عامر کوڕی مالك کوڕی نەسر کوڕی وەهب الله کوڕی شەهران کوڕی حەلەف کوڕی ئەقتەلە و بەخەسعەمیش ناویان بردووە. ئەبوبەکر لەئەسما، محەممەد کوڕی ئەبی بەکری هێنایە دنیا.

هەروەها لەرۆژگاری ئیسلامیدا، حەبیبە کچی خارجیە کوڕی زەید کوڕی ئەبی زوهەیری حارسی خەزرەجی وەك هاوسەر هەڵبژارد کە لەکاتی مردنی ئەبوبەکر

دووگیان بوو. دوای مردنی ئەو کچێکی هێنایە دنیا و بەناوی دایکی کولسوم.

## ناوی قازی و دەبیرەکان

### و لێپرسراوانی ئەو بۆ کۆکردنەوەی زەکات

مەسعەر دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خەلافەتی گرتەدەست، باوکی عوبەیدە پێی وت: من کاروبارەکانی جەزیە دەگرمە ئەستۆ. عومەر وتی: داوەری کردن لەئەستۆی من. ساڵێك تێپەڕی و کەس نەڕۆشتە لای عومەر.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر عومەری وەك داوەر هەڵبژارد و ساڵێك تێپەڕی و کەس سکالآی نەبردە لای عومەر.

دەڵێت: نوسەری ئەبوبەکر زەید کوڕی سابت بوو. هەواڵەکان عوسمان کوڕی عەفان بۆی دەنووسی. هەرکەس ئامادەبوایە، ئەو کارەی بۆ ئەنجام دەدا. لێپرسراوی ئەبوبەکر لەمەککە، عەتاب کوڕی ئەسید، لەتاییف عوسمان کوڕی ئەبی عاس، لەسەنعا موهاجیر کوڕی ئەبی ئومەییە، لەحەزەرمەوت زیاد کوڕی لوبەید، خەولان یەعلی کوڕی ئومەییە، زوبەید و زەمع، ئەبوموسا ئەشعەری، جوند، مەعاز کوڕی جەبەل، بەحرەین عەلا کوڕی حەزرەمی، جەریر کوڕی عەبدوللەی بۆ نەجران نارد و عەبدوللە کوڕی سوری رەغوسی بۆناوچەی جەرش نارد و عەیاز کوڕی غەنەمی قەهری بۆ دومەت ئەلجوندەل. باوکی عوبەیدە و شورەحبیل کوڕی حەسەنە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیانی و عەمرۆ کوڕی عاس لەشام بوون. هەرکام سەرکردەی سوپایەك و خالید کوڕی وەلید سەرکردەی هەموویان بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەبوبەکر (خوا لێی خۆش بێت) بەخشندە و نەرم و نیان بوو. ڕێزی لەڕەچەڵەکی عەرەبەکان دەگرت.

حەبان کوڕی سایغ دەڵێت: نەخشی ئەنگوستیلەکەی ئەبوبەکر نعم القادر الله بوو.

دەڵێت، باوکی ئەبوبەکر دوای مردنی ئەو شەش مانگ و چەند رۆژ زیندوو بوو و لەموحەڕەمی ساڵی چواردەیەم لەتەمەنی نەوەد و حەوت ساڵی لەمەککە مرد.

ئەبوبەکر لەکاتی نەخۆشی پەیمانی بۆ عومەر وەرگرت تا دوای ئەو ببێتە خەلیفە.

لەگێڕانەوەی واقدی هاتووە: ئەبوبەکر لەکاتی مەرگ کاتێك دەیویست بۆ عومەر پەیمان وەربگرێت، عەبدولرەحمان کوڕی عەوفی بانگ کرد و وتی: لەعومەر ئاگادارم

بکەرەوە.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا، باشتر لەوەیە کەگومان دەکەیت، بەڵام توورەیە.

ئەبوبەکر وتی: توندی ئەو لەبەر ئەوەیە من بەکەسێکی نەرم و نیان دەزانێت، ئەگەر خەلافەت بگرێتەدەست، توند و تیژی پشتگوێ دەخات. ئەی باوکی محەممەد، چەندین جار لێی وردبوومەتەوە، کاتێك لەکەسێك توورە دەبم داوام لێدەکات نەرم و نیانی لەگەڵ بکەم و کاتێك ڕێگەی نەرمی لەگەڵ کەسێك دەگرمەبەر، ڕێگەی توند وتیژیم نیشان دەدات. ئەی باوکی محەممەد ئەوەی باسم کرد، لای کەس باسی مەکە.

عەبدولرەحمان وتی: باسی ناکەم.

ئەبوبەکر عوسمان کوڕی عەفانی بانگ کرد و وتی: ئەی باوکی عەبدوللە! سەبارەت بەعومەر قسە بکە.

وتی: تۆ باشتر دەزانیت.

ئەبوبەکر وتی: ئەی باوکی عەبدوللە، باسی بکە.

وتی: سوێند بەخوا بێ گومانم لەوەی ناخی لەرووکەش پاکترە و لەناو ئێمەدا کەس وەك ئەو نییە.

ئەبوبەکر وتی: خوا بتبەخشێت، ئەی باوکی عەبدوللە، ئەوەی باسمان کرد، باسی مەکە.

وتی: ئەو کارە دەکەم.

ئەبوبەکر بەعوسمانی وت: ئەگەر چاوپۆشیم لەو دەکرد تۆم دەکردە خەلیفە، ئەگەری هەیە عومەر بەخەلافەت رازی نەبێت، خێری لەوەدایە کاروباری ئێوە نەگرێتە دەست، چەندە خۆش بوو ئەگەر منیش رازی نەدەبووم و یەکێك بووم لەکوژراوەکانی ئێوە. ئەی باوکی عەبدوللە، ئەوەی سەبارەت بەعومەر باسم کرد، لای کەس باسی مەکە.

باوکی سەفەر دەڵێت: ئەبوبەکر لەسەرئاو هاتەدەر، ئەسما کچی عەمیس دەستی گرتبوو، دەستی ئەسما خاڵکوتی پێوەی دەبینرا، ئەبوبەکر وتی: ئایا ئەو کەسەی دەیکەم بەخەلیفەی ئێوە، پەسەندی دەکەن؟ سوێند بەخوا لەم کارە وردبوومەوە و خەلافەتم نەدا بەکەس و کارەکەی خۆم، عومەر کوڕی خەتابم وەك خەلیفەی ئێوە هەڵبژارد، گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانەکانی بن.

وتیان: بیسمان وگوێرایەڵین.

قەیس دەڵێت: عومەر کوڕی خەتابم بینی، دانیشتبوو. کەسانێکی لای ئەو دانیشتبوون. عومەر دارێکی بەدەستەوە بوو، دەیوت: ئەی خەڵکینە، گوێ لەوتەکانی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ) بگرن چوونکە دەڵێت: بۆ خێری ئێوە هەوڵمداوە.

دەڵێت: شەدید کۆیلەی ئەبوبەکر لەگەڵ عومەردابوو. نوسراوی خەلافەتی عومەری هەڵگرتبوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی، ئەبوبەکر عوسمانی بانگ کرد و وتی:

((بنووسە بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە پەیمانی ئەبوبەکر خەلیفەی پێغەمبەرە بۆ موسوڵمانان...

دەڵێت: ئەبوبەکر لەهۆش خۆی چوو وعوسمان نووسی: من عومەر کوڕی خەتابم وەك خەلیفەی ئێوە هەڵبژارد و خێری ئێوەم دەویست.

ئەبوبەکر هاتەخۆ و وتی: بیخوێنە بزانم چیت نووسیوە.

کاتێك عوسمان خوێندییەوە، ئەبوبەکر ناوی خوای هێنایە سەرزمان و وتی: سوێند بەخوا ترسایت ئەگەر لەم بێهۆشییە رزگارم نەبێت، خەڵکان لەسەر ئەو کارە کێشەیان بۆ دروست ببێت.

عوسمان وتی: بەڵێ.

وتی: خواوەند لەلایەن ئیسلام و موسوڵمانانەوە پاداشتی چاکەت بداتەوە.

لەگێڕانەوەی یونس کوڕی عەبدولعەلی هاتووە: عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەکاتی نەخۆشی ڕۆشتە لای ئەبوبەکر. ئەوی بەخەمبار بینی و وتی: سپاس بۆ خوا باش بوویتەوە؟

ئەبوبەکر وتی: بەراستە؟

وتی: بەڵێ.

وتی: کاری ئێوەم بەکەسێك سپارد گومان دەکەم لەهەموان باشتر بێت، هەرکامتان دەتانویست، خەلافەت بگرنە دەست چوونکە بەدوای بەخت و شانسەکانی ئەم دنیایە دەگەڕان بەلأم بەختەوەری دنیا دوای ئەمەیە کاتێك پەردەی حەریر و گرانباییتان هەبێت، لەخەوتن لەسەر پەڕۆی زبری ئازەری نیگەران و ناڕاحەت نەبن وەك بڵێی لەسەر چقڵ خەوتوون. سوێند بەخوا ئەگەر یەکێك لەئێوە بێنن و بێ گوناح بیکوژن، باشترە لەوەی باوەش بۆ دنیا بکەنەوە. بەیانی دەبنە یەکەم گومڕاکەرانی خەڵك و ئەوان

لەرێگەی راست بەلارێدا دەبەن چوونکە رێبوار یا بەرێگەی راستدا دەڕوات یا رێگەی پڕ مەترسی.

عەبدولرەحمان دەڵێت: پێم وت: خوا بتبەخشێت، ئارام بە با دووبارە نەخۆش نەکەویت، خەڵك لەگەڵ تۆ دوو جۆرن، دەستەیەکیان هاوڕای بۆچوونەکەی تۆ و دەستەیەك دژی تۆیە لەتۆ و هاورێکەت فەرمان دەبەن، تۆ بەردەوام چاکەکار بوویت و لەوەی روویداوە، خەمت نییە.

ئەبوبەکر وتی: بەڵێ لەوەی روویداوە، ترس و خەمم نییە جگە لەسێ کار کەکردم و باش دەبوو ئەگەر نەمدەکرد و سێ کارم نەکرد و باش دەبوو ئەگەر دەمکردن و سێ پرس کەخۆزگە لەپێغەمبەرم دەپرسی.

ئەو سێ کارەی حەزم دەکرد نەمکردایە: خۆزگە ماڵی فاتیمەم نەدەکردەوە ئەگەر تەنانەت بەمەبەستی شەڕ دایاندەخست. خۆزگە فەجای سولەمیم بەزیندووی لەئاگردا نەدەسووتاند، یا دەمکوشت یا ئازادم دەکرد، خۆزگە لەرۆژەی سەقیفەی مناڵەکانی ساعیدە، خەلافەتم بەعومەر یا باوکی عوبەیدە دەسپارد تا یەکیان ببێتە ئەمیر و منیش وەزیر.

بەلاّم ئەو سێ کارەی نەمکرد: خۆزگە ئەو کاتەی ئەشعەسیان بەئەسیری هێنایە لای من، سەرم دەپەڕاند چوونکە گومان دەکەم لەهەر شوێنێك شەڕ ببینێت، هاوکاری دەکات، خۆزگە کاتێك خالید کوڕی وەلیدم بۆ شەڕی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان دەنارد، لەزو ئەلقسە دەمامەو بۆ ئەوەی ئەگەر موسوڵمانەکان سەرکەوتنیان بەدەست نەدەهێنا، ئامادەی جەنگ و هاوکاری ئەوان بم. خۆزگە کاتێك خالید کوڕی وەلیدم بۆ شام نارد، عومەر کوڕی خەتابیشم بۆ عێراق دەنارد تا هەردوو دەستەکەی خۆم لەرێگا خوادا کردبێتەوە.

دەڵێت: لێرەدا دەستی خۆی درێژ کرد و دووبارە وتی: خۆزگە سەبارەت بەخەلافەت لەپێغەمبەر پرسیارم دەکرد تا کەس لەسەر ئەو کێشە و شەڕ دروست نەکات، خۆزگە لە پێغەمبەرم دەپرسی ئایا ئەنسارییەکان لەم کارەدا بەشیان هەیە؟ خۆزگە سەبارەت بەمیراتی خوشکەزا و پورەکان پرسیارم لێدەکرد چوونکە لەو بارەوە دڵنیا نیم.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەبوبەکر پێش ئەوەی کاروباری خەلافەت بگرێتەدەست، بازرگانی دەکرد و ماڵەکەی لەسەنح و دوای ئەوە لەمەدینە نیشتەجێ بوو.

عایشە دەڵێت: باوکم لەسەنح لای هاوسەرەکەی حەبیبە کچی خاریجە کوڕی زەید کوڕی ئەبی زوهەیر حارسی خەزرەجی دەمایەوە. دوو ژووری دروست کردبوو و بەگەڵای دارخورما دایانپۆشیبوو. هیچی پێ زیاد نەکرد تا هاتەماڵەکەی خۆی لەمەدینە. دوای ئەوەی بەیعەتیان لەگەڵ بەست بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەنح مایەوە و بەرەبەیانان بەپێ دەهات بۆ مەدینە، هەندێ کاتیش سوار ئەسپەکەی خۆی دەبوو. دەهاتە مەدینە و نوێژی لەگەڵ خەڵکان دەخوێند و دوای نوێژی ئێواری دەگەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی. هەرکات لەمەدینە بوایە، پێشنوێژی بۆ خەڵکان دەکرد و لەئەگەری ئامادە نەبوونی ئەو عومەر کوڕی خەتاب پێشنوێژ بوو.

دەڵێت: ڕۆژانەی هەینی، سەرەتای ڕۆژی لەماڵەوە بەسەر دەبرد، سەروریشی خۆی ڕەنگ دەکرد و دواتر بۆ نوێژی هەینی ڕووی دەکردە مەدینە.

دەڵێت: پیاوێکی بازرگان بوو. هەموو ڕۆژێك بەیانی دەڕۆشتە بازار و ئاڵوگۆڕی دەکرد. ڕانە مەڕێکی بوو. شەوانە دەڕۆشتە لایان و هەندێ کات خۆی دەیبردن بۆ لەوەڕاندن. هەندێ کات کەسانی دیکە ئەو کارەیان بۆ دەکرد. پێشتر مەڕی خەڵکانی دەدۆشی و کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، یەکێك لەکچەکانی خەڵکان وتی: ئێستا چیتر ئاژەڵە شیردەرەکانی ئێمە نادۆشێت.

دەڵێت: ئەبوبەکر بیستی و وتی: بۆنا، مەڕەکانتان بۆ دەدۆشم و هیوادارم خەلافەت گۆڕانکاری بەسەر مندا نەهێنێت. بەهەمان شێوە مەڕی خەڵکی دەدۆشی و هەندێ کات بەیەکێك لەکچەکانی دەوت: دەخوازیت مەڕەکانت بۆ بدۆشم یا بیانبەم بۆ لەوەڕین؟ هەندێ کات دەیوت: بیانبە و هەندێ کات دەیوت: بیاندۆشە. ئەبوبەکر بەقسەی دەکرد.

دەڵێت: شەش مانگی بەمشێوەیە لەسەنح بەسەر برد. دوای ئەوە هاتە مەدینە و لەوێ ماڵی گرت. سەیری کارەکانی خۆی کرد و وتی: سوێند بەخو، بەبازرگانی کردن کاروباری خەڵك بەڕێوەنابرێت، دەبێت بەئاسوودەییەوە ئەو کارە ئەنجام بدرێت. بازرگانی پشتگوێ خست. ڕۆژانە لەماڵی موسوڵمانان بەئەندازەی بژێوی خۆی هەڵدەگرت وخەرجی حەج و عەمرەیشی دەکرد. ئەوەی بۆی دیاری کرابوو، ساڵانە شەش هەزار درەم بوو. کاتێك لەمردن نزیك کەوتەوە، وتی: ئەوەی لەماڵی موسوڵمانان لای ئێمەیە، بیگەڕێننەوە و هیچی لای من نەمێنێت، ئەو زەوییەی لەفلان شوێندایە لەلەبەرابەر ئەوەی وەرمگرتووە، تایبەتە بەموسوڵمانان. زەوییەکەی تەسلیمی عومەر کرد لەگەڵ ئاژەڵێکی هیلکەکەر و کۆیلەیەکەی پیشگەر و قەتیفەیەك بەبەهای پێنج درەم.

عومەر وتی: ڕەنجی ماڵ و منداڵەکەی زیاد کرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر وتی: بزانن لەو کاتەوەی خەلافەتم گرتۆتە دەست تا ئێستا، چەندەم لەماڵی موسوڵمانان هەڵگرتووە و لەلایەن منەوە بیدەنەوە. ئەو برە پارەی هەڵیگرتبوو، هەشت هەزار درەم بوو.

ئەسما کچی عەمیس دەڵێت: تەڵحە کوڕی عوبەیدالله ڕۆشتە لای ئەبوبەکر و وتی: عومەرت کردە خەلیفەی خەڵکان، نابینی بەبوونی تۆ چی لەدەستی ئەو دەکێشن، کاتێك کاروبارەکان بگرێتەدەست چی دەکات؟ دەڕۆیتە پێشگای خواوەند و لەمبارەوە پرسیارت لێدەکات.

دەڵێت، ئەبوبەکر راکشابوو، وتی: هەڵمستێنن. کاتێك هەڵیانساند و دانیشت، بەتەڵحەی وت: من لەخوا دەترسێنیت! کاتێك دەڕۆمە پێشگای خواوەند و کاتێك لەمن بپرسێت، دەڵێم باشترین کەسی تۆم کردە خەلیفە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر باسی ئەوەمان کرد ئەبوبەکر چ کاتێك پەیمانی خەلافەتی بۆ عومەر مووسی وچ کاتێك مرد و ئەوەی کەعومەر نوێژی لەسەر خوێند و هەمان شەو، بەخاك سپێردرا.

دەڵێت: بەرەبەیان یەکەم کاری عومەر ئەوە بوو کە جامیع کوڕی شەداد باسی دەکات: کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: من دۆعا دەکەم و ئێوە بڵێن ئامین.

بەڵام لەگێڕانەوەی زەرار کوڕی حوسینی موڕی هاتووە: یەکەم وتەکانی عومەر ئەمە بوو: نموونەی عەرەبەکان هاوشێوەی وشتری سەرکێشە و بەدوای ئەو کەسەدا دەڕوات کەرایدەکێشێت، ئەوەی رایاندەکێشت دەڕوانێت بزانێت بۆ کوێیان راکێشێت، بەڵام سوێند بەخوای کەعبە، بۆ ڕێگەی راستیان دەبەم.

سالح کوڕی کەیسان دەڵێت: یەکەم نامەی سەردەمی خەلافەتی عومەر ئەوە بوو باوکی عوبەیدەی کردە سەرکردە و وتی: پێشنیار دەکەم لەخوا ترس بیت چوونکە ئەو دەمێنێتەوە و هەموو شتەکان لەناو دەچێت، ئەو خوایەی ئێمەی لەتاریکی رزگار و بۆ رووناکی ڕێنوێنی کردین، کاری سوپاکەی خالید کوڕی وەلیدم بەتۆ سپارد، بەشێوەیەکی دادپەروەرانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکە و موسوڵمانان بۆ بەدەست هێنانی تالانی رووبەرووی مەترسی مەکەرەوە و پێش ئەوەی بۆ شوێنێك رەوانەیان

بکەیت، بەباشی لێکۆڵینەوە لەهەموو وردەکارییەکان بکە. خواوەند تۆی گیرۆدەی من و منی گیرۆدەی تۆ کرد، چاو لەدنیا بپۆشە و باوەشی بۆ مەکەرەوە، ئاگادار بەوەك رابردووان کەلەناوچوون و شوێنی لەناوچوونی ئەوانت بینیوە، لەناو نەچیت.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: شەداد کوڕی ئەوس کوڕی سابتی ئەنساری و مەحمییە کوڕی جەز و یەرفأ بەهەواڵی مەرگی ئەبوبەکر هاتنە شام بەڵام هەواڵەکەیان بڵاو نەکردەوە تا ئەو کاتەی موسوڵمانان لەشەڕی واقوسە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ئەمە لەمانگی رەجەبدا بوو. دواتر باوکی عوبەیدەیان لەمەرگی ئەبوبەکر و خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب ئاگادار کردەوە. هەروەها پێیان راگەیاند سەرکردایەتی سوپاکەی بەو سپاردووە و سەرکردەکانی دیکە پەیوەستی ئەو و خالید کوڕی وەلیدی لەسەر کارلابردووە.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: موسوڵمانەکان دوای تەواو بوون لەئەجنادین روویان کردە فەحل لەسەرزەمینی ئەردەن. دەستە بڵاوەکانی سەرزەمینی رۆم لەوێ کۆببوونەوە. موسوڵمانەکان لەگەڵ سەرکردەکانی خۆیان بوون. خالید لەپێشەوەی سوپاکەبوو. کاتێك رۆمییەکان لەبیسان دابەزین، ئاوی رووبارەکانیان بەردایەوە، زەوییەکە سوێرەڵان و بوو بەقوڕ.

رۆمییەکان لەنێوان فەحل و بیسان لەنێوان فەلەستین وئەردەن جێگیر بوون و کاتێك موسوڵمانەکان گەیشتنە بیسان و لەکاروباری رۆمییەکان ئاگادار بوونەوە، ئەسپەکانیان چەقی و گرفتاری رەنج و دژواری بوون. خواوەند رزگاری بەخشین و بیسانیان بە ذات الردغە – قوڕەلاّن، شوێنێك قوڕ بێت و قاچ بچەقێت—ناوبرد لەبەر ئەوەی موسوڵمانان رەنجی زۆریان پێبرا.

دوای ئەوە موسوڵمانان لەفەحل رووبەرووی رۆمییەکان بوونەوە و شەڕیان دەسپێکرد. رۆمییەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانەکان رۆشتنە ناو فەحل. سوپا پرژ و بڵاوەکەی رۆم رووی لەدیمەشق کرد.

شەڕی فەحل لەزیقەعدەی ساڵی سیانزەیەمی کۆچ، حەوت مانگ دوای دەسپێکردنی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب روویدا. لەم ساڵەدا عەبدولرەحمان کوڕی عەوف سەرپەرەستی حەج و حاجییەکان بوو.

دوای شەڕی فەحل، موسوڵمانان روویان لەدیمەشق کرد. خالید لەپێشەوەی سوپاکەدا بوو. رۆمییەکان لەدیمەشق لەدەوری پیاوێکی رۆمی بەناوی باهان

کۆبوونەوە. عومەر کوڕی خەتاب سەرکردایەتی لەخالید کوڕی وەلید سەندبوویەوە و باوکی عوبەیدەی جەڕاحی بۆ ئەو مەبەستە دیاری کردبوو. موسوڵمانەکان و ڕۆمییەکان لەدەوروبەری دیمەشق ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. خواوەند شکستی بەڕۆمییەکان بەخشی و موسوڵمانان کەسانێکی زۆریان لەوان کوشت. ڕۆمییەکان ڕۆشتنە ناو دیمەشق و دەروازەکانیان بەست. موسوڵمانەکان گەمارۆیان خستە سەر شارەکە تا ئەو کاتەی دەستی بەسەردا گیرا و جەزیەیاندا.

لەم کاتەدا نامەی عومەر کوڕی خەتاب بۆ سەرکردایەتی باوکی عوبەیدەی جەڕاح گەیشتبوو، بەڵام باوکی عوبەیدە شەرمی دەکرد نامەکە بۆ خالید بخوێنێتەوە. نامەکەی نەخوێندەوە تا ئەو کاتەی دیمەشق دەستی بەسەردا گیرا و پەیمانی ئاشتی لەسەر دەستی خالید و بە ناوی ئەوەوە نووسرا.

کاتێک دیمەشق پەیمانی ئاشتی بەست، باهان سەرکردەی ڕۆمییەکان کەشەڕی لەگەڵ موسوڵمانەکان کردبوو، پەیوەستی هێرقل بوو. گرتنی دیمەشق لەساڵی چواردەیەمی کۆچ و لەمانگی ڕەجەب ڕوویدا.

دوای پەیمانی ئاشتی، باوکی عوبەیدە سەرکردایەتی خۆی ئاشکرا و خالیدی لەسەر کار لابرد.

موسوڵمانەکان و ڕۆمییەکان لەشاری عەین فەحل ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕێکی قورسیان کردبوو. دوای ئەوە ڕۆمییەکان ڕوویان لەدیمەشق کرد.

بەڵام لەگێڕانەوەی باوکی عوسماندا هاتووە: موسوڵمانان لەیەرموك و لەگەڵ ڕۆمییەکان شەڕیان دەکرد کەنێردراو هات و هەواڵی مەرگی ئەبوبەکر و سەرکردایەتی باوکی عوبەیدەی هێنا. داستانی یەرموك و داستانی دیمەشق لەم گێڕانەوەدا جیاوازە لەوەی لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقدا هاتووە. ئێمە، ئاماژە بەبەشێکی دەدەین.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەخالید کوڕی سەعید و وەلید کوڕی عوقبە ڕازی بوو وئەوانی بەخشی، مۆڵەتی پێدان بێنە ناو مەدینە چوونکە بەهۆی هەڵاتنیان لەگۆڕەپانی شەڕ، ئەبوبەکر ڕێگەی نەدەدان بێنە ناو شارەکە وئەوانی بۆ شام گەڕاندەوە و وتبووی: دەبێت هەوڵ بدەن و ڕەنجتان پێببڕێت، بەدڵخوازی خۆتان پەیوەستی سوپای یەکێك لەئەمیرەکان بن. ئەوان پەیوەستی سوپاکەی شام بوون.

## شەڕی دیمەشق بەگێڕانەوەیەکی جیاواز

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك خواوەند سوپای ڕۆمی لەیەرموك شکست پێهێنا و خەڵکی واقوسە بڵاوەیان لێکرد و تالآنییەکان دابەش کرا و پێنج یەکیان بۆ ئەبوبەکر نارد، نێردراوان بەرێکەوتن. باوکی عوبەیدە بەشیر کوڕی کەعبی حەمیری لەیەرموك بەجێهێشت تا لەگەڕانەوەی دوژمن بێ ئاگا نەبێت و ڕێگەکەی لێ نەبەستن. خۆی لەگەڵ سوپاکەی بەمەبەستی سەفەر بەرێکەوت. دەیویست شوێن هەڵاتووان بکەوێت بەڵام نەیدەزانی کۆبوونەوە یا پرژ و بڵاون. هەواڵی پێگەیشت کەروویان لەفەحل کردووە.

هەروەها ئاگادار بوویەوە خەڵکانی دیمەشق لەحیمسەوە هاوکارییان پێگەیشتووە. نەیزانی بەرەو دیمەشق بڕوات یا فەحل لەئەردەن. لەمبارەوە نامەی بۆ عومەر نووسی و چاوەرانی وەڵامی کرد. کاتێك عومەر لەسەرکەوتنی یەرموك ئاگادار بوویەوە، سەرکردەکانی بەهەمان شێوەی ئەبوبەکر هێشتەوە جگە لەعەمرۆ کوڕی عاس و خالید کوڕی وەلید کەخالیدی پەیوەستی سوپاکەی باوکی عوبەیدە کرد و فەرمانی بەعەمرۆدا هاوکاری خەڵکانی دیکە بکات تا ئەو کاتەی شەڕدەگاتە ناوچەکانی فەلەستین و دواتر کاروبارەکانی ئەو سەرزەمینە لەئەستۆ بگرێت.

بەڵام لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەکاری خالید کوڕی وەلید و لەسەر کار لابرانی لەلایەن عومەر کوڕی خەتاب بەمشێوە هاتووە: عومەر بەهۆی ئەو قسەی خالید کردبووی، لێی تووڕە بوو و لەهەموو ڕۆژگاری ئەبوبەکر بەهۆی کوشتنی مالك کوڕی نەویرە و هەروەها بەهۆی هەڵس و کەوتی خالید لەکاروباری جەنگ لێی بێزار بوو، کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، یەکەم وتەی سەبارەت بەسەر کار لابردنی خالید بوو، وتی: هەرگیز لەلایەن منەوە هیچ کارێکی پێناسپێردرێت. نامەی بۆ باوکی عوبەیدە نووسی، ئەگەر خالید حاشای لەوتەکانی خۆی کرد سەرکردەی سوپا بێت وئەگەر حاشای نەکرد، تۆ سەرکردەیت و عەمامە لەسەری هەڵگرە و دەست بەسەر نیوەی سامانەکەیدا بگرە.

کاتێك باوکی عوبەیدە ئەمەی لای خالید باس کرد، خالید وتی: مۆڵەتم پێبدە تا لەگەڵ خوشکەکەم ڕاوێژ بکەم. باوکی عوبدیدە مۆڵەتی پێدا. خالید ڕۆشتە لای خوشکەکەی فاتیمە کچی وەلید کەژنی حارس کوڕی هوشام بوو. لەرووداوەکە ئاگاداری

کردەوە.

فاتیمە وتی: سوێند بەخوا هەرگیز عومەر نابێتە هاوڕێی تۆ، دەیەوێت حاشا لەوتەکانی خۆت بکەیت، ئەوسا تۆ لەسەر کار لاببات.

خالید سەری خوشکەکەی ماچ کرد و وتی: سوێند بەخوا ڕاست دەکەیت. پێداگری لەسەر کارەکەی خۆی کرد و لەحاشا کردن لەوتەکانی، خۆی بەدوور گرت.

بیلال کۆیلەی ئەبوبەکر هاتە لای باوکی عوبەیدە و وتی: سەبارەت بەخالید چ فەرمانێکت پێیە؟

وتی: فەرمانم پێدراوە دەستارەکەی لەسەر لابەرم و دەست بەسەر نیوەی سامانەکەیدا بگرم. نیوەی سامانەکەی گرت تا پێپۆشەکانی مایەوە، باوکی عوبەیدە وتی: ئەم تاکە پێڵاوە بێ ئەوەی دیکەیان کەڵکی نییە.

خالید وتی: بەڵێ، بەڵام کەسێك نیم نافەرمانی سەروەری باوەڕداران بکەم، هەرچی دەخوازیت ئەنجامی بدە. باوکی عوبەیدە تاکێکی پێڵاوەکەی هەڵگرت و تاکێکی دایەوە بەخالید. خالیدی لەسەر کار لابراو لەمەدینە ڕۆشتە لای عومەر.

دەڵێت: عومەر هەرکاتێك لای خالید تێپەڕی دەکرد، دەیوت: ئەی خالید ماڵی خوا لەژێر ڕاخەرەکەت دەربێنە.

خالید دەیوت: سوێند بەخوا هیچم لا نییە.

کاتێك عومەر بەردەوام ئەم قسەی دووبارە دەکردەوە، خالید پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، سوێند بەخوا ئەوەی لەحکومەتەکەی ئێوە بەدەستم هێناوە، چل هەزار درهەم ناژێت.

عومەر وتی: هەموویم بەچل هەزار درهەم لەتۆ کڕی.

خالید وتی: بۆ تۆ.

وتی: بۆ من.

دەڵێت: خالید جگە لەسیلاح و بەندە هیچی نەبوو، کاتێك خەملاندیان، هەشتا هەزار درهەم دەژیا، عومەر چل هەزار درهەمی پێدا و دەستی بەسەر سامانەکەی ئەودا گرت.

بەعومەریان وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، باشترە سامانەکەی بۆ بگەڕێنیتەوە.؟

عومەر وتی: ئەو کارەم بۆ موسوڵمانان کردووە، سوێند بەخوا هیچ کات بۆی ناگەڕێنمەوە.

عومەر کاتێك ئەم کارەی کرد، گومانی کرد توانیوویەتی تۆڵە لەخالید بستێنێتەوە.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك نامەی باوکی عوبەیدە بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەپرسیبووی: لەکوێوە دەست پێبکات؟ عومەر لەوەڵامدا نووسی: سەرەتا لەدیمەشقەوە دەست پێبکەن و بڕۆنە ئەوێ چوونکە قەڵای شام وماڵی پاشاکانی شامە. سوپایەك ڕەوانە بکە تا لەبەرابەر خەڵکانی فەحل و فەلەستین و حیمس بێت، ئەگەر خواوەند فەحلی پێش دیمەشق بەئێوە بەخشی، باشتر و ئەگەر گرتنی ئەو دواکەوت و دیمەشق دەستی بەسەردا گیرا، یەکێك بۆ پاراستنی دیمەشق بمێنێتەوە و تۆ و سەرکردەکانی دیکە هێرش بکەنە سەر فەحل و ئەگەر دەستتان بەسەر ئەو سەرزەمینەدا گرت، لەگەڵ خالید ڕووبکەنە حیمس و شورەحبیل و عەمرۆ لەئەردەن و فەلەستین بەجێ بێڵە. سەرکردەی هەر سوپا و هەر ویلایەتێك، سەرکردایەتی سوپاکەی خۆی بکات تا لەویلایەتەکەی ئەو دەڕۆنەدەر.

باوکی عوبەیدە دەکەس لەسەرکردەکانی خەڵك، باوکی ئەعوەری سولەمی، عەبد عەمرۆ کوڕی یەزید کوڕی عامر

جورشەمی، عامر کوڕی حەسمە، عەمرۆ کوڕی کەلیبی یەحسبەی، عومارە کوڕی سەعق کوڕی کەعب، سەیفی کوڕی عەلبە کوڕی شامل، عەمرۆ کوڕی حەبیب کوڕی عەمرۆ، وەلیدە کوڕی عامر کوڕی خەسعەمە، بیشر کوڕی عیسمە و عومارە کوڕی مەخشی ڕەوانە کرد. هەرکامیان پێنج سەرکردەی دیکەی لەگەڵدا بوو.

سەرکردەکان لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بوون مەگەر ئەو کەسانەی نەیاندەتوانی کاروبارەکان ڕاپەڕێنن. هەموویان لەسەفەرەوە بەرێکەوتن و لەنزیك فەحل دابەزین. کاتێك ڕۆمییەکان ئاگادار بوونەوە سوپای موسوڵمانان مەبەستی هێرشی کردنیان هەیە، ئاوی دەوروبەری فەحلیان بەردایەوە و زەوی بوو بەقوڕ. موسوڵمانان کەوتنە ڕەنجەوە و خەڵکانی فەحل هەشتا هەزار سوار بوون، لەهێرشی ئەوان پارێزران. خەڵکانی فەحل یەکەم خەڵکان بوون لەسەرزەمینی شام خۆیان لەپشت قەڵاکانەوە حەشاردا. دوای ئەوان خەڵکانی دیمەشق ئەو کارەیان کرد.

باوکی عوبەیدە زو ئەلکەلاعی نارد تا لەنێوان دیمەشق و حیمس پشتیوانی موسوڵمانان بێت. عەلقەمە کوڕی حەکیم و مەسروقیشی ڕەوانە کرد تا لەنێوان دیمەشق و فەلەستین بن. سەرکردەی سوپای ئەو ناوچە یەزید بوو. هات و باوکی عوبەیدەیش لەمەرجەوە هات. خالید کوڕی وەلیدیش پەیوەستیان بوو. سوپای عەمرۆ و باوکی

عوبەیدە، لەملاولای سوپاکەی ئەودا جێگر بوون. عەیاز سەرکردەی سوارەکان و شورەحبیل کوڕی حەسەنە سەرکردەی پیادەکان بوو. هەموویان ڕوویانکردە دیمەشق کەسەرکردەکەی نەستاس کوڕی نەستوس بوو. گەمارۆیان خستە سەرشارەکە و لەدەوری شارەکە ئوردوویان لێدا. باوکی عەمرۆ لەقۆڵێك و عەمرۆ لەقۆڵێك و یەزید لەقۆڵێکدا بوو.

لەم کاتەدا هێرقڵ لەحیمس بوو. شاری حیمس لەنێوان ئەوان و موسوڵمانەکان جیایی دروست کردبوو. بۆ ماوەی حەفتا ڕۆژ گەمارۆیان خستە سەر دیمەشق. هێرشی سوپا و تیرهاویشتن و مەنجەنیق بەکاردەبران. دیمەشقییەکانی ناو شارەکە چاوەڕوانی هاوکاری بوون. هێرقل لێیان نزیك و داوای هاوکارییان لێکردبوو. زوئەلکەلاع لەیەك مەنزڵی دیمەشق لەنێوان سوپای موسوڵمانان و حیمس ئوردوی لێدابوو. وای نیشاندەدا دەیەوێت هێرش بکاتە سەر حیمس. سوارەکانی هێرقل بۆ هاوکاری خەڵکانی دیمەشق هاتن. سوپاکەی زو ئەلکەلاع هێرشی کردە سەریان وڕێگر بوون لەگەیشتنی ئەوان بۆ ناو شارەکە. گەڕانەوە و لەبەرابەر ئەو ئوردوویان لێدا. کاتێك خەڵکانی دیمەشق لەهاتنی سوپای هاوکاری بێ هیوا بوون، لاواز و خەمبار بوون. موسوڵمانان هیوادار بوون خۆیان بدەن بەدەستەوە.

خەڵکان دیمەشق گومانیان کرد بوو ئەم هێرشەیش هاوشێوەی شەڕەکانی پێشوو و کاتێك وەرزی سەرما بگات، دوژمن شوێنەکەی خۆی بەجێدێڵێت بەڵام زستان هات وعەرەبەکان لەشوێنی خۆیان بوون. چتیر هیوایان نەما و لەوەی خۆیان لەناو دیواری شارەکەدا حەشارداوە، پەشیمان بوونەوە.

لەم ناوەدا بەترێقێك لەسەرکردەکانی دیمەشق، کوڕێکی بۆ هاتە دنیا. خواردنێکی ئامادە و خەڵکان خواردیان و خواردیانەوە. ئاگایان لەپێگە و شوێنەکانی خۆیان نەما. لەموسوڵمانان کەس بەمەی نەزانی جگە لەخالید چوونکە هیچ کارێکی دوژمن لەچاوی ئەو شاراوە نەبوو. سیخوڕەکانی بەردەوام هەواڵەکانیان بۆ دەهێنا و ئاگای لەدەوروبەری خۆی بوو. تەناف و کەمەندی هاوشێوەی پەیژە ئامادە کرد.

بۆ شەوی ئەو ڕۆژە لەگەڵ دەستەیەك لەشەڕکەرانی خۆی بەرێکەوت. خۆی و قەعقاع کوڕی عەمرۆ و مەزعور کوڕی عودەی وکەسانێکی هاوشێوەی خۆیان لەپێشەوە بوون، وتیان: کاتێك لەسەر دیوارەکە دەنگی تەکبیری ئێمەتان بیست، وەرنەسەر و بۆ لای

دەرگاکە بڕۆن. کاتێك خالید و هاوەڵانی گەیشتنە لای دەرگاکە، تەنافەکانیان هەڵدایەسەر، ئەو مەشکانەی بەهۆیەوە لەخەندەکەکە پەڕیبوونەوە، بەپشتیانەوە بوو. دوو کەمەند بەدیوارەکەوە گیری کرد. قەعقاع و مەعور سەرکەوتن و تەناف و کەمەندەکانی دیکەیان بەدیوارەکەوە گیر کرد. ئەو شوێنەی هێرشیان کردە سەر بەهێزترین شوێنی شارەکە بوو و زیاتر لەهەموو شوێنێك ئاوی لێ بوو. ڕۆشتن بۆ ئەو شوێنە دژوارو پڕ مەترسی دەهاتە بەرچاو. کەسان یەك لەدوای یەك هاتن و کەس لەهاوەڵانی خالید نەمایەوە مەگەر ئەوەی سەرکەوت و لەدەرگاکە نزیك کەوتەوە.

کاتێك لەسەر دیوارەکە جێگیر بوون، هەموویان ڕۆشتنە خوار. خالید لەگەڵ ئەوان دابەزی وکەسانێکی دانا تا ئەو شوێنە بۆ ئەو کەسانەی سەردەکەون، بپارێزن و فەرمانی پێدان تەکبیر بڵێن، ئەوانەی لەسەر دیوارەکان بوون، بانگی تەکبیریان بەرز کردەوە و موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر دەرگاکە و ژمارەیەکی زۆر خۆیان بەتەنافەکانەوە هەڵواسی. خالید گەیشتە یەکەم ڕیزی بەرگریکاران و ئەوانی کوشت. ڕووی کردە دەروازەکە و دەروازەوانەکەی کوشت. جموجۆڵ لەناو خەڵکانی شارەکە دروست بوو. خەڵکان بۆ شوێن و پێگەکانی خۆیان گەڕانەوە بەڵام نەیاندەزانی چی ڕوویداوە. خالید و هاوەڵانی کڵێونی دەرگاکانیان بەشمشێر قرتاند و دەرگایان بۆ موسوڵمانان کردەوە. هاتنە ناوشارەکە و هێرشیان کردە سەردوژمن بەشێوەیەك هەموو بەرگریکارەکانی دەروازەکەی خالید کوژران.

کاتێك خالید هێرشی کردە سەر کەسانی نزیکی خۆی و بەسەر ئەواندا سەرکەوت، ئەوانەی ڕزگاریان ببوو، ڕوویان لەدەروازەکانی دیکە کرد. پێشتر موسوڵمانان پێشنیاری ئاشتییان پێدەکردن بۆ ئەوەی ئاشتی سەقامگیر بێت و سامانەکان دابەش بکەن بەڵام ڕازی نەبوون و لەناکاو خوازیاری ئاشتی بوون و موسوڵمانان ڕازی بوون. دەرگاکانیان کردەوە و وتیان: وەرن و ئێمە لەبەرگریکارانی ئەم دەروازەیە بپارێزن.

هێرشبەرانی سەر هەر دەروازەیەك بەئاشتی هاتنە ناو شارەکە بەڵام خالید بەشەڕ. خالید و سەرکردەکانی دیکە لەناوەڕاستی شار یەکیانگرتەوە. ئەمان بەکوشتار و تاڵانی و ئەوان بەئاشتی و ئارامی. ناوچەکەی خالیدیان لەناو پەیمانی ئاشتییەکەدا جێگە کردەوە و ئاشتی بەرقەرار کرا.

ئاشتی دیمەشق لەسەر بنەمای دابەش کردنی دینار و ماڵ بوو. یەك دیناری سەرانە و سامانە تاڵان کراوەکانیان دابەش کرد. هاوەڵانی خالید وەك شەڕکەرانی

سەرکردەکانی دیکە بوون. بۆ هەر جەریبێك لەسەرزەمینی دیمەشق پێوانەیەك لەداهات لەبەرچاو گیرا و ماڵ و سامانی پاشا و شوێنکەوتەکانی وەك تالانی حسێبی بۆ کرا و بەسەر زوئەلکەلاع و باوکی ئەعوەر و بەشیر و شەڕکەرەکانیان دابەش کرا. هەواڵی ئەم ڕووداوەیان بۆ عومەر نووسی.

نامەی عومەر بەباوکی عوبەیدەی جەڕاح گەیشت: سوپاکەی عێراق بۆ عێراق بگەڕێنەرەوە و فەرمان بدە بەخێرایی بڕۆنە لای سەعد کوڕی مالك و هاشم کوڕی عوتبەی کردە سەرکردەی سوپای عێراق و قەعقاع کوڕی عەمرۆ فەرماندەی پێشەنگەکانی بوو. عەمرۆ کوڕی مالك و ڕێبعی کوڕی عامر فەرماندەی دوو باڵی سوپاکە بوون. پێش کۆتایی هاتن بەکاروباری دیمەش بەرەو لای سەعد بەڕێکەوتن. هاشم لەگەڵ سوپای عێراق ڕێگەی عێراقی گرتەبەر و سەرکردەکانی دیکە ڕوویان لەفەحل کرد.

شەڕکەرانی هاشم دەهەزار کەس بوون. شوێنی کوژراوان بەکەسانی دیکە پڕکرایەوە. قەیس و ئەشتەر لەناو ئەواندا دەبینران.

لەناو سەرکردەکان عەلقەمە و مەسروق ڕوویان لەئیلیا کرد و لەسەر ڕێگەی ئەو سەرزەمینە دابەزین. دەستەیەك لەسەرکردەکانی یەمەن لەدیمەشق لەگەڵ یەزید کوڕی ئەبی سوفیان مانەوە. عەمرۆ کوڕی شیمر کوڕی غەزیە و سەهم کوڕی موسافیر کوڕی هەزمە و موشافیع کوڕی عەبدوللە کوڕی شافیع لەناویاندا دەبینران.

یەزید کوڕی ئەبی سوفیان دوای گرتنی دیمەشق دەحیە کوڕی خەلیفەی کەلبی لەگەڵ سوپایەك بۆ تەدمور و باوکی زەهرای قوشیری بۆ بەسنییە و حوران نارد. ئەو ناوچانەیش هاوشێوەی دیمەشق پەیمانی ئاشتییان بەست و سەرکردەکان بەڕێوبەردنی کاروباری ناوچەکانیان لەئەستۆ گرت.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گرتنی دیمەشق لەساڵی چواردەی کۆچ و لەمانگی ڕەجەب ڕوویدا.

هەروەها دەڵێت: شەڕی فەحل پێش دیمەشق بوو و سوپا پەرژوبلاوەکەی فەحل ڕوویان لەدیمەشق کرد. موسوڵمانان کاتێك شوێنیان کەوتن ڕوویان لەدیمەشق کرد. بەگومانی ئەو شەڕی فەحل لەساڵی سیانزەی کۆچ و لەمانگی زیقەعدە ڕوویدا.

واقدی هاوشێوەی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: شەڕی دیمەشق لەساڵی چواردەی کۆچ

ڕوویدا. بەگومانی ئەو گەمارۆدانی سەر شارەکە درێژەی کێشا و بەگومانی ئەو، شەڕی یەرموك لەساڵی پانزە ڕوویدا و لەم ساڵە و لەمانگی شەعبان، هێرقل دوای شەڕی یەرموك لەئەنتاکییەوە ڕووی کردە قوستەنتەنییە و دوای یەرموك، لەشام شەڕ ڕووینەدا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر، لەڕووی گێڕانەوەی حەدیسەکانەوە ئاماژەمان بەوەدا شەڕی یەرموك لەساڵی سیانزەی کۆچ ڕوویدا و هەواڵی مەرگی ئەبوبەکر لە لەکۆتایی ئەو ڕۆژەی ڕۆمییەکان شکستیان خوارد، بەموسوڵمانان گەیشت. عومەر، فەرمانیدابوو دوای تەواو بوون لەیەرموك ڕووبکەنە دیمەشق. بەپێی ئەم حەدیسانە شەڕی فەحل دوای شەڕی دیمەشق ڕوویدا و دوای ئەوە و پێش ئەوەی هێرقل بەرەو قوستەنتەنییە بڕوات، لەنێوان موسوڵمانەکان و ڕۆمییەکان چەندین شەڕ ڕوویدا. بەخواستی خوا لەکاتی خۆیدا ئاماژەی پێدەدەین.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی سیانزەیەمی کۆچ، عومەر کوڕی خەتاب، باوکی مەسعودی سەقەفی بۆ عێراق نارد و بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا کوژرا. بەڵام کوڕی ئیسحاق دەڵێت: شەڕی پرد کەتیایدا باوکی عوبەیدە کوڕی مەسعودی سەقەفی کوژرا، لەساڵی چواردەیەمی کۆچ ڕوویدا.

شەڕی فەحل بەپێی گێڕانەوەیەکی تر

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هەنووکە باسی گرتنی فەحل دەکەین کە سەبارەت بەو جیاوازی هەیە و ئەم جیاوازییە سەرسوڕهێنەرە چوونکە ڕووداوەکان لەیەکەوە نزیك بوون.

ئاماژەمان بەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق دا. بەڵام گێڕانەوەی باوکی عوسمان و یەزید کوڕی ئەسیدی غەسانی و باوکی حارسەی عوتەبی بەمشێوەیە کەدەڵێن: دوای گرتنی دیمەشق، موسوڵمانان یەزید کوڕی ئەبی سوفیانیان لەگەڵ سوپاکەی لەدیمەشق بەجێهێشت و ڕویان کردە فەحل. سەرکردەی شەرکەران شورەحبیل کوڕی حەسەنە بوو و ئەویش خالیدی وەك فەرماندەی پێشەنگەکانی دەستنیشان کرد. باوکی عوبەیدە و

عەمرۆ فەرماندەی دوو باڵی سوپاکە بوون. زەرار کوڕی ئەزوەر سەرکردەی سوارەکان و عەیاز سەرکردەی پیادەکان بوو. موسوڵمانان دەیانویست رووبەرووی هێرقل ببنەوە و سوپا هەشتا هەزار کەسییەکەی دوژمن لەپشت سەری خۆیان بەجێبێڵن.

دەیانزانی سوپای نیشتەجێی نزیك فەحل هێزی سەرەکی رۆمە و لەوان چاوەڕوانن و دوای ئەوان شام ئارام دەبێت. کاتێك گەیشتنە لای باوکی ئەعوەر، ئەویان بۆ تەبەرییە نارد و گەمارۆی خستە سەر ئەوشارە و لەفەحل کەبەشێکە لەئەردەن، ئوردوویان لێدا. کاتێك باوکی ئەعوەر لەفەحل ئوردووی لێدابوو، خەڵکی ئەو شوێنە ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشت و روویان کردە بیسان.

شورەحبیل لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەفەحل دابەزی. رۆمییەکان لەبیسان بوون. لەنێوان ئەوان و موسوڵمانەکان ئاو و قوڕ دووری دروست کردبوو. ئەم هەواڵەیان بۆ عومەر نووسی و دەیانخواست بمێننەوە و نەیاندەویست لەفەحل بڕۆن تا وەڵامی نامەکە لەلایەن عومەر خەتابەوە دێت. لەوێ بوون و نەیاندەتوانی دژی دوژمن هیچ کارێك بکەن. قوڕاو رێگر بوو. عەرەبەکان ئەم شەڕەیان بەفەحل، قوڕاو و بیسان ناوبرد.

موسوڵمانەکان لەگوندەکانی ئەردەن شتی زیاتریان لەناباوەڕان وەردەگرت. خواردنی بەردەوامیان پێدەگەیشت. ئالفی زۆریان لەبەردەستا بوو. رۆمییەکان چاوی تەماحییان تێبڕین و سەرکردەکەیان سەقلار کوڕی مێحراق بوو. هیوادار بوون موسوڵمانان ناکاوگیر بکەن و مەبەستی هێرش کردنە سەر ئەوانیان کرد.

بەڵام موسوڵمانان ئاگادار و وشیار بوون و شورەحبیل شەو و رۆژ سوپاکەی لەئامادە باشیدا هێشتەوە. کاتێك رۆمییەکان لەناکاو هێرشیان برد، موسوڵمانان رووبەروویان بوونەوە و ئەمانیان پێنەدان. رۆمییەکان لەفەحل یەك شەو و رۆژی تەواو بوێرانە و تێکۆشەرانە شەڕیان کرد کەهیچ کات شەڕێکی هاوشێوەی ئەوەیان نەبینیبوو. کاتێك رۆژی دووەم و گەیشتە شەو و تاریکی داهات، سەریان سوڕما و شکستیان خوارد. نەیاندەزانی چی بکەن چوونکە سەرکردەکەیان سەقلار کوڕی مێحراق و جێگرەکەی نەستورس هەردووکیان کوژران. موسوڵمانان سەرکەوتنی تەواویان بەدەست هێنا و شوێن دوژمن کەوتن چوونکە گومانیان دەکرد هەڵاتنی ئەوان مەبەستێکی لەپشتەوەیە. دواتر دەرکەوت سەریان سوڕماوە و نازانن چی بکەن. لەکاتی هەڵاتن روویان لەقوڕەکە کرد و چەقین. لەم کاتەدا یەکەم دەستەی هێرشبەرە موسوڵمانەکان گەیشتن و ئەوان

کەتوانای بەرگرییان نەمابوو لەلایەن موسوڵمانانەوە کوشتار کرد.

رۆمییەکان لەفەحل شکستیان خوارد بەڵام کوشتار لەناو قوڕ و لیتەکەدا بوو. هەشتا هەزارکەسیان لێکوژرا و جگە لەژمارەیەکی کەم کەس رزگاری نەبوو. موسوڵمانان بەردانەوەی ئاوەکە و دروست بوونی قوڕیان پەسند نەکرد—بەڵام قوڕ و لیتەکە هاوکاری کردن و ئەم بەخششەی خواوەند بووە هۆکاری سەرکەوتنی ئەوان.

کاتێك تاڵانییەکانیان دابەش کرد، باوکی عوبەیدە لەفەحلەوە بەرەو حیمس بەرێکەوت. سەمیر کوڕی کەعب و زوئەلکەلاع و هاورێکانی ئەویان لەگەڵ خۆیان برد. شورەحبیل و هاورێکانیان بەجێهێشت.

## شەڕی بیسان

کاتێك شورەحبیل لەشەڕی فەحل تەواو بوو، لەگەڵ عەمرۆ و سوپاکەی رووی کردە بیسان و لەوێ ئوردووی لێدا، باوکی ئەعوەر و سەرکردەکانی سوپاکەی سەرقاڵی گەمارۆدانی تەبەرییە بوون. خەڵکی ئەردەن لەرووخانی دیمەشق و چارەنووسی سەقلار و رۆمییەکان لەفەحل و لەقوڕ و لیتەکان وهاتنی شورەحبیل و عەمرۆ کوڕی عاس هاورێ لەگەڵ حارس کوڕی هوشام و سوهەیل کوڕی عەمرۆ بەمەبەستی بیسان، ئاگادار بوونەوە. هەموویان لەپشت دیوارەکانەوە سەنگەریان گرت. شورەحبیل لەگەڵ سوپاکەی بەرەو بیسان بەرێکەوت و چەند رۆژێك گەمارۆی خستە سەر ئەو ناوچەیە. دوای ئەوە خەڵکانی بیسان هاتنەدەر و موسوڵمانان رووبەرووی بوونەوە. هەموو ئەو کەسانەی بۆ شەڕ هاتبوون، کوژران و ئەوانی دیکە بەپەیمانی ئاشتی رازی بوون و پەیمان نامەیەکی هاوشێوەی پەیمان نامەکەی دیمەشق مۆر کرا.

## تەبەرییە

کاتێك خەڵکانی تەبەرییە ئاگادار بوونەوە، لەگەڵ باوکی ئەعوەر خوازیاری ئاشتی بوون تا ئەوان بباتە لای شورەحبیل. ئەو کارەی کرد و لەگەڵ ئەوان هاوشێوەی خەڵکی بیسان پەیمان نامەی ئاشتی مۆر کرا کەماڵەکانی شەر و دەوروبەری لەگەڵ موسوڵمانان

دابەش بکەن و نیوەی بەوان بسپێرن و لەنیوەکەی دیکە بمێننەوە و هەر کەسێك، ساڵانە یەك دینار بدات و هەر جەریبێك زەوی یەك هەمانە گەنم یا جۆ. بەمشێوەیە پەیمانی ئاشتییان مۆر کرد و سەرکردە و سوپاییەکان لەوێ دابەزین و پەیمانی ئاشتی ئەردەن ئەنجامدرا. موسوڵمانان لەشارەکان و گوندەکانی ئەردەن بڵاوبوونەوە و هەواڵی سەرکەوتنەکانیان بۆ عومەر نووسی.

## شەڕی موسەنا کوڕی حارسە و باوکی عوبەید کوڕی مەسعود

زیاد کوڕی سەرجسی ئەحمەری دەڵێت: یەکەم کاری عومەر کوڕی خەتاب ئەوە بوو، دوای نوێژی بەیانی ئەو شەوەی ئەبوبەکری راستگۆی تیا مرد، پێشنیاری بەخەڵکان کرد لەگەڵ موسەنا کوڕی حارسەی شەیبانی بەرەو دیاری پارسەکان بڕۆن. بەرەبەیان لەگەڵ خەڵك بەیعەتی کرد و دووبارە پێشنیاری ڕۆشتنی بەخەڵکاندا. خەڵکان یەك لەدوای یەك بۆ بەیعەت دەهاتن. لەماوەی سێ ڕۆژ کاری بەیعەت وەرگرتن تەواو بوو. هەموو ڕۆژێك پێشنیاری ڕۆشتنی بەخەڵکان دەکرد بەلام کەس نەیدەویست بۆ ئەو سەرزەمینە بڕوات چوونکە بەرەی شەڕی پارسەکان دژوار و سەخت و هێز و شکۆی ئەوان فراوان و بەسەر چەندین ئۆمەت و نەتەوەدا زاڵ ببوون.

دەڵێت: بۆ ڕۆژی چوارەم، دووبارە عومەر کوڕی خەتاب خەڵکانی بۆ ڕۆشتن بۆ عێراق هاندا و یەکەم کەس باوکی عوبەیدە کوڕی مەسعود بوو. دوای ئەو سەعد کوڕی عوبەیدەی ئەنساری هاوپەیمانی فەزارە ئامادەیی خۆی نیشاندا، ئەو لەشەڕی پرد هەڵات و هەرکاتێك پێشنیاری ڕۆشتن بۆ شەڕیان پێدەکرد، خۆی دەدزییەوە جگە لەعێراق دەیوت: خواوەند لەوێ هەڵاتنی کردە بەشم، ئەگەری هەیە ئەمجارە هێرش کردنم پێببەخشێت. خەڵکان فراوان بوون.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: موسەنا کوڕی حارسە قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم بەرەیە بەدژوار و سەخت مەزانن، ئێمە گوندەکانی فارسمان گرتووە و بەسەر نیوەی سوادادا زاڵبووین و دەستدرێژیمان کردۆتە سەریان. کەسانێك پێش ئێوە بوێری شەڕیان لەخۆیان نیشانداوە و بەخواستی خوا بەردەوام دەبین.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: حیجاز شوێنی مانەوەی ئێوە نییە مەگەر ئەوەی بۆ بژێوی لەشوێنێکی دیکەدا بگەڕێن و خەڵکانی حیجاز تەنیا بەمە هێز و دەسەڵاتیان فراوان

دەبێت، ئەو موهاجیرانەی بەرێگەی خوادا دەڕۆشتن، لەکوێن؟ بەزەویدا بڵاو ببنەوە چوونکە خواوەند لەقورئاندا بەڵێنی پێداون کەزەوی بەئێوە دەبەخشێت و فەرموویەتی ئیسلام بەسەر هەموو دینەکان زاڵ دەکات، خواوەند سەرکەوتن بەدینەکەی خۆی دەبەخشێت و پشتیوانی لەهاورێکانی خۆی دەکات و میراتی ئۆمەتەکان بەوان دەسپێرێت. خواپەرستەکان لەکوێن؟

دەڵێت: یەکەم کەس باوکی عوبەید کوڕی مەسعود و دوای ئەو سەعد کوڕی عوبەید و سەلیت کوڕی قەیس ئامادەیی خۆیان نیشاندا. کاتێك بۆ بەرێکەوتن ئامادە بوون، بەعومەریان وت: یەکێك لەموسوڵمانە کۆنەکان، لەموهاجیر یا ئەنسارەکان، وەك سەرکردەی خەڵکان دیاری بکە.

عومەر وتی: سوێند بەخوا هەرگیز ئەو کارە ناکەم چوونکە خواوەند دەرفەتی پێشبڕکێ بۆ رووبەروو بوونەوە بەدوژمنی پێدان بەڵام ترسان و شەڕتان بەخۆش نەزانی، شیاوترین کەس بۆ سەرکردایەتی ئەو کەسەیە زووتر لەهەمووان خۆی بۆ ڕۆشتن ئامادە کرد، تەنیا کەسانی یەکەم دەکەمە سەرکردە.

عومەر، باوکی عوبەید و سەلیت و سەعدی بانگ کرد و وتی: ئێوە دووانە ئەگەر پێش باوکی عوبەید ئامادەییتان لەخۆتان نیشان دەدا، سەرکردایەتیم بەئێوە دەبەخشی. باوکی عوبەیدەی کردە سەرکردەی سوپاکە و پێی وت: گوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بگرە و لەکاروبارەکاندا راوێژیان پێبکە و بۆ ئەنجامدانی کارەکان پەلە مەکە تا بەتەواوی هەڵیسەنگێنیت چوونکە جەنگە و لەجەنگ تەنیا پیاوی وردبین و دەرفەت خواز کاریگەری دەبێت.

یەکێك لەئەنسارییەکان دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەباوکی عوبەیدەی وت: رێگری سەرکردایەتی سەلیت ئەوە بوو بۆ شەڕ کردن بەپەلەیە و پەلە کردن لەجەنگ مەترسی لێدەکەوێتەوە مەگەر ئەوەی هاورێ لەگەڵ وردبینییەکی شیاو بێت. سوێند بەخوا ئەگەر جرپن نەدەبوو، ئەوم وەك سەرکردە هەڵدەبژارد بەڵام شەڕی پیاوی ورد بین و وشیاری دەوێت.

شەعبی دەڵێت: موسەنا لەساڵی سیانزەیەم هاتە لای ئەبوبەکر و عومەر ئەوی لەگەڵ دەستەیەك نارد، سێ ڕۆژ پێشنیاری ڕۆشتنی بەخەڵکان کرد و کەس ئامادەیی لەخۆی نیشاننەدا. سەرئەنجام باوکی عوبەید و دوای ئەو سەعد کوڕی عوبەید ئامادەیی خۆیان نیشاندا. باوکی عوبەید کاتێك ئامادەیی خۆی دەربڕی، وتی: سەرکردایەتی تایبەتە

بەمن. سەعد وتی: سەرکردایەتی تایبەتە بەمن. بەهۆی کارەکەی پێشووتری، سەڵیتیش قسەی ئەوانی دووبارە کردەوە.

دەڵێت: ئەوان بەعومەریان وت: یەکێك لەئەسحابی پێغەمبەر(د.خ) بکەرە سەرکردەی ئەوان.

عومەر وتی: لەپێشی ئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەوێوە سەرچاوەی دەگرت کەبەخێرایی رووبەرووی دوژمن دەبوونەوە و جێگەی نەهاتووانیان پڕدەکردەوە. ئەگەر کەسانێك وەك نەهاتووەکان بن و لەجیاتی ئەوان کەسانێك پێشتر ئامادەیی خۆیان نیشاندا، سەرکردایەتی مافی ئەوانە. سوێند بەخوا کەسێك دەکەمە سەرکردە کەزووتر لەهەموان ئامادەیی خۆی نیشاندا. باوکی عوبەیدی وەك سەرکردە دەستنیشان و پێشنیارەکانی پێکرد.

سالم دەڵێت: یەکەم دەستە کەعومەر کوڕی خەتاب ڕەوانەی کرد، دەستەکەی باوکی عوبەید بوو. دوای ئەو یەعلی کوڕی ئومەییەی بۆ یەمەن نارد و وتی: خەڵکانی نەجران دەربکات بەهۆی وەسیەتی پێغەمبەر(د.خ) کە لەکاتی مردن لەمبارەوە فەرمانی خۆیدا و هەروەها بۆ ئەنجامدانی وەسیەتی ئەبوبەکر کە لەکاتی نەخۆشی خۆی وتبووی: سوپایەك بۆ سەر ئەوان بنێرە و لەدینەکەیان پەشمیانیان مەکەرەوە، هەرکەس دەخوازێت لەسەر دینەکەی خۆی بێت، بڕوات، موسوڵمانەکان بمێننەوە. زەوی ئەو کەسانەی دەڕۆن، ئەندازە بگرە و رێگەیان بدە بەئازادی سەرزەمینی دڵخوازی خۆیان هەڵبژێرن و پێیان بڵێ بەفەرمانی خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) ئەوان دەردەکەین کەفەرموویانە: لەدوورگەی عەرەب دوو دین نابێت بوونیان ببێت. هەرکەس لەسەر دینەکەی خۆی دەمێنێتەوە، دەبێت بڕوات و زەوییەك هاوشێوەی زەوییەکەی خۆیانیان پێدەدەین کەمافەکانیان لای ئێمە سەلمێنراوە و بەپێی فەرمانی خواوەند و پەیمانەکەی خۆمان دەجووڵێینەوە و ئەمە لەجیاتی زەوییەکانی ئەوانە کە لەگوندەکان بۆ دراوسێکانیان ماوەتەوە.

## ئەماروق

شەعبی دەڵێت: باوکی عوبەید هاوڕێ لەگەڵ سەعد کوڕی عوبەید و سەڵیت کوڕی قەیسی عەدەوی و موسەنا کوڕی حارسە شەیبانی بەرێکەوت.

باوکی روەق دەڵێت: پوران کچی پاشا لەکێشەکانی خەڵکی مەداین داوەری دەکرد تا ئاشتی لەناویاندا سەقامگیر بکات و کاتێك فەروخزاد کوڕی بەندوان کوژرا و رۆستەم هات و ئازەرمیدۆختی کوشت، ئەو لەسەر کاری داوەری بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی یەزدگێردیان هێنا. کاتی هاتنی باوکی عوبەیدە، پورانی داوەری دەکرد و کاروباری جەنگ لەئەستۆی رۆستەمدا بوو.

دەڵێت: پوران دیاری بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد و پێغەمبەر(د.خ) رازی بوو. پوران ئەیاری شیری و دواتر بوو بەشوێنکەوتەی ئەو و بڕیاریاندا شیری سەروەر و پوران داوەر بێت.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك سیاوەخش، فەروخزاد کوڕی بەندوانی کوشت و ئازەرمیدۆخت پاشایەتی گرتەدەست، دووبەرەکی لەناو فارسەکاندا دروست بوو. لەهەموو کاتی مانەوەی موسەنا سەرقاڵی کێشەکانی خۆیان بوون تا ئەو کاتەی موسەنا لەمەدینە گەڕایەوە. پوران ئەم هەواڵەی بۆ رۆستەم نارد تا بەخێرایی بێت. رۆستەم لەسنوورەکانی خوراسان بوو. لەگەڵ سوپاکەی هات و لەنزیك مەداین ئوردووی لێدا. لەهەر شوێنێك رووبەرووی سوپاکەی ئازەرمیدۆخت بوویەوە، شکستی پێهێنان. لەمەداینیش شەڕ روویدا و سیاوەخش شکستی خوارد و خۆی داشارد. ئازەرۆمیدۆخت گەمارۆی خرایەسەر و کاتێك دەستی بەسەر مەدایندا گرت، سیاوەخشی کوشت و چاوی ئازەرمیدۆختی کوێر و پورانی وەك پاشا دەستنیشان کرد. پوران داوای لێکرد کاروباری پارسەکان رابەرێنێت و لەلاوازی دەربار و بەرێوبەری کاروبارەکان سکالای کرد و وتی: دە ساڵ پاشایەتی پێدەبەخشێت بەو مەرجەی دوای ئەوە پاشایەتی بۆ بنەماڵەی کەسرا بگەڕێتەوە، ئەگەر لەگەنجەکانی بنەماڵەی کەسرا کەسیان بەشیاو زانی پاشایەتی تەسلیم بکەن و وەگەرنە پاشایەتی بەژنان بسپێرن.

بەڵام رۆستەم وتی: من فەرمانبردرام و بەدوای پاشایەتیدا ناگەڕێم، ئەگەر رێزت لەمن گرتووە و کارێکتان بۆ کردووم، هەموو کاروبارەکان لەدەستی ئێوەدایە. من تیری ئێوە و

گوێڕایەڵی ئێوەم.

پوران: بەیانی وەرە لای من.

بەیانی ڕۆستەم هات و پوران سنووردارەکانی پارسی کۆکردەوە و نامەیەکی ڕەسمی بۆ ڕۆستەم نووسی: کاروباری شەڕی فارسەکان لەئەستۆی تۆدایە و جگە لەخوا کەس باڵادەستی تۆ نییە و ئەم فەرمانە بەرەزامەندی ئێمە دەرکراوە و دەبێت هەمووان ملکەچی فەرمانەکانی تۆبن تا ئەو کاتەی بەرگری لەم سەرزەمینە دەکەیت و بۆ ڕێگرتن لەدووبەرەکی و ئاژاوە نێوخۆییەکان هەوڵ دەدەیت، فەرمانەکە کاری پێدەکرێت.

تاجی تەسلیم کرد و بەپارسەکانی وت، شوێنکەوتە و ملکەچی فەرمانەکانی بن. دوای هاتنی باوکی عوبەید، دەسەڵاتی فارسەکان لەدەستی ڕۆستەمدا بوو.

دەڵێت: یەکەم کاری عومەر کوڕی خەتاب دوای مەرگی ئەبوبەکر ئەمە بوو: خەڵکانی بۆ نوێژ کۆکردەوە و پێشنیاری ڕۆشتنە بۆ عێراقی پێکردن. بەڵام کەس ڕازی نەبوو و بڵاوەیان لێکرد. بۆ چوار ڕۆژی بەردەوام پێشنیارەکەی دووبارە کردەوە. باوکی عوبەید لەڕۆژی چوارەم ئامادەیی خۆی نیشاندا و یەکەم کەس بوو. کەسانی دیکە یەك لەدوای یەك ئامادەیی خۆیان نیشاندا و عومەر لەخەڵکانی مەدینە و دەوروبەر هەزار کەسی هەڵبژارد و باوکی عوبەیدەی کردە سەرکردەی ئەوان.

دەڵێت: بەعومەریان وت: یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بکەرە سەرکردەی ئەوان.

بەڵام وتی: خوا نەکات، ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، پێشنیاری ڕۆشتنتان پێدەکەم و سستی لەخۆتان نیشان دەدەن و کەسانی تر وەڵامی پێشنیارەکەی من دەدەنەوە. ئەوان دەکەمە سەرکردەی ئێوە، لەپێشی ئێوە بۆ ئامادەبوونتان بۆ شەڕەکان بوو، کاتێك لاوازیتان لەخۆتان نیشاندا، کەسانی دیکە بۆ سەرکردایەتی شیاوترن. یەکەم کەس دەکەمە سەرکردەی ئێوە. داوای لەموسەننا کرد پەلە بکات و وتی: خێرا بەرێکەوە تا هاوەڵانت بێن.

دەڵێت: یەکەم کاری عومەر لەکاتی بەیعەت وەرگرتن بۆ خۆی، ڕەوانە کردنی سوپاکەی باوکی عوبەیدە بوو. دواتر خەڵکانی نەجرانی دەرکرد، دواتر هەڵگەڕاوەکانی بانگێشت کرد کەبەخێرایی لەهەموو سووچەکانەوە لەدەوری کۆبوونەوە و ئەوانی بۆ شام و عێراق نارد و نامەی بۆ خەڵکانی یەرموك نووسی کەباوکی عوبەیدە کوڕی جەراح سەرکردەی ئێوەیە و نامەی بۆ ئەو نووسی: سەرکردایەتی سوپاکە لەدەستی تۆدایە و

ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشیت، خەڵکانی عێراق و هێزە پشتیوانەکان هەرکەسێك خوازیار بوو، بۆ عێراق ڕەوانە بکە.

دەڵێت: یەکەم سەرکەوتنی عومەر لەیەرموك و بیست ڕۆژ دوای مردنی ئەبوبەکر بەدەستهات. یەکێك لەو هێزە پشتیوانانەی لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە یەرموك، قەیس کوڕی هوبەیرە بوو و لەگەڵ خەڵکانی عێراق گەڕایەوە بەڵام لەوان نەبوو و ئەو کاتەی عومەر مۆڵەتی جەنگی بەهەڵگەڕاوەکاندا، لەگەڵ ئەوان هات.

دەڵێت: فارسەکان بەمردنی شەهرەبەراز لەکاری موسوڵمانان سەرقاڵی کێشە نێوخۆییەکانی خۆیان بوون. ژنەکانیان وەك پاشا هەڵبژارد تا ئەو کاتەی لەسەر پاشایەتی شاپور کوڕی شەهرەبەراز کوڕی ئەردەشێر کوڕی شەهریار ڕێککەوتن. ئازەرمیدۆخت دژی ئەو ڕاپەڕی و ئەوی لەگەڵ فەرخوزاد کوشت و پاشایەتی گرتەدەست. لەم کاتەدا ڕۆستەم کوڕی فەروخزاد سنورداری خوراسان و پوران، ئاگاداری کردەوە.

دەڵێت: موسەنا لەگەڵ دەکەس لەمەدینەوە بەرەو حیرە بەرێکەوت و باوکی عوبەیدە یەك مانگ دواتر پەیوەستی بوو. موسەنا پانزە ڕۆژ لەحیرە مایەوە. ڕۆستەم نامەی بۆ جووتیارانی سواد نووسی تا دژی موسوڵمانەکان شۆڕش بکەن. لەهەر گوندێك پیاوێکی دانا تا خەڵکان دژی موسوڵمانان هانبدات. جاپانی بۆ لای بەقوبازی خواروو نارد و نێرسی بۆ کەسکەر و ڕۆژێکی بۆ ئەم کارە دیاری کرد. سوپایەك بۆ شەڕی موسەنا بەرێکرد. موسەنا ئاگادار بویەوە و ئەردووگاکانی دەوروبەری خۆی کۆکردەوە و بەوردی چاودێری بارودۆخی دەکرد. جاپان پەلە و شۆڕشی دەستپێکرد و لەنەماروق دابەزی. کەسان بەردەوام پەیوەستی دەبوون. نێرسی هات و لەزەندروود ئوردووی لێدا. خەڵکی گوندەکان لەسەرەوە تا خوارەوەی فورات شۆڕشیان کرد.

موسەنا لەگەڵ دەستەیەك هاتەدەر تا لەخەفان ئوردوو لێبدات بۆ ئەوەی لەپشتەوە زیانەی بەرنەکەوێت. مایەوە تا ئەو کاتەی باوکی عوبەیدە پەیوەستی بوو. باوکی عوبەیدە سەرکردە و یەك ڕۆژ لەخەفان مایەوە تای هاوەڵانی بحەسێنەوە. ژمارەیەکی زۆر لەشۆڕشگێران لەدەوری جاپان کۆبوونەوە.

باوکی عوبەیدە دوای حەسانەوەی خەڵك و چوارپێکان، بەرێکەوت. موسەنای وەك سەرکردەی سوارەکان دانا، باڵی ڕاستی بەوالق کوڕی جیدار و باڵی چەپی بەعەمرۆ کوڕی هەیسەم کوڕی سەڵت کوڕی حەبیبی سولەمی سپارد. فەرماندەی باڵەکانی

سوپاکەی جابان، جەشنس ماه و مەدان شا بوون. سوپای موسوڵمانان لەنەماروق دابەزی و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. خواوەند فارسەکان شکستدا و جاپان ئەسیر کرا. مەتەر کوڕی فەزەی تەمیمی ئەوی ئەسیر کرد. مەردانشا گیرا، ئەکتەل کوڕی شەماخی عوکەلی ئەوی گرت.

ئەکتەل، مردان شای کوشت بەڵام مەتەر کوڕی فەزە لەجاپان فریوی خوارد و شتێکی وەرگرت و بەرەڵای کرد. دووبارە بەدەستی موسوڵمانان ئەسیر کرا و بردیانە لای باوکی عوبەیدە و وتیان: ئەمە پاشایە و دەبێت بکوژرێت.

بەڵام باوکی عوبەیدە وتی: سەبارەت بەکوشتنی ئەو لەخوا دەترسم چوونکە یەکێك لەموسوڵمانەکان ئەمانی پێداوە و موسوڵمانان بۆ هاورێیەتی و دۆستایەتی وەك یەك جەستەن، ئەگەر یەکیان بەڵێنی شتێك بدات، بەڵێنی هەموویانە.

وتیان: ئەمە پاشایە.

وتی: ئەگەر تەنانەت پاشا بێت. ئەوی ئازاد کرد.

باوکی عیمران حەفس دەڵێت: فارسەکان بۆ ماوەی دەساڵ کاروباری جەنگیان بەرۆستەم سپارد و ئەویان وەك پاشا هەڵبژارد. رۆستەم ئەستێرە ناس و شارەزای ئەو زانستە بوو. کەسێك پێی وت: تۆ ئاگات لەبارودۆخ هەیە، بۆ بەو کارە رازی بوویت؟

وتی: لەبەر تەماح وئارەزووی سەرۆکایەتی.

رۆستەم نامەی بۆ خەڵکانی سواد نووسی و سەرکردەکانی بۆ لای ئەوان نارد تا دژی موسوڵمانەکان شۆڕش بکەن. بەخەڵکانی وتبوو یەکەم کەس شۆڕش بکات سەرکردەی ئێوەیە. جاپان لەناوچەی فورات بادقلی ئاڵای شۆڕشی هەڵکرد و خەڵکانی شوێنی کەوتن.

موسوڵمانان لەحیرە ڕۆشتنە لای موسەنا و ئەو لەخەفان دابەزی و بەرگری کرد تا باوکی عوبەیدە هات کەسەرکردەی موسەنا و کەسانی دیکە بوو. جاپان لەنەماروق دابەزی و باوکی عوبەیدە لەخەفانەوە رووبەرووی بوویەوە. لەنەماروق شەڕی دەستی پێکرد. خواوەند فارسەکانی شکستدا و موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆریان لەوان کوشت. مەتەر کوڕی فەزە کەنازناوی خۆی لەدایکیەوە وەرگرتبوو، لەگەڵ ئەبی کەسێکیان بینی و هێرشیان کردەسەر. ئەویان ئەسیر و بینیان پیرەپیاوێکی پەککەوتەیە. ئەبی ئەوی نەویست. مەتەر دڵی بەبەهای ئازادی ئەو خۆش کرد. رێککەوتن ئەبی جل و بەرگەکانی

هەڵگرت و بەهای ئازادییەکەی بۆ مەتەر بێت. کاتێك مەتەر و ئەو تەنیا مانەوە، پێی وت: ئێوە عەرەبەکان پەیمانەکانی خۆتان دەبەنە سەر، دەخوازیت ئەمان بەمن بدەیت و دوو کۆیلەی تازەپێگەیشتوو بەم تایبەتمەندییانە بەتۆ بدەم؟

مەتەر وتی: بەڵێ.

وتی: من بۆ لای سەرکردەکەتان ببە تا بەئامادە بوونی ئەو ئەم رێککەوتنە ئەنجام بدرێت. مەتەر ئەوی بردە لای باوکی عوبەیدە و ئەمانی پێبەخشی. باوکی عوبەیدە ئەمانەکەی پشتڕاستکردەوە، دواتر ئەبی و چەند کەسێك لەخەڵکانی رەبیعە هەستان و وتیان: من ئەسیرم کرد و ئەو کاتە ئەمانی نەبوو.

خەڵکانی رەبیعە ئەویان ناسییەوە، وتیان: ئەمە جاپانی پاشایە و ئەمە شەڕکەرەکانی ئەو بوون.

باوکی عوبەیدە وتی: ئەی خەڵکانی رەبیعە دەتانەوێت چی بکەم، هاورێکەی ئێوە ئەمانی پێداوە، چۆن بیکوژم! معاذ الله لەم کارە.

باوکی عوبەیدە تالآنییەکانی دابەش کرد. بۆنێکی زۆر لەناو تالآنییەکان دەبینرا، بەشی کرد و پێنج یەکی تالآنییەکانی بەقاسمدا بۆ مەدینە نارد.

## سەقاتییە کەسکەر

تەڵحە دەڵێت: کاتێك پارسەکان شکستیان خوارد، ڕێگەی کەسکەریان گرتەبەر تا پەنا بۆ نێرسی ببەن. نێرسی کوڕە پوورِی کەسرا و کەسکەر شوێنی مانەوەی ئەو بوو. نێرسیان تایبەت کردبوو بەخۆی و کەسی هیچی لێنەدەخوارد و کشتوکاڵییان تیانەدەکرد جگە لەکەسەکانی ئەو یا شای پارسەکان یا ئەو کەسەی شتێکیان لەویَ پێدەدا. ئەمە لەناو خەڵکدا بەناوبانگ بوو کەبەرهەم و داهاتی ئەوشوێنە تایبەتە. ڕۆستەم و پوران بەنێرسی یان وت: برۆ سەرزەمینەکەی خۆت و ئەویَ لەدوژمن بپارێزە و پیاوەتی و جوامێری لەخۆت نیشان بدە.

دەڵێت: کاتێك سوپای فارس لەنەماروق شکستی خوارد و پاشماوەکان پەنایان بۆ نێرسی برد، باوکی عوبەیدە فەرمانی ڕۆشتنیدا و سوارچاکەکانی وت شوێن هەڵاتووان بکەون تا ئوردووگاکەی نێرسی و لەنێوان نەماروق و بارق و دەرتا لەناویان ببەن.

عاسم کوڕی عەمرۆ لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

((سوێند بەگیانی خۆم و گیانی خۆم بەکەم بەها نازانم

خەڵکانی نەماروق ریسوا بوون

لەسەر دەستی ئەو کەسانەی خواوەند کۆچی پێکردن

و لەنێوان دەرتا و بارقی ئەوان بەدوای ڕێگەیەك دەگەڕان

لەرێگەی بەزاروق لەنێوان مەرجی موسلیح و هەوافی

ئەوانمان کوشتار کرد))

دەڵێت: باوکی عوبەیدە لەنەماروقەوە بەڕێکەوت و لەکەسکەر لەبەرابەر نێرسی ئوردووی لێدا، نێرسی لەخوارەوەی کەسکەر بوو. موسەنا بەهەمان شێوەی لەگەڵ جاپان شەڕی کردبوو، سوپاکەی ڕازاندەوە. دوو کوڕە پوورکەی نێرسی کەکوڕی پووری کەسرا بوون، بەناوی بەندویە و تیرویە کوڕەکانی بەستام لەناو سوپاکەیدا دەبینران. کاتێك پوران و ڕۆستەم لەشکستی جاپان ئاگادار بوونەوە کەسیان بۆ لای جالینوس نارد و نێرسی و خەڵکی کەسکەر و باروسما و ڕووباری جەریر و زاب ئاگادار بوونەوە و هیوادار بوون پێش شەڕ پەیوەستی ئەوان بێت. بەڵام باوکی عوبەیدە هێرشی کردەسەریان و لەخوارەوەی کەسکەر، لەشوێنێك بەناوی سەقاتییە ڕووبەڕووی یەکبوونەوە. لەساراکانی مەڵس شەڕێکی دژوار ڕوویدا و پارسەکان شکستیان خوارد و

نێرسی هەڵات و ئوردووگا و زەوییەکانی کەوتە ژێر دەستی موسوڵمانان. باوکی عوبەیدە هەموو دەوروبەری کەسکەر و ئوردووگاکەی وێران و تالآنییەکانیان کۆکردەوە. خواردەمەنی زۆریان دەستکەوت. کەسیان بۆ لای عەرەبەکانی نزیك نارد و ئەوەی دەیانخواست هەڵیانگرت. دەستیان بەسەر خەزێنەکانی نێرسیدا کرد و لەهیچ شوێنێك بەئەندازەی ئەم شوێنە و خەزێنەکانی نێرسی شادمان نەبوون. نێرسی ئەم خەزێنانەی کۆکردەوە و پاشاکانی فارس هاوکارییان دەکرد. خەزێنەکانیان دابەش کرد و خواردەمەنییان بەوەرزێرەکاندا و پێنج یەکیان بۆ عەمەر کوڕی خەتاب نارد و بۆیان نووسی: خواوەند ئەو خواردنانەی خوسرەوەکان کۆیاندەکردەوە، بەئێمەی بەخشی، ویستمان بیبینن و بیری نیعمەتەکانی خواوەند بکەونەوە.

باوکی عوبەیدە لەکەسکەر مایەوە و موسەنای بۆ باروسما و واڵقی بۆ زەوابی و عاسمی بۆ رووباری جوەیر. ئەم سەرکردانە شکستیان بەهەموو سوپای ئەو ناوچانە هێنا و وێران و ئەسیری زۆریان دەستکەوت. یەکێك لەو شوێنانەی موسەنا وێران و خەڵکەکەی ئەسیر کرد، زەندرود و بۆسریسی بوو. باوکی زەعبەل یەکێك لەئەسیرەکانی زەندروود بوو.

ئەم سوپایە پەنای بۆ جالینوس برد.عاسم خەڵکانی بەیتیق و رووباری جوەیری ئەسیر کرد. باوکی سەڵت یەکێك لەئەسیرەکانی واڵق بوو.

فورخ و فەروەنداد ڕۆشتنە لای موسەنا بۆ ئەوەی جەزیە بدەن و لەلایەن موسوڵمانانەوە پشتیوانیان لێبکرێت و زەوییەکانیان پارێزراو بێت. باوکی عوبەید کەسێکی بۆ باروسما و یەکی دیکەی بۆ رووباری جوەیر نارد و لەهەر کەسێك چواردرەم جەزیەی وەرگرت. فەروخ لەباروسما و فەروەنداد لەرووباری جوەیر و کەسانی وەك ئەوان لەزەوابی و کەسکەر. بۆ خێرا کردن چەندین کەسیان پەیوەستی ئەوان کرد و کارەکە کۆتایی و پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا. فەروخ و فەروەنداد دەفرەکانیان بردە لای باوکی عوبەیدە کەلێوانلێو بوو لەجۆرەکانی خواردنی پارسی لەکولآو و شیرینییەکان و شتەکانی دیکە، وتیان: ئەمە بۆ رێزگرتن و میوانداری کردن لەتۆیە.

وتی: بەم شێوەیە رێز و میوانداری سوپاکەتان کرد؟

وتیان: ئامادە نەبووە بەلآم ئەو کارە دەکەین. لەراستیدا چاوەڕوان بوون جالینوس بێت و لەدەرئەنجامی رووداوەکان ئاگادار ببنەوە.

باوکی عوبەید وتی: پێویستم بەشتێك نییە کەبەشی هەموو سوپاکەم نەکات.

گەڕاندییەوە.

باوکی عوبەید بەرێکەوت و لەباروسما دابەزی و لەهەواڵی بەرێکەوتنی جالینوس ئاگادار بوویەوە.

نەسر کوڕی سەری زەببی دەڵێت: ئەندەرغوڕ کوڕی خوکبوز خواردنی لەو چەشنەی بردە لای باوکی عوبەیدە.

وتی: بەمشێوەیە ریز و میوانداری سوپاکەتان کردووە؟

وتیان: نە.

باوکی عوبەید گەڕاندییەوە و وتی: پێویستمان پێی نییە، پیاوێکی خراپە باوکی عوبەیدە لەگەڵ خەڵکێك لەسەرزەمینەکەی خۆیەوە بێت کەخوێنیان لەبەردەمی ڕژابێت یا نەڕژابێت و ئەو شتێك یا خواردنێکی تایبەت بخوات، نە، سوێند بەخوا تەنیا ئەوە دەخوات کەخواوەند وەك تالآنی پێی بەخشیوە.

گێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق سەبارەت بەموسەنا و باوکی عوبەید کەعومەر کوڕی خەتاب ئەوانی بۆ عێراق نارد و چەندین شەڕیان کرد، بەمشێوەیە بەلآم دەڵێت: کاتێك جالینوس و سوپاکەی شکستیان خوارد و باوکی عوبەیدە ڕۆشتە ناو باروسما، خۆی و هاوەڵانی لەناو یەکێك لەگوندەکان دابەزین. خورادنێکیان بۆ باوکی عوبەیدە ئامادە کرد و کاتێك بینی وتی: کەسێك نیم ئەمە بخۆم و موسوڵمانان نەیخۆن.

وتیان: بخۆ، بەهەموو هاوەڵانی تۆ لەشوێنی مانەوەیان خواردنێکی لەم چەشنە یا باشتریان داوە.

باوکی عوبەید خواردی و کاتێك خەڵکان هاتن سەبارەت بەخواردنی ئەوان پرسیاری کرد و ئەوان، لەچۆنییەتی و جۆری خواردنەکە ئاگاداری کردنەوە.

تەڵحە دەڵێت: جاپان و نێرسی داوای هاوکارییان لەپوران کرد و ئەو جالینوس بۆ هاوکاری ئەوان نارد. سوپاکەی جاپان پەیوەستی سوپاکەی ئەو کرد و فەرمانی پێدا بۆ لای نێرسی بڕوات و دواتر ڕووبەرووی باوکی عوبەیدە ببێتەوە. بەلآم باوکی عوبەید پێشدەستی کرد و پێش ئەوەی نزیك ببێتەوە، ڕووبەرووی بوویەوە. جالینوس لەباقریا دابەزی کەبەشێکە لەباروسما و باوکی عوبەید لەگەڵ موسوڵمانەکان هێرشی کردەسەر. جالینوس سوپاکەی ئامادە کردبوو. لەباقسیاسا جەنگ ڕوویدا و موسوڵمانان توانیان شکستیان پێبێنن. جالینوس هەلآت و باوکی عوبەید بەسەر سەرزمینەکەی ئەواندا زاڵ

بوو.

نەزر دەڵێت: وەرزێرە نیگەرانەکان خواردنیان بۆ سوپاکە هێنا چوونکە لەگیانی خۆیان دەترسان.

دەڵێت: باوکی عوبەید وتی: مەگەر نەموت ئەوەی بەشی هەموو سوپاکەم نەکات، لێی ناخۆم.

وتیان: خواردنی لەم چەشنە یا باشتریان بەوانیش داوە.

کاتێك خەڵکان لەدەروی باوکی عوبەید کۆبوونەوە سەبارەت بەمیوانداری خەڵکان پرسی و ئاگاداریان کردەوە. لەسەرەتا کەمتەرخەمییان لەخۆیان نیشاندا بوو چوونکە لەسزای پارسەکان دەترسان.

بەڵام لەگێڕانەوەی محەممەد هاتووە: باوکی عوبەید خواردنەکەی وەرگرت و خواردی. ناردی بەکەسانی هاوەڵی خۆی بۆ ئەوەی لەخواردنەکە بخۆن و خواردیان. ئەوانەی لەخواردنی پارسەکانیان خواردبوو، گومانیان کرد هیچیان بۆ باوکی عوبەید نەبردووە و پێشنیاری خواردنی سادەی رۆژانەیان پێدەکات و حەزیان نەدەکرد لەو خواردنانە بێ بەش بن و وتیان: بەسەرکردە بڵێ، بەو خواردنانەی وەرزێرەکان هێناویانە، ئیشتیامان لەهیچی دیکە نییە.

دەڵێت: بەڵام باوکی عوبەید کەسی ناردو وتی خواردنێکی زۆریان لەخواردنی عەجەمەکان هێناوە، وەرەن سەیری بکەن بزانن لەگەڵ ئەوەی بۆ ئێوەیان هێناوە، جیاوازییەکەی چییە چوونکە لێرە کارگ و بەچکە کۆتر و کەباب و شتی دیکە هەیە.

عاسم کوڕی عەمرۆ لەکۆڕی میوانەکانی خۆی هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((ئەگەر لای تۆ کارگ و بەچکەکۆتر و هەیە

لای کوڕی فروخ کەباب دەستدەکەوێت.))

باوکی عوبەید بەرێکەوت و موسەنای وەك پێشەکی سوپاکەی دانا و بەسوپایەکی تەیار رووی لەحیرە کرد.

نەزر دەڵێت: عومەر بەباوکی عوبەیدەی وت: بۆ سەرزەمینی فرت و فێڵ و فریو دەڕۆیت، بۆ لای خەڵکانێك کەباوشەیان بۆ شەڕ کردۆتەوە و فێری بوون و خێریان لەبیر کردووە و نایزانن، لەکارەکانت وردببەرەوە، زمانی خۆت بگرە و نهێنییەکانی خۆت مەدرکێنە چوونکە خاوەنی نهێنی تا ئەو کاتەی بیپارێزێت، پارێزراوە و ناسازگاری تیا نابینێت بەڵام کاتێك نهێنییەکەی بدرکێنێت، گیرۆدەی بەلا و ناسازگارییەکان دەبێت.

## شەڕی قرقس کە بەقس قس ناتف و پرد و مەروحەیش ناوی دەبەن

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: لەگێڕانەوەی تەڵحەدا هاتووە: کاتێك جالینوس لەگەڵ ئەو دەستە لەسوپاکەی کەرزگاریان ببوو، بۆ لای ڕۆستەم گەڕایەوە، ڕۆستەم بەهاوەڵانی خۆی وت: بەبڕوای ئێوە کام یەك لەعەجەمەکان بۆ شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان سەرسەختترە؟

وتیان: بەهمەن جادویە.

ڕۆستەم بەهمەنی نارد و فیلێکی پێدا و جالینوسی کردە هاوڕێی ئەو، وتی: جالینوس لەپێشەوە ڕەوانە بکە و ئەگەر هەڵات، بیکوژە.

بەهمەن بەرێکەوت، ئاڵای کاویان، ئاڵای کەسرای پێبوو. ئاڵاکە لەپێستی پڵنگ و هەشت زەراع درێژی و دوانزە زەراع پانی بوو. باوکی عوبەیدە بەرێکەوت و لەمەروحە لەنزیك بورج و عاقول دابەزی. بەهمەن جادویە کەسی نارد و وتی: یا لای ئێمە تێپەڕن و لەکاتی پەڕینەوە نابینە ئەرك بۆتان، یا ڕێگە بکەنەوە با ئێمە تێپەڕین. خەڵکان بەباوکی عوبەیدیان وت: تۆ مەڕۆ با ئەوان بپەڕنەوە. سەلیت لەهەمووان زیاتر پێداگری کرد بەلاّم باوکی عوبەید دژی بۆچوونی ئەوان وەستایەوە و وتی: ئەوان بۆ مردن بوێرتر لەئێمە نین، ئێمە دەڕۆینە لای ئەوان. ئەو کارەیان کرد و لەشوێنێکی تەنگ و تەسك دابەزین. ڕۆژێك شەڕیان کرد. ژمارەی سوپاکەی باوکی عوبەیدە لەنێوان شەش بۆ دوانزە هەزار کەس دەبوو. کاتێك ڕۆژ کۆتایی هات یەکێك لەخەڵکانی سەقیف کەبۆ سەرکەوتن پەلەی بوو، خەڵکانی پەیوەستی یەك کرد و شەڕ گەرم بوو. شمشێرەکان بەریەك کەوتن و باوکی عوبەید بەشمشێر لەفیلەکەیدا و فیلەکە ئەوی شێلا. موسوڵمانان نزیکەی شەش هەزار کەس لەفارسەکانیان کوشت و زۆری نەمابوو بەتەواوەتی شکست بخۆن بەلاّم لەبەر ئەوەی فیلەکە باوکی عوبەیدی خستە ژێر قاچەکانی و لەسەر جەستەی ئەو وەستا، وورەی موسوڵمانان رووخا. فارسەکان هێرشیان برد و یەکێك لەسەقیفییەکان رووی کردە پردەکە و قرتاندی. کاتێك موسوڵمانان گەیشتنە پردەکە و فارسەکان لەدواوە هێرشیان هێنابوو، کەوتنە ناو فورات. لەو ڕۆژەدا لەموسوڵمانان چوار هەزار کەس بەکوژراو و خنکاو لەناوچوون. موسەنا و عاسم و کەلجی زەببی و مەعور سەرقاڵی کۆکردنەوە و پاراستی خەڵکان بوون تا پردەکەیان هەڵبەستەوە و پەڕینەوە. خۆیان لەدوای سوپاکەوە ڕێگەیان دەبڕی و لەمەروحە دابەزین. موسەناو کەلج و عاسم و مەزعور کەبەرگرییان لەموسوڵمانان

دەکرد، بریندار ببوون. ژمارەیەکی زۆر لەشەڕکەران هەڵاتن و ریسوا بوون. هەموان لەو رووداوەی روویدابوو، هەستیان بەشەرم دەکرد.

عومەر رووداوەکەی لەزمانی ئەو کەسانەی پەنایان بۆ مەدینە بردبوو، بیست و وتی:

((ئەی بەندەکانی خوا، سوێند بەخوا هەر موسوڵمانێکم بەخشیوە. من (کروە، ئاماژەیە بۆ ئایەی شانزەیەم سوری ئەنفال کەدەڵێت ئەگەر هەڵاتووی شەڕ رووبکاتە دەستەیەکی دیکە، گوناحی نییە)هەر موسوڵمانێکم. خواوەند باوکی عوبەید ببەخشێت، ئەگەر دەپەڕییەوە و بۆ خەیف پەنای دەبرد یا دەگەڕایەوە بۆ لای ئێمە و شەڕی نەدەکرد، ئێمە کروەی ئەو دەبووین. کاتێك پارسەکان ویستیان بپەڕنەوە، هەواڵیان پێگەیشت کەخەڵکانی مەداین دژی رۆستەم شۆڕشیان کردووە و پەیمانەکەی ئەویان خستۆتە ژێرپێ و بوونەتە دوو دەستە، فەهلوجان لایەنگری لەرۆستەم و پارسەکان داوای پاشایەتی فیروزان دەکەن.

لەشەڕی یەرموك تا شەڕی پرد چل رۆژە. هەواڵی سەرکەوتنی یەرموك جەریر کوڕی عەبدولله حەمیری بەخەڵکانی مەدینەی گەیاند و هەواڵی شکستی پرد، عەبدولله کوڕی زەیدی ئەنساری کە بەچاوی خۆی شەڕەکەی نەبینیبوو. کاتێك گەیشتە لای عومەر، لەسەر مینبەر بوو، هاواری کرد: ئەی عەبدولله کوڕی زەید، چ هەواڵێکت پێیە؟

عەبدولله وتی: هەواڵی کۆتایی.

بەمینبەرەکەدا سەرکەوت و بەشێوەیەکی نهێنی لەرووداوەکە ئاگاداری کردەوە.

شەڕی یەرموك لەجومادی الاخر و شەڕی پرد لەشەعبان روویدا.،

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: رۆستەم بەهمەن جادویەی بۆ شەڕی باوکی عوبەیدە نارد و جالینوسی کردە هاورێی ئەو لەگەڵ چەند فیلێك. یەکێك لەفیلەکان سپی و چەندین تیغی برەڕیان پێوە هەڵواسیبوو. بەهمەن لەگەڵ سوپایەکی فراوان هات و باوکی عوبەید بۆ رووبەروو بوونەوە رووی لەبابل کرد. کاتێك نزیك بوویەوە، رێگەکەی خوار کرد و فوراتی کردە دیوارێك لەنێوان خۆیاندا و لەمەروحە ئوردووی لێدا.

بەڵام کاتێك لەوێ ئوردوویان لێدا، باوکی عوبەید پەشیمان بوویەوە. وتیان: یا ئێوە بۆ لای ئێمە بپەڕنە یا ئێمە ئەو کارە دەکەین. باوکی عوبەید سوێندی خوارد لەفورات دەپەڕێتەوە بۆ ئەوەی قەرەبووی هەڵەکەی خۆی بکاتەوە. سەڵیت و سەرکردەکان سوێندیاندا نەڕوات و وتیان: عەرەبەکان تا ئێستا رووبەرووی سوپایەکی لەم چەشنە نەبوونەتەوە، ئەوان بۆ شەڕی ئێمە خۆیان ئامادە کردووە، ژمارەیان فراوان و

کەرەستەی پێویستیان لەبەردەستایە. ئێستا لەشوێنێکیت کەجێگە و ڕێگەی گەڕانەوە و هەلاتنمان هەیە و دەتوانین هەرکارێك بکەین. بەلام باوکی عوبەید رازی نەبوو، وتی: سوێند بەخوا دەڕۆم، ئێوە ترساون.

نێردراو لەنێوان بەهمەن و باوکی عوبەید مەردان شای خەسی بوو، بەموسولمانانی وت: فارسەکان گالتەیان پیکردوون و پێداگری باوکی عوبەید زیادی کرد. گوێی لەوتەی هاوەلانی نەگرت و سەلیتی بەترسەنۆك زانی و وتی: سوێند بەخوا لەتۆ بوێرترم، ڕێگەی راستم نیشاندایت و دەزانیت.

ئەغوڕی عیجلی دەلێت: بەهمەن هات و لەکەناری فورات لەنس ناتف دابەزی. باوکی عوبەید لەکەناری فورات لەمەروحە ئوردووی لێدابوو. بەهمەن وتی: یا ئێوە بۆ لای ئێمە بپەڕنەوە یا ئێمە ئەو کارە دەکەین.

باوکی عوبەید وتی: ئێمە دەپەڕینەوە. کوڕی سەلوبا بۆ دوو دەستە پردی هەلبەست. پێش ئەوە دومە هاوسەرەکەی باوکی عوبەید خەوی بینیبوو کەپیاوێك بەدەفرێك لەئاسمانەوە هات. دەفرەکە شەربەتی تیا بووەو و باوکی عوبەید و چەند کەسێك لێیان خواردەوە. کاتێك خەوەکەی بۆ باوکی عوبەید گێڕایەوە، وتی: ئەمە شەهید بوونەوە. وەسیەتی بۆ کەسەکانی خۆی کرد و وتی: ئەگەر کوژرام جەبر سەرکردەیە و ئەگەر ئەو کوژرا، فلان کەس. هەموو ئەو کەسانەی لەشەربەتەکەیان خواردبوو، ناوی بردن، دواتر وتی: ئەگەر باوکی قاسم کوژرا، موسەنا سەرکردەیە.

لەگەل سوپاکەی پەڕینەوە. زەوی بۆ خەلکان تەنگ بوو. کەسان ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و ئەسپی عەرەبەکان لەفیلەکان و ئەسپە زرێدارەکان ڕەمیان کرد. کاتێك موسولمانان دەیانویست هێرش بەرن ئەسپەکان بۆ پێشەوە نەدەڕۆشتن و کاتێك فارسەکان بەفیلەکانیان هێرشیان دەکردە سەرموسولمانان، بلاوەیان پێدەکردن و ئەسپەکان ڕەمیان دەکرد. فارسەکان بەتیر نیشانەیان دەگرتن و ژمارەیەکی زۆر لەموسولمانان کوژرا.

باوکی عوبەید بەناچاری دابەزی. شەرکەرانیش لەئەسپەکانیان هاتنەخوار و پیادە ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە. شمشێرەکان بەریەك کەوتن و کاتێك فیل هێرشی دەکردە سەر دەستەیەك، ئەوانی دوور دەخستەوە. باوکی عوبەید فەرمانیدا هێرش بکەنە سەر فیلەکان. خۆی هێرشی کردە سەر فیلە سپییەکە و بەندی کەژاوەی فیلەکەی قرتاند.

سوارەکانی کەوتنە خوار. کەسانی دیکەیش ئەو کارەیان کرد و هیچ فیلێك نەمایەوە شەڕکەرانی لەسەر بێت. فیلە سپییەکە هێرشی کردە سەر باوکی عوبەید. لووتی فیلی بەشمشێرەکەی بریندار کرد فیلەکە بەرگری لەخۆی دەکرد و بەدەست لەباوکی عوبەیدیدا و کەوتە سەرزەوی. فیلەکە بەقاچ چووە سەر جەستەی وەستا.

کاتێك موسوڵمانەکان باوکی عوبەیدیان لەژێر قاچی فیلەکەدا بینی، دەستەیەکیان ترسان. ئەو کەسەی دوای باوکی عوبەید سەرکردایەتی گرتەدەست، لەگەڵ فیلەکە شەڕی کرد تا قاچی لەسەر جەستەی باوکی عوبەید لابرد و بۆ لای موسوڵمانەکانی گەڕاندەوە و پەلاماری فیلەکەیدا. فیلەکەی ئەویشی کوشت و لەسەر جەستەی وەستا. حەوت کەس لەسەقیفییەکان یەك یەك ئالآکەیان هەڵگرت و شەڕیان کرد تا کوژران.

موسەنا ئالآکەی هەڵگرت و موسوڵمانان هەلآتن. کاتێك عەبدوللە کوڕی مورسەدی سەقەفی کوژرانی باوکی عوبەید و جێگرەکانی ئەوو هەلآتنی خەڵکی بۆ لای پردەکە بینی، ڕێگەی بەست و وتی: ئەی خەڵکینە، وەك سەرکردەکانی خۆتان پیاوانە شەڕ بکەن یا دەکوژرێن یا سەرکەوتن بەدەست دێنن.

فارسەکان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان لەترسا خۆیان خستە ناو ئاوەکەوە، ئەوەی خۆڕاگری نەکرد، خنکا و هەرکەس خۆڕاگری دەکرد ڕووبەرووی مەترسی کوژران دەبوویەوە. موسەنا لەگەڵ دەستەیەك لەسوارکاران پارێزگاری لەموسوڵمانەکان دەکرد و هاواری کرد: ئەی خەڵکینە من بەرگری دەکەم، بەهێواشی لەسەر پردەکە بپەڕنەوە و مەترسن. لێرە ناڕۆم تا ئێوە لەو بەری ئاوەکە دەبینم، خۆتان مەخنکێنن.

عەبدوللە کوڕی مورسەد لەسەر پردەکە وەستا و ڕێگەی لێ گرتن. ئەویان گرت و بردیانە لای موسەنا. موسەنا لێیدا و وتی: بۆ ئەو کارە دەکەیت؟

وتی: بۆ ئەوەی خەڵکان شەڕ بکەن.

موسەنا فەرمانیدا هەلآتووان کۆبکەنەوە و چەند کەسێك لەخەڵکانی ئەو ناوچەیان هێنا و کەشتییەکانی خۆیان لەجێگەیەکی چۆل دانا و خەڵکان پەڕینەوە. دوایین کوژراوی سەر پردەکە سەلیت کوڕی قەیس بوو. موسەنا لەپردەکەی پەڕییەوەو و پارێزگاری لەباڵەکەی خۆی دەکرد بەلآم سوپاکەی شڵەژا و پەرشیان بوو. بەهمەن مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد بەلآم نەیتوانی هیچ کارێك بکات. کاتێك موسەنا گەیشتە ناو شەڕکەران و خەڵکانی مەدینە بلآوەیان لێکرد و بۆ مەدینە گەڕانەوە، دەستەیەکی

دیکەیش لێی جیابوونەوە و روویان کردە ساراکان. موسەنا لەگەڵ چەند کەسێك مایەوە.

باوکی عوسمانی نەهدی دەڵێت: لەشەڕی پرد لەکوژراو و خنکاو، چوارهەزار کەس لەناوچوون و دوو هەزار کەس هەڵاتن و سێ هەزار کەس مایەوە. بەهمەن جادوویە لەکێشە و دووبەرەکییەکانی نێوخۆی ئێران ئاگادار بوویەوە و لەگەڵ سوپاکەی خۆی گەڕایەوە و بەمشێوەیە سوپاکەی ئەویش بڵاوەی لێکرد. موسەنا بریندار ببوو. چەند ئاڵقەیەکی زرێکەی لەجەستەی چەقیبوو.

ئەزر دەڵێت: کاتێك خەڵکان گەیشتنە مەدینە و وتیان لەگەڕانەوە بۆ ویلایەتەکانی خۆیان شەرمەزارن، عومەر خەمبار و بەزەیی بەواندا هاتەوە.

شەعبی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب وتی: خواوەندا، هەموو مووسڵمانەکانم بەخشی، من پشتیوانی هەر موسوڵمانێکم، هەر موسوڵمانێك کەرووبەرووی دوژمن بۆتەوە و گرفتاری بەلاّ و رەنج بووە، من کوڕوەی ئەوم، خواوەندا باوکی عوبەید ببەخشە، ئەگەر دەهاتە لای من، دەبوومە کوڕوەی ئەویش.

دەڵێت: موسەنا رووداوەکەی بە عەبدوللە کوڕی زەید بۆ عومەر نارد. ئەو یەکەم کەس بوو ڕۆشتە لای عومەر.

لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقیش ئەم شەڕە بەمشێوەیە باسی کراوە، بەلاّم دەڵێت: دومە دایکی موختار لەخەودا بینی پیاوێك لەئاسمانەوە هات، دەفرێکی بەدەستەوە بوو کەلێوانلێو بوو لەشەربەتی بەهەشت. باوکی عوبەید و جەبر کوڕی عوبەید و چەند کەسێك لەهاوەڵانی لێیان خواردەوە.

دەڵێت: کاتێك باوکی عوبەید فیلەکەی بینی، وتی: ئەم ئاژەڵە شوێنی کوشتنی هەیە؟ وتیان: بەڵێ، ئەگەر لووتی بقرتێت، دەمرێت.

باوکی عوبەید هێرشی کردە سەر فیلەکە و لووتی قرتاند. فیلەکە کەوت بەسەریا و باوکی عوبەیدیش مرد.

هەروەها دەڵێت: فارسەکان گەڕانەوە و موسەنا کوڕی حارسە لەئەلیس جێگیر بوو. خەڵکان بڵاوەیان لێکرد و گەڕانەوە بۆ مەدینە. یەکەم کەس کەعومەری لەم رووداوە ئاگادار کردەوە، عەبدوللە کوڕی زەید کوڕی حوسێن بوو.

عایشە هاوسەری پێغەمبەر(د.خ) دەڵێت: دەنگی عومەر کوڕی خەتابم بیست کاتێك

عەبدوللە کوڕی زەید هات، هاواری دەکرد: ئەی عەبدوللە کوڕی زەید، چ هەواڵێکت پێیە؟

عەبدوللە هاتە ناو مزگەوت و لەژوورەکەی من تێپەڕی، عومەر وتی: ئەی عەبدوللە کوڕی زەید، چ هەواڵێکت پێیە؟

عەبدوللە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەواڵی راست.

کاتێك لەعومەر نزیك کەوتەوە، لەرووداوەکان ئاگاداری کردەوە و وتی: کەسم نەبینوە هاوشێوەی عەبدوللە هەواڵەکانی بەراستی باس کردبێت.

دەڵێت: کاتێك هەلاّتووان گەیشتنە مەدینە، عومەر بینی ئەوان، لەموهاجیر و ئەنسار، لەتاو هەلاّتن و شکست، خەمبار و نیگەرانن، وتی: ئەی موسوڵمانان، خەمبار مەبن، من کوڕوەی ئێوەم، ئێوە گەڕاونەتەوە بۆلای من.

محەممەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی حوسێن دەڵێت: مەعاز قورئان خوێنی منالەکانی نەجار یەکێك لەبەشدار بووانی شەڕی پرد و یەکێك بوو لەهەلاّتووان. کاتێك ئەم ئایەی دەخوێندەوە:

((ومن يولهم يومئذ دبره الا متحرفالقتال، او متحيزا الى فئة فقد باء بغضب من الله و مأواه جهنم و بئس المصير.

واتاکەی: هەرکەس لەو رۆژەدا پشتی خۆی بکاتە ئەوان، مەگەر ئەوەی بۆ هێرشێك خۆی ئامادە بکات یا پەیوەستی دەستەیەکی دیکە بێت، گرفتاری غەزەب و تورەی خواوەند دەبێتەوە، جێگەی ئەو جەهەننەمە و سەرئەنجامێکی خراپە.))

لەخوێندنەوەی ئەم ئایە دەستی بەگریان دەکرد و عومەر پێی دەوت: مەعاز مەگری، من کوڕوەی تۆم، تۆ گەڕاوەیتەوە بۆ لای من.

## ئەلیسی بچوك

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەحەدیسی عەتییەدا هاتووە، جاپان و مەردانشا هاتن و ڕێگەیان بەست و چاوەڕوانی پرژ وبلاوبوونەوەی موسوڵمانانیان دەکرد و لەکێشەی دووبەرەکی فارسەکان بیٚ ئاگا بوون. کاتێك فارسەکان بلاوەیان لێکرد و بەهمەن بەدوای ئەواندا گەڕایەوە و موسەنا لەمەبەستەکەی جاپان و مەردانشا ئاگادار بوویەوە، عاسم کوڕی عەمرۆی وەك فەرماندەی سوپاکەدانا و لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکان مەبەستی شەڕ کردن لەگەڵ ئەوانی کرد چوونکە گومانیان دەکرد هەلاتووە و ڕێگەکەیان لیٚ بەست. هەردووکیان ئەسیر کران و خەڵکانی ئەلیس هێرشیان کردە سەر سوپاکەی ئەوان و ژمارەیەکی زۆر ئەسیریان لای موسەنا کۆکردەوە. پەیمانی پشتیوانی کردنی بەواندا و جاپان و مەردانشای بانگ کرد و وتی: ئێوە ئەمیرەکەی ئێمەتان فریودا و درۆتان کرد، ئەوانی کوشت. ئەسیرەکانیشی کوشت. دواتر بۆ ئوردووگاکەی خۆی گەڕایەوە.

دەڵێت: باوکی میحجەن لەئەلیس هەلاّت و لەگەڵ موسەنا گەڕایەوە.

دەڵێت: جەریر کوڕی عەبدوللە کوڕی حەنزەلە کوڕی ڕەبیع و چەند کەسێکی دیکە داوای مۆڵەتیان لەخالید کوڕی وەلید کرد. خالید مۆڵەتی پێدان و ئەوان گەڕانەوە بۆ لای ئەبوبەکر. جەریر مەبەستەکەی خۆی لەگەڵ باس کرد و ئەبوبەکر وتی: لەئێستادا؟ کارەکەی ئەوی دواخست و کاتێك عومەر خەلافەتی گرتەدەست، داوای شایەتی کرد و کاتێك شایەتەکانی بردە لای عومەر. عومەر نامەی بۆ لێپرسراوانی خۆی لەهۆزەکانی عەرەب نووسی: هەرکەسێك لەسەردەمی جاهلییەت ڕچەڵەکی دەگەڕێتەوە سەر بوجەیلە و لەئیسلامیشدا بەمشێوەیە، بۆ جەریری بنێرن.

جەریر بەڵێنی بەخەڵکەکەی خۆیدا کەجێگەیەکیان لەنێوان عێراق و مەدینە دەبێت. کاتێك خەڵکانی بوجەیلەی لەناو هۆزە عەرەبەکان کۆکردەوە، لەسەر چالاٚوێك لەنێوان مەککە و مەدینە و عێراق، بڕیاری کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەواندا. عومەر فەرمانی بەجەریردا: بڕۆ پەیوەستی موسەنا ببە.

جەریر وتی: بەرەو شام دەڕۆم.

عومەر وتی: بەرەو عێراق بڕۆ چوونکە موسوڵمانان بەسەر دوژمندا زاڵبوون. جەریر نەیدەویست بڕوات و عومەر بۆ ڕۆشتن ناچاری کرد. کاتێك مەبەستی ڕۆشتن بۆ

عێراقیان کرد، عومەر بۆ دڵنەوای کردنی ئەو، یەك لەسەر چواری ئەو تالآنییانەی خەڵکەکەی لەشەڕ بەدەستیان دەهێنا، پێی بەخشین. ئەوان گەڕانەوە بۆ مەدینە و لەوێوە ڕێگەی عێراقیان گرتەبەر تا هاوکاری موسەنا بکەن.

دەڵێت: عومەر عیمەس کوڕی عەبدوللەی زەببی لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی شوێنکەوتەی خۆی بۆ هاوکاری موسەنا نارد. کاتێك نامەی بۆ هەڵگەڕاوەکان نووسی، ئەوانەی لەمانگی شەعبان هاتن، ئەوانیشی بۆ هاوکاری کردنی موسەنا ڕەوانە کرد.

## شەڕی بوەیب

زیاد دەڵێت: دوای شەڕی پرد موسەنا کەسی بۆ لای پشتیوانەکانی دەوروبەری خۆی نارد و ژمارەیەکی زۆر لەدەوری کۆبوونەوە. ڕۆستەم و فیروزان ئاگادار بوونەوە و سیخوڕەکان پێیان ڕاگەیاندن کەموسوڵمانەکان چاوەڕوانی هێزی پشتیوانن. بڕیاریاندا مێهرانی هەمەدانی بنێرن. مێهران لەگەڵ سوارەکان بەرێکەوت و فەرمانیان پێدا رووبکات حیرە. موسەنا لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە. لەم کاتەدا لەگەڵ ئەو دەستانەی بۆ هاوکاری کردنی هاتبوون لەمەرج ئەلسەباخ لەنێوان قادسیەو خەفان ئوردووی لێدابوو. بیشر و کەنانە هەواڵەکانیان بۆ دەهێنا. بیشر لەحیرە بوو و ڕووی کردە فورات بادقلی وکەسی بۆ لای جەریر و هاوەڵانی ئەونارد کە: هەواڵێکمان پێگەیشت نەمانتوانی بمێنینەوە تا ئەو کاتەی ئێوەیش پەیوەستی ئێمە دەبن. پەلە بکەن و لەبوەیب کۆببنەوە. جەریر هاوکاری موسەنا بوو.

موسەنا بۆ عیسمە و هاوەڵانانی و هەموو سەردارەکانی دیکە کەبۆهاوکاری کردنی ئەو هاتبوون، نامەیەکی بەو ناوەڕۆکە نووسی و وتی: لەرێگەی جوفەوە وەرن، ئەوانیش بۆ تێپەڕین لەقادسیە و جوف مەبەستی ئەویان کرد. موسەنا لەسواد گوزەری کرد و لەنەهرەین و خوەرنەق تێپەڕی. عیسمە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی نەجەف بەجێهێشت و جەریر و هاوەڵانی لەجوف پەڕینەوە و هەمووان لای موسەنا لەبوەیب کۆبوونەوە. میهران لەوبەر فورات لەبەرابەر ئەو ئوردووی لێدا بوو. ئوردووگای موسوڵمانان لەبوەیب، شوێن لەنزیك کوفەیە و لەبەرابەر ئوردووگای مێهران، موسەنا سەرکردەی خەڵکان بەیەکێك لەدانیشتووانی سوادی وت: شوێنی ئوردووگاکەی مێهران ناوی چییە؟

وتیك بەسوسیا.

موسەنا وتی: مێهران لەناچوو و لەشوێنێك ئوردووی لێدا کەبەسوسە. بەسوس بەمانای کەمی و بەربلاوی و کەمی شیری وشترە. موسەنا لەشوێنەکەی خۆی مایەوە تا مێهران نامەی بۆ نووسی، یا ئێوە بپەڕنەوە بۆ لای ئێمە، یا ئێمە دەپەڕینەوە.

موسەنا وەلامی بۆ نارد: ئێوە بپەڕنەوە.

مێهران لەرووبارە پەڕییەوە و لەکەنارەکانی فورات لەمەڵتات لەنزیك موسوڵمانان دابەزی. موسەنا بەو پیاوە سوادییەی وت: ئەو زەوییەی مێهران و سوپاکەی لەوێ دابەزین، ناوی چییە؟

وتی: شومیا. ئەمە لەمانگی رەمەزاندا بوو.

موسەنا فەرمانیدا: پێشڕەوی بکەن.

موسەنا سوپاکەی رازاندبوویەوە و مەزعور و نەسیری وەك فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەی دانا. عاسم سەرکردەی پیادەکان و عیسمە پێشەنگ بوو. هەردوولا ریزیان بەست و موسەنا لەناو موسوڵمانان قسەی کرد و وتی: ئێوە بەرۆژن و رۆژو هوکارێکە بۆ لاوازی، بۆچوونی من ئەوەیە رۆژو بشکێنن و بخۆن تا هێز وەربگرن.

وتیان: ئەو کارە دەکەین. رۆژویان شکاند.

موسەنا کەسێکی بینی لەریزەکان جیادەبێتەوە، وتی: ئەوە چی دەکات؟

وتیان: یەکێکە لەو کەسانەی لەشەڕی پرد هەڵاتووە و دەخوازێت شەڕ دەستپێبکات.

موسەنا بەرم لێیدا و وتی: ئەبی بێ باوك! لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە و کاتێك دوژمن هات رووبەرووی ببەرەوە، بەلام شەڕ دەستپێمەکە.

ئەو کەسە وتی: ئەو کارە دەکەم، گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

شەعبی دەڵێت: کاتێك دەستەی بوجەیلە کۆببوونەوە، عومەر وتی لای ئێمەوە برۆن. سەران و سەرکردەکانی بوجەیلە هاتن.

عومەر وتی: حەزتان لەکام بەرەی شەڕە؟

وتیان: شام چوونکە بەشی زۆری خەڵکانی ئێمە لەوێن.

وتی: بەرەو عێراق برۆن چوونکە لەشام بەئەندازەی پێویست شەڕکەری لێیە. ئەوان رازی نەبوون تا ئەوەی فەرمانیدا یەك لەسەر چواری تالانییەکان بەبەشی ئەوان زیاد بکرێت. عەرەفجەی وەك سەرکردەی تیرەی جەدیلەی بوجەیلە دەستنیشان کرد و

جەریری وەك سەركردەی منداڵەكانی عامر و كەسانی دیكە.

دەڵێت: ئەبوبەكر ئەوی لەگەڵ شەڕكەران بۆ شەڕ كردن لەعەممان راسپاردبوو و كاتێك لەدەریا شەڕی كرد ئەوی گەڕاندەوە و عومەر بەشی زۆری خەڵكانی بوجەیلەی بەوسپارد و وتی: شوێنكەتەی ئەمە بن.، بەكەسانی دیكەی وت: شوێنكەوتەی جەریر بن.

جەریر بەخەڵكانی بوجەیلەی وت: ئایا دەبنە شوێنەكەوتەی ئەم كەسە كەئەو بەڵای بەسەر ئێمەدا هێنا؟

خەڵكانی بوجەیلە بەهۆی یەكێك لەژنەكانیانەوە لەعەرەفجە تورە بوون. كۆبوونەوە و ڕۆشتنە لای عومەر و وتیان: ئێمە بەسەركردایەتی عەرەفجە رازی نابین.

عومەر وتی: لەعەرەفجە چاو ناپۆشم كەپێش هەمووتان باوەڕی بەئیسلام هێناوە و لەرێگەی خوا لەهەمووتان زیاتر تێكۆشاوە.

وتیان: كەسێك لەخۆتان بكە سالاری ئێمە.

عومەر هەستی كرد لەڕەچەڵەكی ئەو گومان دەكەن و وتی: ئاگاتان لەقسەكانتان بێت.

وتیان: قسەی ئێمە ئەوەیە.

عومەر كەسی بۆ لای عەرەفجە نارد، هات و وتی: ئەوان بەسەركردایەتی تۆ رازی نین و گومان دەكەن لەوان نیت، تۆ دەڵێی چی؟

وتی: راست دەكەن و نامەوێت لەوان بم چوونكە من لەخەڵكانی ئەزدم لەتیرەی بارق لەدەستەیەكی بێ ژماری خاوەن ڕەچەڵەك و نەژادی پاك.

عومەر وتی: ئەزد خەڵكانێكی چاكەكارن و لەخراپ و باش پشكیان بەركەوتووە.

عەرەغجە وتی: خراپە لەناو ئێمەدا بلاوبوویەوە چوونكە لەیەك سەرزەمیندا بووین، خوێنی یەكمان ڕشت و ستەمكاریمان كردە پیشە و من لەخەڵكەكەی خۆم ترسام و لەوان دابڕام و پەیوەستی ئەوان بووم. سەركردەی ئەوان بووم و سەبارەت بەڕووداوەی لەنێوان من و وەرزێرەكانی ئەوان روویدا، لەمن دڵگرانن و ڕژدیم پێدەبەن.

عومەر وتی: گرنگ نەبێت بەلاتەوە، كاتێك بەتۆ دڵخۆش نین، سەركردایەتی ئەوان لەئەستۆ مەگرە. جەریری وەك سەركردەی ئەوان دانا و وای نیشانی خەڵكانی جەدیلە و بوجەیلەدا مەبەستی ئەوەی كردووە عەرەفجە بۆ شام ڕەوانە بكات و ئەوان خوازیاری ڕۆشتن بۆ عێراق بوون. جەریر لەگەڵ خەڵكەكەی خۆی بۆ هاوكاری كردنی موسەنا

رووی کردە عێراق و گەیشتە زیقار و لەوێوە ڕۆشتە جەل. موسەنا لەمەرج ئەلسەباخ و لەوتەکەی بەشیر لەحیرە ئاگادار ببوویەوە کەعەجەمەکان مێهرانیان ناردووە و لەمەدایینەوە بەرەو حیرە دێت. کەسی بۆ لای جەریر و عیسمە نارد و بۆ ئەوەی لەزووترین کات پەیوەستی بین. عومەر فەرمانی پێدابوون تا ئەو کاتەی سەرکەوتن بەدەست نەهێنن لەرووبار یا پردێك نەپەڕنەوە. لەبوەیب کۆبوونەوە و دوو ئوردووگا لەکەنارەکانی رۆژهەلاتی بوەیب پەیوەستی یەکبوون.

بوەیب لەرۆژگاری فارسەکان کەئاو بەرز دەبوویەوە، زەلکاوی فارسەکان و دەرژایە جووف. ئوردوگای فارسەکان لەدار ئەلوەرەق و موسولمانەکان لەسەکون بوون.

موجالید دەلێت: شەرکەرانی منالەکانی کەنانە و ئەزد حەوتسەد کەس بوون، رۆشتنە لای عومەر، پێی وتن: حەزتان لەکام بەرەی جەنگە؟

وتیان: شام چوونکە زۆربەی کەسەکانی ئێمە لەوێن.

عومەر وتی: شام بەئەندازەی پێویست شەڕکەری لێیە، عێراق، عێراق، سەرزەمینێك کەخواوەند شکۆ و ژمارەی ئەوانی کەم کردۆتەوە، پشتگوێ بخەن و بۆ شەڕی ئەو خەلکانە بڕۆن کەبەشێوەیەکی ئاسوودە ژیان بەسەر دەبەن، ئەگەری هەیە خواوەند بەشێك لەئاسوودەی ئەوان بەئێوە ببەخشێت.

غالیب کوڕی فلانی لەیسی و عەرەفجەی بارقی هەرکام بەخەلکەکەی خۆیان وت و فەرمانیان پێدان بەوتەی سەروەری باوەڕداران رازی بین.

وتیان: ئێمە شوێنکەوتەی تۆ و سەروەری باوەڕدارانین.

عومەر کوڕی خەتاب دۆعای خێری بۆ کردن. غالیب کوڕی عەبدوللەی وەك سەرکردەی منالەکانی کەنانە و ئەوی ڕەوانە کرد، عەرەفجە کوڕی هەرسیمەی کردە سالاری خەلکانی ئەزد کەزۆربەیان لەتیرەی بارق بوون، ئەوان دلخۆش بوون بەوەی عەرەفجە گەڕاوەتەوە بۆ ناویان. ئەم دوو سەرکردەیە لەگەلٚ شەرکەرەکانیان بەرێکەوتن و لەعێراق پەیوەستی موسەنا بوون.

عەمرۆ دەلێت: هیلال کوڕی عەلفەی تیمی لەگەلٚ کەسانێك لەخەلکی ڕەباب، ڕۆشتە لای عومەر. عومەر کوڕی خەتاب ئەوی کردە سەرکردەی خەلکەکەی و بۆ عێراقی ناردن، کوڕی موسەنای جوشەمی سەعدی هات و ئەوی کردە سەرکردەی منالەکانی سەعد و ڕەوانەی کردن و لەعێراق پەیوەستی موسەنا بوون.

شەعەبی دەڵێت: عەبدوللە کوڕی زوئەلسەهمەین لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی خەسعەم هات. عومەر کوڕی خەتاب ئەوی کردە سەرکردەی خەڵکەکەی و بۆ عێراق، ڕەوانەی کردن.

عەمرۆ دەڵێت: ڕەبعی لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی حەنزەلە هات و عومەر ئەوی کردە سەرکردەی ئەوان و بەرێکەوتن تا پەیوەستی موسەنا بوون، دوای ئەو کوڕەکەی شیبس کوڕی ڕێبعی سەرکردایەتی خەڵکانی گرتە ئەستۆ و دەستەیەك لەمناڵەکانی عەمرۆ هاتن و عومەر، ڕێبعی کوڕی عامر کوڕی خالیدی عەنوودی کردە سەرکردەی ئەوان و ڕەوانەی عێراقی کردن.

هەروەها دەستەیەك لەمناڵەکانی زەببە هاتن و ئەوانی کردە دوو دەستە، سەرکردایەتی دەستەیەکی بە باوکی هوبەرە و سەرکردایەتی دەستەکەی دیکەی بەمونزەر کوڕی حساندا، قورت کوڕی جوماح لەگەڵ دەستەیەك لەمناڵەکانی عەبدقەیس هات و ئەوانیشی ڕەوانە کرد.

دەڵێن: کاتێك فیروزان و ڕۆستەم بڕیاریاندا مێهران بۆ شەڕی موسەنا ڕەوانە بکەن، داوای مۆڵەتیان لەپووران کرد. کاتێك کارێکیان دەبوو لێی نزیك دەکەوتنەوە تا گفتوگۆی لەگەڵ بکەن و کاتێك بۆچوونی خۆیان باس کرد، سەبارەت بەژمارەی سوپاکە ئاخاوتن. پارسەکان پێش هێرشی عەرەبەکان سوپای فراوانیان بۆ شوێنێك ڕەوانە نەدەکرد و کاتێك زۆری سوپاکەیان لای پوران باس کرد، وتی: بۆ پارسەکان هاوشێوەی ڕۆژگاری کۆن هێرش ناکەنە سەر عەرەبەکان و بۆ کاروباری سوپا هاوشێوەی پاشاکانی کۆن نییە؟

وتیان: لەو ڕۆژگارەدا دوژمنانی ئێمە ترسەنۆك و هەنووکە ترس لەناو سوپاکەی ئێمەدا بڵاو بۆتەوە.

پووران بۆچوونەکەی ئەوانی پەسەند کرد و مێهران لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و لەکەنارەکانی فورات ئوردوی لێدا. موسەنا و سوپاکەی لەکەناری دیکەی فورات و فورات لەنێوان ئەواندا بوو.

لەم کاتەدا ئەنس کوڕی هیلالی نەمری لەگەڵ دەستەیەك لەمەسیحییەکانی نەمر لەگەڵ ئەسپەکانی خۆیان بۆ هاوکاری کردن پەیوەستی موسوڵمانان و موسەنا بوو. هەروەها کوڕی پیاوێکی فێهری تەغلەبی لەگەڵ مەسیحییەکانی تەغلەب بۆ هاوکاری کردنی ئەوان هاتن. ناوی ئەو پیاوە عەبدوللە کوڕی کەلیب کوڕی خالید بوو.

مەسیحییەکان کاتێك بینیبوویان عەرەبەکان لەبەرابەر عەجەمەکان ئوردوویان لێداوە، وتبوویان ئێمەیش شان بەشانی خەڵکەکەی خۆمان شەڕ دەکەین.

مێهران وتی: یا ئێوە بپەڕنەوە یا ئێمە لەرووبار دەپەڕینەوە.

موسوڵمانان وتیان: ئێوە لەرووبارە بپەڕنەوە.

فارسەکان لەبەسوسیا روویان کرد شومیا کەشوێنی دارئەلرزق بوو.

موحفیز دەڵێت: کاتێك عەجەمەکان مۆڵەتی پەڕینەوەیان پێدرا، لەشومیا جێگیر بوون کەشوێنی دار ئەلرزقە. لەوێ ریزیان بەست و لەسێ ریزدا رووبەرووی موسوڵمانان بوونەوە. هەر ریزێك فیلێکی لەگەڵدا بوو. پیادەکان لەپێش فیلەکان و لەکاتی پێشڕەوی هۆنراوەیان دەخوێندەوە.

دەڵێت: موسەنا بەموسوڵمانانی وت: ئەوەی دەیبیستن، فیڕۆیە و ئێوە بێدەنگ بن.

خەڵکان بێدەنگ بوون. فارسەکان لەموسوڵمانان نزیك کەوتنەوە و لەلای رووباری منالەکانی سەلیم کەهەنووکەیش رووباری منالەکانی سەلیم لەوێیە، هاتنەپێش و موسوڵمانان لەنێوان شوێنێك کەهەنووکە رووباری منالەکانی سەلیمە، لەملای رووبارەکە، ریزیان بەستبوو.

تەڵحە دەڵێت: بەشیر و بوسر کوڕی ئەبی رۆهم فەرماندەی باڵەکانی سوپاکی موسەنا بوون و مەعنی سەرکردەی سوارەکان و مەسعود سەرکردەی پیادەکان و بوسر پێشتر فەرماندەی پێشەنگەکان و مەزعور فەرماندەی دواوەی سوپاکە بوو.

دەڵێت: فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەی مێهران کوڕی ئەزازبە سنورداری حیرە و مەردان شا بوون.

موسەنا هاتەناو ریزی سوپای موسوڵمانان و قسەی لەگەڵ کردن. سوار ئەسپی شەموس بوو. ئەسپەکەی ئەویان بەشەموس ناودەبرد. موسەنا لەکاتی شەڕ سوار ئەو ئەسپە دەبوو و لەکاتی ئارامی خزمەتی دەکرد. لای یەك یەکی ئالآکان وەستا و بۆ شەڕ کردن هانیدان و لەفەرمانەکانی خۆی ئاگاداری کردنەوە و تایبەتمەندییەکانی هەردەستەیەکی هێنایە سەرزمان و بەهەموویانی وت هیوادارم ئەمڕۆ لەشوێنەکەی ئێوەوە زیان بەعەرەبەکان نەگات، سوێند بەخوا ئەوەی ئەمڕۆ من دڵخۆش دەکات، بۆ ئێوەیش دەخوازم. بەشێوەیەکی پەسەند وەڵامیان دایەوە.

دەڵێت: موسەنا بەوتار و کردار دادپەروەری لەگەڵ خەڵکان دەکرد و لەچاکە و

خراپەی ئەوان خۆی دەکردە شەریك. کەس نەیدەتوانی رەخنە لەوتار یا ئاکارەکانی بگرێت.

وتی: سێ جار تەکبیر دەڵێم، خۆتان ئامادەکەن و لەگەڵ تەکبیری چوارەمی من، هێرش بەرن. کاتێك تەکبیری یەکەمی وت، فارسەکان هێرشیان هێنا و موسوڵمانان رووبەروویان بوونەوە. موسەنا لەیەکێك لەریزەکانی خۆی لاوازی و سستی بینی و کەسی بۆ لای ئەوان نارد و وتی: سەرکردە سڵاوتان دەگەیێنێت و دەڵێت مەبنە هۆکاری ریسوایی موسوڵمانەکان. وتیان: بەسەرچاو. ریزەکەیان راست کردەوە، پێشتر بینیبوویان موسەنا لەتاو ئەوان ریشی خۆی رادەکێشا و بۆ کردەوەکانیان سەرکۆنەی دەکردن. ئەمجارە سەیریان کرد و بینیان لەخۆشحاڵیدا پێدەکەنێت. ئەوان، منداڵەکانی عێجل بوون.

دەڵێت: شەڕ درێژ و رووی لەدژواری کرد، موسەنا رووی کردە ئەنس کوڕی هیلال و وتی: ئەی ئەنس، تۆ پیاوێکی عەرەبیت، هەرچەندە لەسەر دینەکەی ئێمە نیت، کاتێك بینیت هێرشم کردە سەر مێهران، لەگەڵ من هێرش بێنە. بەپیاوی فێهریشی وت. موسەنا هێرشی بردە سەر مێهران و پاشەکشێی پێکرد. مێهران رووی کردە باڵی راستی سوپاکەی خۆی. دوو دڵی سوپا پەلاماری یەکیاندا و تەپ و تۆز لەگۆڕەپانی شەڕ بەرزبوویەوە. باڵەکانیش سەرقاڵی شەڕی یەکتر بوون و نەیاندتوانی هاوکاری فەرماندەو سەرکردەکەی خۆیان بکەن.

دەڵێت: لەم رۆژەدا مەسعود و دەستەیەك لەسەرکردەکان بریندار بوون و ئەوانیان لەگۆڕەپانی شەڕ بردەدەر. پێیان وتبوون: ئەگەر بینیبووتان ئێمە کوژراین، دەست لەشەڕ هەڵمەگرن تا سوپاکە لاواز نەبێت، بجەنگن و هاوکاری کەنارەکانی خۆتان بکەن.

شەڕکەرانی دڵی سوپای موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆر لەدڵی سوپای فارسەکانیان کوشت. گەنجێك لەمەسیحییەکانی تەغلەب مێهرانی کوشت و سوار ئەسپەکەی بوو. موسەنا سیلاح و جل و بەرگی ئەوی بەسەرکردەی سوارەکان بەخشی. بەمشێوەیە کاتێك ناباوەڕێك بەدەستی سوارێك دەکوژرا، جل و بەرگ و سیلاحەکەی تایبەت بوو بەسەرکردەی ئەو دەستەیە. کۆیلەی تەغلەبی دوو سەرکردەی بوو، یەکیان جەریر و ئەوی دیکەیان کوڕی هوبەرە. سیلاح و جل و بەرگەکانی مێهرانیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد.

مەحفیز کوڕی سەعلەبە دەڵێت: گەنجەکانی منداڵەکانی تەغلەب سوار ئەسپ بوون و

کاتێك لەشەڕی بوەیب موسوڵمانان و فارسەکان ڕوویەروو یەکبوونەوە، وتیان: هاوریٚ لەگەڵ عەرەبەکان شەڕ لەگەڵ عەجەمەکان دەکەین. یەکێك لەوان مێهرانی کوشت. مێهران سوار ئەسپێکی موو سوور و زرێیەکی زەردی لەبەردا بوو. کاتێك گەنجی تەغلەبی مێهرانی کوشت، سوار ئەسپەکەی بوو و هاواری کرد من گەنجی تەغلەبیم، من مێهرانم کوشت. جەریر و کوڕی هەوبەرە هاتن و قاچی ئەویان گرت و لەئەسپەکە هێنایانە خوار.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: جەریر و مونزەر لەکوشتنی مێهران بەشدار بوون و سەبارەت بەسیلاحەکەی ئەو کێشەیان بۆ دروست بوو. داوەریان بردە لای موسەنا. ئەو سیلاح و پشتێنەکانی لەنێوان ئەواندا دابەش کرد چوونکە ئەوان شکستیان بەدڵی سوپای ناباوەڕان هێنا بوو.

کوڕی ڕوەق دەڵێت: ڕوومان کردە بوەیب و لەویٚ لەنێوان سەکون و منداڵەکانی سەلیم، ئێسقانی سەر و ئەندامی کوژراوەکانمان بینی، سپی بوون و دەدرەوشانەوە و هۆکارێك بوون بۆ وانە وەرگرتن.

دەڵێت: ئەو کەسانەی ئەوەیان بینی، گومانیان کردووە ئێسقانی یەك سەد هەزار مردووە.

تەڵحە دەڵێت: کاتێك تەپ و تۆز بەرزبوویەوە، موسەنا مایەوە تا تەپوتۆز دامرکایەوە. دڵی سوپای فارسەکان شکستی خوارد. باڵەکانی سوپا سەرقاڵی شەڕ کردن بوون و کاتێك موسوڵمانان بینیان، شەڕکەرانی دڵی سوپاکەیان توانیویەتی شکست بەناباوەڕان بێنن، هێز و ورەیان زیادی کرد و بەگوڕ و تینێکی زیاترەوە جەنگان. موسەنا دۆعای بۆ دەکردن و لەخوا دەپاڕایەوە. بەردەوام کەسی دەنارد و دەیوت: هاوکاری خواوەند بکەن تا هاوکاریتان بکات. موسوڵمانان توانیان شکستیان پیٚ بێنن و موسەنا پێش ئەوان خۆی گەیاندە پردەکە و ڕێگەی لیٚ بەستن. لەکەنارەکانی فورات بوونە دوو دەستەو بۆ سەروخوار ڕایان دەکرد. سوارەکانی موسوڵمان شوێنیان دەکەوتن و دەیانکوشتن. بەشێوەیەك لەهیچ کام لەشەڕەکانی نێوان عەرەب و عەجەم بەو ئەندازەیە ئێسقان نەمایەوە.

دەڵێت: مەسعود کوڕی حارسە بریندار بوو و پێش شکستی دوژمن کوژرا. ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو بوون، ورەیان نەما. مەسعود لەسەرەمەرگدا وتی: ئەی منداڵەکانی

بەکر کوڕی وایل، ئالآکانی خۆتان بەرز بکەنەوە، سوێندتان دەدەم بەخوا گرنگی بەکوژرانی من نەدەن.

دەڵێت: ئەو ڕۆژە ئەنس کوڕی هیلالی نەمری شەڕی کرد تا کوژرا. موسەنا ئەوی لەگۆڕەپانی شەڕ بردەدەر و لای مەسعود داینا و هەروەها قورت کوڕی جوماحی عەبدی جەنگان و چەندین ڕم و شمشێری شکاند و شەهریەراز وەرزێری فارسی و سەرکردەی سوارەکانی مێهرانی کوشت.

دەڵێت: کاتێك شەڕەکە کۆتایی پێهات، موسەنا لەگەڵ خەڵکان دانیشت و قسەی کرد و قسەیان کرد. کاتێك کەسێك دەهات، دەیوت: سەبارەت بەکارەکەی خۆت قسە بکە.

قورت کوڕی جوماح وتی: کەسێکم کوشت بۆنی موشکی لێدەهات، گومانم کرد مێهرانە و هیوادار بووم ئەو بێت بەڵآم بۆم دەرکەوت شەهریەراز سەرکردەی سوارەکانە.

موسەنا وتی: لەرۆژگاری جاهلییەت لەگەڵ عەرەب و عەجەم جەنگاوم. سوێند بەخوا لەرۆژگاری جاهلییەت سەد عەجەم بەهێزتر لەهەزار عەرەب بوو و هەنووکە سەد عەرەب بەرابەر لەگەڵ هەزار عەجەم چوونکە خواوەند شکۆ و مەزنی لەوان سەندەوە و هێزی ئەوانی لەناو برد. زرق و برق و ژمارەی شەڕکەران و کەوانە کراوەکان و تیرە درێژەکانیان ئێوە نەترسێنێت چوونکە کاتێك لێی جیاببنەوە یا لەدەستی بدەن، هاوشێوەی چوارپێکان بۆ کوێ پێتان خۆش بێت، دەتوانن لێیان خوڕن.

ڕێبعی لەگەڵ موسەنا قسەی کرد و وتی: کاتێك بینیم شەڕ بەردەوامە، وتم قەڵغانەکان بەرز بکەنەوە چوونکە دوژمن هێرش دەهێنێت، لەبەرابەر دوو هێرشی ئەوان خۆڕاگری بکەن و لەسێیەم هێرش سەرکەوتن بەدەست دێنن. شەڕکەران ئەو کارەیان کرد و خواوەند بەڵێنەکەی منی هێنایەدی.

کوڕی زوئەلسەهمەین دەڵێت: بەهاوەڵآنی خۆم وت، بیستم سەرکردە قورئان دەخوێنێت و باسی ترس دەکات. بەشوێن ئالآکەی خۆتانەوە بن، پارێزگاری لەسوارەکان بکەن و هێرش بەرن چوونکە بەڵێنەکانی خواوەند دێتەدی. خواوەند بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدی.

عەرەفجە وتی: دەستەیەك لەوانمان بۆ لای فورات دوور خستەوە و هیوادار بووین خواوەند فەرمانی خنکانی ئەوانی دابێت و ئەو بەڵای لەشەڕی پرد بینیمان، قەرەبوو بکرێتەوە. کاتێك ڕووبەرووی مەترسی بوونەوە، هێرشیان کردە سەر ئێمە و شەڕمان لەگەڵ کردن تا ئەوەی کەسێك بەمنی وت: چی دەبێت ئەگەر کەمێك پاشەکشێ

بەئالآکەی خۆت بکەیت.

وتم: دەبێت بۆ پێشەوەی ببەم. هێرشم کردە سەر فەرماندەی دواوەی سوپاکەی ئەوان و کوشتم. عەجەمەکان روویان کردە وفورات و هەڵاتن بەڵام کەسیان بەزیندووی رزگاری نەبوو.

رەبیعی کوڕی عامر کوڕی خالید دەڵێت: لەشەڕی بوەیب لەگەڵ باوکم بووم. بوەیبیان بەشەڕی دەیانەکان ناو دەبرد چوونکە لەو رۆژەدا سەد کەسیان نیشاندابن کەهەرکام نزیکەی دەکەسی لەگۆڕەپانی شەڕدا کوشتبوو. عوروە کوڕی زەید ئەلخەیل یەکێك بوو لەو کەسانەی نۆ کەسی کوشتبوو، عەرەفجە سەرکردەی خەڵکانی ئەزد نۆ کەسی کوشتبوو. ناباوەڕان لەنێوان ئەو شوێنەی ئێستاکە سەکوونە، تا کەناری فورات و کەناری رۆژهەلاتی بوەیب کوشتار کران بەهۆی ئەوەی کاتێك شکستیان خوارد، موسەنا پێش ئەوان خۆی گەیاندە پردەکە و ئەوان رێگەی چەپ وراستیان گرتەبەر و موسوڵمانان تا کاتی شەو بەشوێنکەوتن و کوشتنی ئەوان سەرقاڵ بوون. رۆژی دواتر تا شەو ئەم کارە بەردەوام بوو.

دەڵێت: موسەنا لەبەستنی رێگەی پردەکە پەشیمان بوویەوە و وتی: کارێکی نارەوام کرد، خواوەند لەخراپە بمپارێزێت چوونکە پێش ئەوان رێگەی پردەکەم بەست و رێگە چارەی ئەوانم بڕی. چیتر هیچ کات ئەو کارە دووبارە ناکەمەوە، ئێوەیش کاری لەو شێوە مەکەن. هەڵە بوو، نابێت رێگەی دەرباز بوون لەکەس بگرین مەگەر ئەو کەسەی هچ توانایەکی بەرگری کردنی نەبێت.

دەڵێت: کەسانێك لەسەرکردە بریندارەکان کوژران. خالید کوڕی هیلال و مەسعود کوڕی حارسە لەناو کوژراوەکاندا دەبینران. موسەنا نوێژی لەسەر خوێندن و جەنازەکانی کرد بەنووکی ڕم و شمشێرەکان و وتی: سوێند بەخوا ئەم کارە خەمەکانم ناهێڵێت چوونکە لەشەڕی بوەیب بەشدار بوون و خۆڕاگرییان کرد و نەترسان و شەهادەت، کەفارەی هەموو گوناحەکانە.

زیاد دەڵێت: موسەنا و عیسمە و جەریر لەبوەیب خواردەمەنییەکانی مێهرانیان تالآن کرد کەبریتی بوو لەمەڕ و مانگا و ناردیان بۆ ژن و منالی ئەو کەسانەی لەمەدینەوە هاتبوون. ئەوان ژن و منالەکانی خۆیان لەقەوادیس دانابوو. هەروەها بەشی ژن و منالی شەرکەرانی پێشوویان نارد کەلەحیرە بوون. ئەو کەسانەی خواردنەکانیان برد عەمرۆ

کوڕی عەبدولمەسیح کوڕی بەقیلە بوو. کاتێك گەیشتنە لای ژنان و سوارەکانیان بینی، هاواریان بەرز کردەوە و گومانیان کرد هێرشیان کراوەتەسەر. بەبەرد و دار بەرگرییان لەمناڵەکان دەکرد. عەمرۆ وتی: ژنانی ئەم سوپایە دەبێت بەمشێوە بن. مژدەی سەرکەوتنیان بەژنان بەخشی و وتیان: ئەمە سەرەتای کارە.

بوسر سەرکردەی ئەو کاروانە بوو کەخواردنەکانیان دەبرد. چەندین پاسەوانی بۆ خواردنەکان دانابوو. عەمرۆ کوڕی عەبدولمەسیح لەگەڕانەوە، لەحیرە مایەوە.

موسەنا وتی: کێ تا سیب شوێن دوژمن دەکەوێت؟

جەریر کوڕی عەبدوللە بەخەڵکەکەی خۆی وت: ئەی خەڵکانی بوجەیلە ئێوە و ئەوکەسانەی لەم شەرە بەشدار بوون، بۆ پێشینەتان لەئیسلام و چاکەکاری وەك یەکەن بەڵام لەتالآنییەکان کەس وەك ئێوە بەشی بەرناکەوێت چوونکە یەك چواری تایبەتە بەئێوە و سەروەری باوەرداران پێی بەخشیون، کەس نابێت زووتر لەئێوە شوێن دوژمن بکەوێت و زیاتر لەئێوە هەول بدات چوونکە یەکێك لەم دوو شتە چاوەڕوانتانە: شەهید بوون و بەهەشت یا تالآنی و بەهەشت

موسەنا بەدەستەیەك لەهەلآتووانی شەڕی پرد کەدەیانویست شەڕ بکەن، وتی: موستەبسل و هاوەلآنی لەکوێن؟ شوێن دوژمن بکەون و ببنە هۆکاری ریسوایی و زەلیل بوونی ئەوان چوونکە ئەمە چاکەیە و پاداشتی چاکەی بەدواوەیە. داوای بەخشین لەخوا بکەن لەبەر ئەوەی بەخشندە و میهرەبانە

عەلی کوڕی مەحفیز دەڵێت: یەکەم کەسان ئەو رۆژە بەداواکەی موسەنا رازی بوون، موستەبسل و هاوەلآنی بوون. ئەو رۆژی پێشتر دەیویست لەموسوڵمانان جیاببێتەوە و شوێن دوژمن بکەوێت. موسەنا فەرمانیدا و پردەکانیان بۆ هەڵبەستن و ئەوانی بەدوای دوژمن ڕەوانە کرد. دوای ئەوان خەڵکانی بوجەیلە و موسوڵمانانی دیکە بەرێکەوتن و تا سیب شوێن دوژمن کەوتن. لەئوردووگا کەس لەشەڕکەرانی پرد بەجێنەما. مانگا و تالآنی زۆریان دەستکەوت و موسەنا لەناو ئەواندا دابەشی کرد. بەتێکۆشەران زیاتری بەخشی و چواریەکی بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر خەڵکانی بوجەیلەدا دابەش کرد و سێ لەسەر چواری بەعێکرەمە بۆ مەدینە نارد.

موسەنا مۆڵەتی پێدان و ئەوان هێرشیان برد تا گەشتنە سابات. خەڵکی سابات سەنگەریان گرت و هێرشبەران گوندەکانی دەوروبەریان تالآن کرد. خەڵکان لەپشت سەنگەرەکانەوە تیریان دەهاویشت. یەکەم کەسان کەڕۆشتنە ناو سەنگەری دوژمن،

عیسمە و عاسم و جەریر بوون و کەسانی تر بەدوای ئەواندا ڕۆشتن. دواتر بۆ لای موسەنا گەڕانەوە.

عەتییە کوڕی حارس دەڵێت: کاتێك خواوەند مێهرانی کوشت و موسوڵمانان بەسەر سواد تا دیجلەدا زاڵ بوون و بێ ئەوەی هەڕەشەی هێرشی دوژمنیان لەسەر بێت، هاتوچۆی دیجلەیان دەکرد، پادگانەکانی عەجەم بلاوەیان لێکرد و پەنایان بۆ سابات برد. دڵخۆش بوون بەوەی کەس لەمبەر دیجلە کاری پێیان نەبێت.

دەڵێت: شەڕی بوەیب لەرەمەزانی ساڵی سیانزەی کۆچ ڕوویدا و خواوەند شکستی بەسوپای فارسەکان هێنا. لەملاولای بوەیب ئێسقانی مرۆڤەکان کەڵەکە کرابوو و لەرۆژگاری فیتنە، خاك دایپۆشی. هێشتا ئەگەر ئەو ناوچەیە هەڵکەنن، ئێسك و پروسکی مرۆڤەکان دەردەکەون. بوەیب لەنێوان سەکون و مەرهەبەی منداڵەکانی سەلیمە و لەرۆژگاری خوسرەوەکان زەلکاوی فورات و دەڕژایە ناو جوف.

ئەعوەری عەبدی سەبارەت بەم شەڕە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

لەدیاری هۆز، ڕەنجەکانی ئەعوەر زیادی کرد
و دوای عەبدقەیس گەیشتە خەفان
ئەو ناوچەی بینی خەڵکان کۆببوونەوە
کاتێك کوژراوەکانی سوپای مێهران لەنەخیلە بوو
رۆژگارێك کەموسەنا لەگەڵ سوپایەك هێرشی کردەسەریان
و دەستەکانی فارسی و گیلانی کوشت
و بەسەر مێهران و سوپاکەیدا سەرکەوت
و جووت جووت و یەك یەك لەناوی بردن.))

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەلأم بەسەرهاتی جەریر و عەرەفجە و موسەنا و شەڕی موسەنا لەگەڵ مێهران لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق بەشێوەیەکی دیکەیە. دەڵێت: کاتێك هەواڵی شکستی پرد بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت و پاشماوەی سوپاکە ڕۆشتن، جەریر کوڕی عەبدولله بەجلی و عەرەفجە کوڕی هەرسیمە لەگەڵ دەستەیەك لەخەڵکانی بەجیلە لەیەمەنەوە هاتنە مەدینە و لەو کاتەدا عەرەفجە سەرکردەیان بوو. ئەو، یەکێك لەخەڵکانی ئەزد و پەیمانی لەگەڵ خەڵکانی بەجیلە بەستبوو.

دەڵێت: عومەر گفتوگۆی لەگەڵ کردن و وتی: لەو بەلأی لەعێراق بەسەر براکانتان

هاتووە، ئاگادارن، بەرەو عێراق بڕۆن و منیش ئەو کەسانەی لەناو هۆزەکانی عەرەب بڵاو بوونەتەوە، بۆ لای ئێوە ڕەوانە دەکەم.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو کارە دەکەین.

عومەر کوڕی خەتاب تیرەی کەبە و سەجیمە و عورەینە لەهۆزەکانی قتس کەپەیوەستی منالەکانی عامر کوڕی سەعسەعە بوون، کۆکردەوە و عەرفجە کوڕی هەرسیمەی کردە سەرکردەی ئەوان. جەریر کوڕی عەبدوللە بەجلی لەم کارە توڕە بوو و بەخەڵکەکەی وت: لەگەڵ سەروەری باوەڕداران لەمبارەوە گفتوگۆ بکەن.

خەڵکانی بەجیلە بەعومەر کوڕی خەتابیان وت: پیاوێکت کردۆتە سەرکردەی ئێمە کە لەئێمە نییە. عومەر عەرەفجەی بانگ کرد و وتی: ئەوانە چی دەڵێن؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران ڕاست دەکەن. من لەوان نیم و یەکێك لەخەڵکانی ئەزدم. لەرۆژگاری جاهلییەت کەسێکم کوشت و پەیوەستی خەڵکانی بەجیلە بووم و لەناو ئەوان ئەم پێگەیەم بەدەستهێناوە.

عومەر وتی: کەواتە لەشوێنەکەی خۆت بە و ئەگەر بەسەرکردایەتی تۆ ڕازی نابن، سەرکردایەتی ئەوان لەئەستۆ مەگرە. وتی: ئەو کارە دەکەم و لەگەڵ ئەوان ناڕۆم.

عەرەفجە سەرکردایەتی پشتگوێ خست و لەخەڵکانی بەجیلە جیابوویەوە و ڕووی کردە بەسرە. عومەر کوڕی خەتاب جەریر کوڕی عەبدوڵلەی وەك سەرکردەی ئەوان دەستنیشان کرد و ڕووی کردە کوفە. کاتێك لەنزیك موسەنا کوڕی حارسە تێپەڕی، موسەنا نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پەیوەست بوونی پێدا چوونکە ئەویان بۆ هاوکاری ئەو ڕەوانە کردبوو.

بەڵام جەریر لەوەڵامدا نووسی: ئەو کارە ناکەم مەگەر سەروەری باوەڕداران فەرمانم پێبدات چوونکە تۆ سەرکردەیت و منیش سەرکردەم.

جەریر بەرەو پردەکە ڕۆشت و لەبوجەیلە لەگەڵ مێهران کوڕی بازان یەکێك لەگەورەکانی فارس ڕووبەڕوو بوویەوە چوونکە پردەکەی ڕووخاندبوو و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. مونزەر کوڕی حسان کوڕی زەراری زەببی هێرشی کردە سەر مێهران و بەشمشێر لێیدا و لەئەسپەکەی کەوتەخوار. جەریر هێرشی کردەسەر و سەری بڕی. لەسەر سیلاح و جل و بەرگەکانی کێشەیان بۆ دروست بوو. دواتر ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی جەریر سیلاحەکانی هەڵگرێت و حسان پشتێنەکەی.

دەڵێت: بیستم کاتێك مێهران جەریری بینی، هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

(( ئەگەر سەبارەت بەمن پرسیار دەکەن، مێهرانم
و ئەگەر حاشای لێبکەن، کوڕی بازانم))

دەڵێت: من بەمە رازی نەبووم تا یەکێك لەمێژوونوسە شارەزاکان پێی وتم ئەو، خوو و عادەتی عەرەبەکانی بوو. کاتێك باوکی لێپرسراوی یەمەن بوو، لەگەڵ ئەو گەورە و پەروەردە کرابوو. من بەوتەکەی ئەو رازیم.

موسەنا نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و سکاڵای لەجەریر کرد. عومەر لەوەلآمدا نووسی: من تۆ ناکەم سەرکردەی هاوەڵانی محەممەد، مەبەستی جەریر بوو.

دوای ئەوە عومەر کوڕی خەتاب، سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی لەگەڵ شەش هەزار کەس بۆ عێراق ڕەوانە کرد و سەرکردایەتی خەڵکانی بەو سپارد. نامەی بۆ موسەنا و جەریر کوڕی عەبدوڵڵە نووسی تا پەیوەستی سەعد بن و ئەوی کردە سەرکردەی ئەوان. سەعد ڕۆشت و لەشەراف مەنزڵی گرت و موسەنا و جەریریش پەیوەستی بوون. سەعد زستانی لەو ناوچەیە بەسەر برد و لەو کەسانەی لەدەوری ئەو کۆببوونەوە. موسەنا کوڕی حارسە کوچی دوایی کرد

## شەڕی خەنافیس

زیاد دەڵێت موسەنا لەسواد پێشڕەوی کرد و بوشر کوڕی خەسایسەی لەحیرە وەك جێگری خۆی دانا و جەریری بۆ میشان نارد و هیلال کوڕی عەلەفەی تیمی بۆ دەشتی میشان و عیسمە کوری فلآنی زەببی و کەلجی زەببی و عەرەفجەی بارقی و کەسانی دیکەی لەسەرکردەکانی موسوڵمانان وەك فەرماندەی پادگانەکان دەستنیشان کرد.

موسەنا لەئەلیس دابەزی کەیەکێکە لەگوندەکانی ئەنبار. ئەم شەڕە بەشەڕی کۆتایی ئەنبار و کوتایی ئەلیس ناوبانگی دەرکرد. دوو کەس کەیەکیان خەڵکی ئەنبار و ئەوی دیکەیان خەڵکی حیرە بوو. موسەنایان بۆ پێشڕەوی هاندا و هەرکامیان باسی بازاڕێکیان دەکرد. پیاوی ئەنباری ئەوی بۆ لای خەنافس و پیاوی خەڵکی حیرە هانیدەدا بۆ ئەوەی بەرەو بەغداد بڕوات.

موسەنا وتی: کامیان پێش ئەوەی دیکەیە؟

وتیان: ئەم دوو شوێنە چەند مەنزڵێك لەیەکەوە دوورن.

وتیان: کامیان خێراترە؟

وتیان: بازاری خەنافس کەخەڵکان دەڕۆنە ئەوێ و هۆزی رەبیعە و قوزاعە بۆ پارێزگاری کردن لەبازار لەوێ کۆدەبنەوە.

موسەنا بۆ هێرش کردنە سەر بازاری خەنافس خۆی ئامادە کرد و کاتێك گومانی کرد لەکاتی رۆژدا دەگاتە ئەو بازارە، مەبەستی هێرش کردنی کرد و لەرۆژی بازاری خەنافس هێرشی کردەسەر خەنافس.

دوو دەستە لەرەبیعە و قوزاعە لەوێ بوون. سەرکردەی دەستەکە قوزاعە کوڕی رۆمانس کوڕی وەبرە و سەرکردەی رەبیعە سەلیل کوڕی قەیس بوو کەپارێزگارییان لەبازارەکە دەکرد.

موسەنا بازارەکەی شڵەقاند و پارێزەرانی تالآن کرد و لەرێگەکەی خۆی گەڕایەوە و بەرەبەیانان گەیشتە لای وەرزێرەکانی ئەنبار کەسەنگەریان گرت و کاتێك ئەویان ناسییەوە لەسەنگەرەکانی هاتنەدەر و ئالف وتوێشوویان پێدا و چەندین رێ نیشاندەریان خستە بەردەست و موسەنا مەبەستی هێرش کردنە سەر بازاری بەغدادی کرد و لەکاتی بەرەبەیانی گەیشت.

کاتێك موسەنا لەئەنبار بوو، موسوڵمانان لەسواد پێشڕەوییان کرد و لەنێوان خوارەوەی کەسکەر و خوارەوەی فورات و پردەکانی مەسقەب تا عەین ئەلتەمر و سەرزەمینەکانی دەوروبەر (فلالیج و عال) هێرشیان دەبرد و تالآنییەکانیان کۆدەکردەوە.

مەحفیز دەڵێت: یەکێك لەدانیشتووانی حیرە بەموسەنای وت: دەتەوێت رێگەی گوندێکت نیشان بدەین کەبازرگانەکانی مەداینی کەسرا و بازرگانەکانی سواد ساڵی یەکجار لەوێ کۆدەبنەوە و بەئەندازەی بیت المال سامانیان پێیە. ئێستا رۆژەکانی بازاری ئەوانە و ئەگەر بتوانی بەشێوەیەکی لەناکاو هێرش بکەیتە سەر ئەوان، بەرادەیەك سامان بەدەست دێنیت کەموسوڵمانان بەهێز دەبن و بۆ هەمیشە لەبەرابەر دوژمنانیان خاوەن دەسەلآت.

موسەنا وتی: لەمەداینی کەسراوە تا بەغداد چەند رۆژ رێگەیە؟

وتی: یەك رۆژ یا کەمتر.

وتی: چۆن دەتوانم بڕۆمە ئەو سەرزەمینە؟

وتی: ئەگەر بخوازیت دەبێت لەرێگەی دەشتەوە بەرەو خەنافس بڕۆیت چوونکە خەڵکانی ئەنبار بەرەو بەغداد دەڕۆن و ئەوان ئاگادار دەکەنەوە. دواتر لەئەنبارەوە

ڕێگەی خۆت خوار بکەیت و لەوەرزێرەکان چەند کەسێك وەك ڕێنیشاندەر هەڵبگرە و ئەگەر هەمووی شەو ڕێگە ببڕیت، بەرەبەیان دەگەیتە بەغداد و دەتوانیت هێرش بکەیتە ئەو سەرزەمینە.

موسەنا لەئەلیسەوە بەرێکەوت و گەیشتە خەنافس. دواتر ڕێگەی خوار کرد و ڕێگەی ئەنباری گرتەبەر و کاتێك ئەمیری ئەنبار لەهاتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، سەنگەری گرت چوونکە نەیدەزانی کێیە. کاتێك ئەوی ناسییەوە، لەقەڵاکەی هاتەخوار و موسەنا هەڕەشەی لێکرد و تەماحی خستەبەر و وتی: ئەم هەواڵە نهێنی بێت چوونکە دەمەوێت هێرش بکەمە سەر بەغداد. چەند کەسێك وەك ڕێنیشاندەر لەگەڵ من ڕەوانە بکە، دەخوازم بڕۆمە بەغداد و لەوێوە هێرش بکەمە سەر مەداین.

ئەمیری ئەنبار وتی: لەگەڵ تۆ دێم.

وتی: نامەوێت لەگەڵ من بێیت، کەسێك لەگەڵ من بنێرە باشتر لەتۆ شارەزای ڕێگە بێت.

ئەمیری ئەنبار ئالف و توێشووی پێدان و چەند کەسێکی خستنە بەردەست. ڕێگەیان بڕی و کاتێك گەیشتنە نیوە، موسەنا بەرێنیشاندەرەکانی وت: لێرەوە تا بەغداد چەند ڕێگەیە؟

وتیان: چوار یا پێنج فەرسەخ.

موسەنا بەهاوەڵانی خۆی وت: کێ پاسەوانی دەدات. دەستەیەك ئامادەیی خۆیان نیشاندا و بەوانی وت: پاسەوانەکان دانێن. دابەزی و وتی: ئەی خەڵکینە بمێننەوە، دەستنوێژ بگرن و چاوەڕوان بن.

چەند کەسێکی ڕاسپارد ڕێگە لەخەڵکان بگرێت بۆ ئەوەی پێش ئەوان نەگەنە بەغداد و هەواڵەکان بڵاو بکەنەوە.

کاتێك خەڵکان حەوانەوە، کۆتاییەکانی شەو بەرێکەوت و گەیشتە بەغداد. بەرەبەیان هێرشی کردە سەر بازارەکان و شمشێری خستە ناو خەڵکان و ئەوانی کوشت و ئەوەی دەیانویست، تالانیان کرد.

دەڵێت: موسەنا دەیوت: جگە لەزێڕ و زیو هیچ هەڵمەگرن، کەل و پەل ئەوەندە هەڵگبرن بتوانن لەسەر چوارپێکەی خۆتان باری بکەن.

خەڵکانی بازار هەڵاتن و موسوڵمانەکان تا ئەو جێگەی دەیانتوانی زێڕ و زیو کالآ

نایابەکانیان هەڵگرت. موسەنا ڕێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر و تا ڕووباری سەلیحینی ئەنبار ئەسپی غاردا و لەوێ دابەزی. قسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: ئەی خەڵکینە دابەزن و نیاز و پێویستی و کارەکانی خۆتان جێبەجێ بکەن و بۆ بەرێکەوتن خۆتان ئامادە بکەن. داوای بەخشین لەخوا و بۆ ڕۆشتن پەلە بکەن.

دەڵێت: شەڕکەرەکان کارەکانی خۆیانیان ئەنجامدا. موسەنا بیستی چەند کەسێك لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد کەدوژمن بەدوامانەوەیە. وتی: تەنیا بۆ چاکە و خواپەرەستی بەنهێنی قسە بکەن و بۆ گوناح و دەستدرێژی، بەشێوەیەکی نهێنی قسە مەکەن. لەوتەکانی خۆتان ورد ببنەوە ئەوسا بیهێنە سەرزمان، هێشتا ئەم هەواڵە بەشاری ئەوان نەگەیشتووە و ئەگەر ئاگادار بووبێتنەوە، ترس، ڕێگەیان پێنادات شوێن ئێوە بکەون چوونکە هێرشی لەناکاو دەبێتە هۆی دروست بوونی ترسێك کەشەو و ڕۆژێك دەخایەنێت. ئەگەر پاسەوانانی بازار بەدوای ئێوەدا هاتبێتن پێتان ناگەنەوە تا ئەو کاتەی پەیوەستی ئوردووگاکانی خۆتان دەبنەوە چوونکە سوار لەسەر ئەسپە ڕەسەنەکان ڕێگە دەبڕن. ئەگەر پێمان گەشتنەوە، بەهیوای بەدەستهێنانی سەرکەوتن ڕووبەڕوویان دەبینەوە. پشت بەخوا ببەستن چوونکە لەزۆر شەڕدا سەرکەوتنی پێبەخشیون هەرچەند دوژمن زۆر بەهێزتر و لەژمارەدا زیاتر بووە. ئێستا پێتان دەڵێم بۆ بەخێرایی ڕێگە دەبڕین و مەبەستمان کوێیە؟ ئەبوبەکری ڕاستگۆ فەرمانی پێداین لەکاتی تالآنییەکان کەمتر وەچان بگرین و بەخێرایی بگەڕێینەوە و لەهەموو کاتێك لەکاتی گەڕانەوە پەلە بکەین.

دەڵێت: لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت، ڕێنیشاندەرەکانیان لەگەڵدا بوو، لەڕووبار و ساراکان گوزەریان کرد تا گەیشتنە ئەنبار. وەرزێرەکانی ئەنبار پێشوازییان لێکردن و لەتەندروستی ئەو شادمان بوون چوونکە بەڵێنی دابوو ئەگەر کردەوەکانیان پەسەند بێت، بەشێوەیەکی چاکە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکات.

زیاد دەڵێت: کاتێك موسەنا لەبەغداد بۆ ئەنبار گەڕایەوە، موزاریبی عیجلی و زەیدی بۆ کەباس نارد کەفارس ئەلعنابی تەغلەبی لەوێ بوو. خۆی دوای ئەوان بەرێکەوت. کاتێك ئەو دووانە گەیشتنە کەباس، خەڵکان بڵاوەیان لێکردبوو و کەباس چۆل بوو. زۆربەی خەڵکەکەی لەمناڵەکانی تەغلە بوون و موزاریب و زەید شوێنیان کەوتن و گەیشتنە کۆتایی خەڵکان. فارس ئەلعناب پارێزگاری لەوان و بۆ کاژێرێك بەرگری کرد. دواتر هەلآت و ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان کوژران.

موسەنا بۆ ئوردووگاکەی خۆی لەئەنبار گەڕایەوە. فورات کوڕی حەیان فەرماندەی ئوردووگاکە بوو. کاتێك گەیشتە ئەنبار، فورات کوڕی حەیان و عوتەبە کوڕی نەهاسی ڕەوانە کرد و فەرمانی پێدان هێرش بکەنە سەر هۆزەکانی تەغلەب و نەمنر لەسەفین. خۆی بەدوای ئەوان بەرێکەوت و عەمرۆ کوڕی ئەبی ئەسلەمی وەك جێگری خۆی دانا.

کاتێك لەسەفین نزیك کەوتنەوە، موسەنا و فورات و عوتەبە لەیەك جیابوونەوە و خەڵکانی سەفین هەڵاتن و لەفورات پەڕینەوە و سەنگەریان گرت. موسەنا و هاوەڵانی توێشوویان پێنەبوو. بەناچاری چوارپێکانی خۆیان کوشت و تەنانەت پێست و ئێسقانەکانیشیان خوارد. دواتر ڕووبەڕووی کاروانێك لەخەڵکانی دەبا و حوران بوونەوە. کاروانییەکانیان کوشت و سییان لەمناڵەکانی تەغلەبی کاروانەکەیان ئەسیر کرد. کاروانەکەیان تالآن کرد.

موسەنا بەو سێ تەغلەبییەی وت: ڕێگە نیشانی من بدەن.

یەکیان وتی: بۆ خۆم و کەسانی خێزانەکەم ئەمانم پێبدە تا شوێنی یەکێك لەهۆزەکانی تەغلەبتان نیشان بدەم کەئەم بەیانییە لای ئەوان هاتووم.

موسەنا ئەمانی پێبەخشی و پاشماوەی ڕۆژ لەگەڵ ئەو ڕێگەی بڕی و لەکاتی شەو هێرشی کردە سەر تەغلەبییەکان. لەو کاتەدا وشترەکان لەناوخواردن دەگەڕانەوە و خەڵکان لای خێوەتەکانیان دانیشتبوون. هێرش دەستی پێکرد، پیاوانیان کوشت و ژن و مناڵەکانیان ئەسیر و وشترەکانیان پێش خۆیان خست. دواتر بۆیان دەرکەوت کەمناڵەکانی ڕویەحلەن. ئەو کەسانی لەهۆزی ڕەبیعە و لەناو سوپای موسوڵمانان‌دا بوون، بەسامانی خۆیان ئەسیرەکانیان کڕییەو ئازادیان کردن. خەڵکانی ڕەبیعە لەڕۆژگاری جاهلییەت کەسیان ئەسیر نەدەکرد.

دواتر ئاگادار بوونەوە زۆربەی خەڵکی ئەو سەرزەمینە ڕوویان کردۆتە کەنارەکانی دیجلە. موسەنا بەڕێکەوت. لەهەمووی ئەم جەنگانە، حوزەیفە کوڕی غەلەفانی فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی و نەعمان کوڕی عەوف کوڕی نەعمان و مەتەر، هەردووکیان شەیبانی، فەرماندەی باڵی ڕاست و چەپی سوپاکەی بوون. فەرمانی بەحوزەیفەدا شوێن خەڵکان بکەوێت و خۆی دوای ئەو، ملی ڕێگەی گرتەبەر. لەنزیك تکریت بەوان گەیشتنەوە. دەستیان بەسەر وشترەکاندا گرت. هەر کەسێك پێنج وشتر و پێنج ئەسیری بەرکەوت. موسەنا پێنج یەکی تالآنییەکانی هەڵگرت و لەگەڵ سوپاکەی

بۆ ئەنبار گەڕایەوە و فورات و عوتەبە درێژەیان بەرێگەدا و هێرشیان کردە سەر سەفین. لەئاکامی هێرشی ئەوان دەستەیەك لەخەڵکان خۆیان خستە ناو ئاوەکە و داوای ئەمانیان کرد بەڵام ئەمانیان پێنەدان. هاواریان دەکرد: خنکاین، خنکاین. فورات و عوتەبە دەیانوت: ئەم خنکاندنە باشترە لەسووتاندن. ئەم وتەیە یەکێك لەشەڕەکانی رۆژگاری جاهلییەتی بیردەخستنەوە کەتیایدا دەستەیەك لەمناڵەکانی بەکر کوڕی وایلیان سووتاندبوو.

عوتەبە و فورات دوای خنکاندنی ئەو دەستەیە بۆ لای موسەنا گەڕانەوە. کاتێك هەموو نێردراوان لەئوردووگای ئەنبار کۆبوونەوە و نێردراو و دەستەکان گەڕانەوە، موسەنا لەگەڵ سوپاکەی بەرەو جەزیرە بەرێکەوت و لەوێ ئوردووی لێدا.

عومەر کوڕی خەتاب لەناو هەر سوپایەك کەسێکی دانابوو تا هەواڵی شەڕەکانی بۆ بنووسێت. وتەکەی فورات و عوتەبە لەکاتی خنکاندنی ئەو دەستە لەخەڵکان بەعومەر گەیشت. ئەوانی بانگ کرد و لەمبارەوە پرسیاری لێکردن. وتیان: ئەم وتەیان وەك نموونە هێناوەتەوە و مەبەست تۆڵەسەندنەوەی رۆژگاری جاهلییەت نەبووە. عومەر سوێندیدان و سوێندیان خوارد. عومەر رازی و ئەوانی بۆ لای موسەنا گەڕاندەوە.

## ئامادەکارییەکانی شەڕی قادسییە

عەبدولرەحمان کوڕی ساباتی ئەحمەری دەڵێت: فارسەکان بەرۆستەم و فیروزان سەرکردەکانی خەڵکیان وت: چی دەکەن، دووبەرەکی ئێوە بۆتە هۆکاری لاوازی فارسەکان ودوژمن چاوی تەماحی تێبڕیون، رێزی ئێوە بەو ئەندازەیە نییە فارسەکان بەو بارودۆخە رازی بن کە بەرەو هەڵدێری لەناوچوونیان ببەن، دوای بەغداد و سابات و تکریت، سەرەی مەداینە، سوێند بەخوا یا کێشەکانتان چارەسەر دەکەن یا پێش ئەوەی دوژمن پێمان شاد ببێت، ئێوە لەسەر کار لادەبەین.

مەحفیز دەڵێت: لەم کاتەدا موسوڵمانان لەسواد لەپەلامار و هێرشەکانی خۆیان بەردەوام بوون. فارسەکان بەرۆستەمیان وت: دەڵێی چاوەڕێن هێرش بکەنە سەر ئێمە و لەناو بچین. سوێند بەخوا ئەی سەردارەکانی فارس، هۆکاری ئەم لاوازییە، لەئێوەیە کەبڵاوە و دووبەرەکیتان لەناو فارسەکاندا دروست کردووە و چیتر ناتوانن بەرگری بکەن، سوێند بەخوا ئەگەر کوشتنی ئێوە نەدەبووە هۆی لەناوچوونی ئێمە، خوێنمان

دەرشتن. ئەگەر کۆتایی بەکێشەکان نەهێنن، ئێوە دەکوژین چوونکە ئەگەر لەناو بچین، لانی کەم تۆڵەمان لەئێوە سەندۆتەوە.

زیاد دەڵێت: فیروزان و ڕۆستەم بەپوران کچی کەسرایان وت: ژنان و هاوڕێیانی خوسرەو و هەروەها ژنان و هاوڕێکانی بنەماڵەی خوسرەو بۆ ئێمە بنووسە. پوران هەموویانی لەتۆمارێکدا نووسی و تەسلیمی ئەوانی کرد. کەسیان بەدوای ژناندا نارد و هەموویان کۆکردەوە. پیاوەکانیان دانا و ئەشکەنجەیان کردن بۆ ئەوەی نێرینەیەك لەبنەماڵەی کەسرا بدۆزنەوە بەڵام کەسیان دەستنەکەوت. ژنان وتیان یا ژنێکی وتی: گەنجێك لەمناڵەکانی شەهریار کوڕی خوسرەو ماوەتەوە و دایکی خەڵکی بادوریایە. کەسیان بۆ لای ئەو ژنە نارد و ئەویان هێنا. ئەو لەڕۆژگاری شیری کەهەموو ژنەکانی لەکۆشکی ئەبیەز کۆکردبوویەوە و هەموو نێرینەکانی کوشتبوو، ژنەکە، کوڕەکەی خۆی بۆ دەرەوەی کۆشك نارد و بەڵێنی لەخاڵۆکانی خۆی وەرگرت و کوڕەکەی ڕەوانەی زەبیل کرد.

کاتێك لەژنەکە سەبارەت بەکوڕەکە پرسیاریان کرد، شوێنەکەی ئەوی نیشاندان. کەسیان نارد و ئەویان هێنا و تاجی پاشایەتییان پێبەخشی. کوڕەکە تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو. هەمووان لەسەر پاشایەتی ئەو ڕێککەوتن و سەرکردەکان شوێنکەوتە و ملکەچی بوون. بۆ پادگانەکان و سنوورەکانی خوسرەو وەك حیرە و ئەنبار و ئۆبلە و پادگانەکانی دیکە، سوپاکان ڕەوانە کران.

موسەننا و موسوڵمانان لەکاری فارسەکان و ڕێککەوتنی ئەوان لەسەر پاشایەتی یەزدگێرد ئاگادار بوونەوە و نامەیان بۆ عومەر نووسی و ئاگاداریان کردەوە کەچاوەڕانن خەڵکانی دەوروبەر ئالای شۆرش بەرز بکەنەوە و تا ئەو کاتەی نامەکە بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت، خەڵکانی سواد چ ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ موسوڵمانان بەستبوو و چ ئەوانەی پەیمانیان نەبوو، کافر بوون. موسەننا لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرێکەوت و لەزیقار جێگیر بوو. موسوڵمانان لەتف ئوردوویان لێدا تا نامەکەی عومەر کوڕی خەتاب بەدەستیان گەیشت. نووسرا بوو:

(( لەناو عەجەمەکان وەرنەدەر و لەسەر ئەو ئاوانەی نزیك لەسنووری عەجەمەکانە، لەسنووری ژێر دەسەڵاتی خۆتان و سەرزەمینەکەی ئەوان ئوردوو لێبدەن. هەموو سوارەکان و شەڕکەرەکانی ڕەبیعە و موزێر و خەڵکانی هاوپەیمانی ئەوان کۆبکەنەوە و

هەرکەس بەدڵخواز پەیوەستتان نەبوو، نابەدڵخواز بانگی بکەن. ئێستا کەعەجەمەکان هەوڵەکانی خۆیان خستۆتەگەڕ، ئێوەیش هەوڵەکانتان بۆ کۆکردنەوەی عەرەبەکان چڕ بکەنەوە و بەهەموو هێزی خۆتان رووبەرووی هێزی ئەوان ببنەوە.))

موسەنا لەزیقار جێگیر بوو. موسوڵمانان لەجل و شەراف تا غەزا و سەلمان ئوردوویان لێدا. غەزا لەسنووری بەسرەدا بوو، جەریر کوڕی عەبدوڵلە و سەبرە کوڕی عەمرۆ عەنبەری و هاوەڵانی ئەو لەسەلمان بوون. موسوڵمانان لەسەر ئاوەکانی عێراق لەسەرەتاوە تا کۆتایی جێگیر و چاودێری یەکیان دەکرد تا ئەگەر رووداوێك بۆ یەکێك لەدەستەکان روویدا، بەخێرایی بتوانن هاوکاری بکەن. ئەم کارانە لەزیقەعدەی ساڵی سیانزەی کۆچ ئەنجامدران.

زیاد دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ئاگادار بوویەوە کەعەجەمەکان یەزدگێردیان وەك پاشای خۆیان دەستنیشان کردووە، بۆ هەموو لێپرسراوانی ناوچە و ویلایەتەکان و هۆزەکانی عەرەب لەزیحەججەی ساڵی سیانزەی کۆچ نامەی نووسی. کاتێك بەمەبەستی حەج بەرەو مەککە دەڕۆشت، عومەر کوڕی خەتاب هەموو ساڵێك حەجی دەکرد، فەرمانیدا ئەو کەسەی سیلاح یا ئەسپ یا توانای شەڕ کردنی هەیە، دیاری و ڕەوانەی لای منیان بکەن. بۆ ئەم کارە بەپەلە بن و کاتێك بەرەو مەککە دەڕۆشت، نێردراوەکان روویان کردە ناوچە و ویلایەتەکان. یەکەم دەستە لەو هۆزانە هاتن کەرێگەیان لەنێوان مەککە و مەدینە بوو. ئەوانەی لەخەڵکانی مەدینە یا نیوەی رێگەی عێراق و مەدینە بوون، لەکاتی گەڕانەوەی عومەر کوڕی خەتاب لەحەج لەمەدینە ڕۆشتنە لای و ئەوانەی دوورتر بوون، پەیوەستی موسەنا بون. ئەوانەی لەدەوری عومەر کۆببوونەوە، ئاگاداریان کردەوە کەهۆزەکانی دەوروبەریش لەزووترین کات پەیوەستیان دەبن.

بەڵام لەگێڕانەوەی باوکی موعەشەر و کوڕی ئیسحاق هاتووە: لەساڵی سیانزەی کۆچ سەرکردەی حەج و حاجییەکان، عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بوو.

عەبدوڵلە کوڕی عومەر دەڵێت: ئەو ساڵەی عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتەدەست، سەرپەرەستی حەجی بە عەبدولرەحمان کوڕی عەوف بەخشی و عەبدولرەحمان لەو ساڵەدا لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد. دوای ئەوە هەموو ساڵەکانی دیکە خۆی حەجی دەکرد. وەك دەڵێن: لەم ساڵەدا کارگوزاری عومەر لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید بوو، کارگوزاری تاییف عوسمان کوڕی ئەبی عاس، لەیەمەن یەعلی کوڕی

مونییە، لەعەممان و یەمامە حوزەیفە کوڕی موحسین، لەبەحرەین عەلا کوڕی حەزرەمی، لەشام باوکی عوبەیدە جەڕاح و لەسنوورەکانی کوفە و ناوچە داگیرکراوەکان موسەنا کوڕی حارسە کارگوزاری عومەر کوڕی خەتاب بوو. وەك دەڵێن عەلی کوڕی ئەبی تالیب سەپەرەستی کاروباری داوەری و بەوتەیەك عومەر لەڕۆژگاری خەلافەتی خۆی، داوەری نەبوو.

## ساڵی چواردەی کۆچ دەستپێکرد

لەیەکەم رۆژی موحەرەمی ساڵی چواردەی کۆچ وەك لەگێرانەوەی زیاد ئاماژەی پێدراوە: عومەر بەرێکەوت و لەسەر چاڵاوێك بەناوی سورار دابەزی وئوردووی لێدا. خەڵکان نەیاندەزانی مەبەستی چی هەیە، ئایا بەرێدەکەوێت یا دەمێنێتەوە؟ کاتێك دەیانویست شتێك لەعومەر کوڕی خەتاب بپرسن، عوسمان یا عەبدولرەحمان کوڕی عەوفیان دەنارد. لەسەردەمی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب عوسمانیان بەرەدیف ناو دەبرد و رەدیف لەزمانی عەرەبی بەمانای کەسێکە کەدوای پیاوێك بێت. عەرەبەکان ئەو ناوە بەکەسێك دەڵێن هیواداربن دەبێتە جێگری سەرکردەکەیان. کاتێك ئەو دوو کەسە نەیاندەتوانی لەمەبەستەکەی ئاگادار ببنەوە، عەباسیان دەنارد.

کاتێك عوسمان رۆشتە لای عومەر، وتی: دەنگ وباس چییە؟ مەبەستی ئەنجامدانی چ کارێکت کردووە؟

عومەر بانگی نوێژیدا و خەڵکان کۆبوونەوە و لەمەبەستەکەی خۆی ئاگاداری کردنەوە بۆ ئەوەی بۆچوونی ئەوان بپرسێت.

زۆربەی خەڵکان وتیان: بەرێکەوە و ئێمەیش لەگەڵ خۆت ببە. عومەر کوڕی خەتاب بۆچوونەکەی ئەوانی پەسەند کرد چوونکە دەیویست بەشێوەیەکی نەرم و نیان لەم بۆچوونە پاشگەزیان بکاتەوە، وتی: ئامادە بن و کەرەستە پێویستەکان هەڵبگرن چوونکە من دەڕۆم مەگەر ئەوەی بۆچوونێکی پەسەندتر باس بکرێت.

کەسانی بیرمەند و خاوەن بۆچوونی بانگ کرد و سەرکردەی ئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەدەوری کۆبوونەوە و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە چوونکە دەمەوێت بەرێکەوم.

بەڵام بڕیاریاندا یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) بنێرێت و خۆی بمێنێتەوە و سوپا رەوانە بکات. ئەگەر بارودۆخ بەدڵخواز بوو و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەمەبەستەکەی خۆی گەیشتووە و گەرنە کەسێکی دیکە رەوانە دەکات تا دوژمن تێکبشکێنێت و هێز و وره بەموسوڵمانان ببەخشێت تا خواوەند سەرکەوتنیان بۆ دەستەبەر بکات و بەڵێنەکانی بێتەدی.

عومەر بانگی نوێژیدا و خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە و کەسی نارد و عەلی کوڕی ئەبی تالبیان لەمەدینە بانگ کرد کەوەك جێگری خۆی دایینابوو. عەلی کوڕی ئەبی

تالیب هات. تەڵحەیش کەوەك فەرماندەی پێشەنگەکان ڕەوانەی کردبوو، گەڕایەوە. زیاد و عەبدولڕەحمان کوڕی عەوفیش هاتن. لەناو ئەوان قسەی کرد و وتی: خواوەند موسوڵمانانی لەسەر ئیسلام کۆکردەوە و دڵی ئەوان یەکیگرت و کەسان هاوشێوەی برای یەکترن چوونکە موسوڵمانان ئەندامانی یەك جەستەن و ئەگەر ئەندامێك زیانی بەرکەوێت، ئازار بەوانی دیکە دەگات. دەبێت کاروباری موسوڵمانان بەبۆچوون و ڕاوێژ کردن ئەنجام بدرێت چوونکە کاتێك لەخەلیفە رازین و سەبارەت بەخەلافەتی ئەو کۆکن، خەلیفە لەکاروبار و لەبۆچوونەکان شوێنکەوتەی ئەوانە. ئەی خەڵکینە من کەسێکم وەك ئێوە و بیرمەندان ڕێگەی ڕۆشتنیان لەمن گرت. دەمەوێت بمێنمەوە و کەسێك لەئێوە ڕەوانە بکەم. کەسانێك کەپێشتر ڕەوانەم کردوون یا ئەوانەی لەمەدینە دامناون، هەموویان لێرە کۆبوونەتەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەمەدینە جێگری عومەر و تەڵحە فەرمانەدەی پێشەنگی سوپاکەی لەئەعوەس بوو.

عومەر کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەکوژرانی باوکی عوبەید کوڕی مەسعود و ڕێککەوتنی فارسەکانی بۆ پاشایەتی یەزدگێرد، ئاگادار بوویەوە، موهاجیر و ئەنسارەکانی بانگ کرد و بەرێکەوت تا گەیشتە سورار. تەڵحە کوڕی عوبەیدالله‌ی ڕەوانە کرد و گەیشتە ئەعوەس. فەرمانەدەی باڵی ڕاستی سوپاکەی بە عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف سپارد و فەرماندەی باڵی چەپ زوبەیر کوڕی عەوام بوو. عەلی کوڕی ئەبیی تالبی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا. لەگەڵ خەڵکان ڕاوێژی کرد و هەموویان وتیان: ڕووبکەرە دیاری فارسەکان، لەمبارەوە بۆچوونی کەسی وەرنەگرت تا ئەو کاتەی گەیشتە سورار. تەڵحە گەڕایەوە و عومەر کوڕی خەتاب ڕاوێژی لەگەڵ کردن. بۆچوونی تەڵحە هاوشێوەی خەڵکان بوو، بەڵام عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف یەکێك بوو لەو کەسانەی ڕێگەی ڕۆشتنی لێگرت.

عەبدولڕەحمان دەڵێت: دوای پێغەمبەر(د.خ)، دایك و باوکم نەکردە قوربانی کەس، بەعومەر کوڕی خەتابم وت: دایك و باوکم بەقوربانت بن، ئەم هەڵەیە بخە ئەستۆی من، خۆت بمێنەرەوە و سوپایەك ڕەوانە بکە چوونکە قەزا و قەدەری خواوەندت سەبارەت بەسوپاکەی خۆت بینیوە، ئەگەر سوپاکەت تێکبشکێت هاوشێوەی شکستی تۆ نابێت و ئەگەر بکوژرێیت یا شکست بخۆیت، دەترسم موسوڵمانان هەرگیز تەکبیر نەڵێن و لا اله

الا الله نەهێنە سەرزمان.

لەم کاتە کەعومەر کوڕی خەتاب بیری لەناردنی کەسێك دەکردەوە و لەگەڵ ئەوان راوێژی دەکرد، نامەی سەعدی پێگەیشت، ئەو لەنەجد لێپرسراوی کۆکردنەوەی زەکات بوو. عومەر وتی: کەسێك بەمن بناسێنن؟

عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتی: کەسێکت دۆزییەوە.

وتی: کێ؟

وتی: شێرەکە، سەعد کوڕی مالك.

هەمووان رازی بوون.

زوفرە دەڵێت: موسەنا نامەی بۆعومەر کوڕی خەتاب نووسی کەفارسەکان لەسەر پاشایەتی یەزدگێرد یەکیان گرتووە و سوپاکانیان ڕەوانە کردووە و خەڵکان ئالآی شۆڕشیان بەرز کردۆتەوە. عومەر نامەی بۆ نووسی و فەرمانی پێدا بەرەو سارا بڕوات و هۆزەکانی دەوروبەر لەخۆی کۆبکاتەوە و لەسنووری سەرزەمینی فارسەکان بمێنێتەوە تا فەرمانەکانی دەگات.

دەڵێت: عەجەمەکان بەخێرایی هاتن و سوپاکانیان ڕەوانە کرد. ئەهلی زەممە شۆڕشیان کرد و موسەنا کەسانێکی برد و بەشێوەی دەستەی جیاجیا لەسەرەتا تا کۆتایی عێراق جێگیری کردن و لەغەزا تا قەتقەتانە ئوردوویان لێدا. پادگان و سنوورەکانی خوسرەو ساماندران و کاروباری فارسەکان بەرەو باشبوون دەڕۆشت بەلآم دەترسان. موسوڵمانەکان هاوشێوەی شێر کەچاوی تەماحیان لەنێچیرەکەی بڕیبێت، ئامادەی هێرش بردن بوون بەلآم سەرکردەکان بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی عومەر کوڕی خەتاب، ڕێگەیان لێدەگرتن.

قاسم کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەبوبەکر سەعدی وەك لێپرسراوی زەکاتی هەوازین و نەجد دیاری کرد و عومەر ئەوی لەسەر کارەکەی خۆی هێشتەوە. کاتێك نامەی بۆ کارگوزارەکانی خۆی نووسی، نامەی بۆ ئەویش نارد و فەرمانی پێدا پیاوانی سیلاحدار و خاوەن ئەسپ و کەسانی بوێر هەڵبژێرێت و ڕەوانەیان بکات. سەعد نامەی بۆ نووسی و ئاگاداری کردەوە کەدەستەیەك لەخەڵکان کۆبوونەتەوە. نامەکەی کاتێك بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەعومەر بۆ ناردنی کەسێك لەگەڵ کەسانی نزیکی خۆی راوێژی دەکرد و کاتێك ناوی ئەو هاتە ناو ناوان، پێیان وت: ئەو ڕەوانە بکە.

تەڵحە دەڵێت: سەعد لێپرسراوی زەکاتی هەوازین و عومەر نامەیەکی بۆ نووسی تا

خەڵکانی بیرمەند و بوێر، ئەوانەی سیلاح و ئەسپیان هەیە هەڵبژێرێت. نامەکەی سەعد گەیشت کەنووسیبووی هەزار سوارەم هەڵبژارد و هەموویان بیرمەند و بوێر و پارێزەر و بەرگریکاری خەڵکەکەی خۆیان بوون و لەناو ئەوان پێگە و ڕێزیان هەیە و هەنووکە ئامادەن.

دەڵێت: ئەم نامەیەکە کاتێك بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەسەرقاڵی ڕاوێژ کردن لەگەڵ کەسەکان بوو. بەعومەریان وت: ئەو کەسەی دەبێت ڕەوانەی بکەیت، دۆزیتەوە.

وتی: کێیە؟

وتیان: شێری دارستان.

وتی: کێ؟

وتیان: سەعد.

عومەر بەبۆچوونی ئەوان ڕازی و کەسی بەدوای سەعددا نارد و سەرکردایەتی شەڕی عێراقی بەو سپارد. فەرمانەکانی خۆی پێدا و وتی: ئەی سەعد کوڕی وەهیب! لەکاروباری خواوەند لەخۆبایی مەبە کەدەڵێن خاڵ و هاوەڵی پێغەمبەری خوایە چوونکە خواوەند خراپە بەخراپە ناسرێتەوە، بەڵکو خراپە بەچاکە لەناو دەچێت و خواوەند تەنیا بەهۆی خواپەرەستی کەسەکان لەیەك جیادەکاتەوە وەگەرنە بارودۆخی هەمووان لای خواوەند یەکسانە. ئەوان بەندەکانی خوان و جیاوازییان لەبەخشینی خواوەنددایە. بزانە پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی هەڵبژاردنی بۆ پێغەمبەر(د.خ) تا کاتی مردن چۆن بوو، تۆیش بەو شێوە بە، ئامۆژگاری من بۆ تۆ ئەمەیە. ئەگەر پشت بکەیتە شێوازەکانی پێغەمبەر(د.خ)، کاروبارەکانت فیرۆیە و دەبیتە یەکێك لەخراپەکاران.

کاتێك دەیویست سەعد ڕەوانە بکات، ئەوی بانگ کرد و وتی: تۆم وەك سەرکردەی شەڕی عێراق دەستنیشان کرد. پێشنیارەکانی منت لەبیر بێت چوونکە کارێکی گەورە و مەترسیدارت لەبەردەمدایە و بەهاوکاری خواوەند دەتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنیت. خۆت و هاوەڵانت بۆ چاکە عادەت پێبدە و داوای سەرکەوتن لەخوا بکەن چونکە هەر عادەتێك ئامرازێکە، ئامرازی چاکە سەبرە. بۆ ئەو زیان و بەڵایانەی ڕووبەڕووی تۆدەبنەوە، خۆڕاگربە تا بگەیتە دوا پلەکانی خواپەرەستی. خواپەرەستی دوو شتە: شوێنکەوتن و ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند و خۆ دوور خستنەوە لەگوناحەکانی

ئەو. ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند دوژمنی دنیایە و خۆشەویستی ئاخیرەت و نافەرمانی خواوەند خۆشەویستی دنیایە و دوژمنی ئاخیرەت. دڵی کەسەکان لێوانلێوە لەراستییەکان کەخواوەند دەیهێنێتە بوون لەنهێنی و ئاشکرا. ئاشکرا ئەوەیە مافی خواپەرەست و موسوڵمان بەشێوەی یەکسان بدات و نهێنی ئەوەیە حیکمەت و زانست لەدڵەوە بگاتە سەر زمان. لەهاورێیەتی بێ ئاگا مەبە چوونکە پێغەمبەران خوازیاری هاورێیەتی کەسان بوون. خواوەند کاتێك بەندەیەکی خۆش دەوێت ئەو دەکاتە خۆشەویستی خەڵکان و ئەگەر بەندەکەی بەدوژمنی خۆی بزانێت، دەیکاتە دوژمنی خەڵکان. پێگەی رێز و گەورەیی تۆ لای خواوەند ئەو پێگەیە لای هاورێکانت هەتە.

ئەوی لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەی لەمەدینە کۆببوونەوە رەوانە کرد. سەعد لەگەڵ چواردەهەزار کەس لەخەڵکانی مەدینە رێگەی عێراقی گرتەبەر. سێ هەزار کەس لەوان لەیەمەن و سراتەوە هاتبوون. سەرکردەی خەڵکانی سرات حەمیزە کوڕی نەعمانی بارقی و هەموویان لەتایەفەی بارق و ئەلمەع و غامد و خزمەکانی ئەم تایەفانە و ژمارەیان حەوتسەد کەس بوو. خەڵکانی یەمەن دوو هەزار و سێسەد کەس بوون. نەخەع کوڕی عەمرۆ یەکێك بوو لەوان. هەموویان بەشەڕکەران و ژن و منداڵەکانەوە چوار هەزار کەس بوون. عومەر هاتە ئوردووگاکەیان و دەیویست ئەوان بۆ عێراق رەوانە بکات بەڵام ئارەزوومەند بوون رێگەی شام بگرنەبەر بەڵام عومەر دەیویست ئەوان بەرەو عێراق بڕۆن. سەرئەنجام نیوەی ئەوانی بۆ عێراق و نیوەی ئەوانی دیکەی بۆ شام رەوانە کرد.

حەنشی نەخەعی دەڵێت: عومەر هاتە ئوردووگاکە و وتی: ئەی خەڵکی نەخەع شەرەف لەناو ئێوەدا ماوە، لەگەڵ سەعد بڕۆن. ئەوان ئارەزوویان دەکرد بۆ شام بڕۆن. عومەریش دەیخواست ئەوان بۆ عێراق رەوانە بکات. سەرئەنجام نیوەی ئەوانی بۆ عێراق و نیوەی ئەوانی بۆ شام نارد.

موستەنیر دەڵێت: لەخەڵکانی حەزرەمەوت و سەدف سێسەد کەس لەناو ئەواندا دەبینرا و سەرکردەکەیان شەداد کوڕی زەمعەج بوو. هەزار و سێسەد کەس لەخەڵکانی مەزحەج و سێ سەرکردەیان بوو: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب سەرکردەی منداڵەکانی زەبیە، ئەبوسیرە کوڕی زوەیب سەرکردەی جوعفی و خزمەکانی حەفس وەك جەزۆ و زوبەید و ئەنس الله و کەسانی هاوشێوەی ئەوان، یەزید کوڕی حارسی سەدایی سەرکردەی سەدا و جونب و موسەیلە و ژمارەی هەموویان سێسەد کەس لەهۆزی مەزحەج بوون. ئەوان لەکاتی بەرێکەوتنی سەعد، مەدینەیان بەجێهێشت. لەهۆزی

قەیسی عەیلان هەزار کەس بەسەرکردایەتی بوشر کوڕی عەبدوللە هیلالی بەشدار بوون.

ئیبراهیم دەڵێت: دەستەی قادسییە چوار هەزار کەس بوون کە لەمەدینەوە هاتن: سێ هەزارکەس لەخەڵکانی یەمەن و هەزار کەس لەخەڵکانیتر.

قاسم دەڵێت: عومەر لەسوورارە تا ئەعوەس لەگەڵ سوپاکەدا ڕۆشت. دواتر لەناو شەرکەران قسەی کرد و وتی: خواوەند نموونەی بۆ هێناونەتەوە و ئامۆژیاری کردوون تا دڵەکان زیندوو بکاتەوە. هەرکەس شتێك دەزانێت، سوودی لێوەربگرێت، دادپەروەری نیشانەی هەیە، نیشانەکانی حەیایە و بەخشش و نەرم و نیانی و بەزەییەکانی خواوەند. خواوەند بۆ هەرکارێك دەرگایەکی داناوە و بۆ هەر دەرگایەك کلیلێکی ئامادە کردووە، لەدادپەروەری وانە وەرگرتن فێربوونە و کلیلەکەی خۆپارێزی، وانە وەرگرتن بیرکردنەوەی مەرگە و باسی مردووەکان و ئامادە بوون بۆ مردن، خۆپارێزییە، ماف لەکەسان وەرگرتنەوە و گەڕاندنەوەی بۆ خاوەن مافەکان چاکەکارییە. دەبێت بەئەندازەی پێویست قانع بین. هەرکەس بەئەندازەی پێویست قانع نەبێت، هیچ شتێك بێ نیازی ناکات. من لەنێوان ئێوە و خودام بەڵام لەنێوان من و خواوەند هیچ کەسێك نییە، سکاڵاکانی خۆتان بێنە لای ئێمە و هەرکەس نەیتوانی بڕواتە لای کەسێك کەبەئێمەی بگەیێنێت. دڵنیابن دەستبەجێ مافەکانی بۆ وەردەگرینەوە.

فەرمانی بەڕێکەوتنی بەسەعددا و وتی: کاتێك گەیشتیتە زەرود، دابەزن و بڵاو ببنەوە. خەڵکان بانگ بکە و کەسانی بیرمەندو بوێر و خاوەن ئەسپ و سیلاح پەیوەستی سوپاکەی خۆت بکە.

محەممەد کوڕی سوقە دەڵێت: خەڵکانی سەکوون لەگەڵ یەکەم دەستەی کێندە بەسەرکردایەتی حوسێن کوڕی نەمیری سەکوونی و معاویە کوڕی خودەیج گوزەریان کرد و ژمارەیان چوارسەد کەس بوو. عومەر ڕێگەی لێگرتن و گەنجەکانی دەڵم سەباتی لەگەڵ معاویە کوڕی خودەیج بینی و پشتی تێکردن و دووبارە پشتی تێکردن تا ئەو کاتەی پێیان وت: بۆ پشت دەکەیتە ئەم خەڵکە؟

وتی: لەوان نیگەرانم، کەس لەعەرەبەکان بەبەردەم من نەڕۆشتن کە لەمان بۆمن ناخۆشتر بێت. دواتر فەرمانی بەڕێکەوتنی پێدان.

عومەر دواتریش بەردەوام بەخراپە باسی ئەوانی دەکرد. خەڵکان لەبۆچوونی عومەر سەبارەت بەو خەڵکانە سەریانسوڕمابوو. یەکێك لەوان بەناوی سودان کوڕی حیمران،

عوسمان کوڕی عەفانی کوشت و یەکێك لەخزمەکانیان بەناوی خالید کوڕی مولجەم عەلی کوڕی ئەبی تالیبی کوشت. معاویە کوڕی خودەیج لەگەڵ دەستەیەك لەوان شوێن بکوژەکانی عوسمان کەوت بەڵام خەڵکەکەیان پەنایان بەبکوژەکەی عوسماندا.

ماهان دەڵێت: دوای ئەوەی سەعد ڕۆشت، عومەر کوڕی خەتاب دوو هەزار کەس لەخەڵکانی یەمەن و دوو هەزار کەس لەخەڵکانی نەجد لەغەتەفان و هۆزەکانی دیکە بۆ هاوکاری کردنی ئەو ڕەوانە کرد. سەعد لەسەرەتای زستان گەیشتە زەرود و لەوێ دابەزی و سوپاکەی لەسەر ئاوەکانی منالەکانی تەمیم و ئەسەد بلاو کردەوە و چاوەڕوانی پەیوەست بوونی کەسانی دیکە و فەرمانەکانی عومەری دەکرد. چوار هەزار کەس لەمنالەکانی تەمیم و ڕەبابی هەڵبژارد کەسێ هەزار کەسیان تەمیمی و هەزار کەسیان لەرەباب بوون. لەمنالەکانی ئەسەدیش سێ هەزار کەسی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان لەسنوری سەرزەمینەکانی خۆیان لەنێوان حوزن و بەسیتە بمێننەوە. لەوێ مانەوە و لەنێوان سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و موسەنا کوڕی حارسە جێگیر بوون.

موسەنا هەشت هەزار کەس لەخەڵکانی ڕەبیعەی لەگەڵدا بوو کەشەش هەزار کەسیان لەمنالەکانی بەکر کوڕی وائیل و دوو هەزار کەسیان لەهۆزەکانی ڕەبیعە و دوای ڕۆشتنی خالید کوڕی وەلید ئەوانی هەڵبژارد، چوار هەزار کەس لەپاشماوەکانی شەڕی پردی لەگەڵمابوو. لەخەڵکانی یەمەن دوو هەزار کەس لەخەڵکانی بوجەیلەو دووهەزار کەس لەخەڵکانی قوزاعە و تەی لەگەڵدا بوو.

سالاری خەڵکانی تەی، عودی کوڕی حاتەم و سەرکردەی قوزاعە عەمرۆ کوڕی وەبرە و سەرکردەی بوجەیلە جەریر کوڕی عەبدوللە بوو.

لەم کاتەدا کەسەعد چاوەڕوان بوو موسەنا پەیوەستی ببێت، موسەنایش چاوەڕوانی ڕۆشتنی سەعدی دەکرد. موسەنا بەهۆی ئەو برینەی لەشەڕی پرد، لەجەستەی دروست بوو، مرد و بوشر کوڕی خەسایسەی وەك جێگری خۆی دانا. سەعد لەزەرود بوو و سەرکردەکانی خەڵك لەعێراق هاوڕێیەتی خەسایسەیان دەکرد. دەستە عێراقییەکان و لەناو ئەوان فورات کوڕی حەیانی عێجلی و عوتەیبە کەڕۆشتبوونە لای عومەر، لای سەعد بوون. عومەر ئەوانی ناردبوو.

ماهان دەڵێت: لەبەر ئەمەیە خەڵکان سەبارەت بەژمارەی شەڕکەرانی قادسیە بۆچوونەکانیان جیاوازە. ئەوانەی وتوویانە چوار هەزار کەس بوون لەبەر ئەمەیە کەچوار هەزار کەس لەگەڵ سەعد مەدینەیان بەجێهێشت و ئەوانەی دەڵێن هەشت هەزار

کەس بوون، لەبەر ئەوەیە هەشت هەزار کەس لەزەرود کۆبوونەوە و ئەوانەی دەڵێن نۆ هەزار کەس لەبەر ئەوەیە پەیوەست بوونی خەڵکانی قەیسیان لەبەر چاو گرتووە و ئەوانەی دەڵێن دوانزە هەزار کەس بوون سێ هەزارکەس لەمناڵەکانی ئەسەد لەتیرەکانی حوزن لەبەر چاو دەگرن.

سەعد فەرمانی پێشڕەوی دەرکرد و بەرەو عێراق بەرێکەوت. خەڵکان لەشەراف بوون و کاتێك سەعد گەیشتە شەراف، ئەشعەش کوڕی قەیس لەگەڵ هەزار و حەوتسەد کەس لەخەڵکانی یەمەن پەیوەستی بوو.

دەڵێت: هەموو ئامادەبووان لەشەڕی قادسیە سی و چەند هەزار کەس بوون. ئەو کەسانەی لەتالآنییەکانی قادسییە پشکیان بەرکەوت، نزیکەی سی هەزار کەس بوون.

جەریر دەڵێت: خەڵکانی یەمەن ئارەزوویان دەکرد بەرەو شام بڕۆن و خەڵکانی موزێر خوازیاری ڕۆشتن بۆ عێراق بوون. عومەر وتی: پەیوەندییەکانی ئێوە لەپەیوەندییەکانی ئێمە بەهێزترە چوونکە خەڵکانی موزێر رابردووانی خۆیان بیر نەدەهێنایەوە کە لەشام بوون.

محەممەد کوڕی حوزەیفە کوڕی یەمان دەڵێت: هیچ کەس لەعەرەبەکان لەبەرابەر فارسەکان بوێرتر لەخەڵکانی رەبیعە نەبوو. موسوڵمانان ئەوانیان بەرەبیعەی شێر یا رەبیعەی سوار ناو دەبرد. عەرەبەکانی رۆژگاری جاهلییەت فارسەکانیان بەشێر ناو دەبرد بەهەمان شێوە رۆمییەکانیش.

ماهان دەڵێت: عومەر وتی: سوێند بەخوا پاشاکانی عەجەم لەگەڵ پاشاکانی عەرەب بەراوەرد دەکەم. ئەوەی بیرمەند و فرەزان و شاعیر و سەرکردە بوو، بۆ لای فارسەکان ڕەوانەی کردن و ئەوانی لەگەڵ سەرکردەکانی عەرەب رووبەروو کردەوە.

شەعبی دەڵێت: ئەو کاتەی دەبوا سەعد لەزەرود بەرێکەوێت، عومەر نامەی بۆ نووسی تا پیاوێکی شیاو بۆ دەروازەی هێند بنێرێت و چاودێری ئەو ناوچەیە بکات تا لەوێوە زیان بەموسوڵمانان نەگات. سەعد موغەیرە کوڕی شەعبەی لەگەڵ پێنسەد کەس ڕەوانە کرد کەرووی کردە غەزی و لەنزیك جەریر لەو ناوچەیە جێگیر بوو. غەزی لەسەرزەمینی عەرەب و رووبەرووی ئۆبلەیە کەسنوور و دەروازەی هێند هەژمار دەکرا.

کاتێك سەعد لەشەراف جێگیر بوو، عومەر کوڕی خەتابی لەشوێنی مانەوەی خۆی و شوێنی مانەوەی موسوڵمانان ئاگادار کردەوە.

عومەر لەوەڵامدا نووسی: هەرکاتێك ئەم نامەی من بەتۆ بگات، کەسان بۆ دەستەی دەکەسی دابەش بکە و بۆ هەردەستەیەك کەسێك وەك سەرکردەیان دەستنیشان بکە. سوپاکەی خۆت بەمشێوەیە برازێنەرەوە و بەسەرکردەکان بڵێ لەدەوری تۆ کۆببنەوە و لەژمارەی شەڕکەرانی خۆیان ئاگادارت بکەنەوە. دواتر ئەوان بۆ لای سوپاکەیان بگەڕێنەرەوە و قادسیە وەك شوێنی کۆبوونەوەی گشتی دیاریبکە. موغەیرە کوڕی شەعبەیش پەیوەستی سوپاکەی خۆت بکە و لەچۆنییەتی بەرەو پێش چوونی کارەکان ئاگادارم بکەرەوە.

سەعد کەسی بۆ لای موغەیرە و سەرکردەی هۆزەکان نارد و هاتن. لەژمارەی ئەوان ئاگادار بوویەوە و بۆ هەر دەکەس سەرکردەیەکی دەستنیشان کرد. بۆ هەڵگرتنی ئاڵاکان کەسانێك لەموسوڵمانە کۆنەکانی راسپارد و سەرکردەی دەستە دە کەسییەکانی لەناو ئەو کەسانە هەڵبژارد کەپێشینە و پێگەیەکی بەرزیان لەناو ئیسلامدا هەبوو. بۆ بەشەکانی دیکەی سوپا وەك پێشەنگ و فەرماندەی باڵەکانی سوپا کەسانی بەئەزموون و شارەزای هەڵبژارد. تا ئەو کاتەی نامەی عومەر کوڕی خەتابی بەدەست نەگەیشت، بەرێنەکەوت. سەرکردەکان بەمشێوە بوون:

زوهرە کوڕی عەبدوللە کوڕی قتادە کەپاشای هیجر لەرۆژگاری جاهلییەت سەرکردایەتی پێبەخشی و ئەوی بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە کرد، فەرماندەیی پێشەنگەکانی بەو سپارد و کاتێك فەرمانی بەرێکەوتنی لەعومەر کوڕی خەتابەوە پێگەیشت، بەرێکەوت تا گەیشتە عوزەیب.

عەبدوللە کوڕی موتعیمی وەك فەرماندەی باڵی راست دانا. ئەو یەکێك بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) و یەکێك لەو نۆ کەسە بوو سەردانی پێغەمبەری کردبوو.

تەڵحە کوڕی عوبەیداللەی وەك سەردەستەی خەڵکان دیاریکرد.

شورەحبیل کوڕی سیمتی کێندی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دەستنیشان کرد. ئەو گەنج و لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان شەڕی کردبوو. لەدەورانی مەدینەوە تا ئەو کاتەی بناغەی کوفە درایێژرا، وەك پێگە لەپێش ئەشعەسی کێندییەوە بوو. باوکی لەناو سوپاکەی باوکی عوبەیدەی جەراح بوو.

خالید کوڕی عەرەفتەی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کرد.

عاسم کوڕی عەمرۆی تەمیمی بۆ سەرکردایەتی دواوەی سوپاکەی راسپارد.

سواد کوڕی مالکی تەمیمی وەك فەرماندەی پێشەنگەکان دانا.

سلێمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی کردە سەرکردەی سوارە شارەزاکان.

حەمال کوڕی مالکی ئەسەدی، سەرکردەی پیادەکان.

عەبدوللە کوڕی زەی ئەلسەهمەیتی خەسعەمی وەك سەرکردەی سوارەکان.

سەرکردەی دەستەکان دوای سەرکردەی سوپاکان بوون. سەردەستەی دە کەسییەکان دوای سەرکردەی دەستەکان. دوای ئەوان ئالأدارەکان و دوای ئالأدارەکان و سەرکردەکان، سەرکردەی هۆزەکان بوون.

بەپێی گێڕانەوەکان ئەبوبەکر لەشەڕی هەڵگەڕاوەکان و شەڕی عەجەمەکان هاوکاری لەهەڵگەڕاوەکان وەرنەدەگرت. عومەر ئەوانی بۆ شەڕ ڕەوانە کرد بەڵام هیچ لێپرسراویەتییەکەی بەوان نەسپارد.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب تیمارکەرانی نارد و عەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعەی باهلی زوئەلنوری بۆ داوەری کردن لەناو کەسەکان دەستنیشان کرد و تۆمار کردن و دابەش کردنی تالأنییەکانی بەوسپارد.

کوڕی عوسمانی ئەهدی دەڵێت: وەرگێڕی خەڵکان هیلالی هیجری بوو و دەبیر، زیاد کوڕی ئەبی سوفیان.

کاتێك سەعد لەرازاندنەوە و ڕێکخستنی سوپاکەی تەواو بوو، بۆ هەر کارێك دەستەیەك و سەرکردەیەکی دەستنیشان کرد و عومەر کوڕی خەتابی لەکاروبارەکان ئاگادار کردەوە.

ئەو کاتەی نامەکەی بۆ عومەر ڕەوانە کرد و وەڵامی بۆ هاتەوە کە لەشەرافەوە بەرو قادسییە بەرێکەوێت، مەعنی کوڕی حارسەی لەگەڵ سەلمیٚ کچی خەفسەی تیمی، تیم اللات، بەوەسیەت نامەکەی موسەنا هاتە لای سەعد. موسەنا وەسیەتی کردبوو وەسیەت نامەکەی ئەو بەخێرایی بۆ زەرود بۆ لای سەعد ببەن بەڵام دەرفەتی ئەو کارەیان دەست نەکەوت، کێشەی قابوس کوڕی قابوس کوڕی مونزەر ڕێگەی پۆشتنی لێگرتن.

ئەزازمەرد کوڕی ئەزازبە قابوسی بۆ قادسیە نارد و وتی: عەرەبەکان بانگێشت بکە و سەرکردایەتی ئەو کەسانەی بەبانگێشتەکەی تۆ رازی دەبن لەئەستۆی خۆتا بێت بەهەمان شێوەی باوکانت.

قابوس لەقادسیە جێگیر و نامەی بۆ هۆزی بەکر کوڕی وایل نووسی بەهەمان شێوەی

نەعمان و هەڕەشەی لێکردن.

کاتێك مەعنی ئاگادار بوویەوە، بەخێرایی لەزیقارەوە هات و شەوانە هێرشی کردە سەر قابوس و خۆی و هەموو کەسانی کوشت. دواتر بۆ زوقار گەڕایەوە و لەوێوە هاوریٚ لەگەڵ سەلمیٚ بەرەو لای سەعد بەرێکەوتن و لەشەراف گەیشتنە لای. وەسیەت نامەکە و بۆچوونەکانی موسەنایان تەسلیمی سەعد کرد. لەوەسیت نامەکەدا نووسرابوو: بۆچوونی من ئەمەیە کاتێك سوپاکە ئامادە بوو، لەگەڵ دوژمنی خۆت و دوژمنی موسوڵمانان یانی فارسەکان لەسەرزەمینی ئەوان شەڕ نەکات بەڵکو لەکەنارەکانی سەرزەمینی ئەوان لەنزیکترین شوێنی بەردەلان لەسەرزەمینی عەرەب و نزیکترین سارا لەسەرزەمینی عەرەب، شەڕیان لەگەڵ بکات ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی دەتوانن بەشوێنەکانی دیکە بگەن و ئەگەر پێچەوانەکەی روویدا، شارەزای رێگەن و دەتوانن لەدیاری عەرەب هاتوچۆ بکەن تا ئەوکاتەی دەرفەتێکی دیکەیان دەستدەکەوێت.

کاتێك وەسیت نامەکەی موسەنا بەدەستی سەعد گەیشت، داوای بەخشینی بۆ کرد و مەعنی لەشوێنەکەی ئەو هێشتەوە و پێشنیاری کرد لەگەڵ بنەماڵەکەی موسەنا چاکە بکات و خوازبێنی سەلمیٚی کرد و ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

لەناو دەستەکانی سوپا حەفتا و چەند کەس لەشەڕکەرانی بەدر دەبینران و سێسەد و چەند کەس لەوان لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) قسەیان کردبوو. سێسەد کەس لەوان لەگرتنی مەککە بەشدار و حەوتسەد کەس لەمناڵەی ئەسحابەکان و هەموو هۆزەکانی عەرەب لەناو ئەواندا دەبینرا.

سەعد لەشەراف بوو نامەی عومەر کوڕی خەتابی پێگەیشت کەناوەڕۆکەکەی هاوشێوەی وەسیەت نامەکەی موسەنا بوو. عومەر کوڕی خەتاب هەمان کات نامەیەکی بۆ باوکی عوبەیدەی جەراح نووسیبوو تا خەڵکانی عێراق کەژمارەیان شەش هەزار کەس بوو لەگەڵ هەرکەس لەسوپاکەی کەخوازیاری ڕۆشتن بۆ عێراقە، بۆ عێراق ڕەوانە بکات. ناوەرۆکی نامەکەی عومەر کوڕی خەتاب بۆ سەعد بەمشێوەیە:

((دوای شەراف لەگەڵ هەموو موسوڵمانەکانی هاورێت، رووبکەرە فارسەکان و لەهەموو کارەکانی خۆت پشت بەخوا ببەستە و داوای هاوکاری لەو بکە. بزانە کەرووبەرووی خەڵکانێك دەبیتەوە ژمارەیان فراوان و کەرەستەی بیٚ ئەندازەیان لەبەردەستایە و هێزیان زۆرە. سەرزەمینی ئەوان هەرچەند دەشتە بەڵام بەهۆی

دەریاكان و ئاوەكان و بەردەلأنەكان دژوارە مەگەر ئەوەی لەئاوە كەم قولأییەكان گوزەربكەن. كاتێك لەگەڵ هەموو شەڕكەرەكانت رووبەرووی یەكێك لەوان بوویتەوە، هێرش دەستپێبكەن. ئاگادار بن لەگەڵ تەواوی سوپاكەی ئەوان رووبەروو نەبنەوە و لەفریوەكانی ئەوان بترسن چوونكە خەڵكانێكی فریوكار و فێڵبازن و كردەوەكانیان جیاوازە لەكردەوەكانی ئێوە. كاتێك گەیشتیتە قادسیە، قادسیە لەرۆژگاری جاهلییەت دەروازەی دیاری فارسەكان و لەو شوێنە زیاتر لەهەموو ناوچەكانی دیكە، كەرستەی فراوانتریان هەیە لەبەر ئەوەی شوێنێكی بەربلأو و پان و بەرین و بەهێزە و بەردەمی پردەكان و رووبارەكان جێگیرە كەپەڕینەوە لێیان دژوارە، دەبێت لەسەر هەموو رێگەكانی ئەوان ئوردوویێك لێ بدەیت و موسوڵمانان لەنێوان بەردەلأن و بیاباندا بن. لەكەنارەكانی بەردەلأن و كەنارەكانی بیابان و ریخەلأنەكان جێگیر بن. دواتر لەشوێنیكەی خۆت بمێنەرەوە بێ ئەوە پێشڕەوی بكەیت چوونكە كاتێك ئاگادار ببنەوە دەكەونە جموجۆڵ و سوپاكەی خۆیان بەسوار و پیادە بۆ رووبەروو بوونەوەی ئێوە رەوانە دەكەن. ئەگەر لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بكەن هیوادارم خواوەند سەركەوتنتان پێببەخشێت و هیچ كات نەتوانن سوپایەكی هاوشێوەی ئەم سوپایە دژی ئێوە كۆبكەنەوەو ئەگەر كۆببوونەوە، دڵخۆش نەبن. ئەگەر شكستتان خوارد، بەردەلأن لەپشتی سەری ئێوەدایە و لەبیابانی نزیك دیاری ئەوان رووبكەنە بەردەلأنی نزیك لەدیارەكەی خۆتان چوونكە باشتر شارەزای ئەو شوێن و ناوچەن و دوژمن لەوێ لەئێوە دەترسێت تا ئەو كاتەی خواوەند دەرفەتی سەركەوتن بەئێوە دەبەخشێت.

عومەر كوڕی خەتاب رۆژی بەرێكەوتنی سەعدی لەشەراف دیاری كرد و نووسی: فلأن رۆژ لەگەڵ سوپاكەت بەرێكەوە و لەنێوان عوزەیبی هجانات و عوزەیبی قوادس جێگیر ببە و كەسەكان بۆ ئەملاولا بنێرە.

دوای ئەوەی وەڵامی نامەكەی عومەر كوڕی خەتابی دایەوە، نامەیەكی بەدەست گەیشت بەم ناوەرۆكە:

((لەگەڵ خۆت پەیمان ببەستە وئامۆژیاری سوپاكەی خۆت بە و باسی خۆڕاگری و جوامێرییان بۆ بكە تا هەركەس بێ ئاگا بێت، بیری بكەوێتەوە. خۆڕاگری بكەن، خۆڕاگری بكەن چوونكە هاوكاری خواوەند بەئەندازەی خۆڕاگری ئێوەیە و پاداش بەئەندازەی جوامێری. سەبارەت بەژێر دەستەكان و مەبەستەكەتان چاودێری بارودۆخ

بکە و تەندروستیتان لەخواوەند بوێت. بەردەوام بڵێن لا حول و لا قوة الا بالله. بۆم بنووسە فارسەکان تا کوێ پێشڕەوییان کردووە و سەرکردەکەیان کێیە چوونکە بەهۆی کەمی زانیاری لەسەر بارودۆخی ئێوە، نەمتوانی هەموو ئەوشتانەی دەمویست، بینووسم. شوێنی موسوڵمانان لەگەڵ ئەو رووبارەی نێوان خۆتان و مەداین بۆ ئێمە وەسف بکە بەشێوەیەك وەك بڵێی لەبەرچاومایە و لەبارودۆخی خۆتان بەتەواوی ئاگادارم بکەرەوە. لەخوا بترسە و هیوادار بە. بزانە خواوەند بەڵێنی ئەم کارەی بەئێوەداوە و بەڵێنەکانی خواوەند دێتەدی. ئاگاداربن خواوەند ئەم سەرکەوتنە لەئێوە نەگرێتەوە و کەسانی دیکە بخاتە جێگەی ئێوە.

سەعد سەبارەت بەوەسفی شارەکە نووسی: قادسیە لەنێوان خەندەك و عەتیقدایە و لەلای چەپی قادسییە رووبارێکی سەوز رەنگە و ئاوەکەی روونەو تا حیرە درێژ دەبێتەوە. لەنێوان دوو رێگە کەیەکیان بۆ بیابان دەڕوات و ئەوی دیکەیان لەکەناری رووبارێکدایە بەناوی حەزوز کەتا ناوچەی نێوان خوەرنەق و حیرە درێژ دەبێتەوە. لای راستی قادسیە تا وەلجە یەکێك لەزۆلکاوەکانی ئەو سەرزەمینەیە. هەموو خەڵکانی سواد کەپێش من لەگەڵ موسوڵمانەکان پەیمانیان بەستبوو، خوازیاری هاوکاری کردنی فارسەکانن و پەیوەستی ئەوان بوون و دژی ئێمە خۆیان ئامادە کردووە. ئەو کەسەی بۆ شەڕی ئێمە هاتووە، رۆستەمە و کەسانێك هاوشێوەی ئەو کەخەڵکان دژی ئێمە هاندەدەن. ئێمەیش دەخوازین ئەوان هان بدەین و بۆ شەڕ کردن دژی فارسەکان ناچاریان بکەین. فەرمانی خواوەند دەبێت ئەنجام بدرێت و قەزای ئەو ئێمە بۆ لای قەدەری خۆمان دەبێت.

عومەر لەوەڵامدا نووسی: نامەکەی تۆمان بەدەست گەیشت و هەستمان بەناوەرۆکەکەی کرد، لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە تا دوژمن جموجۆڵەکانی دەستپێبکات. ئەم کارە بەردەوامە. ئەگەر خواوەند شکستی بەدوژمن بەخشی، دەستیان لێ هەڵمەگرە تا ئەو کاتەی هێرش دەکەیتە سەر مەداین، چوونکە ئەگەر خواوەند بخوازێت، دەبیتە هۆکاری وێران بوونی ئەو شارە.

عومەر کوڕی خەتاب دۆعای تایبەتی بۆ سەعد دەکرد و خەڵکانیش دەپاڕانەوە و بۆ سوپاکە بەگشتی دۆعایان دەکرد.

زوهرە کوڕی حەویە بەرێکەوت و لەعوزەیبی هیجانات ئۆردووی لێدا و سەعد بەدوای ئەو هات تا لەعوزەیبی هیجانات پەیوەستی ببێت. زوهرە ڕۆشتە پێش و

لەقادسیە لەنێوان عەتیق و خەندەك، لەبەرابەر پردەکە، جێگیر بوون. قەدیس، لەو ڕۆژەدا یەك میل لەخوارەوەی پردەکە بوو.

سەیف کوڕی قەعقاع دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بۆ سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی نووسی:

((دڵنیام کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە، شکستی پێدەهێنن، گومان و دوودڵی پشتگوێ بخەن و دڵنیایی هەڵبژێرن. ئەگەر یەکێك لەئێوە وەك گاڵتە کردن بەیەکێك لەعەجەمەکان ئەمانی داوە، یا ئیشارەیەکی بۆ کردووە یا وتەیەکی هێناوەتە سەرزمان و لای ئەوان هاوشێوەی ئەمان حسێبی بۆ کراوە، وەك ئەمان حسێبی بۆ بکەن و لەتوند و تیژی خۆتان بەدوور بگرن، بۆ پەیمانەکانتان وەفادار بن چوونکە وەفا تەنانەت بەهەڵە سوودمەندە و خیانەت تەنانەت بەهەڵە، هۆکاری لەناوچوون و لاوازی ئێوە و بەهێزی دوژمنی لێدەکەوێتەوە. کارێك مەکەن ببنە هۆکاری ڕیسوایی و زەلیلی موسوڵمانان.

کەرب کوڕی کەربی عەکلی کەیەکێك لەپێشەنگەکانی سوپای قادسیە بوو، دەڵێت: سەعد لەشەرافەوە ئێمەی ڕەوانە کرد و لەعوزەیبی هیجانات دابەزین. ئەویش بەرێکەوت و کاتێك لەو ناوچەیە پەیوەستی ئێمە بوو، زوهرە کوڕی حەویە لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و کاتێك عوزەیب یەکێك لەپادگانەکانی فارسەکان دەرکەوت، لەسەر بورجەکانی کەسانێکمان بینی. سەیری بورجەکانمان دەکرد و کەسێکمان دەبینی. ئێمە لەگەڵ سوارچاکەکان بووین و ماینەوە تا هەمووان پەیوەستمان بوون. یەکێك لەوان هاتەدەر و بەخێرایی بەرەو قادسیە بەرێکەوت. کاتێك گەیشتینە ئەوێ و ڕۆشتینە ناو، کەسی لێ نەبوو. تەنیا ئەم پیاوە بوو کەبەفرت و فێڵ و شێوازی جۆراوجۆر خۆی نیشانی ئێمە دەدا. شوێنی کەوتین بەڵام نەمانگرتەوە. زوهرە لەم ڕووداوە ئاگادار بوویەوە و هاتە لای ئێمە. شوێن پیاوەکە کەوت و وتی: ئەگەر ئەم سیخوڕە ڕزگاری بێت، فارسەکان ئاگادار دەکاتەوە. لەنزیك خەندەکەکە پێی گەیشتەوە و ئەوی کوشت. خەڵکانی قادسیە لەبوێری ئەم پیاوە و شارەزایی ئەو لەکاروباری جەنگ سەریان سوورما بوو. کەس بوێرتر و دڵێرتر لەو لەناو فارسەکان نەدەبینرا. ئەگەر مەبەستەکەی دوور نەدەبوو، زوهرە نەیدەتوانی پێی بگاتەوە.

دەڵێت: موسوڵمانان لەعوزەیب ڕم و تیر و سنووقی دارینی زۆریان دەستکەوت.

ئەوسا لەتاریکی شەو دەستەیەکی نارد و وتی هێرش بکەنە سەر کەنارەکانی حیرە.

بوکەیر کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی وەك سەرکردەی ئەوان دەستنیشان کرد. شوماخ، شاعیری قەیسی، لەناو ئەواندا بوو و لەگەڵ سی کەس لەبوێرەکان بەرێکەوت و لەسەلیحین تێپەڕین. پردەکەیان بڕی و مەبەستی هێرش کردنە سەر حیرەیان کرد.

لەرێگەدا دەنگەدەنگیان بیست، هیچ کارێکیان نەکرد و خۆیان داشارد بۆ ئەوەی بزانن چییە. مانەوە تا دەستەیەك تێپەڕین. دەستەیەك سوار لەپێشیانەوە بوو و ڕێگەی سەنینیان گرتەبەر و هەستیان بەبوونی موسوڵمانەکان نەکرد. سەرنجی بۆ لای شوێنی خۆحەشاردانی ئەوان رانەکێشرا.

خوشکی ئازادمەرد کوڕی ئازازبە سنورداری حیرە کەبووکی ئەمیری سەنین بوو، دەیانبردەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. ئەمیری سەنین یەکێك لەگەورەکانی عەجەم و پاسەوانەکان بۆ پارێزگاری کردن لەبووکەکەی ئەو لەو ڕێگەیەدا بوون. کاتێك سوارەکان لەهاوەڵانی بووکەکە جیابوونەوە، هێشتا موسوڵمانەکان لەناو دارخورمانکاندا خۆیان حەشاردابوو. کەل و پەل و بارەکانیان بەبەردەم ئەوانەوە برد. بوکەیر هێرشی کردە سەر کوڕی ئازازبە کە لەنێوان سوارەکان و کاروانی کەل و پەلەکان بوو. ئەوی کوشت و سوارەکان هەڵاتن. باروبنە و کچەکەی ئازازبەی لەگەڵ سێسەد ژن لەجوتیاران و خزمەتکارەکانی گرت و لەگەڵ تالانییەکە کەکەس نەیتوانی بەهاکەی دیاریبکات، گەڕایەوە. بەرەبەیان لەگەڵ تالانییەکان لەعوزەیبی هیجانات گەیشتە لای سەعد و خەڵکان بەدەنگی بەرز تەکبیریان وت. سەعد وتی: سوێند بەخوا ئەمە هاواری کەسانێکە هێز و وزەیان هەیە.

سەعد تالانییەکانی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد. پێنج یەکی هەڵگرت و پاشماوەکەی لەناو شەڕکەراندا بڵاو کردەوە. دەستەیەکی لەعوزەیب بەجێهێشت تا پارێزگاری لەژنەکان بکەن و کەسەکانی پەیوەستی ئەوان کرد. غالیب کوڕی عەبدوڵڵە سەرکردەی ئەم دەستەیە بوو.

سەعد ڕووی کردە قادسیە و لەقەدیس ئوردووی لێدا. زوهرەیش لەبەرابەر پردی عەتیق ئەو شوێنەی هەنووکە لەقادسیەیە، جێگیر بوو. سەعد هەواڵی هێرشەکەی بوکەیری بۆ مەدینە نارد و یەك مانگ لەشوێنەکەی خۆی مایەوە. دواتر نامەی بۆ عومەر نووسی کەدوژمن کەسی بۆ لای ئێمە نەناردووە و نازانین چ کەسێکیان بۆ شەڕ لەگەڵ ئێمە دەستنیشان کردووە. هەرکاتێك ئاگادار بووینەوە، هەواڵەکانت بۆ دەنێرین. داوای سەرکەوتن لەخواوەند بکە چوونکە ڕووبەڕووی دنیایەکی پان و بەرینین. لەگەڵ

خەڵکانێکی بەهێز ڕووبەڕوو دەبینەوە کەپێشتر خواوەند ئاگاداری کردووینەتەوە و دەفەرمێت: ئێوە ڕووبەڕووی خەڵکانێکی بەهێز دەبنەوە.

سەعد لەکاتی مانەوەی خۆی عاسم کوڕی عەمرۆی بۆ خوارەوەی فورات نارد. ئەو تا میشان ڕۆشتە پێش. لەدوای مەڕ و مانگادا دەگەڕا بەڵام بەدەستی نەهێنا و ئەو کەسانەی لەکێڵگە کشتوکاڵییەکاندا بوون، هەڵاتن و لەدارستانەکان خۆیان داشارد. عاسم ڕۆشتە پێش تا لای دارستانێك پیاوێکی گرت و سەبارەت بەشوێنی مەڕومالاّت پرسیاری لێکرد. بەدوای مانگادا دەگەڕا و ئەو کەسە سوێندی دەخوارد: نازانم. بەلاّم ئەو شوانی ئەو مەڕومالاّتە بوو کە لەناو دارستانەکەدا بوون. مانگایەك دەنگی بەرز کردەوە کەسوێند بەخوا درۆ دەکات ئێمە لێرەین. عاسم ڕۆشتە ناو دارستانەکە و مانگاکانی پێش خۆی خست و گەڕایەوە. سەعد مانگاکانی لەناو شەڕکەراندا دابەش کرد و چەند ڕۆژێکیان بەخۆشی بەسەر برد.

لەرۆژگاری حەجاج ئەم ڕووداوەیان بۆ باس کرد. چەند کەسێك لەئامادەبووانی ئەو پێشهاتەی بانگ کرد کەیەزید کوڕی عەمرۆ و وەلید کوڕی عەبدشەمس و زاهیر لەناو ئەواندا دەبینران. پرسیاری لێکرد و وتیان: بەڵێ ئێمە ئەمەمان بیست و بینیمان و مانگاکانمان پێش خۆمان خست.

حەجاج وتی: درۆ دەکەن.

وتیان: ئەگەر تۆ لەوێ بوویت و ئێمە نەبووین، ڕاست دەکەیت.

وتی: ڕاست دەکەن، موسوڵمانان لەمبارەوە چییان وت؟

وتیان: ئەمەیان وەك مژدە لەقەڵەمدا کەباسی ڕەزامەندی خوا و شکستی دوژمنی دەکرد.

وتی: ئەمە لەبەر ئەوە بوو ئەو دەستەیە خۆپارێز و چاکەکار بوون.

وتیان: ئێمە ئاگامان لەنهێنی دڵەکان نەبوو بەلاّم ئەوەی دەمانبینی کەس بەئەندازەی ئەوان لەدنیا بێزار نەبوو و کەس زیاتر لەوان دنیایی بەدوژمن نەدەزانی. هیچ کامیان نەدەترسان و ئەم شەڕەیان بەشەڕی مانگاکان ناوبرد.

سەعد چەندین دەستەی بۆ نێوان کەسکەر و ئەنبار نارد و بەرادەیەك خواردنیان هێنا کە بۆماوەیەکی زۆر توانییان بەخۆشی ژیان بەبەنەسەر. هەروەها سیخوڕەکانی بۆ لای خەڵکانی حیرە و سەلوبا نارد تا لەکاروباری دەنگ و باسەکانی فارسەکان ئاگادار

بینەوە. هەواڵیان بۆ هێنا کە پاشا ڕۆستەم کوڕی فەروخزادی ئەرمەنی وەك لێپرسراوی کاروباری جەنگ دەستنیشان کردووە و سەرکردایەتی سوپاکەی بەوداوە. سەعد، ئەم هەواڵەی بۆ عومەر نووسی. عومەر لەوەڵامدا وتی: لەو هەواڵانەی بەتۆ دەگات، نیگەران مەبە، پشت بەخوا ببەستە و داوای هاوکاری لیّ بکە. کەسانێکی بیرمەند و بوێر بۆ لای ئەو بنێرە تا پێشنیاری خواپەرەستی پێبکەن و بەمشێوەیە ببنە هۆکاری لاوازی دوژمن. ڕۆژانە نامە بۆ من بنووسە.

کاتێك ڕۆستەم لەسابات ئوردووی لێدا، نامەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: کاتێك سەعد ئاگادار بوویەوە ڕۆستەم لەسابات ئوردووی لێداوە، لەناو سوپاکەی خۆی دەستی بەئامادە کردنی شەڕکەران کرد.

ئیسماعیل دەڵێت: سەعد نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی: ڕۆستەم لەسابات لەملای مەداین ئوردووی لێداوە.

باوکی زەمورە دەڵێت: سەعد بۆ عومەر کوڕی خەتابی نووسی: ڕۆستەم لەسابات ئوردووی لێداوە و لەگەڵ سوپا و فیلەکان مەبەستی شەڕکردن لەگەڵ ئێمەی لەسەردایە. هیچ شتێك بۆ من گرنگتر لەوە نییە بەو شێوە بم کەدەخوازیت، داوای هاوکاری لەخوا دەکەین و پشتی پێدەبەستین، فلاّن کەس و فلاّن کەسم ناردووە بەهەمان شێوەی فەرمانت دابوو.

سەعد کوڕی مەرزبان دەڵێت: کاتێك فەرمانەکانی عومەر بەسەعد گەیشت، سەعد کوڕی ئەبی وەقاس چەند کەسێکی بەناوبانگ و بیرمەندی بۆ ڕەوانە کردن ئامادە کرد. ئەو کەسانە نەعمان کوڕی موقرین و بوسر کوڕی ئەبی روعم و حەملە کوڕی جەویەی کەنانی و حەنزەلە کوڕی رەبیعی تەمیمی و فورات کوڕی حەیانی عێجلی و عودەی کوڕی سوهەیل و موغەیرە کوڕی زەرارە کوڕی نەباش بوون. هەروەها کەسانی وەك عەتارد کوڕی حاجب و ئەشعەس کوڕی قەیس و حارس کوڕی حسان و عاسم کوڕی عەمرۆ و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و موغەیرە کوڕی شوعبە و مەعنی کوڕی حارسە هاورێیەتیان دەکرد. ئەوانی بۆ لای ڕۆستەم نارد.

باوکی وایل دەڵێت: سەعد هات و لەقادسیە جێگیر بوو. کەسانێك هاورێیەتیان دەکرد. دەڵێت: نازانم ئەگەری هەیە نزیکەی حەوت هەزار کەس دەبووین، عەجەمەکان سی هەزار کەس بوون. بەئێمەیان وت: هێز و سیلاح و ژمارەی شەڕکەری پێویستتان نییە، بۆ هاتوون. بگەرێنەوە.

وتمان: ناگەڕێینەوە. لەبینینی تیرەکانی ئێمە پێدەکەنین و دەیانوت: دوک، دوک. دەیانشوبهاند بەتەشی بەن بادان.

دەڵێت: کاتێك بەگەڕانەوە رازی نەبووین، وتیان: یەکێك لەپیرەمەندەکانی خۆتان بنێرن بۆ ئەوەی لەمەبەستی هاتنی ئێوە ئاگادار ببینەوە.

موغەیرە کوڕی شوعبە وتی: من دەڕۆم. ڕۆشت و لەگەڵ رۆستەم لەسەر تەخت دانیشت. فارسەکان بۆڵەبۆڵیان کرد و دەنگیان بەرز کردوە.

موغەیرە کوڕی شوعبە وتی: ئەمە پێگەی منی بەرز و گەورەیی سەرکردەکەی ئێوەی کەم نەکردەوە.

رۆستەم وتی: راست دەکەیت، بۆ هاتوون؟.

وتی: ئێمە خەڵکانێك بووین لەگومڕایی و تاریکیدا ژیانمان بەسەر دەبرد. خواوەند پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردین و رێگەی نیشاندایین و لەسەر دەستی ئەو رۆژی پێبەخشین. یەکێك لەو شتانەی کردییە رۆژی ئێمە، دانەوێڵەیەکە کەدەڵێن لەم دیارەدا دەڕوێت، کاتێك خواردمان و دەرخواردی کەسەکانی خۆماندا، وتیان: ناتوانین چاو لەمە بپۆشین، ئێمە لەو سەرزەمینە نیشتەجێ بکەن تا لەمە بخۆین.

رۆستەم وتی: بەڵام ئێمە دەتانکوژین.

وتی: ئەگەر بمانکوژن دەڕۆینە بەهەشت و ئەگەر ئێمە ئێوە بکوژین، دەڕۆنە جەهەننەم. جەزیەمان پێبدەن.

دەڵێت: کاتێك وتی: جەزیە بدەن، دەنگیان بەرز کردەوە و وتیان: ئاشتی لەنێوان ئێمە و ئێوەدا نییە.

موغەیرە وتی: ئێوە دەپەڕنەوە یا ئێمە بپەڕینەوە.

رۆستەم وتی: ئێمە بۆ لای ئێوە دەپەڕێینەوە.

موسوڵمانان پاشەکشێیان کرد تا فارسەکان پەڕینەوە. هێرشیان کردنەسەر و شکستیان پێهێنان.

عوبەید کوڕی جەحشی سولەمی دەڵێت: ئەوکەسانەی کەوتبوونە ناو گۆڕەپانی شەڕ و سیلاحیان پێ نەبوو، یەکتریان پێشێل کرد. کیسەیەك کافور کەوتە دەستمان و وامانزانی خوێیە و دڵنیا بووین. گۆشتمان کوڵاند و کافورەکەمان کردە ناو گۆشتەکە بەڵام تامی نەبوو. پیاوێکی عوبادی لای ئێمە گوزەری کرد، کراسێکی لەبەردا بوو،

وتی: ئەی عەرەبەکان، خواردنەکەی خۆتان بەفیرۆمەدەن، خوێی ئەم سەرزەمینە باش نییە، دەتانەوێت لەبەرابەر ئەو خوێیە، ئەم کراسەی من وەربگرن. کراسەکەمان لێ وەرگرت و کەسێك لەئێمە لەبەری کرد. بەدەوری ئەودا دەسوڕاینەوە و سەرمان لەکراسەکە سوڕمابوو. کاتێك پارچەکەیمان ناسییەوە، زانیمان بەهاکەی دوو درەمە.

دەڵێت: لەکەسێکەوە نزیك بووم کەدوو دەزیەندی زێڕی لەدەستا بوو. خۆم نزیك کردەوە و کوشتم.

دەڵێت: دوژمن شکستی خوارد و تاسورات ڕۆشتن. ئێمە شوێنیان کەوتین و دووبارە شکستیان خوارد و تا مەداین نەوەستانەوە. موسوڵمانان لەکوسی و ئوردووگای ناباوەڕان لەدێری ئەلمەسلاخ بوو. موسوڵمانان هێرشیان کرد و رووبەروویان بوونەوە. ناباوەڕان شکستیان خوارد و روویان لەکەنارەکانی دیجلە کرد. دەستەیەکیان لەکەلوازی پەڕینەوە و دەستەیەکیان لەخوارەوەی مەداین. موسوڵمانان گەمارۆیان خستنەسەر بەشێوەیەك سەگ و پشیلەی ئەوان، هیچیان بۆ خواردن دەستنەدەکەوت. شەوانە روویان لەجەلەولا کرد. موسوڵمانان بەدوایانەوە بوون. هاشم کوڕی عوتبە فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی سەعد و لەفەرید هێرشیان کردنەسەر.

باوکی وایل دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب حوزەیفە کوڕی یەمانی وەك فەرماندەی خەڵکانی کوفە دەستنیشان کرد و موجاشیع کوڕی مەسعودی وەك فەرمانداری خەڵکانی بەسرە.

موغەیرە دەڵێت: ئەو دەستەی سەعد دیاری کردبوو، لەئوردووگاکە ڕۆشتنەدەر و روویان لەمەداین کرد تا بەڵگە و پێشنیارەکانی خۆیان باس بکەن و پێشنیاری خواپەرەستی بەیەزدگێرد بکەن. گەشتنە بەردەم بارەگای یەزدگێرد و لای ئەسپە بێ زینەکان وەستان. یەزدگێرد کەسی بۆ لای وەزیر و سەرکردەکانی فارس نارد و راوێژی لەگەڵ کردن تا چۆن وەڵامی نێردراوەکان بداتەوە. خەڵکان ئاگادار بوونەوە و بۆ بینینیان هاتن. جلوبەرگی دووراو و قامچی بچوك و پێپۆشی چەرمینیان لەپێدابوو. کاتێك خەڵکان کۆبوونەوە، مۆڵەتیان پێدرا پاشا ببینن.

کچی کەیسانی زەببی لەیەکێك لەسەرکردەکانی قادسیە کە لەکاتی گەیشتنی نێردراوانی عەرەب، ئامادە بوو، دەگێڕێتەوە: خەڵکان لەدەوری پاشا کۆببوونەوە و سەیری ئەوانیان دەکرد. هەرگیز هاوشێوەی ئەوان دەکەسم نەبینیوە کەلەکاتی بینین هاوشێوەی هەزار کەس بن. ئەسپەکانیان بەریەك دەکەوت و فارسەکان بەبینینی

بارودۆخی خۆیان وئەسپەکانیان نیگەران بوون. کاتێك ڕۆشتنە لای یەزدگێرد، وتی: دانیشن. پیاوێکی خراپەکار بوو. یەکەم کاری ئەوە بوو بەوەرگێڕەکەی وت: لێیان بپرسە ئەو جل و بەرگانەیان ناوی چییە؟ ئەو لەنەعمان سەرکردەی نێردراوەکانی پرسی: بەو جلانەی تۆ دەڵێن چی؟

وتی: بۆرد.

ئەمەی بەشێوەیەکی خراپ لێکدایەوە و وتی: بۆردی جیهان (بۆرد بەمانای بردنەوەیە)

ڕەنگی فارسەکان گۆڕا چوونکە ئەم وتەیە بۆ ئەوان دژوار بوو.

وتی: سەبارەت بەپێپۆشەکانیان پرسیار بکە.

وەرگێڕ وتی: پێپۆشەکانتان ناوی چییە؟

نەعمان وتی: نەعال.

دووبارە بەشێوەیەکی خراپ لێکیدایەوە و وتی: ناڵە ناڵە، لەسەرزەمینی ئێمە.

پرسی: ئەوە چییە بەدەستانەوە؟ وتی: سوت. سوت (سوخت) لەفارسیدا بەمانای سووتانە.

وتی: فارسیان سوتاند، خوا بیانسووتێنێت. فارسەکان لەوتەکانی ئەو خەمبار بوون.

لەگێڕانەوەی شەعبیش بەمشێوەیە باسی کراوە بەم زیادەیە کەپاشا وتی: لەوان بپرسە بۆ هاتوون و هۆکار و بزوێنەری ئێوە بۆ شەڕ لەگەڵ ئێمە چییە؟ ئەگەری هەیە پشتگوێمان خستوون و لەئێوە بێ ئاگا بووین وا بەمشێوەیە بوێر بوون؟

نەعمان کوڕی موقرین بەهاورێکانی خۆی وت: ئەگەر دەخوازن بەنوێنەرایەتی ئێوە وەڵامی دەدەمەوە و ئەگەر کەسێك دەیەوێت قسەبکات، وەڵامی بداتەوە.

وتیان: تۆ قسە بکە. بەپاشایان وت: وتەی ئەم پیاوە، وتەی ئێمەیە.

نەعمان قسەی کرد و وتی: خواوەند پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردین تا بۆ چاکەکاری ببێتە رێبەری ئێمە و فەرمانی چاکەکاریمان پێ بکات و لەخراپە و بەڵاکان دوورمان بخاتەوە. لەبەرابەر رازی بوون بەبانگەوازەکەی بەڵێنی خێری دنیا و ڕۆژی هەستانەوەی بەئێمەدا. پێشنیاری بەهەر هۆزێك کرد، بوون بەدوو دەستە، دەستەیەك باوەڕیان هێنا و دەستەیەك خۆیان لێ دوور خستەوە. تەنیا چاکەکاران باوەڕیان بەدینەکەی هێنا. دواتر فەرمانی پێدرا لەگەڵ عەرەبە نەیارەکانی بجەنگێت و لەوانەوە دەستی پێکرد. شەڕی

کرد تا ئەوەی هەموو عەرەبەکان باوەڕیان هێنا. یا نابەدڵخواز یا بەرەزامەندییەوە، شوێنی کەوتین. دواتر فەرمانی پێدراین پێشنیاری دادپەروەری و خواپەرەستی بەنەتەوەکانی دەوروبەری خۆمان بکەین، ئێمە پێشنیاری دینەکەی خۆمان بەئێوە دەکەین کەچاکە بەچاکە و خراپە بەخراپ دەزانێت. ئەگەر رازی نەبن گیرۆدەی بەلاّ دەبن یانی دەبێت جەزیە بدەن و ئەگەر بەوە رازی نەبن، تەنیا جەنگ لەنێوان ئێمەدا دەمێنێتەوە. ئەگەر باوەڕ بەدینەکەی ئێمە بێنن، کتێبی خوا لەناو ئێوەدا بەجێدێڵین و دەبێت فەرمان وئەرکەکانی وەك موسوڵمانان بگرنە ئەستۆ و ئێمەیش دەگەڕێینەوە. ئەگەر جەزیە بدەن، رازی دەبین و دەبینە پشتیوانی ئێوە، جیاواز لەم دوو شێوەیە شەڕتان لەگەڵ دکەین.

دەڵێت: یەزدگێرد وتی: لەسەر زەوی خەڵکانێکی بەدبەختتر و چارەڕەشتر لەئێوە ناناسم. ئێمە گوندەکانی دەوروبەرمان بۆ شەڕی ئێوە نارد و تا ئێستا فارسەکان بۆ شەڕی ئێوە نەهاتوون، ئێوە توانای رووبەروو بوونەوە لەگەڵ ئەوانتان نییە، ئەگەر ژمارەتان زیادی کردووە، لەخۆتان بایی مەبن و ئەگەر بەمەبەستی بەدەست هێنانی بژێوی و سامان هاتوون، فەرمان دەدەین، بۆتان دابین بکەن و رێز لەگەورەکانتان دەگرین. جل و بەرگتان پێ دەدەین و کەسێك وەك پاشای ئێوە دیاریدەکەین تا بەشێوەیەکی نەرم و نیان هەڵس و کەوتتان لەگەڵ بکات.

عەرەبەکان بێدەنگ بوون. موغەیرە کوڕی زەرارە کوڕی نەباش هەستا و وتی: ئەی پاشا، ئەوانە سەرکردە و گەورەکانی عەرەبن و گەورەکانی خەڵك لەگەورەیی شەرم دەکەن چوونکە گەورەکان رێزی گەورەکانیان هەیە و گەورەکان رێز لەگەورەکان دەگرن و بەگەورەیان دەزانن. بەم پێیە هەموو پێشنیار و فەرمانەکانی خۆیان بەگوێی تۆ نەگەیاند و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی تۆیان نەدایەوە. ئێستا گوێ بگرە تا وەڵام بدەمەوە و ئەوان شایەتی وتەکانمان بن. بەشێوەیەك نەزانانە وەسفی ئێمەت کرد ، باسی هەژاری و نەداری ئێمەت کرد کەکەس لەئێمە هەژارتر نەبوو، برسیەتی ئێمە برسیەتی نەبوو، قالۆنچە و دووپشك و مارمان دەخوارد و بەخواردنێکی خۆشمان دەزانی. مەنزڵگەی ئێمە سەرزەوی و جگە لەتووکی مەڕ و وشتر کەدەمانڕست، هیچ پۆششێکمان نەبوو. دینەکەمان ئەوە بوو هێرش بکەینە سەر یەك و خوێنی یەکتر بڕێژین. کچانی خۆمان زیندە بەچاڵ دەکرد تا خواردنی ئێمە نەخوات، ئەمە بارودۆخی ئێمە بوو. خولوەند پیاوێکی خاوەن نەژاد و ناسراوی ڕەوانە فەرموو. سەرزەمینی ئەو

باشترین سەرزەمینی ئێمە بوو. شەرەف و گەورەیی پێش هەموو خەڵکان. بنەماڵەکەی بەناوبانگ و هۆزەکەی لەهەموو هۆزەکان بەناوبانگتر و خۆی لەهەمووان راستگۆتر و بیرمەندتر بوو. پێشنیاری ئایینێکی بەئێمە کرد کەکەس جگە لەهاورێیەکی رازی نەبوو و دواتر بوو بەجێگری. ئەو قسەی کردو وەڵاممان دایەوە، ئەو راستی هێنایە سەرزمان و ئێمە درۆمان کرد. هێزی ئەو زیادی کرد و ئێمە لەناوچووین، ئەوەی باسی کرد، هاتەدی و ئەوەی فەرمانی پێدەدا، فەرمانی خواوەند بوو. بەئێمەی وت: پەروەردگار دەفەرمێت، من خوای تاقانەم و شەریکم نییە، کاتێك بووم، هیچ شتێك نەبوو و هەموو شتێك جگە لەخۆم لەناو دەچێت. هەموو شتێکم ئافراند و هەموو شتێك بۆ لای من دەگەڕێتەوە. بەزەیی و بەخششی من ئێوەی گرتەوە و ئەم پیاوەم بۆ لای ئێوە نارد تا ئەو رێگەی بەهۆیەوە دوای مردن ئێوە لەئازارەکانی خۆم رزگار دەکەم، نیشانی ئێوە بدات. ئێمە شایەتی دەدەین ئەو لەسەر راستی بوو و فەرمانی پێداین هەرکەس باوەڕ بەدینەکەی ئێمە بێنێت، ئەرك و لێپرسراویەتی هاوشێوەی ئێمەی لەسەر شان دەبێت، هەرکەس رازی نەبوو، جەزیەی لێ بستێنن و هەرکەس رازی نەبوو، شەڕی لەگەڵ بکەن و من دەبمە داوەری ئێوە. هەرکەس لەئێوە بکوژرێت، دەڕواتە بەهەشت و هەرکەس بمێنێتەوە، سەرکەوتنی پێدەبەخشم. ئێستا ئەگەر دەخوازیت جەزیە بدە و تەسلیم بە و گەرنە تەنیا شمشێر لەناو ئێمەدایە، مەگەر ئەوەی باوەڕ بەئیسلام بێنیت و خۆت رزگار بکەیت.

پاشا وتی: بەمشێوەیە قسە لەگەڵ من دەکەیت؟

وتی: قسەم لەگەڵ کەسێك کرد کەقسەی لەگەڵ من کرد و ئەگەر کەسێکی دیکە بەمشێوەیە قسەم لەگەڵ بکات، بەمشێوەیە وەڵامی تۆم نەدەدایەوە.

پاشا وتی: ئەگەر رێگەیان لەکوشتنی نێردراوان نەدەگرت، ئێوەم دەکوشت، کارم بەئێوە نەماوە. دواتر فەرمانیدا بڕێك خۆڵ بێنن و بیکەنە کۆڵی گەورەی ئەم کەسانە تا لەمەداین بیباتەدەر. بەعەرەبەکانی وت: بگەڕێنەوە بۆلای هاورێکەی خۆتان و پێی بڵێن، رۆستەم دەنێرم تا لەقادسیە هەمووتان چاڵ بکات بۆ ئەوەی ببنە وانەیەك بۆ کەسانی دیکە، دواتر رەوانەی سەرزەمینی ئێوەی دەکەم تا بەڵایەکی خراپتر لەبەڵاکەی شاپوور بەسەر ئێوەدا بێنێت.

پرسی: گەورە و سەرکردەی ئێوە کێیە؟ بێدەنگ بوون.

عاسم کوڕی عەمرۆ، کەچەمابوویەوە تا خۆڵەکە بخەنە سەر پشتی، وتی: من سەرکردەی ئەوانم، خۆڵەکە بخەنە سەر پشتی من.

پاشا وتی: راست دەکات؟

وتیان: بەڵێ. خۆڵەکەی لەسەر پشتی ئەو بار کرد و لەئەیوان و ماڵی پاشا هاتەدەر و گەیشتە لای چوارپێکەی خۆی. خۆڵەکەی لەسەر پشتی چوارپێکەی دانا و بەخێرایی بەرێکەوتن و گەڕانەوە بۆ لای سەعد. عاسم پێش ئەوان کەوت و لەدەروازەی قەدیس تێپەڕی و دەیوت: مژدەی سەرکەوتن بەئەمیر ببەخشن، چوونکە دڵنیام خواوەند سەرکەوتنمان پێدەبەخشێت.

عاسم ڕۆشت و خۆڵەکەی لەماڵی خۆیدانا و گەڕایەوە بۆ لای سەعد و لەڕووداوەکان ئاگاداری کردەوە.

سەعد وتی: دڵخۆش بن چوونکە خواوەند کلیلی ماڵی ئەوانی تەسلیمی ئێمە کرد.

شەڕکەران هاتن و ڕۆژانەی هێزی موسوڵمانان زیادی دەکرد و دوژمن لاوازتر دەبوو.

کردەوەی پاشا بۆ ئەوەی خۆڵەکەی لەپشتی ئەوان بار کرد لای کەسانی دیکە ناپەسەند بوو. ڕۆستەم لەساباتەوە گەڕایەوە بۆ لای پاشا و سەبارەت بەکاری موسوڵمانان پرسیاری لێکرد و پرسی: ئەوانت چۆن بینیوە؟

پاشا وتی: نازانم ئایا لەناو عەرەبەکان کەسانی لەمشێوەیە دەبینرێت کەبیرمەندتر و زمان پاراوتر لەئێوەن، راستییەکانیان بەمن وت، وتیان: بەڵێنێکیان پێدراوە یا بەدەستی دێنن یا لەم ڕێگەدا دەکوژرێن. بەڵام سەرکردەکەیان لەهەموویان ئەزاتر بوو. برێکم خۆڵم پێدا کەخستییە سەرپشتی و ڕۆشت. ئەگەر دەیویست دەیتوانی ئەم کارە بەکەسێکی دیکەیان بسپێرێت بێ ئەوەی من هەستی پێبکەم.

ڕۆستەم وتی: ئەی پاشا، ئەوە بیرمەندی ئەوان بووە، بەشێوەیەکی باش لێکدانەوەی بۆ ئەم کارەی خۆی کردووە.

ڕۆستەمی کاهین و ئەستێرەناس توورە لای پاشا هاتەدەر و کەسی بەدوای نێردراواندا ڕەوانە کرد و بەرازدارەکەی خۆی وت: ئەگەر نێردراو بەوان بگاتەوە دەتوانین سەرزەمینەکەی خۆمان بپارێزین و ئەگەر نەتوانێت ئەوان بگرێت، خواوەند زەوی و منداڵەکانتان لەئێوە دەستێنێت.

نێردراو لەحیرە گەڕایەوە و نەیتوانی بەنێردراوانی عەرەب بگاتەوە. ڕۆستەم وتی: بێ گفتوگۆ ئەم خەڵکە دەست بەسەر سەرزەمینەکەی ئێوەدا دەگرن. کوڕی پەردەدار،

شیاوی پاشایەتی نییە، عەرەبەکان کلیلی سەرزەمینەکەی ئێوەیان برد. خواوەند بەهۆی ئەم ڕووداوە، تووڕەیی فارسەکانی زیادی کرد.

سەعد دوای ڕۆشتنی نێردراوان بۆ لای یەزدگێرد، دەستەیەکی نارد کەڕۆشتن و ڕووبەڕووی دەستەیەك لەراوچییانی ماسی بوونەوە کەبڕێکی زۆر ماسییان ڕاو کردبوو. سواد کوڕی مالکی تەمیمی ڕووی کردە نەجاف و فوراز و سێسەد چوارپێی لەئێستر و مانگا پێش خۆی خست و ماسییەکانیان بار کرد و بەرەبەیان گەیشتنە ئۆردووگای موسوڵمانان. سەعد ماسی لەناو شەڕکەراندا دابەش کرد و چوارپێکانیش بەهەمان شێوە دابەش کران. پێنج یەکی تالآنییەکانی هەڵگرت و ئەمەیان بەشەڕی ماسییەکان ناوبرد.

ئازادمەرد کوڕی ئازازبە بۆ دۆزینەوەی کەسانی خۆی هاتەدەر و سواد کوڕی مالکی تەمیمی و دەستەیەك لەهاوەڵانی ڕێگەی ئەویان گرت و لەسەر پردی سەلیحین شەڕیان کرد تا ئەو کاتەی دڵنیابوون تالآنییەکان لەدەستی دوژمن دوور خراوەتەوە. دواتر پاشەکشێیان کرد و گەڕانەوە بۆ ناو موسوڵمانان.

موسوڵمانان تامەزرۆی خواردنی گۆشت بوون. گەنم و جۆ و دانەوێڵەیان بەئەندازەی پێویست لەبەردەست بوو. دەستەکان بۆ بەدەست هێنانی گۆشت ئۆردووگایان بەجێدەهێشت. لەو شەڕانەی بۆ بەدەست هێنانی گۆشت کردییان، شەڕ مانگاکان و شەڕی ماسییەکان بوو.

مالك کوڕی ڕەبیعە کوڕی خالیدی تیمی، وایلی لەگەڵ موشاوێر کوڕی نەعمانی تیمی ڕەبیعی ڕەوانە کران و هێرشیان کردەسەر فیوم و وشترەکانی تەغلەب و نەمریان گرت و شەوانە گەڕانەوە بۆ ناو ئوردووی موسوڵمانان. خەڵکان وشترەکانیان سەربڕی و گۆشتی موسوڵمانان زیادی کرد.

عەمرۆ کوڕی حارس هێرشی کردە سەر نەهرەین و لەسورار مەڕومالآتی زۆریان دەستکەوت و لەسەرزەمینی شیلی کەهەنووکە شاری زیادە، بڕێکی زۆر مەڕومالآتیان پێش خۆیاندا.

دەڵێت: ئەو کاتە تەنیا دوو ڕووبار لەو ناوچەیەدا بوو.

لەو کاتەوەی خالید هاتە عێراق تا ئەو کاتەی سەعد لەقادسیە جێگیر بوو، دوو ساڵ و چەند مانگێکی خایاند. سەعد بۆ ماوەی دوو مانگ لەقادسیە مایەوە تا سەرکەوتنی

بەدەست هێنا.

لەرووداو و پێشهاتی نێوان عەرەبەکان و فارسەکان دوای بوەیب ئەمەیە کەئەنوشگان کوڕی هەربوز لەسوادی بەسرە رووی کردە خەڵکانی غەزی کەمەستوورد و عەبدوللە کوڕی زەید سەرکردەی تیرەی رەبابی تەمیم و جەۆ کوڕی معاویە و کوڕی نابیغە دوو سەرکردەی تیرەی سەعد تەمیم و حەسەن کوڕی نەیار و ئەعوەر کوڕی شەبابە دوو سەرکردەی خەڵکانی عەمرۆ و تەمیم و حوسێن کوڕی مەعبەد و شەبە دوو سەرکردەی خەڵکانی حەنزەلەی تەمیم رێگەیان بەست و ئەویان کوشت. کاتێك سەعد هات ئەوان و خەڵکانی غەزی و هەموو ئەم تایەفانە پەیوەستی سەعد بوون.